دەرەوەی ئەمریکا نایانەوێت کوردەکان سەر بکەون. ئەمانە تەنها دەیانەویست کوردەکان لە بەرامبەر سوپای عێراقدا رابوەستن و درێژە بە شەڕ بدەن و وزە و سەرچاوەکانی وڵاتی عێراق بە فیڕۆ بدەن. راپۆرتێکی CIA لە ۲۲ی ئاداری ۱۹۷۴ وەها باسی سیاسەتی دەرەوەی ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت ئەم رەوتە دەکات:

"ئێمە ئەوە دەزانین کە ئێران رازی نییە بە دامەزرانی حکومەتێکی کوردی کە خاوەن ئۆتۆنۆمییەکی پێناسەکراو بێت. ئێران هەروەك خۆمان قازانجی لەوەدایە کە بارودۆخەکە وەك خۆی بمێنێتەوە و عێراق لە ئەنجامی پێداگری کوردەکان لە سەر نیمچە ئۆتۆنۆمییەك بە تەواوی لاواز بێت. نە ئێمە و نە ئێران نامانەوێت مەسەلەکە بە شێوەیەك لە شێوەکان چارەسەر ببێت. ئەم سیاسەتە هەروەها کە لەم راپۆرتەدا ئاماژەی پێکراوە بە لایەنی بەرامبەری ئێمە(کوردەکان)کە داوامان لێدەکردن درێژە بە شەڕ بدەن، رانەگەیەندرابوو. ئەم رەفتارە تەنانەت لە چوارچێوەی ئۆپەراسیونی نهێنیشدا کارێکی باش نەبوو".

تەنانەت "راپۆرتی پایك" [۱۹] (کە لایەن گرووپی توێژینەوەی کۆنگرێسەوە ئامادە کرابوو ) لایەنگری لەم هەڵسەنگاندنە دەکرد ، لانیکەم تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە سیاسەتی ئەمریکا و ئێران واتا سەرنەکەوتنی کوردەکانەوە هەبوو.

لە گەرماوگەرمی شەڕی تشرینی یەکەمی ۱۹۷۳ی نێوان ئیسراییل و عەرەبەکان، عێراق یەك فەوج سەربازی بۆ بەشداری کردن لەم شەڕەدا رەوانە کرد. کوردەکان لە سەر داوای ئیسراییل دەیانویست کۆمەڵێك هێرشی بەرچاو بکەنە سەر هێزەکانی عێراق بەڵام کیسینجێر کە پەی بەوە بردبوو ئەگەر کوردەکان لەم هێرشەدا سەر بکەون، ئەمریکا تووشی زیان دەبێت ، لە ۱۶ی تشرینی یەکەم فەرمانی بەCIA دا ئەم پەیامە بنێرێت بۆ کوردەکان:

" ئێمە نیازی ئێوە بۆ ئەنجامدانی هێرشی سەربازی کە ئیسراییل پێشنیاری پێکردوون، بە شتێکی باش نازانین."

---

[۱۹] Pike report

کوردەکانیش کە متمانەی تەواویان بە ئەمریکا هەبوو، ئەم مۆچیارییەی (کیسینجێر)یان بە قازانجی بێ ئەملاولای خۆیان لێکدایەوە و قبوڵیان کرد. بەڵام ئەوە سەلیندرا کە متمانەی کوردەکان بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا مەترسیدارە. CIA لە تەواوی ئەم ماوەیەدا کۆمەڵێك راستی لە بەر دەستدا بوو دەربارەی ئەوەی کە هەر کاتێك شا لە سەر ناکۆکییەکە سنوورییەکەی لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت ، بێ گومان دەست لە کوردەکان هەڵدەگرێت .

شا لە سەرویەندی ناکۆکییەکەی لەگەڵ عێراق نە وەك کۆمەڵێك مرۆڤ بەڵکوو وەك ئامرازێك سەیری کوردەکانی دەکرد. CIA ش هەمان خوێندنەوەی لە کوردەکان هەبوو و وەك ئامرازێك بۆ لاواز کردنی پێگەی عێراق لە زیادەخوازییە ناوچەییەکانیدا سەیری کوردەکانی دەکرد.

عێراق کە بە هۆی شەڕی کوردەکان لە توانا کەوتبوو و لەوە دەترسا شەڕەکە درێژ بێتەوە، پێشنیاری ئێرانی بۆ وتووێژ لە سەر بەخشینی کۆمەڵێك پوانی سەرزەمینی لە سنووری ئێران و عێراق قبوڵ کرد لە بەرامبەر ئەوەدا کە ئێران پشتیوانی لە کوردەکان رابوەستێنێت.

رێکەوتننامەکە لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ لە میانەی کونفرانسی OPEK لە ئەلجەزیرە مۆر کرا و دەستبەجێ پاش ئەوە ئێران سنوورەکانی خۆی لە سەر کوردەکانی عێراق داخست و چەند رۆژ پاش ئەوە سوپای عێراق دەستی بە هێرشێکی بەرفراوان و توند کرد. کوردەکان کە لە لایەن شا و ئەمریکاوە بە تەنیا هێلرابوونەوە، نەیاندەتوانی لە بەرامبەر ماشینی کوشتوکوشتاری عێراق رابوەستن و هێزی سەربازیان بە ماوەی چەندساڵ تێکشکا. لە سەرویەندی هێرشەکانی عێراقدا، کوردە ئاوارەبووەکان بە بێهیواییەوە کۆمەڵێك پەیامیان نارد بۆ CIA دەربارەی ئەوەی کە:

"خەڵکەکەمان و هێزەکانمان شڵەژاون و تۆقیون. چارەنووسی خەڵکەکەمان لە مەترسییەکی بێ وێنەدایە، لەگەڵ لەناوچونی تەواو بەرەوڕوین، هیچ پاساوێك بۆ ئەم رووداوانە لە ئارادا نییە. ئێمە دەست بە داوێنی ئێوە و دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبین وەها کە بەڵێنتان پێدابووین، دەستێوەدان بکەن".

لە پەیامێکی دیکەی کوردەکاندا بۆ کیسینجێر هاتووە:

"جەنابی( کیسینجێر) ئێمە کە هەمیشە لە کێشمەکێش و ناکۆکییەکاندا، لەوانە ناکۆکی ئێران و عێراق باوەڕمان بە ڕێگاچارەی ئاشتیخوازانە بووە، خۆشحاڵین کە ئێستا ئەم دوو وڵاتە گەیشتوونەتە کۆمەڵێك ڕێککەوتن ... بەڵام بەهەرحال خوێن لە دڵمان دەتکێت کە یەکێ لە ئاکامە کتوپڕەکانی ئەم ڕێککەوتنە لەناوچوونی خەڵکی بێپاراستنی ئێمەیە. هەموو کەسێك بێ دەنگە. جەنابی (کیسینجێر) ئێمە وا هەست دەکەین ئەرکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە داکۆکی لە ئێمە بکات و بەرپرسیارێتی ئەخلاقی و سیاسی هەیە لە بەرامبەر خەڵکی ئێمە".

بەڵام ئەمریکا هیچ وەڵامێکی ڕاستەوخۆی بە کوردەکان نەدایەوە و هیچ کارێکی بۆ ڕزگار کردنی ۲۰۰ هەزار خەڵکی ئاوارە ئەنجام نەدا. کاتێ کە کارمەندانی *کومیتەی پایك* لە بارەی "هەبوونی دەستی ئەمریکا لە چارەڕەشی کوردەکاندا" گفتوگۆیان لەگەڵ کیسینجێر کرد ، کیسینجێر لە وەڵامدا وتی:

"نابێ ئوپەراسیونی نهێنی لەگەڵ پڕوپاگەندای کاروباری ئایینی تێکەڵ بکرێت".

ئەو قسەیەی "جۆرج لنسۆڤیسکی" [۲۰] بە جێیە کە دەڵێت:"ڕێککەوتنامەی ئەلجەزایر کە ئەمریکا پێی ڕازی بوو، بۆ ناسیونالیستە کوردەکان جۆرێك یالتا [۲۱] بوو". ئەم قسەیە بۆ خۆی ناوەرۆکی چەند بەرگ کتێب لە خۆ دەگرێت. "ئارتوور تۆرنێر" [۲۲] زۆرتر مەسەلەکە شی دەکاتەوە و دەڵێت :

---

[۲۰] George Lenczowski

[۲۱] لە ٤-۱۱ی شوباتی ۱۹٤٥ کونفرانسێك لە یالتا بەڕێوە چوو کە سەرۆك کۆماری بەریتانیا، سۆڤیەت و ئەمریکا تێیدا بەشدار بوون و کۆمەڵێك شەرت و مەرجی گرانیان سەپاند بە سەر ئەو وڵاتانەدا کە شەڕی دووەمی جیهانیان دۆڕاندبوو، بە تایبەت ئاڵمانیا. مەبەستی نوسەر لێرە ئەوەیە کە پەیماننامەی ئەلجەزایر بە هەمان شێوەی "کونفرانسی یالتا" کۆمەڵێك ئاکام و شەرت و مەرجی گرانی بۆ کوردەکان بە دواوە بوو. (وەرگێڕ)

[۲۲] **Arthur Turner**

" ریککەوتننامەی ئەلجەزایر کتێبی وانەیەکە کە نیشان دەدات چۆن ولاتانی گەورە بۆ بەرژەوەندی خۆیان خەلکی هەژار دەکەن بە قوربانی".

## تێوەگلانی ئەمریکا لە شەڕی ١٩٩١ی کەنداو

مێژوو لێوانلێوە لە رووداوگەلی سەیروسەمەرە کە هەندێکیان تراژدیك و هەندێکیان خیانەتبارن. دەستبەجێ دوابەدوای ئوپەراسیونی سەربازی لە شوباتی ١٩٩١ و هەرەسهێنانی هێزەکانی عێراق، سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە بانگەوازێکدا داوای لە خەلکی عێراق کرد راپەڕن و رژێمی سەدام حوسەین بڕوخێنن. ئەم بەیاننامەیە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای خستە ناو بارودۆخێکی دژواری سیاسی و ئاسایشی ناوچەیی و نێونەتەوەیی کە شۆکێکی ژئۆپلۆتیکی لێکەوتەوە کە هێشتاش کومەلێك شەپۆلی ناسەقامگیری لە هاوسەنگی هێزەکان لە ناوچە دروست کردووە. بەهەرحال هەم کوردەکان لە باکوور و هەم شیعەکان لە باشوور بە گڕوتین و شەوقەوە وەلامی ئەم داواکاریەی سەرۆك کوماری ئەمریکایان دایاوە. بەلام لە کاتێکدا کە شیعەکان لە باشوور خۆیان باش نیشان نەدا، کوردەکان بە یارمەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و هێزە هاوپەیمانەکان کە بنکەکانیان لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بوو و "ئوپەراسیونی چەکوشی هاوسەنگی"یان بەڕێوە دەبرد، توانیان کیانێکی ئانکلاوی[٢٣] سەربەخۆی لەرزۆك پێکبێنن.

بەهەرحال هەروەها کە بوش رایگەیاند، سەقامگیری ناوچە تەنها پاش لەسەر دەسەلات نەمانی سەدام حوسەین دەستەبەر دەبوو . بوش هەولێ دیپلوماتیکی زۆری دا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان تا توانی بڕیارنامەی ٦٧٨ لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ پەسەند بکرێت. ماددەی ٢ی ئەم بڕیارنامەیە بە ئەنقەست ناڕوون داڕێژرابوو بۆ ئەوەی شرۆڤە و

---

[٢٣] ئانکلاو بەو کیانە دەلێن کە لەلایەن دەولەتانی دەوروبەری خۆی گەمارۆ درابێ یان بە تەواوی کەوتبێتە ناو خاکی ولاتێکی دیکە. (وەرگێڕ)

کردەوەی جۆراوجۆر هەڵبگرێت و ڕێگای بۆ سەرجەم ئەو دەوڵەتانە کە لەگەڵ کوێت هاوکاریان دەکرد خۆش کرد لە هەموو ئامرازگەلی پێویست بۆ زیندووبوونەوەی ئاشتی و ئاسایشی ناوچە کەڵك وەربگرن.

ئاکام و ئەنجامەکانی بانگەوازە نابەجێکەی بوش نەتەنها نەبووە هۆی لەسەر دەسەلاَت نەمانی سەدام، بەڵکوو بووە هۆی کرانەوەی ئاسۆی دابەشبوونی کۆماری عێراق بە سێ کیانی جیاواز: شیعەکان لە باشوور، سوونەکان لە ناوەڕاست و کوردەکان لە باکوور. ئەم ئاسۆیە هاوسەنگی لەرزۆکی هێزەکانی لە ناوچە لەرزۆکتر کرد. بەهەرحاڵ هەمان ئەزموونی کورد و حکوومەتی عێراق لە ۱۹۷۲-۱۹۷۵ دووپات بووەوە و کوردەکان پاش ئەوەی لە لایەن ولاَتە یەکگرتووەکانەوە تەشویق کران دژی سەدام ڕاپەڕن، بە تەنیا لە بەرامبەر ئاکام و ئەنجامگەلی خوێناوی ڕووبەڕوو بوونەوە و ئەمریکا هیچ یارمەتییەکی نەدان. بوش کە لەم پەیوەندییەدا تۆمەتی کەمتەرخەمبوونی خرابووە پاڵ بە توورەییەوە وەلاَمی دایەوە:

"پێموانییە ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوناهبار بێ لە بەر ئەوەی پێشنیاری ئەوەی بە خەڵکی عێراق کردبێ حکوومەتی عێراق بڕوخێنن و مەبەستی ئەوە بووبێ کە ولاَتە یەکگرتووەکان دێتە مەیدان و پشتیوانی سەربازیان لێدەکات، ئا شتی وا ڕاست نییە، ئێمە قەت مەبەستێکی وامان نەبووە."

پاشەکشەی بەرەبەرەی ئەمریکا لە پشتیوانی کردن لە ئۆپۆزیسیونی عێراق، یەکەم جار لە لایەن (کالین پاوڵ)ەوە ئاشکرابوو واتا ئەو کاتە کە ئەمریکا هوشداری دا بە سەدام کە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرکوتی ڕاپەرینە جۆراوجۆرەکان تۆزێ بەپارێزەوە کار بکات(واتای ئەوە کە تۆزی پارێز بکات ئەوە نەبوو کە سەرکوتەکە ڕابوەستێنێت). پاشان لە ۲۶ی ئادار ڕوون بووەوە کە دەوڵەتی ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری داوە بۆ پشتیوانی لە ڕاپەڕیوان نەیەتە مەیدان. ئەوکاتە فەرماندەی ئەمریکایی هێزە هاوپەیمانەکان، ژنەراڵ "نۆرمەن شوارزکۆف" [۲۴] و هاوتا عێراقییەکەی

---

[۲۴] general Norman Schwartzkopf

لە سەر ئەوە رێککەوتبوون کە سوپای عێراق لە کۆپتەری تۆپدار و ئۆتۆموبیلی سەربازی بۆ تێکشکاندنی راپەرین کەڵك وەرنەگرێت.

چەند رۆژ پاش ئەوە هێرشێکی بەرفراوان بۆ سەر کوردە راپەڕیوەکان دەستی پێکرد. شارە سەرەکییەکان کەوتەوە دەستی هێزەکانی دەوڵەت و بە هەزاران کوردی تۆقاو بەرەو شاخەکان هەڵهاتن و بە شڵەژاوییەوە هەوڵیان دا خۆیان لە کۆمەڵکوژی سەدام رزگار بکەن. تا کۆتایی مانگی نیسان پتر لە دوو میلیون ئاوارە بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا کۆڕەویان کرد. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە کێشەی کوێتی چارەسەر کردبوو و هاوسەنگی هێزەکانی لە ناوچە زیندوو کردبووەوە کێشەیەکەی چەند رەهەندی دیکەی دروست کرد کە ئاکام و لێکەوتەی گەورەی بۆ ئاسایشی ناوچە بە دوواوە بوو و هێزە رکابەرەکانی ناوچەی ناچار دەکرد بەربەرەکانی لەگەڵ بکەن.

سەدام بەتواناییە خێرا و دڕەندەکەی بۆ کونترول کردنی عێراق و راگرتنی دەسەلاتی خۆی ، جیهانی تووشی سەرسووڕمان کرد . "برێنت سکۆکرافت" [٢٥] لەم پەیوەندییەدا وەلامی دایەوە:

"ئێمە قەد چاوەڕوانی ئەوەمان نەدەکرد هێرشێکی ئەوەندە توند بکرێتە سەر کوردەکان "[٢٦]

ئەم کاردانەوە دڕندانەیەی سەدام ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ناچار کرد لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ بڕیارنامەی ٦٨٨ پەسەند بکات کە تێیدا سەرکوتی خەڵکی سیڤیلی عێراق بە تایبەت لە ناوچە کوردنشینەکان شەرمەزار کرا و و رێگە درا بەوەی هەرێمێکی ئارام دروست بکرێت کە ئێستا لە کردەوەدا بووە بە کیانێکی جیاواز لە ناو عێراقدا.

---

**Brent Scowcroft** [٢٥]

[٢٦] ئیدارەی ئەمریکا ئاگاداری ئاکامەکانی بە تەنیا هێشتنەوەی کوردەکان بوو و پێشبینی ئەوەی کردبوو کە کوردەکان ئاوارە دەبن، هەربۆیە پێداویستییەکانی ٢٠ هەزار ئاوارەی (واتا ١٠٠ قات کەمتر لە ژمارەی ئەو کەسانە کە لە راستیدا ئاوارە بوون) لە خاکی تورکیا ئامادە کردبوو.

باری یەك میلیون ئاوارەی کوردی عێراق کە گەیشتبوونە سەر سنووری ئێران لە سەر شانی ئەم وڵاتە بوو و ئەم ژمارەیە زیاد بوو بە سەر ئەو ٦٠٠ هەزار ئاوارەیە کە لە ئاوارەییەکانی پێشووتردا چووبوونە ئێران . تورکیاش میلیۆنێك کوردی دیکەی وەك ئاوارە قبووڵ کردبوو. تورکیا کە یەکێ لە بەشدارە سەرەکییەکانی شەڕی دووەمی کەنداو بوو و خۆی کێشەی زۆری لەگەڵ کوردەکانی خۆی هەبوو، لە لایەن ڕۆژئاواوە ڕێگەی پێدرا دەوری یەکلاییکەرەوە لە ئیدارەی ناوچەی ئالۆزی کوردەکان بگێڕێت. تورکیا هەر لە سەرەتاوە مەنتیقی سیاسەتی دریژخایەنی خۆی بە نیسبەت چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ قەیرانی ئاوارەکان نیشان دا و ڕێبەرەکانی ڕایانگەیاند ئاوارەکان دەبێ بە زووترین کات خاکی تورکیا بە جێ بهێڵن. ئاوارەکان ناچار بوون خاکی تورکیا بە جێ بهێڵن بەڵام بەهەرحاڵ گەڕانەوە بۆ کیانێکی جیاوازی کورد لە ئارادا نەبوو، بەڵکوو دەبوایا گەڕابانەوە بۆ شوێنێکی ئارام لە ناو وڵاتی یەکپارچەی عێراقدا.

لاواز بوونی زیاتری عێراق و دروستبوونی حکوومەتێکی سەربەخۆی کورد هاوسەنگی هێزەکانی بە قازانجی هاوپەیمانیی هەستیاری ئێران و سوریا تێکدەدا. لە ٧ی نیسان ئوزال، سەرۆك کۆماری تورکیا وتی:"ئێمە ناچارین ئەم خەڵکە(کوردەکان)لە ناو قەڵەمڕەوی عێراقدا بهێڵینەوە و ئاگامان لێیان بێت" (دەستەواژەی قەڵەمڕەوی عێراق دبێ سەرنجی پێبدرێت). "جەیمز بەیکێر" بوو بە خەمخۆری بەرژەوەندییەکانی تورکیا و بۆ ئەوەی کوردەکان تێبگەیەنێت ئەمریکا پشتیوانی لە شەڕەکەیان دژی دەوڵەتی عێراق ناکات، لە تورکیا ڕایگەیاند:

" وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت بکەوێتە ناو لێژگەی گێرۆدەبوون بە شەڕی ناوخۆی عێراق "، مەبەستی ئەوە بوو کە بەهەرحاڵ دەوڵەتی دڕندەی سەدام حوسەین هێشتا دەسەڵاتی یاسایی عێراقە. دامەزراندنی ناوەندگەلی حەساندنەوەی نێونەتەوەیی لە خاکی عێراق بێ ڕەزامەندی حکوومەتی عێراق ، زۆرترین دەستێوەردانێك بوو کە ئەمریکا دەیتوانی دژی یەکپارچەیی وڵاتیك بیکات کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا بە فەرمی ناسرا بوو. پاساوی ڕێزگرتن لە

یەکپارچەیی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرەنسیپە کە هاوپەیمانان تەنها بۆ ئازاد کردنی کوێت ئەو شەڕە قورسەیانە کرد.

## ئەنجام

بە وتەی" گور- ئاریە"[27] هیچ نەتەوەیك لە سەدەی بیستەم بە قەد کورد نەبووە بە داردەستی هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان. سیاسەتی دەرەوی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کوردەکانی عێراق بابەتێکی گرنگە کە شرۆڤەی جیاجیا هەڵدەگرێت. دەستێوەردانی ئەمریکا لە کاروباری ناوخۆیی عێراق هەموو توخمەکانی سیاسەتی ماکیاوێلیستی[28] لەخۆ دەگرێت. تەشویق کردنی کوردەکان لە لایەن ئەمریکا بۆ درێژەپێدانی شەڕ ، دووجار هەموو دەرفەتەکانی لە ناو برد بۆ ئەوەی کوردەکان لە ولاتی یەکپارچەی عێراقدا بە ئاشتی بژین.

ئیدارەی ئەمریکا هەردوو جارەکە(خولی ١٩٧٢-١٩٧٥ و خولی ١٩٩١) وەك ئامراز سەیری خەڵکی کوردی کرد، بێ لەبەرچاوگرتنی سەرجەم ئەو پرەنسیپە مرۆڤی و ئەخلاقیانە کە سیاسەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەر بنەمای دامەزرابوو. لە بابەتی ١٩٧٢-١٩٧٥ بە مەبەستی دڵنیابوون لەوەی کە ئەم ئۆپەراسیونە بێ هیچ رەخنە و پرۆتستۆیەك سەردەکەوێت، سەرۆك کۆماری ئەمریکا میکانیزمە چاودێریکارە ئاساییەکانی (کە بۆ ئۆپەراسیونێکی هەواڵگریی وەها پێویست بوو) پشتگوێ خست. ئاستی ئەم ئۆپەراسیونە لە رادەبەدر نهێنی بوو. کۆنگرێس، وەزارەتی دەرەوە و تەنانەت باڵوێزی ئەمریکا لە عێراق ئەوەیان

---

Gur-Arieh [27]

[28] ماکیاوڵیزم رێبازێکی سیاسییە کە لە ناوی ماکیاوڵ، بیرمەندی ئیتالیایی(١٤٦٩-١٥٢٧) گیراوە و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە مرۆڤ بۆ گەیشتن بە ئامانج دەبێ لە هەموو ئامرازێك کەڵك وەربگرێت وەك خیانەت، پەیمانشکێنی، درۆ، پیلانگێڕی و هتد. (وەرگێڕ)

ڕەت دەکردەوە  کە ئاگایان لەم پرۆژەیە هەبووبێت. سەرۆك کۆمار و  وەزیری دەرەوە دڵنیا بوون لەوەی کە بە فەرمی هیچ زانیارییەك  دەربارەی پرۆژەکە دزە ناکاتە دەرەوە. ئەم پلانە ئاگای لە سەرەنجامە گرنگ و  جیدییەکەی خۆی هەبوو، پلانێك بوو کە لە ڕێگای ڕەوتە جێکەوتووەکانی بڕیاردانی ناو سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا  نەخرابووە بەر باس و بڕیاری لە سەر نەدرابوو.

هەروەها لە  بابەتی سالی ١٩٩١ ئەمریکا نەیتوانی بەڵێنەکانی خۆی  بەجێ بێنێت.  وردەدانی بوش بە کوردەکان تەنها بۆ ئەوە بوو تا ئاستێك بتوانن وەك نەیاری سەدام بمێننەوە نە بۆ ئەوە کە ئەوەندە بەهێز بن کە بتوانن عێراق دابەش بکەن. ئەم ڕووداوە نێونەتەوەییانەی دواییە، لە خزمەت بەهێزتر کردنی سیاسەتی ڕنالیستی دەرەوەی ئەمریکادایە. ڕاگرتنی هاوسەنگی دەسەڵات، بیری یەکەم و مەرجی سەرەکی ئەم سیاسەتەیە. بوش زۆر نیگەرانی ئەوە بوو کە هەرچەند کە دەبێ  عێراق لاواز بکرێت  بەڵام نابێت بە تەواوی وەك وڵات تێکبچێت. لەناوچوونی عێراق هاوسەنگی هێزی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکانی  دەوروبەری تێکدەدا. ئەمریکا وا بیری دەکردەوە کە مادام کە هیچ کەس نییە جێگای سەدام بگرێتەوە  کە بتوانێت  کوردە ڕاپەڕیوەکان لە باکوور و موسڵمانە شیعەکان لە باشوور (کە پێیان باشترە بەشێك بن  لە ئێران) کونترۆڵ بکات، باشتر هەر ئەوەیە سەدام  لە سەر دەسەڵات بێت تا ئەوە کە ئاڵۆزی بە سەر عێراقدا زاڵ بێت و ناوچەکەش ناسەقامگیر بێت. ئەگەر  کوردەکان ببن بە بەشێك لە دەرەوی عێراق  یا کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن ، هاوسەنگی لەمێژینەی هێزەکان تێکدەچێت . سەرلەشێواوی ئەمریکا بۆ چۆنیەتی مامەڵە  کردن لەگەڵ  کێشەی عێراق و کوردەکان، گرتنە بەری ڕێگایەك بە گوێرەی مافی مرۆڤی لە ناو برد. ئەوەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ  مامەڵە کردن لەگەڵ هەر دوو مەسەلەکە(مەسەلەی عێراق و کوردەکان) ڕوونە ئەوەیە کە بارودۆخی ناوخۆیی و پەیوەندییە ناوخۆییەکانی هێزە جۆراوجۆرە ناوچەییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە وردی حیسابی بۆ دەکرێت. بە کورتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرژەوەندی

یەکلاییکەرەوەی لە ناوچە هەیە کە زۆر گرنگترە لە مافی کەمینەکان و مافی مرۆڤی ئەتنیکەکان.

رێبەرایەتی کورد لە سەراسەری شۆڕشەکەیدا هیوادار بوو لە ڕێگای پشتیوانی دەرەکی بگات بە مافی نەتەوەیی خۆی و بەهەرحال پەی بەوە نەدەبرد کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی شەڕێکی بە وەکالەت دەکات. گوناهی بەشێك لەم سەرزەنشانە لە ئەستۆی نەبوونی دووربینی سیاسی نێونەتەوەیی لە نێو کوردەکانە. بێخەبەری رێبەرانی کورد، CIA و ئیدارەی ئەمریکای تەشویق کرد لە کێشەی ئالۆزی کورد کەلك وەربگرن و پاشان وەك لەیزتوکێکی(ئامرازی کایە) بێ کەلك بیانخەنە لاوە.

بۆ لاپەڕە ناخۆشەکەی دەستێوەردانی ئەمریکا لە کێشەی نێوان کوردەکان و عێراق دەبێ کێ سەرزەنش بکرێت: CIA یا ئیدارەی سەرۆك کۆمار و یا سیستمی ئەمریکا بە گشتی؟. بەهەرحال راستییەکی سەرسووڕهێنەر کە مرۆڤ دەتوانێت لەم رووداوە دڵساردکەرانە پەی پێببات ئەوەیە کە کوردەکان قەد فێری ئەوە نەبوونە خۆیان نەکەن بە داردەستی بەرژەوەندی زلهێزەکان و بەردەوام بە حوکمی ژئوپلوتیکەکەیان[29] بوونە بە قوربانی هەم ولاتە یەکگرتووەکان و هەم هاوپەیمانەکانی.

---

[29] ژئوپلۆتیك بە واتای سیاسەتی جوگرافیاییە و مەبەست کاریگەری هەلکەوتی جوگرافیایی لە سەر سیاسەتی ئەو ولاتەیە . (وەرگێڕ)

# بەشی یەکەم:
# بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٥٨ تا ١٩٧2

( ۱۹۵۸ ـ ۱۹٦۰ ، بەرگی XII ، لاپەڕەی ۳٤٤-۳٤٦ )[1]

**138 ـ تیلیگرام (بروسکە) لە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

بۆ وەزارەتی دەرەوە

**بەغداد ـ ۱٤ ی تشرینی یەکەمی ۱۹۵۸ ، کاتژمێر ۷ ی سەرلەبەیانی**

**نهێنی**

**بابەت: بارودۆخی عێراق و مەسەلەی کورد**

۱۳۱۲: ئێستا ۳ مانگ تێپەر بووە بەسەر ئەو کودیتایە کە سەرتیپ "قاسم"ی هێنایە سەر دەسەڵات. لەم قۆناخەدا لەوانەیە سوودمەند بێت هەندێ لە لایەنەکانی بارودۆخی ئێستا شرۆڤە بکەین و هەڵیبسەنگێنین و هەوڵ بدەین پێشبینی بکەین کە چی روو دەدات لە مانگەکانی داهاتوو.

۱ـ هێزە چەکدارەکان هێشتا لە باڵوێزخانە مۆڵیان داوە و چاودێری دەکەن بەسەر لیژنە بیانیەکانی دیکەدا، هەرچەند کە ئێستا ژمارەیان کەمتر بووە. هێشتا هەروەك کاربەدەستانی ئەمریکایی، سەردانکەرە دیپلوماتیك و تاکەکەسییەکان کێشەیان بۆ ساز دەکرێت لە دەروازەی باڵوێزخانە، تەنانەت چەند رۆژ لەمەوبەر پێشیان بە هاتنە ژوورەوەی خۆم گرت (پێش ئەوەی خۆم بناسێنم) هەرچەند کە لە ئۆتۆمبیلی رەسمیدا بووم کە ئاڵای بەسەرەوە بوو. ئیدارەی باڵوێزخانە لە تەموز، ئاب و ئەیلوول تەنها بە ناو بوونی هەبوو و هێشتا ئێستاش کۆمەڵێك کەندوکۆسپی نامەعقوڵمان

[1] سەرچاوە: وەزارەتی دەرەوە، فایلە ناوەندییەکان، ۱٤۵۸ ـ ۱۰/۰۰ . ۷۸۷ ، نهێنی، کراوە بە دوبەش و ناردراوە بۆ عەمان، ئانکارا، بەیروت، قاهیرە، دیمەشق، جەددە، کەراچی، لەندەن، تاران و تلابیب.

بۆ دروست دەکرێت. حکومەتی عێراق هێشتا رێگە بە ئێمە نادات ئازادانە هاتوچۆی ئۆفیسەکانی USIS بکەین.

٢ـ چاپەمەنی و رادیۆکانی عێراق بەردەوام هێرش دەکەنە سەر وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و سیاسەتەکانی رابردوو و سیاسەتە فەرمییەکانی ئێستای و نفرین لە کردەوەکانی ئێمە دەکەن وەك کردەوەگەلی ئیمپریالیزتی، و هەمیشە پەیوەندی دەدرێت بە ئیمپریالیزمی بریتانیاوە. ئەو دەستەواژانەی کە لەم هێرشانەدا کەڵکی لێوەردەگیردرێت هەمان دەستەواژەکانی "موسکۆ"ن. خەڵك بە گشتی زۆرتر لەگەڵ ئەم ئاگری نەفرەتەدا دەکەون لە رێگای دادگایی کردنی کاربەدەستانی مەدەنی و سەربازی دەوڵەتەکانی پێشوو. ئەم دادگایی کردنانە لە لایەن رادیۆ و تەلەیوزیون و چاپەمەنیەکانەوە بۆ خەڵك بڵاو دەکرێتەوە. بۆ ئێمە کە لە باڵوێزخانەداین زۆر ناخۆشە کە دەبینین دۆستە فەرمییەکانی پێشوومان و پشتیوانە چالاکەکانی جیهانی ئازاد لە لایەن دادوەرێکی سەربازییەوە(کە وەك دادستین سەیری خۆیشی دەکات) دادگایی دەکرین.

٣ـ ئێمە لە لایەن چەند سەرچاوەیەکەوە ئاگادار کراینەوە کە گلەو گازندە لە نێو دوکاندارەکان و بە تایبەت کرێکاران بەردەوام زیاد دەبێت. ئەو بەڵێنانە کە بە هەراوهوریا و بە شێوازێکی بەرفراوان لە رۆژانی سەرەتای کودیتا دەربارەی ژیانێکی باشتر و ئازادتر دەدرا بە خەڵك بە هیچ شێوەیەك جێبەجێ نەکراوە. ئەمە هۆکاری سەرەکی زیاد بوونی نارەزایەتی خەڵکە.

٤ـ دەوڵەتی ئێستای عێراق چ جۆرە دەوڵەتێکە؟ بە گوێرەی دوایین لێکدانەوەکان ئەو دەوڵەتەی کە پاش ٣ مانگ لە کودیتا ئێستا لە عێراقدا هەیە لە هیچکام لە دەوڵەتەکانی رۆژئاوا ناچێت. وەزیرانی کابینە، هەر کام بۆ خۆیان بەرێوەبەرایەتی دەکەن و رێسا و رێوشوێن دادەنێن. چەند جار کابینە بە گشتی کۆمەڵێك یاسای پەسەند کردووە بەڵام تا ئەمرۆ جێبەجێ نەکراوە و تەنها لە سەر کاغەز ماوەتەوە. ناوەرۆکی ئەم یاسانە ـ کە گەلێکیان بەپەلە ئامادە کراون و ئیمکانی جێبەجێ کردنیان کەمە ـ پێویستی بە روونکردنەوەی بەردەوام هەیە( وەك یاسای کونترۆڵ کردنی کرێ و بەهای کرێکاری و بەرهەمی شەریکی). تەنانەت لە هەفتەکانی سەرەتای کودیتاوە ژیانی

ئاسایی خەڵك تێکچووە لە بەر ئەوەی پسپۆرەکانی ئەم بوارانە ئیدی خزمەتی خەڵك ناکەن و ئەو کەسانەی کە ئێستا لە شوێنی ئەوان کار دەکەن توانایییەکی ئەوتۆیان نییە. سەرەڕای کۆبوونە ڕۆژانەکانی کابینە، هیچ بەرنامەیەکی هاوئاهەنگی دەوڵەتی لە هیچ بوارێکدا نییە، نازانین چتی وا چۆن دەبێت؟ هەرچەند کە کۆمەڵێك کەس لە نێو کابینەدا هەن کە ئەزموونی پێشوویان هەیە بەڵام ئەم دەوڵەتە بەداخەوە پیاوی بەئەزموونی تێدا نییە کە بتوانێ کاری هەستیاری بەڕێوەبردنی دەوڵەت ڕاپەڕێنێت.

ئەم کەموکوڕییە بە تایبەت لە بەشی ئابووریدا بەرچاوە. ئەو کەسانەی کە پۆستەکانی کابینەیان بەدەستەوەیە تا ئەمڕۆش هیچ بەرنامەیەکی ڕێونوێنکردنیان بە دەستەوە نییە، جگە لە بەیاننامە بەردەوام دووپاتبووەکانی سیاسەتی گشتی سەرۆك وەزیرە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق نەبێت دەربارەی ئەوەی کە عێراق سەربەخۆیە، عێراق دەیەوێت ئاستی ژیانی خەڵك بەرز بکاتەوە، عێراق دەیەوێت دۆستی هەموو ئەو دەوڵەتانە بێت (چ دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات و چ ڕۆژئاوا) کە دەیانەوێت دۆستی عێراق بن و پێش لە هەموو شتێك عێراق دەیەوێت هاوکاریی نزیکی هەبێت لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەی عەرەب.

٥ـ ئابووری وڵات هەروا ڕاوەستاوە، زۆرتر بە هۆی ئەوەی کە ئەو بەرنامە پێشکەوتنە ئابوورییانە کە پێشتر تەشویق دەکران ئێستا ڕاوەستاون. هەوڵە هێواشەکانی دەوڵەت بۆ بەڕێوە بردنی ئابووری وڵات، بووەتە هۆی ناڕازی بوونی بازرگانەکان.

٦ـ هەرچەند کە کودیتا زۆرتر لە لایەن گروپێکی زۆر بچووکی پیلانگێڕەوە جێبەجێ کراوە، ناکۆکی لە نێوان کودیتاچییەکان زوو پەرەی سەندووە. ناکۆکی لە نێو سوپا و هەروەها هەندێ لە کاربەدەستانی مەدەنی تایبەتی ڕژیم بەم زووانە سەرهەڵدەدات. ئێستا قاسم جارێ لە ترۆپکدایە. عارف کە کەسایەتی دووەمی پیلانگێڕییەکەی ١٤ ی تەموز بوو، لە پۆستی سەربازی و سیاسی بێ بەش کراوە و لە ١٢ ی تشرینی یەکەم عێراقی بەجێ هێشتووە بۆ ئەوەی ببێ بە باڵوێزی عێراق لە "بۆن". ئەندامانی بە ناوبانگی بەعس لە کابینە دەرکراون یان پۆستەکەیان کەم

کراوەتەوە، هەروەك چۆن عارف دەسەڵاتی کەم کراوەتەوە. کەوابوو گرنگترین کەسایەتیەکانی حکوومەت کە لە پێناو یەککگرتن لەگەڵ UAR(کۆماری یەککگرتووی عەرەبی میسر) کار دەکەن یا لانیکەم لە پێناو هاوکاری زۆر نزیك لەگەڵ ناصر (مەبەستی جمال عبدالناصره- وەرگێڕ) کار دەکەن لە سەر پۆستە گرنگە دەوڵەتییەکان لابراون. ئەو گروپە کە وادیارە لە ئێستادا کاریگەریان لەسەر "قاسم" هەیە، ئەندامانی "حیزبی دیموکراتی نیشتمانی" بە رێبەرایەتی "کەماڵ چادرچی[2]" و "محمد حادید[3]"ن. ئەم گروپە بەداخەوە ئاگاداری ئەو مەترسیە یەکجار زۆرەی زاڵبوونی کومونیزم بەسەر عێراقدا نین.

بە بیروبۆچوونی ئێمە قاسم دژی شیوعییەکانە و لەوانەیە هەوڵێکی راستەقینە بدات بۆ کونترۆڵ کردنی شیوعییەکان. بە پێی ئەو راپۆرتانەی کە گەیشتووە بە دەستی ئێمە لە لایەن هاوکارە دیپلوماتیکەکانمان و ئەو راپۆرتانەی کە لە سەرچاوە عێراقیەکان دزەی کردووە، شیوعیەکان دەورێکی گرنگیان گێراوە لە لەسەر دەسەڵات لابردنی عارف و وەزیرە بەعسیەکان. ئەمڕۆ شیوعییەکان ئەوەندە کاریگەری و دەستڕۆیشتوویان نییە لە نێو رژێمدا. بەهەرحاڵ بە لاوازبوونی کاریگەری بەعسیەکان، بێ گومان شیوعیەکان کەشوهەوای زۆرتریان بۆ جموجۆڵ بۆ دەڕەخسێت.

شوعییەکان هەروەها لە رێگای رێبەری(لە سۆڤیەت) گەڕاوەی کورد، مەلا مستەفا بارزانی بەرگی بەرەندەیەکی دیکەشیان هەیە. مەلا مستەفا ئەم ١١ ساڵە دواییەی لە دوورە ولاتی لە یەکێتی سۆڤیەت تێپەر کردووە. مەلا مستەفا لە نێو زۆربەی کوردەکانی عێراق زۆر خۆشەویستە و توانایەکی بێ پایانی هەیە بۆ تێکدانی سەقامگیری عێراق . کەوابوو بە بیروبۆچۆنی ئێمە ئەمڕۆ گەورەترین هەڕەشە بۆ سەقامگیری عێراق و تەنانەت خودی رژێمی قاسمیش، شیوعیەکانن.

٧ـ ئەمڕۆ پاش ٣ مانگ لە کودیتا، رژێمی قاسم بە هیچ شێوازێك روبەڕوی هیچ دەستدرێژییەك نەبووەتەوە. کۆمەڵێك گوشاری بەهێز لە نێو و لە دەرەوەی رژێم لە سەر رژێمی قاسم هەیە بەڵام

---

Kamal Chaderchi [2]
Mohammed Hadid. [3]

هیچ ناکۆکی و گرژییەکی چڕوپڕ لە ئارادا نییە. ئەم چەند هەفتەیە کە ئێستا تێیداین(و لەوانەیە ببێ بە چەند مانگ) بارودۆخەکە روون و سەقامگیر نییە. بەدڵنیاییەوە هەفتەکانی داهاتوو هەستیار دەبێت. سەقامگیری زۆرتر پەیوەندی بە توانایی قاسمەوە هەیە بۆ ئەوەی لە بەرامبەر ئەو گوشارانەی کە دەخرێتە سەری رابوەستێت و وڵات بگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی ئاسایی جاران.

٨- رژێمی قاسم تا ئێستا (بە ئەنقەست یان بە سەهو) کۆمەڵێك کردەوەی خراپکارانەی ئەنجام داوە. بەبۆچوونی ئێمە هەندێ لەو کەسانەی کە بە دەوروبەری (قاسمدا)ن، سەرەنجام دەرك بەوە دەکەن کە رێگای سادەتر بۆ ئەوان ئەوەیە کە لە باتی ئەوەی دەوڵەت بەڕێوە ببەن، بۆ کودیتا کار بکەن و دەوڵەت لە یەك هەڵبوەشێننەوە. بە گوێرەی بینین و ئەزموونی تاکەکەسی خۆم لە ماوەی ٤ ساڵی رابردوو لە عێراق، دەڵێم بە کوژرانی" نوری" - کە هەندێ جار لە ئاستی مەسایلی ناوخۆیی وڵات بیرتەسك و دەمارگرژ بوو - عێراق باشترین رێبەری خۆی کردە قوربانی کە بەهێزترین رێگر بوو لە بەرامبەر گەڕانەوەی بێ سەرەوبەرەیی(ئەگەر نەڵێین وەحشیگەری) و دەیتوانی عێراق بەرەبەرە بەرەو ژیانێکی شیاو و باش ببات. ژمارەیەك لە کەسایەتییە زیرەك و بلیمەتەکانی عێراق لەم چەند رۆژەی دواییە پێمیان وت لە ماوەی ١٠ ساڵی داهاتوودا مونومینتێك لە بەغداد بۆ "نوری" دروست دەکرێت. هیوادارم ئەمە راست بێت( و لەراستیدا لە سەر ئەو باوەڕەم کە هەرواش دەبێت).

گالمەن[4]

---

[4] GALLMAN

( ١٩٥٨ ـ ١٩٦٠ ، بەرگی XII ، لاپەڕەی ٤٦٠- ٤٦٣ )[1]

کۆبوونەوەی کومیتەی تایبەت دەربارەی ساڵیادی کودیتای قاسم

واشنگتۆن، ١ ی حوزەیرانی ١٩٥٩ ـ کاتژمێر ١١ ی پێش نیوەڕۆ

بەتەواوی نهێنی

بەشدار بووان:

یارمەتیدەری جێگری وەزیری دەرەوە، بەڕێز ویلیام م رۆنتری[2](سەرۆکی کۆبوونەوە)

بەڕێز پارکیر ت هارت[3]، جێگری یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە

بەڕێز ستوارت راکویل[4]، بەرپرسی ئیدارەی کاروباری رۆژهەلاتی نزیك لە وەزارەتی دەرەوە

بەڕێز هارسیون سیمس[5]، یارمەتیدەری تایبەتی بەڕێز رۆنتری

یارمەتیدەری وەزیری بەرگری، بەڕێز هایدین ویلیامز[6]

دوکتۆر لینفۆرد ئا لارەنێر[7]، ISA ، وەزارەتی دەرەوە

کولونیل بوتلێر[8] ـ JCS (USAF)

---

[1] سەرچاوە: کتێبخانەی ئایزنهاوێر، فایلەکانی ئیدارەی کۆشکی سپی، پروژەی پاککراوە، رۆژهەلاتی ناوەڕاست، بەتەواوی نهێنی

William M. Rountree [2]
Mr. Parker T. Hart [3]
Mr. Stuart Rockwell [4]
Mr. Harrison Symmes [5]
[6] . Haydn Williams
[7] . Lynford A. Lardner
[8] Colonel Butler

نوێنەری CIA

بەڕێز ویلیام ج هاندلی[9]، له لایەن NEA ، USIA

بەڕێز فیلیپ ج هالا[10]، کارمەندی NSC (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی)

له سەرەتای کۆبوونەوەکەدا بەڕێز "ڕۆنتری" وتی که باشتر ئەوەیه گروپ بەردەوام له ڕۆژانی دوشەممە، کاتژمێر ۱۱ کۆبوونەوە بگرێت و ئاماژەی بەوە کرد که لەوانەیه هەموومان ڕاپۆرتی تیلگرافی گفتوگۆی باڵوێزی ئەمریکا له عێراق، بەڕێز(جیرنیگان)مان دیتبێت که دوابەدوای گەڕانەوەی له ڕاوێژەکانی له واشنگتۆن لەگەڵ قاسم ئەنجامی داوە. بەڕێز"ڕۆنتری" وای بۆ دەچوو که باڵوێز "جیرنیگان[11]" له ئەنجامی باس و قسەی دوایی لەگەڵ ڕێبەری عێراق، نه دڵخۆش بووە و نه دڵسارد. یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە واهەستی دەکرد که نیشانەیەکی ئەوتۆ له دەستدا نییه دەربارەی باشتر بوونی بارودۆخەکە، به تایبەت به نیسبەت شیوعیەکان. بەهەرحاڵ هیچ نیشانەیەك له دەستدا نییه دەربارەی ئەوەی که قاسم هێزی دژەشیوعی دروست کردبێت بەڵام یەکێ له ڕاستیه دڵخۆشکەرەکان ئەوەیه که قاسم بڕیاری داوە هێزەکانی "بەرخۆدانی گەل" چەکدار نەکات. لانیکەم مرۆڤ دەتوانێت بڵێت بارودۆخەکە لەمە خراپتر نابێت.

بەڕێز روندتری درێژەی به قسەکانی دا و وتی دوایین ڕووداو لەم پەیوەندییەدا ئەوەیه که عێراق بڕیاری داوە ڕێککەوتننامەی یارمەتی سەربازی و کڕینی پێداویستی سەربازی له ئەمریکا هەڵبوەشێنێتەوە. ئەم هەڵوەشاندنەوەیه له ڕێگای یادداشتێکی دیپلۆماتیك به ئێمە ڕاگەیاندراوە

---

[9] Mr. William J. Handley
[10] Mr. Philip J. Halla
[11] Jernegan

که بۆ خۆی داهێنانێکه، هەر چەند که ئەم یادداشته ماوەیەکی کورت پێش ئەوەی که چاپەمەنییەکان بڵاوی بکەنەوە، تەسلیم بە ئێمە کراوە[١٢].

وەزارەتی دەرەوە دڵنیا نییە کە"رێککەوتننامەی یارمەتی ئابووری"ی ٢٣ی تەموزی ١٩٥٧ چییە که عێراق هەڵیوەشاندووەتەوە. بەڕێز "راکویل" وتی لەوانەیە ئەم رێککەوتننامەیە پەیوەندی بەو رێککەوتننامە پولیسییەوە هەبێت کە لە لایەن لیژنەی "ریچارد[١٣]"ەوە ئیمزا کراوە. تیلگیرافی ژمارە ٣٤٣٩ی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە ٢٩ی مایس ـ کە کۆپییەکی هاوپێچ کراوە [١٤]ـ دەڵێت ئەم رێککەوتننامەیە، رێککەوتنامەی (Telecommunication)-ە کە لە پەیوەندی لەگەڵ پەیماننامەی بەغداد واژۆ کراوە.

نوێنەری بەڕێز "رۆنتری"، بەڕێز "پارکێر هارت" دەربارەی دوایین سەفەری خۆی بۆ ناوچە راپۆرتی دا و وتی مەبەستی سەرەکی ئەو لەم سەردانە ئەوە بووە کە بارودۆخی عێراق لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا( لەسەر داوای خۆیان) تاوتوێ بکات. بەڕێز "پارکێر" کونفرانسێکی درێژی گرتبوو لە هوتێل "هیلتۆن" لە ئیستانبول لەگەڵ وەزیرەی دەرەوی تورکیا، "زۆرلوو[١٥]" و چەند کەسی دیکە لە کاربەدەستانی تورکیا، لەوانە باڵوێزی پێشووی تورکیا لە سوریا کە پێشتر لە دیمەشق لە گەڵی ئاشنا بووە و ناسیویەتی[١٤]. بەڕێز "هارت" وەك کەسایەتییەکی زۆر بەهێز سەیری ئەم پیاوە

---

[١٢] دەوڵەتی عێراق سەرلەبەیانی رۆژی ٢٩ی مایس ئەم یادداشتەی تەسلیم کردووە بە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا لە عێراق.

Richard[١٣]
Zorlo[١٥]

[١٤] "هارت"، گفتوگۆکەی خۆی راپۆرت داوە لە برووسکەی ژمارە ٣٢٢٩ لە ئانکارا لە ١٦ی مایس.

دەکات کە ئێستا راوێژکاری "زۆرلوو"ە لە کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. قسە و باسەکە نیشان دەدات لەوانەیە "زۆرلوو" روانگەکانی خۆی بە نیسبەت ناسیونالیزمی عەرەب تۆزێ گۆڕی بێت.

ئێستا وادیارە "زۆرلوو" لە سەر ئەو باوەڕەیە کە مەسەلە مەسەلەی نێوان سەربەخۆیی و کومونیزمە لە عێراق. لە هەمان کاتدا "زۆرلوو" هیواداره ئێمە یارمەتی نەدەین بە زیندووبوونەوەی دەستڕۆیشتوویی ناسر لە عێراق. لە میانەی قسەوباسەکاندا، "زۆرلوو" ئارام بوو و گوێی گرتبوو. لە نێوان مەسەلەکانی دیکەدا، وەزیری دەرەوەی تورکیا رەزامەندی خۆی دەربری لەگەڵ پێشنیاری ئێمە دەربارەی ئەوەی کە تورکەکان پەرە بە یارمەتیدانی سەربازی بە ئاکادیمیای سەربازی ئەفغانستان بدەن.

هەڵویستی "زۆرلوو" بە نیسبەت کوردەکان ئەوە بوو کە کوردەکان بە هۆی ململانییە کۆنەکان هیلاك بوونە و هەمیشە لە نێوان خۆیاندا ناکۆکن. تورکەکان چالاکی کوردەکان لە ئێستا بە باش نازانن و لەم پەیوەندییەدا قاسمیان ئاگادار کردووەتەوە. بەهەرحاڵ "زۆرلوو" دەیوت کوردەکان فاکتورێکن کە دەبێ جارێك رایان بگرێت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا کەڵکیان لێوەربگرێت ئەگەر هاتوو و بارودۆخی عێراق خراپتر بوو. بەڕێز "هارت" ئاماژەی بە کۆبوونەوەکەی کرد لە ئێران لەگەڵ ژنەراڵ "پاکلەوان"(پاکرەوان دروستە - وەرگێڕ)، نوێنەری سەرەکی SAVAK(رێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی وڵاتی ئێران- وەرگێڕ) و پەی بەوە بردووە کە پاکرەوان زۆر شارەزای کاروباری عێراقە.[15] و هەڵویستی گشتی ئێران بە نیسبەت عێراق لە هەڵویستی لوبنان و تورکیا باشترە. وادیارە کە ژنراڵ "پاکرەوان" سەرچاوەی(هەواڵگری) جۆراوجۆری هەیە لە عێراق کە بە بۆچوونی بەڕێز" هارت" ئەم سەرچاوەیە لە نێو کۆمەڵگای مسڵمانە شیعەکانی عێراقدایە. بە باوەڕی "پاکرەوان" هێزێکی گەورە لە نێو سوپای عێراق

---

[15]. "هارت" گفتوگۆکەی خۆی راپۆرت داوە لە بروسکەی ژمارە ٢٣٠٣ لە تاران لە ٢١ی مایس.

دروست بووه که خۆی ئاماده دەکات بۆ ئەوەی له کاتی پێویستدا دژی شیوعیەکان چالاکی بکات. بەڕێز "هارت" هەروەها رایگەیاند که ئێرانیەکان هەوڵیان داوه پشتی کوردەکان بگرن و له داهاتوودا کەڵکیان لێوەربگرن.

له وەلامی پرسیارێکی مندا دەربارەی ئەوەی که ئایا هێشتا هیچ جیاوازێکی بیروڕا هەیه له نێوان "زۆرلوو" و سەرۆك وەزیرانی تورکیا، "عەدنان مەندەرەس" دەربارەی عێراق، بەڕێز "رۆنتری" وتی قسەی کردووه لەگەڵ "زۆرلوو" کاتێك که"زۆرلوو" هەفتەی پێش لێره بووه بۆ بەشداری کردن له رێوەرەسمی به خاك سپاردنی "دول[16]"، وەزیری دەرەوی (ئەمریکا) .

بەڕێز "رونتری" بۆچوونەکانی بەڕێز "هارت"ی پشتڕاست کردەوه و جەختی له سەر ئەوه کردەوه که "زۆرلوو" له ناصر بێزاره و هەست دەکات ئێمه نابێت رێبەری میسر بەهێز بکەین و وای بۆدەچێت که لەوانەیه بارودۆخی عێراق بەخێرایی بەرەو خراپی بچێت. "زۆرلوو" دەیویست ئێمه دەست بکەین بۆ دانانی پلانێکی هاوبەش بۆ روبەڕوو بوونەوه لەگەڵ ئەگەرەکانی عێراق. بەڕێز"رۆنتری" هێشتا وابیر دەکاتەوه که ئەم مەسەلەیه زۆر مەترسیدار دەبێت و وتی به وردی سەیری ئەم داواکارییەی تورکیا دەکات. یارمەتیدەری وەزیر وا هەست دەکات که ئێمه دەبێ درێژه بدەین به ئالۆگۆڕی زانیاری بەڵام لەم قۆناخەدا لەمه زیاتر لەگەڵ تورکەکان نەچینه پێش.

پاشان بەڕێز "رۆنتری" له بەڕێز "راکویل" دەربارەی بیروبۆچوونەکانی پرسیاری کرد. بەرێوەبەری کاروباری رۆژهەلاتی نزیك، بەڕێز "راکویل" وتی به بۆچوونی ئەو، بارودۆخەکه به نیسبەت ئەو کاتەی که دواین کۆبوونەوەی گروپ گیراوه تۆزێك باشتر بووه [17].

---

[16] Dulle

[17] له کۆبوونەوەی ٤٠٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی له ٢٨ ی مایس، "ئالین دولز" لەسەر"کاریگەری پێشهاته گرنگەکانی جیهان لەسەر ئاسایشی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا" کۆمەڵێك هێڵی هاوشێوەی بۆ ئەنجوومەن خستووەته ڕوو و ئاماژەی بەوه کردووه که وادیاره "قاسم " دژی کومونیسته و بەپارێزەوه بەریانی بەرەولای رۆژئاوا هەیه. "دولز" هەروەها

كاتێك كە بە نیسبەت بۆچوونەكانی پرسیاری لێكرا، بەڕێز "رۆنتری" وتی بارودۆخەكە باشتر بووە هەرچەند كە رووداوەكانی ئەم دواییانە خۆی لە خۆیدا شتێكی وا ناسەلمێنێت. "رۆنتری" وتی قاسم قەسدونیازە راستەقینەكانی خۆی ئاشكرا نەكردووە بەلام ئێستا هەندێ شایعە هەیە كە قاسم دەیەوێت یەكێ یان هەر دو برایانی "تاهیر[15]" (كە لایەنگری شیوعیەكانن) لە سەر دەسەلات لاببات یا سەرتیپ "مەهدەوی[16]" لە سەرۆكایەتی دادگای سەربازی لاببات. بەڕێز "هەندلی" لە بەڕێز "رۆنتری" سەبارەت بە بیروڕای وەزارەتی دەرەوە بە نیسبەت پێشنیارەكەی بەڕێز "جیرنیگان"، باڵوێزی ئەمریكا لە بەغداد پرسیاری كرد بۆ ئەوەی ئێمە نوێنەرێك بنێرین بۆ جەژنی شۆڕشی ١٤ ی تەموز. بەڕێز "رۆنتری" لەوەڵامدا وتی ئەگەر بانگهێشت بكرێن، ئێمەش بەشداری دەكەین بەلام ئەگەر سۆڤیەت بانگهێشت بكرێت و ئەمریكا بانگهێشت نەكرێت زۆر گرنگ دەبێت. بەڕێز "هەندلی" پاشان بە منی وت باڵوێز جیرنیگان پێشنیاری كردووە كە كەسێك وەك دوكتۆر ئیلسۆن[17] لە"كلیسای نیشتمانی شێخەكانی پروتیستان" ببێ بە نوێنەری وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا لەم جەژنەدا، هەرچەند كە هێشتا باسی ئەم مەسەلەیەی نەكردووە لە گەڵ بەڕێز "جۆرج ئالێن" [18]. بەڕێز "هەندلی" شك وگومانی دەربڕی بە نیسبەت شیاو بوونی ئەم جۆرە دیاری كردنەی نوێنەر و لە راستیدا سەرسامی خۆی دەربڕی كە ئایا ئێمە قەد دەبێ نوێنەرێكی تایبەت بنێرین بۆ ئەم جەژنە. من وتم لەوانەیە باشتر بێت نوێنەرێكی ناسراوی

---

وتوویەتی كە هێشتا زۆر زووە بۆ دۆزینەوەی هەرچەشنە بەریانێكی روون لە "قاسم"دا(یادداشتنامەی گفتوگۆكان لەلایەن "گلیسۆن"ەوە، ٢٨ ی مایس، كتێبخانەی ئایزینهاوێر، فایلی ، تۆماركراوەكانی NSC)

[15] Taher
[16] Mahdawi
[17] Dr. Elson
[18] George Allen

سەربازی بنێرین بۆ بەشداری کردن لەم جەژنەی رژێمی ئێستای عێراق، هەرچەند کە ئەڵبەتە دوکتور "ئیلسۆن" بە هۆی بەرژەوەندییەکانی لە کاروباری رۆژهەلاتی نزیك بەناوبانگە.

بەرێز "هیدن ویلیامز" بیروڕایەکی ئەوتۆی نەبوو و راپۆرتەکەی بەرێز "رۆنتری" سەرنجراکێش و سودمەند وەسف کرد. "هیدن ویلیامز" لەگەڵ ئەوەدا بوو هەموو هەفتەیەك بەردەوام کۆبوونەوە بگیردرێت و زانیاری سودمەند بەدەست بخرێت بۆ دیاری کردنی پرەنسیپەکانی"ئەنجوومەن" بۆ قسەوباس لە سەر ئەوەی کە ئایا دەبێ راپۆرتێك ئامادە بکرێت و ئەگەر ئامادە بکرێت ناوەرۆکەکەی چی بێت. بەرێز" ویلیامز" لایەنگری قسەوباسی گروپی بوو بۆ دیاری کردنی ناوەرۆکی راپۆرتەکە و وای بۆ دەچوو کە باشتر ئەوەیە لیستێك لەو کردەوانە (کە ئەنجام دراوە) بۆ ئەنجوومەن ئامادە بکرێت. بەرێز "رۆنتری" بە گشتی لەگەڵ ئەم بیروڕایە بوو و ئاماژەی بەوە کرد کە گروپ رێکوپێك و بەردەوام کۆبوونەوە بگرێت .

من پرسیارم کرد ئایا کۆمیتە ئەم هەفتەیە راپۆرت دەدات یا نا؟ بەرێز"رۆنتری" وتی بە گوێرەی هێڵەکانی راپۆرتی پێشوو راپۆرت ئامادە دەکرێت. بەرێز "هەندلی" وتی USIA لە سەر داوای عێراق، کتێبخانەی گەرۆك لە رێگای UNESCO دروست دەکات و پرسیاری لە بەرێز "رۆنتری" کرد کە روانگەت چییە بە نیسبەت ئەم سیاسەتە. بەرێز"رۆنتری" لە وەڵامدا وتی لەگەڵ ئەم بیرۆکەیەدایە، هەرچەند کە خۆشحال نییە بە نیسبەت ئەوەی کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە رێگای ئەم چالاکیانە خۆشەویستی خەڵك بە دەست ناهێنێت. کاتێ کە پرسیاری وردەکارییەکانی ئەم مەسەلەیەی لێکرا، بەرێز "هەندلی" وەڵامی دایەوە باشتر وایە USIA لە گەڵ ICA (لەبەر ئەوەی دروست کردنی ئەم کتێبخانە گەڕۆکانە خەرجی زۆری دەوێت) کار بکات و پەیوەندی هەبێت لە گەڵ بەشی پەیوەندییەکانی UNESCO لە وەزارەتی دەرەوە. USIA دەتوانێت کتێبەکانی ئەم کتێبخانانە دابین بکات.

بەرێز "لاردنێر" لە وەزارەتی بەرگری ئاماژەی بە کێشەی کاریگەرییە تایبەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەکانی یارمەتی سەربازی ئەمریکا بە عێراق کرد. ئەو پرسیارە

هاتە گۆڕێ کە دەبێت هەوڵ بەدەین چی بکەین لەو کەرەستە(سەربازییانەی) کە پێشتر داومانە بە عێراق. باسی ئەوە کرا کە تیمە ٥ فڕۆکەی ٨٦ ـ F و ١٣ "هاوەنی ٨" مان داوە بە عێراق کە بەشێکن لەو کەرەستانەی کە عێراق پێویستی پێیە بۆ هێزەکانی. بەڕێز "بوتلێر" وتی ئەم فڕۆکانە ناتوانن بفڕن لە بەر ئەوەی هەندێ لە پێداویستییەکانیان گەڕێندراونەتە بۆ ئەمریکا. ئەم چەکانە کار دەکەن ئەگەر پاك و خاوێن بکرێنەوە . بەڕێز "ڕۆنتری" و بەڕێز "ڕاکویل" لە سەر ئەوە هاوڕا بوون کە ئەمە کێشەیەکە کە دەبێ لە گەڵ حکوومەتی عێراق تاوتوێی بکەن. بەڕێز "ڕاکویل" ئاماژەی بەوە کرد کە لە نێو ڕێککەوتننامەکە شەرت و مەرجێکی یەك ساڵە دانراوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی، بەڵام دڵنیا نەبوو لەوەی کە ئەمریکا بتوانێ کارێکی ئەوتۆ بکات ئەگەر عێراق بە شێوازی یەك لایەنانە ڕێککەوتننامەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

## یادداشتنامەی پێداچوونەوە

لە دانیشتنی ٤١٤هەمینی "ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی" لە ٢٣ی تەموز، بەرپرسی CIA بەڕێز" ئالێن دولز" [2] وەك بەشێك لە بەرنامەکەی خۆی لە ژێر ناوی "کاریگەرییەکانی پێشهاتە گرنگەکانی جیهان لە سەر ئاسایشی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا" دەربارەی بێ سەرەوبەرەیی لە عێراق ئەنجوومەنی ئاگادار کردەوە.

ئەمە خاڵە سەرەکیەکانی وتەکانی بەڕێز"ئالێن دولز"ە:

بەڕێز "دولز" عێراقی وەك وڵاتێکی پڕکێشە وەسف کرد و وتی عێراق هێشتا کێشەی زۆری هەیە. وادیارە ڕاپەڕینی کەرکوك زۆر خێراتر لەوەی کە چاپەمەنیەکانی خۆمان و میسر نیشانیان داوە، کپ کراوەتەوە. بەهەرحاڵ هێشتا هیچ کەس نازانێت ئەم ڕاپەڕینە چۆن و بۆچی دەستی پێکردووە. لە لایەکی دیکەوە، لەوانەیە ڕاپەڕینی زۆرتر ڕوو بدات لە داهاتوودا. قاسم هەموو ئەو لایەنانەی

---

[2] Allen Dulles

شەرمەزار کردووە کە دەستیان هەبووە لەم راپەڕینانەدا و بەتایبەت ئاماژەی بە شیوعیەکان کردووە.

قاسم بانگهێشت کراوە بۆ موسکۆ بۆ سەردانێکی حکوومی و راپۆرت دراوە کە ئەم بانگهێشتەی قبوڵ کردووە بەڵام بەهەرحاڵ هیچ کاتێکی دیاری نەکردووە بۆ ئەم سەردانە. لە پەیوەندی لەگەڵ ئاژاوەکانی کەرکوک، سەرۆکی ئەنجوومەن دەربارەی ناکۆکیە ئەتنییەکانی نێوان کوردەکان و تورکمانەکان لە بەڕێز "دولز" پرسیاری کرد. بەڕێز "دولز" لە وەڵامدا وتی ئەمانە کۆمەڵێك عەشیرەتی جیاوازن و زمانی جیاوازیان هەیە و بە بۆچوونی ئەو(بەڕێز دولز) لە رووی ئەتنیکیەوە بەتەواوی جیاوازن. بەڕێز "دولز" وتی لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژی تەواو کردووە دەربارەی کوردەکان و دەتوانی لەم پەیوەندیەدا زانیاری زۆرتر بدات بە سەرۆکی ئەنجوومەن.

فیلیپ ج هالا [19]

---

[19] PHILIP J. HALLA

(۱۹٦۱ ـ ۱۹٦۳ بەرگی XVIII ، لاپەرەی ۱۱۷ ـ ۱۱٦ )[1]

٤۹ ـ تیلگرام (بروسکە) لە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق بۆ وەزارەتی دەرەوە

بەغداد ـ ۲۰ ی ئەیلوولی ۱۹٦۲ ، نیوەڕۆ

نهێنی

۱٥۰: کاربەدەستێکی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK ) ـ کە بەرپرسی کاروباری ئەم حیزبەیە لە بەغداد ـ پاش وەرگرتنی ڕێنوێنییەکانی مەلا مستەفا بارزانی لە ۱۸ ی ئەیلوول بە شێوازی پەنانەکی بانگهێشتی باڵوێزخانە کرا. کوردەکان بەتوندی داوای پشتیوانی لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەکەن بۆ شۆڕشەکەیان. ئەم کاربەدەستەی PDK وتی ئێستا پێویستی بە پارە هەیە و لەوانەیە پاشان پێویستی بە چەك هەبێت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زۆربەی شیوعییەکان لە PDK دەرکراون و ئەوانی دیکەش بەم زووانە دەردەکرێن.

لە بەرامبەر پشتیوانی ئێمە، مەلامستەفا بەڵێنی داوە کە: ۱ـ بزووتنەوەکەی پاك بکاتەوە لەو کەسانەی کە ئێمە گومانمان هەیە لێیان. ۲ـ هاوکاری بکات لەگەڵ کەسایەتیە عەرەبە کۆنەپارێزەکانی(کونسیرڤاتیو) عێراق و عێراق بگەڕێنەتەوە بۆ نێو پەیماننامەی بەغداد، ئەگەر ئێمە بمانەوێت. ۳ـ دەستبەجێ زانیاری تەواو بدات بە ئێمە دەربارەی ڕووداوە سیاسی و سەربازییە ناوخۆییەکانی کوردستان یا عێراقی عەرەبی. کاربەدەستەکەی PDK بانگەشەی ئەوەی کرد کە دەزگای هەواڵگری کوردەکان بەرفراوان و ڕاست و دروستە و وتی ئەم پێشنیارە بۆ کوردەکانی

---

[1] سەرچاوە: وەزارەتی دەرەوە، فایلە ناوەندییەکان، ۲۰٦۲ ـ ۹/۰۰ . ۷۸۷ ، نهێنی ، بڵاوکردنەوەی سنووردار، نابێت بیانییەکان بینین، بۆ( باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) لە ئانکارا، دیمەشق، لەندەن، پاریس و تاران نێردراوە.

سوریا و عێراق و هەروەها عێراق وەراست دەگەڕێت . ئەم کوردە وتی PDK هەم لە بەغداد و هەم لە تاران پەیوەندی نزیك و دۆستانەی هەیە لەگەڵ ئێران. ئێرانیەکان رازی بوونە بەوەی کە کاریان بە هاتوچوی کوردەکان لە سەر سنوور نەبێت و پێش بەو یارمەتیانە نەگرن کە کوردەکانی ئێران دەیدەن بە شۆڕش. مەلامستەفا بارزانی خۆشحاڵە بە نیسبەت ئەم پەیوەندییە بەڵام داوای یارمەتی ماددی لە ئێران دەکات. کاربەدەستەکەی PDK وتی مەلامستەفا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە پێشنیاری لکیانی کوردستان بە ئێران وەك" کۆمارێکی خودموختار" بۆ شا سەرنجڕاکێشە.

کوردەکان هەروەها پەیوەندی بەردەوامیان هەیە لە گەڵ میسر (کە دۆستی کوردەکانە بەڵام یارمەتیان نادات) و باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە بەغداد. کاربەدەستەکەی PDK وتی کوردەکان نایانەوێت هەموو پردی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سۆڤیەت بڕۆخێنن، هەتا کاتێك کە دڵنیانەبن لەوەی کە دەوڵەتی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە بزووتنەوەکەیان دەکات.

کاربەدەستەکەی PDK وتی مانگانە هەزار دولار لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت وەردەگرێت بۆ هەندێ لە لایەنگرانی تایبەتی شیوعی لە ناو PDK بەڵام پارەکە دەچێتە ناو سندوقی PDK . مەلا مستەفا ئەم بڕە کەمە پارەیە بە یارمەتیدانی بزووتنەوەکەی نازانێت. کوردەکان داوای یارمتیان لە کوێت کردووە بەڵام کوێت رەتی کردووەتەوە. باڵوێزخانەی بەریتانیا لە بەغداد ئەم هەواڵەی پشتڕاست کردووەتەوە. کاربەدەستەکەی PDK وتی بەریتانیا مۆچیاری کوێتی کردووە پارە نەدات بە شۆڕشگێڕانی کورد. ئیسرائیل پێشنیاری یارمەتی داوە بە کوردەکان لە ئەوروپا بەڵام کوردەکان رەتیان کردووەتەوە، نە لە بەر ئەوەی کە کوردەکان دژی ئیسرائیلن بەڵکوو بەهۆی ئەوە کە دەترسن ئیسرائیل بە ئەنقەست زانیارییەکان ئاشکرا بکات و خەسار لە بزووتنەوەی کورد بکەوێت لە نێو ولاتانی عەرەبیدا.

کاربەدەستەکەی PDK وتی مەلا مستەفا دەزانێ پاش رووخانی قاسم(کە بە بیروڕای بارزانی بەم زووانە روودەدات) سۆڤیەت نیگەران دەبێت و بە پارە و بە چەك یارمەتی کوردەکان دەدات.

ئەم کوردە وتی مەلا مستەفا بە باشتر دەزانێت لەگەڵ رۆژئاوا هاوکاری بکات تا سۆڤیەت و متمانەی بە سۆڤیەت نییە. بەهەرحاڵ هەموو کوردەکان ناسیونالیستن و دەبێ ئێستا ئۆتۆنۆمی بە دەست بهێنن ئەگەرنا دەبێ خۆیان بۆ لەناوچوونی رەگەزی ئامادە بکەن بەڵام بۆ ئەوەی شتێکی وا روونەدات کوردەکان یارمەتی لە سۆڤیەت یان تەنانەت لە شەیتانیش قبوڵ دەکەن.
کاربەدەستەکەی PDK بە روونی ئاگادار کرایەوە کە سیاسەتی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە نیسبەت شۆڕشی کورد ئاڵوگۆڕی بە سەردا نەهاتووە[٢]. ئەویش لە وەڵامدا وتی ئەگەر وایە دەبێ بەزووترین کات پەیوەندی لەگەڵ مەلامستەفا بگرێت و پەیامی بۆ بنێرێت.
میلبۆڕن[2]

---

[٢] یادداشتنامەیەك لە ١١ ی ئەیلوول لەلایەن "سترانگ" بۆ "تالبۆت"، هەڵویستی گشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت کێشەی کورد وەها وەسف دەکات:
وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کێشەی کورد لە عێراق بە کێشەیەکی ناوخۆیی دەزانێت کە دەبێت لە ناوخۆی عێراق چارەسەر بکرێت. دەوڵەتی ئێمە بە هیچ شێوەیەك پشتیوانی ناکات لە چالاکیەکانی کوردەکان دژی دەوڵەتی عێراق و هیوادارە بەم زووانە رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم کێشەیە بدۆزرێتەوە. ئێمە واتێدەگەین کە کوردەکان داوای ئەوە دەکەن کە هەندێ لە داواکارییەکانیان لەلایەن یاسای بنەرەتییەوە زامن بکرێت. لەکاتێکدا کە هەڵویستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا روونە بەنیسبەت ئەوەی کە یاسایەکی دیموکرات هەبێت لە عێراقدا، بەڵام هەرچەشنە شرۆڤەیەك دەربارەی ئەم داواکارییانە لە عێراق دەبێت بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی ئەم وڵاتە. بەبۆچوونی ئێمە، داهاتوو باش دەبێت بۆ کوردەکان لە عێراق(هەروەها لە ئێران و تورکیا) ئەگەر پەیوەندییەکی ئەپسارەیان هەبێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین. ئێمە دەزانین تورکیا و ئێران هەر ئەم روانگەیانە هەیە و لەسەر ئەو باوەڕەن کە حکوومەتی عێراق بە هەمان شێوە هەست دەکات.

(١٩٦٣ ـ ١٩٦١ ، بەرگی XVIII ، لاپەڕەی ٨٢ ـ ٣٨١ )[1]

١٧٣ ـ یادداشتنامەی کارمەندی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی( رۆبێرت کۆمێر[3] ) بۆ یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆك کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی(بەڕێز بۆندی[4] )

واشنگتۆن، ١ ی ئاداری ١٩٦٣

نهێنی

**MCGB**

بابەت: مەترسی هەڵگیرسانەوەی کێشەی کورد

هەندێ لە سیخوڕەکانمان بە تەواوی نیگەران بوونە لە مەترسی هەڵگیرسانەوەی کێشەی کورد کە دەبێت بە بەڵا بۆ رژێمی نوێی عێراق. وەڵامی ئەو پرسیارە زەحمەتە کە ئایا وتووێژەکانی نێوان کورد و حکومەت لە بەغداد باش دەچێتە پێش یا نا بەڵام گەلێ دەوڵەت ( تورکیا، ئێران، میسر بە رێبەرایەتی ناسر و لە سەرووی هەموویان سۆڤیەت ) پێیان خۆشە کوردەکان هان بدەن. ئێمە بە تایبەت هۆشداریمان داوە بە ئێران کە خۆی دور بگرێت لەم مەسەلەیە بەڵام ئەگەر شا بزانێت رژێمی نوێی عێراق زۆر لەگەڵ ناسر گەرمە، لەوانەیە ئەم مۆچیارییەی ئێمە پشتگوێ بخات.

---

[2] MELBOURNE

سەرچاوە: کتێبخانەی کنیدی، فایلەکانی ئاسایشی نەتەوەیی، زنجیرەی وڵاتان، عەرەبستانی سعودی ٣/٦٣ ـ ١/٦٣، نهێنی[1]

[3] Robert W. Komer

[4] Bundy

من پێداگریم کردووە لە سەر CIA کە بەرنامەیەك لە گروپی تایبەت بۆ جاری داهاتوو ئامادە بکات بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەگەرەکانی ئەم بارودۆخە و هیوادارم ئێوە پشتیوانیان لێبکەن. ئەوەی کە ئێمە ئێستا زۆرترین پێویستیمان پێیەتی دیپلوماسی پێشگیرانەیە.

CIA نیگەرانە(DIA ش نیگەرانە بەڵام لە ئاستێکی کەمتردا) بە نیسبەت زیاد بوونی ئەگەری هێرشی زەمینی ناسر بۆ سەر عەرەبستانی سعودی. وەزارەتی دەرەوە وابیر دەکاتەوە کە بە لەبەرچاوگرتنی هاوسەنگی هێزەکان، روودانی شتێکی وا دوورە(ناسر نایەوێت بەم کارە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێمە بپچڕێنێت) بەڵام من پێموایە ناصر دەیەوێت ئێمە تاقی بکاتەوە.

بەهەرحاڵ من پێداگریم کردووە لە سەر پنتاگۆن(وەزارەتی بەرگری ئەمریکا- وەرگێڕ) کە کردەوەی پێشگیرانە بگرێتە بەر یان دژکردەوەی سەربازی بە دوای ئەوە ئەنجام بدات. هیوادارم ناسر بارودۆخەکە لەمە زیاتر خراپ نەکات، بەڵام ئێمە دەبێ ئامادە بین ئەگەر پێویست بکات بڕیاری بە ئێش و ژان دەر بکەین.

باب ك[5]

---

[5] Bob K

(١٩٦١ ـ ١٩٦٣ ، بەرگی XVIII ، لاپەڕەی ٣٨٢ ـ ٣٨٩ )[1]

ئەیرگرام لە وەزارەتی دەرەوە بۆ لایەنە تایبەتە پەیوەندیدارەکان

CA ـ ٩٤١١

واشنگتۆن، ٢ی ئاداری ١٩٦٣ ، کاتژمێر ١:٥ ی پاش نیوەڕۆ

نهێنی

بابەت: سیاسەتی ڕێنوێنی کاتی بۆ مامەڵە لەگەڵ عێراق و پەیوەندییەکانی کودیتای ئەم دواییەی عێراق لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

ڕێنوێنی بۆ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان:

کودیتای ئەم دواییەی عێراق(کە لەلایەن وتەبێژی کودیتاوە وەك درێژەی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ وەسف کراوە) پێشهاتێکە کە لە بنەڕەتدا بۆ عێراق، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و

---

[1] سەرچاوە: وەزارەتی دەرەوە، فایلە ناوەندییەکان. POL 1 IRAQ ـ US ،"سترانگ" و "کیلگۆر" لە ٢٥ ی شوبات ئامادەیان کردووە و "نۆکز"، "بۆولینگ"، "نیکولاس" (E )، "گاود" (AID ) "مورهاوس" (INR )، "کۆنیستت" (S/S ) "کیرنز ـ پریستۆن "(لە وەزارەتی بازرگانی) و "مەگهی" بینیویانە و لەلایەن "تالبۆت"ەوە پەسەند کراوە. هەروەها نێردراوە بۆ ئادیس ئابابا، ئەلجەزیرە، عەمان، ئاتین، بەغداد، بەیروت، بیلگراد، بۆن، قاهیرە، دیمەشق، جەددە، کابۆل، کەراچی، خارتوم، لەندەن، موگادیشۆ، موسکۆ، نیودلهی، نیکوزیا، پاریس، ڕابات، ڕۆم، تایپە، تایز، تاران، تلابیب، توکیۆ، تریپولیی، تونس، وەرشەڤ ، ئاکرا و کوێت.

ولآته یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگە. ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێ لەگەڵ رژێمی نوێی عێراق بژی، هەر وەك ئێستا دەیبینین.

حکوومەتی عێراق لە ئاستی ناوخۆدا دەبێ لەگەڵ ٤ کێشەی بنەڕەتیدا مامەڵە بکات:

١ـ شۆڕشی کورد

٢ـ کومپانیای نەوتی عێراق(IPC )

٣ـ یاسای بنەرەتی

٤ـ پێشکەوتنی ئابووری

سەرنەکەوتن لە دۆزینەوەی چارەسەرییەکی سیاسی بۆ کێشەی کورد، تەنها بە قازانجی سۆڤیەت و شیوعیەکانی عێراق دەبێت . ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك مەسەلەیەکی بەتەواوی ناوخۆیی سەیری کێشەی کورد لە عێراق دەکات. ئێمە دەبێ درێژە بە راوێژ لەگەڵ بەریتانیا بدەین لە بارەی مەسەلەکانی IPC و ئەو لایەنانە کە بەشیان هەیە لە IPC دا و بەتەواوی تەشویقیان بکەین وەلآمی نەرمونیان بدەنەوە بە دەستپێشخەرییەکانی حکوومەتی عێراق بۆ چارەسەرکردنی کێشە چارەسەر نەکراوەکان. ئێمە دەبێ خۆشحاڵی خۆمان دەربڕین بە نیسبەت نیازی عێراق(وەها کە رایگەیاندووە) بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی یاساسەروەر.

حکوومەتی عێراق سەرچاوەی ماددی پێویستی هەیە(ئەگەر باش بەڕێوەی ببات) بۆ ئەوەی ئابووری ولآتەکەی پێش بخات. ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئیرادەی خۆی نیشان بدات بۆ یارمەتیدانی عێراق بێ ئەوەی لەرووی ماددییەوە ئاستی یارمەتی خۆی بە عێراق بەرز بکاتەوە. دەبێ بازرگانانی ئەمریکایی تەشویق بکرێن لە هەلە بازرگانیەکانی عێراق کەڵك وەربگرن و حکوومەتی عێراقیش دەبێ ئەو کەندوکۆسپانە لاببات کە "قاسم" لەسەر رێگای بازرگانی بیانی داینابوو.

لە ئاستی دەرەکیدا حکوومەتی عێراق پێگەیەکی بەهێزی لە نێو ولآتانی رۆژهەلآتی جیهانی عەرەب دەبێت ئەگەر هێزی خۆی پتەو بکات و یەکگرتوویی خۆی لەگەڵ ئەم ولآتانە بپارێزێت.

ئامانج و ئیدوئۆلوژی عێراق، بە تایبەت سوریا، ئۆردون، یەمەن و لە ئاستێکی نزمتردا، کوێت، عەرەبستانی سعودی و لوبنان بەرەولای خۆی رادەکێشت.
حکومەتی عێراق دەیەوێت لە ئاستی دەرەوە لەسەر "پان عەرەبیزم" چڕ بێتەوە بەلاّم هەوڵ دەدات پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەبێت بۆ ئەوەی بەرەی پشتی خۆی قایم بکات. ململانێی نێوان عێراق و UAR (میسر) لەوانەیە روو بدات. بەهەر حاڵ ئیسرائیل لە کاریگەری روو لە زیادبوونی عێراق لە سەر عەرەبەکان نیگەران دەبێت. ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ عێراق تەشویق بکات پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەبێت و دەوڵەتی ئێرانیش هان بدات لە کاروباری عێراقدا دەستێوردان نەکات.
ئێمە دەبێ دووری بکەین لە بەکارهێنانی دەستەواژەی"هیلالی خصیب[1]" و درێژە بە پەیوەندی دوو لایەنەی دۆستانە و پڕ قازانج لەگەڵ ولاّتانی دیکەی عەرەب بدەین و بە تەواوی بێ لایەن بین لە کێشەی نێوان میسر و عێراق. ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(و بەریتانیا) دەبێ دۆزینەوەی رێگایەك بۆ پێکەوەژیانی کوێت و عێراق تەشویق بکەن و لە هەمان کاتدا، درێژە بدەن بە پشتیوانی کردن لە سەربەخۆیی کوێت. ئەگەر کوێت ئازادانە سیستمی فدراتیو لەگەڵ عێراق هەڵبژێرێت ئێمە نابێ دژایەتی ئەوە بکەین کە کوێت دەسەلاّتی بڕیاردانی تەواوی هەبێت لەسەر مەسەلەی نەوت. ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بە توندی پشتیوانی بکات لە ئۆردون.

---

[1] لە ئەدەبیاتی سیاسیدا مەبەست لە "هیلالی خصیب"(کەوانەی بەپیت) ئەو سیاسەتەیە کە زلهێزەکان بۆ پێشگرتن لە تەشەنە کردنی ئیسلامی سیاسی و بەربەرەکانی لەگەڵ رۆحی نەیارێتی لەگەڵ ولاّتانی رۆژئاوا لە ناو ولاّتە ئیسلامیەکاندا گرتیانە بەر. هەندی لە ولاّتانی ئیسلامی لەوانە میسر، لوبنان، فەلەستین و بەشێك لە ئۆردۆن، سوریا، عێراق ، تورکیا و ئێران دەکەونە ناو ئەم کەوانەیە. وەرگێڕ

سوریا بەرەولای عێراق رادەکێشرێت. ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێ دژایەتی سیستمی فدراسیونی سوریا لەگەڵ عێراق یا میسر بکات. لەم پەیوەندییەدا پێویست بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی ناکات و زۆربەی خەڵکی سوریا رازی دەبن بەم سیستمە. ئێمە دەبێ وەك رابردوو وەلاٌمی ئەرێنی بدەینەوە بە داواکارییەکانی سوریا بۆ یارمەتی ئەمریکا. ئێمە دەبێ لە نیگەرانیەکانی عەرەبستانی سعودی لە بارەی عێراق کەڵك وەربگرین بۆ ئەوەی تێوەنەگلانی یەمەن و پێشکەوتنە خێراکان لەپەیوەندی لەگەڵ چاکسازی و نۆژەنکردنەوە تەشویق بکەین.

ئێمە دەبێ لوبنان و ولاٌتانی دیکە سەرلەنوێ دڵنیا بکەینەوە کە پشتیوانی لە سەربەخۆییان دەکەین بێ ئەوەی چاومان لە هیچ بێت. لەبەر دژایەتی کردنی عێراق لەگەڵ بەریتانیا لە عەدەن و لەگەڵ عەرەبستانی سعودی ئێمە نابێ چالاکیەکانی عێراق لە یەمەن تەشویق بکەین. ئێمە دەبێ لە نیگەرانی ئیسرائیل دەربارەی ناکامەکانی شۆڕشی عێراق تێبگەین و لە هەمان کاتدا درێژە بدەین بە بێ لایەنبوونمان لە نێوان ئیسرائیل و ولاٌتانی عەرەبی. لەهەمان کاتدا دەبێ بەرژەوەندییەکانی خۆمان(بە نیسبەت ئاسایشی ئیسرائیل و مافی دەوڵەتبوونی ئەم ولاٌتە و بوونی ئاشتیەکی هەنگاو بە هەنگاوی هەمیشەیی لە نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل) بۆ عێراق و دەوڵەتانی دیکەی عەرەب روون بکەینەوە.

**الف- روانگەی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت مەسەلە ناوخۆییەکانی عێراق:**

حکوومەتی عێراق ئەوەی سەلماندووە کە دەتوانێ دەسەلاٌتی خۆی پتەو بکات. حکوومەتی نوێی عێراق(کە حکوومەتێکی بەعسی ئینتیلافیی ناسیونالێستە) لەسەر "پان عەرەبیزم" لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی عێراق و بوونی حکوومەتێکی بێ لایەن، چاکسازەخواز و سوسیالیست(وەك نمونەی ولاٌتانی ئیسکاندیناویا) پێ دادەگرێ و دەڵێت ئامانجەکانی هەمان ئامانجەکانی خەڵکی عێراق دەبێت. وادیارە دوابەدوای ئارام کردنەوەی ولاٌت(لەوانە چارەسەر کردنی کێشەی کورد) حکوومەتی عێراق هەوڵ دەدات ببێ بە حکوومەتێکی دیموکرات و یاساسەروەر و زۆرتر خۆی نزیك بکاتەوە لە پێشکەوتنی ئابووری.

له روانگەی كاروباری ناوخۆیی عێراقەوە، ئێمە چاوەڕوانی ئەوە دەكەین كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بتوانێ لەگەڵ حكومەتی عێراق بژی. هەرچەند لەوانەیە لەمەوبەدوا شیوعیەكان بتوانن پێگەیەكی جەماوەری بەدەست بهێنن بەڵام حكومەتی عێراق دەیەوێت كاریگەریان بەرتەسك بكاتەوە. چاوەڕوان دەكرێت حكومەتی عێراق هەڵوێستێكی"دەروەس نەبوویانە" بگرێتە بەر كە له كردەوەدا پێگەی بلۆك(ی رۆژهەڵات) له عێراق لاواز دەكات.

ئێمە هیوادارین حكومەتی عێراق بە شێوەیەكی مەعقول لەگەڵ IPC مامەڵە بكات . بەهەرحاڵ هەندێ نیشانەی درێژخایەنتر هەن كە كار دەكەنە سەر سیاسەتی دەرەوەی عێراق كە بۆ ئێمە ناخۆشە. له بەشی ۲ دا باسی ئەم مەسەلەیە دەكەین.

له پەیوەندی لەگەڵ ئەم چوار مەسەلە ناوخۆییە بنەڕەتیە كە حكومەتی عێراق دەبێ مامەڵەی لەگەڵ بكات، رێنوێنیتان دەكەین كە:

١ـ شۆڕشی كورد: سەرنەوكەوتن لە دۆزینەوەی رێگاچارەیەكی سیاسی بۆ كێشەی كورد بەم زووانە تەنها بە قازانجی سۆڤیەت و شیوعیەكانی عێراق دەبێت.

هەڵوێستی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا: وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ درێژە بدات بەوە كە كێشەی كورد بە مەسەلەیەكی بە تەواوی ناوخۆیی عێراق بزانێت كە نایەوێت هیچ دەورێكی راستەوخۆ یان راستەخۆی تێدا ببینێت. له كاتی قسەوباس لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتانی دیكە، كاربەدەستانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ تەنها هیوای خۆیان دەربڕن كە حكومەتی عێراق و كوردەكان بتوانن بگەن بە رێككەوتنێك كە هەر دولا پێی رازی بن و لەم پەیوەندییەدا وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا سیاسەتێكی بێ لایەنانە بگرێتە بەر. ئێمە دەبێ كار بكەینە سەر ئێران و توركیا بۆ ئەوەی سیاسەتێكی بێ لایەنانەی هاوشێوە لەلایەن خۆیانەوە بگرنە بەر.

٢ـ نەوت: IPC بەم ئاكامە گەیشت كە ناتوانێ مامەڵەیەكی مەعقول لەگەڵ قاسم بكات. له كاتێكدا كە حكومەتی نوێی عێراق حكومەتێكی لاواز نییە بەڵام بەڵگەكان وا نیشان دەدەن كە

ناتوانێت هەڕەشەیەکی جیدی دروست بکات بۆ ناوچەی کەنداو ، و هەوڵە یەك لە دوای یەکەکانی نەیارانی بەعس بۆ کودیتا ئەم بیرورایەی بە هێزتر دەکرد.
بەریانی ئیدارەی نیکسۆن بەرەولای ئێران بووە هۆی گۆڕانێکی گرنگ لە سیاسەتی ئەمریکا بە نیسبەت ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٧٢: یەکەم ئەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان دەست لە هەوڵە جارناجارەکانی هەڵگرت بۆ کونترۆڵ کردنی خەرجە سەربازییە یەکجار زۆرەکانی ئێران . لە میانەی سەردانەکەی بۆ ئیران لە ١٩٧٢ نیکسۆن بەڵێنی دا هەموو جۆرە چەکێکی ئەمریکی (جگە لە چەکی ناوکی)کە شا دەیەوێت بفرۆشێت بە ئێران. دووەم ئەوە کە لە هەمان دانیشتندا سەرۆك کۆماری ئەمریکا هاوڕا بوو لەگەڵ ئەو روانگەیەی شا کە عێراق(کە ببوو بە هاوپەیمانێکی نزیکی سۆڤیەت)مەترسییە بۆ ئاسایشی ناوچەی کەنداو.
حکوومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ راگرتنی هاوسەنگی لەگەڵ رژێمی بەعس لە تەموزی ١٩٧٢ەوە دەستی کرد بە پشتیوانی کردن لە شۆڕشی کوردەکانی عێراق بە رێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی. هەرچەند کە شا چەندین ساڵ بەر لە وەش یارمەتی ماددی دەدا بە بارزانی، بەڵام حکوومەتی ئەمریکا داواکاری یارمەتیخوازانەی کوردەکانی رەت دەکردەوە لە سەر بنەمای پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتانی دیکە. بەهەرحاڵ پاش ئەوەی کە عێراق لە نیسانی ١٩٧٢ پەیماننامەیەکی لەگەڵ سۆڤیەت مۆر کرد، کاربەدەستانی ئەمریکا (بە تایبەت کاربەدەستانی CIA) گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە دەبێ سەرنج بدەن بە هەڕەشەکانی عێراق.
دوابەدوای پچڕانی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و عیراق لە میانەی شەڕی ١٩٦٧ی عەرەب و ئیسراییل، لە رێگای بەلژیکاوە تۆزی پەیوەندی لە نێوانیاندا دروست بوو بەڵام ئەمریکا لە عێراق بوونی نەبوو و کەم دەستی لەم وڵاتە دەڕۆیشت. لە ١٩٦٩ حکوومەتی بەعس "بە هۆکاری ئەمنی"چاوی تەماحی بڕیبووە ملکی باڵوێزخانەی پێشووی ئەمریکا لە بەغداد و سەرەنجام وەها کە پێشبینی دەکرا پاش چەند ساڵ وتووێژی بێ سوود لە مایسی ١٩٧١ دەستی بە سەردا گرت. ئەم رووداوە ئیدارەی نیکسونی هان دا تا لە ساڵی ١٩٧٢ نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندی

ئەمریكا لە باڵوێزخانەی بەلژیكا لە بەغداد بكاتەوە، هەروەها كە عێراق نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندی خۆی لە ١٩٦٧ لە واشنگتۆن كردبووەوە.

ئیدارەی نیكسۆن لە سەرەتای ١٩٦٩ لەگەڵ دەستنەرۆیشتوییی لە عێراق روبەڕوو بووەوە واتا ئەو كاتە كە هەوڵی دا پێش لە تۆڵە سەندنەوەی ئیسراییل لە دەوڵەتی عێراق بگرێت بە هۆی شەپۆلی گشتی لە سێدارەدانی جولەكەكانی عێراق و ئەو كەسانە كە تاوانی سیخوڕی بۆ ئیسراییلیان خرابووە پاڵ. بۆ ئارام كردنەوەی ئیسراییل، وەزیری دەرەوەی ئەمریكا لە بەیاننامەیەكدا لە نەتەوە یەكگرتووەكان ئەم كردەوەیەی عێراقی(لە سێدارەدانی جولەكەكان) شەرمەزار كرد. هەروەها كاربەدەستانی وڵاتە یەكگرتووەكان بەرنامەیەكیان دارشت بۆ ئەوەی جولەكەكانی عێراق بتوانن كۆچ بكەن بۆ وڵاتە یەكگرتووەكان. بەهەرحاڵ ئەمریكا دەركی بەوە دەكرد كە هاوكاری بنەڕەتی عێراق دەستەبەر نابێت ئەگەر واشنگتۆن بكەوێتە ناو كێشەكە ، هەربۆیە وەزارەتی دەرەوە ئەندامانی كۆنگریسی پەشیمان كردەوە كە مەسەلەی لەسێدارەدانی جولەكەكان لە كۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان بخەنە روو.

لە تشرینی یەكەمی ١٩٧٠ باڵوێزخانەی بەلژیكا راپۆرتی دا كە بارودۆخەكە باشتر بووە بۆ جولەكەكانی عێراق ، هەرچەند كە ئەو راپۆرتانە كە پاشان دەربارەی دەستگیركرانی جولەكەكان (كە ویستوویانبوو لە عێراق كۆچ بكەن)بڵاو بووەوە دەوڵەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی لە ئاداری ١٩٧١ هان دا تا داوا لە كومیسیونی باڵای نەتەوە یەكگرتوەكان لە كاروباری پەنابەران بكات تاوتوێی ئەم مەسەلەیە بكات. ئەم كومیسیونە لەپاڵ هاوپەیمانەكانی دیكەی ئەمریكا (كە ئەمریكا داوای لێكردبوون) توانی لە لایەن جوولەكەكانی عێراقەوە سكاڵایەك تەسلیم بە حكوومەتی عێراق بكات ، بەهەرحاڵ مەسەلەكە جارناجار سەری هەڵدەدایەوە. كاربەدەستانی ئەمریكا ئازاردانی جولەكەكانی عێراقیان وەك هەوڵێك بۆ راكیشانی پشتیوانی خەڵك بەرەولای رژێمی بەعس لە رێگای كایەكردن بە هەڕەشەی سەربازی ئەمریكا لێكدایەوە. بە وتەی INR

کرپیوه بۆ سەربازانی عێراق. هەروەها بە وتەی سەرچاوەکان، سۆڤیەت ٨ پ.سپۆڕی گازە ژەهراوییەکانی ناردووە بۆ عێراق تا سەربازە عێراقییەکان رابهێنن.

کوردەکان کە ژمارەیان نزیکە ١٠٠هەزار کەسە لە عێراقدا ، خەڵکێکی عەشیرەتی غەیرە عەرەبن کە لە شاخەکانی عێراقدا دەژین و داوای دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمی کوردی دەکەن. ئەوان لە سەدەی رابردوودا چەندجار لە گەڵ حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق شەڕیان کردووە کە دواییینیان لە ١٩٧٠ کۆتایی پێهات . ئەوکاتە بە پێی رێککەوتننامەیەك ، بەغداد بەڵێنی دا بە کورد کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی هەتا مارسی ١٩٧٤ دامەزرێنێت، بەڵام نوێنەرانی کورد ئێستا دەڵێن عێراق نکوڵی لەو رێککەوتننامەیە دەکات و هێرشەکانی بۆ سەر هێزە کوردەکان دەست پێکردوەتەوە . بە وتەی بەرپرسانی کورد کە لێرەن، دوایین هێرش لە ناوەڕاستی ئاب لە ناوچەی سنجار رووی داوە . لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا ٣٠ سەربازی عێراق کوژراون و چەند کەسیش لە کوردەکان بریندار بوونە .

سەرچاوەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە عێراق لەو شەڕەدا تۆپ و فڕۆکەی MIG بەکارهێناوە .

کوردەکان دەڵێن هیواداربوونە بەرپەرچدانەوەی هێرشی عێراق ، کۆتایی بە هەوڵەکانی دەوڵەتی بەغداد هێنابایا بۆ پێشێل کردنی رێککەوتننامەی ١٩٧٠ بەڵام هەرحاڵ ئێستا کڕینی گازی ژەهراوی لە سۆڤیەت نیشان دەدات کە بەغداد هەوڵ دەدات دوایین رێگاچارەی کێشەی کورد جێبەجێ بکات ، بە هەمان شێوە کە هیتلێر جوولەکەکانی قەڵاچۆ کرد.

بە وتەی وتەبێژی کورد ، گازی کیمایی لە کەمپی لەشکری "تاجی[4] "، هەڵکەوتوو لە رۆژئاوای بەغداد و ناوەندی فەرماندەیی ٢ی سۆپا لە کەرکوك و ناوەندی فەرماندەیی ٤ی سۆپا لە مووسڵ رادەگیرێت . وتەبێژەکە وتی تەنها بیروڕای گشتی دەتوانێت پێش لە بە کارهێنانی گازی ژەهراوی دژبە کورد بگرێت و داوای لە بیروڕای گشتی کرد کە داوا لە سۆڤیەت بکەن گازی ژەهراوی و پسپۆڕەکانی خۆی لە عێراق بباتە دەرەوە .

---

Taji[4]

## کوردهکان له عێراقدا

### ١١ی تهموزی ١٩٧٤- ئهنجوومهنی نوێنهران

بهڕێز " هامیلتۆن[١]" :

بهڕێز سهرۆکی ئهنجوومهنی نوێنهران، ئهوهی که لهم ڕۆژانهی دواییدا له ڕۆژنامهکاندا سهرنجی پێدراوه شهڕێکی دیکهیه له ڕۆژههڵاتی ناوهڕاستدا . ئهم شهڕه له نێوان هێزه کوردهکان و لایهنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان له لایهك و هێزهکانی سوپای عێراق له لایهکی دیکهیه . ئهم شهڕه له سهر ئهوهیه که کوردهکان داوای جۆرێك ئۆتۆنۆمی ناوچهیی دهکهن له ناو وڵاتی عێراقدا . ئهم شهڕه نوێ نییه و له ماوهی ١٣ساڵی ڕابردوودا پهیتا پهیتا بهردهوام بووه.

لهم دواییانهدا من و کۆنگریسمهن " فرایزێر[٢] " له سهر داواکاری خۆیان لهگهڵ نوێنهرانی پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) دیدارمان کرد تا سهبارهت بهم شهڕه و کاریگهرییهکانی له سهر ئاشتی و سهقامگیری ڕۆژههڵاتی ناوهڕاست قسهو باس بکهین. بێ ئهوهی که بیر وڕای خۆمان سهبارهت به شایانبوونی کێشهی کورد و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لهم شهڕانهی دواییدا و کێشه ناوخۆیی و بنهڕهتییهکانی دیکهی عێراق دهرببڕین ، ئێمهله سهر ئهو بڕوایهین که پێویسته بیروڕای نوێنهره کوردهکان به ههند وهربگیردرێت و بۆ ئهم مهبهسته ئێمه داوامان له وهزارهتی دهرهوه کردووه که به شێوازی غهیره فهرمی له گهڵ ئهم نوێنهرانهی PDK دابنیشێت ، بهڵام وهزارهتی دهرهوه قبووڵی نهکردووه .

له حاڵێکدا من له سهر ئهو بڕوایهم که نابێت هیچ چهشنه یارمهتییهکی نهێنی و ئاشکرا بدرێت به کورده ڕاپهڕیوهکان، بهڵام پێمناخۆش بوو که بهرپرسانی پایهبهرزی وهزارهتی دهرهوه نهیانویست به شێوازی غهیره فهرمی دیدار بکهن لهگهڵ دوو وهزیری پێشووی عێراق که ئهندامی PDK ـ

---

[١] Mr. HAMILTON

[٢] Congressman FRASER

ن. کەوابوو هەلێکی سوودمەندمان لە دەست چوو بۆ ئاگاداربوون لە یەکێ لە روانگەکانی ئەم شەڕە کە لە ٢ مانگی رابردوودا پەرەیەکی بەرچاوی سەندووە . ئەمە دەقی ئەو نامەیەیە کە من و بەڕێز "فرایزێر" ناردوومانە بۆ وەزارەتی دەرەوە :

کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران

واشنگتۆن دی سی ، ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٤

بەڕێز " هێنری کیسینجێر[٣] "، وەزیری کاروباری دەرەوە، واشنگتۆن دی سی

بەڕێز جەنابی وەزیر ، ئێمە دەمانەوێت داواتان لێ بکەین نوێنەری پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە ، جێگری وەزیری دەرەوە ، "جۆزێف سیسکۆ[٤]"یا یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە " ئالفرێد ئەسێرتۆن[٥] " لە گەڵ " م م عەبدولڕحمان" و "م دزەیی" ، وەزیرانی پێشوی دەوڵەتی عێراق و "شەفیق قەزاز "دیدار بکەن کە هەموویان ئەندامی پایەبەرزی پارتی دیموکراتی کوردستانن و ئێستا لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادان بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەی نەتەوەیەککگرتووەکاندا بەشداری بکەن .

بێ ئەوەی رای خۆمان لە سەر داخوازییەکانی ئەو ئەندامانەی PDK دەرببڕین ، ئێمە لە سەر ئەو بڕوایەین کە مەسەلەی ئەم نوێنەرانە شایانی ئەوەیە لەلایەن نوێنەرانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە گوێی لێبگیردرێت. شەڕی ناوخۆی عێراق کە تا ئێستا نزیکەی ١٣ ساڵی خاباندووە ، لەم دوایانەدا بووە بە شەڕێکی جیدی تر و خوێناویتر و ژمارەیەکی بەرچاو تێیدا کوژراون . ئێمە لەو بڕوایەداین کە بە هۆی ئەوەی کە ئەم شەڕە دەتوانی کار بکاتە سەر رەوشی هەستیاری رۆژهەلاتی

---

[٣] HENRY A. KISSINGER
[٤] Joseph J. Sisco
[٥] Alfred Atherton

ناوەڕاست، و هەندێ لە دراوسێکانی عێراقی سەرقاڵی خۆی کردووە ، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئاگاداری هەموو لایەنەکانی ئەم شەڕە بێت .
ئێمە سپاستان دەکەین ئەگەر بەزووترین کات سەرنج بدەن بەم بابەتە.
لەگەڵ ڕێزماندا
" لی ھ هامیلتۆن"، سەرۆکی کومیسیۆنی رۆژهەلاتی نزیك و باشووری ئاسیا
"دۆناڵ م فریزێر "، سەرۆکی کومیسیۆنی ڕێکخراو و بزووتنەوە نێونەتەوەییەکان

**ئەمەش دەقی وەلامەکەی وەزارەتی دەرەوەیە:**

وەزارەتی کاروباری دەرەوە
واشنگتۆن دی سی، ٣ی تەموزی ١٩٧٤
بەڕێز لی ھ هامیلتۆن
سەرۆکی کومیسیۆنی رۆژهەلاتی نزیك و باشووری ئاسیا، ئەنجوومەنی نوێنەران ، واشنگتۆن دی سی
بەڕێز جەنابی سەرۆك
جەنابی وەزیر داوای لێمکردووە تا وەلامی نامەکەی ١٣ی حوزەیرانی ئێوە بدەمەوە کە سەرۆك " فرایزێر" یش واژۆی کردووە و داواتان کردووە جێگری وەزیر ، "سیسکۆ" یا یارمەتیدەری وەزیر،" ئەسێرتۆن" لە گەڵ نوێنەرانی پایەبەرزی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK ) دیدار بکات.
ئێمە چەند داواکارێکمان لە لایەن نوێنەرانی کوردەوە بۆ چاوپێکەتن بە دەست گەیشتووە. لە ساڵی رابردوودا پەیوەندی ئێمە لە گەڵ PDK لە ئاستێکی نزمدا بوو. ئەگەر ئێمە ئێستا ئەم سیاسەتە بگۆڕین لە وانەیە هەم کوردەکان و هەم دەوڵەتی بەغداد بەهەڵە تێبگەن . هەرواکە ئێمە

سەرنجمان داوە ، لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەی ئێمەدا ، بانگەشەكانی عێراق كەم بۆتەوە دەربارەی ئەوە كە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پشتیوانی لە راپەڕینی كورد دەكات .
لە كاتێكدا كە گەلێ لە ئەمریكاییەكان هاوسۆزی كوردەكانن ، هەڵوێستی وەزارەتی كاروباری دەرەوە ئەوەیە كە ئەم ململانێیە پێش هەموو شتێك كێشەی ناوخۆیی عێراقە و ئێمە نامانەوێت كوردەكان بەو باوەڕە بگەن كە ئێمە ئامادەین بە ئاشكرا یان نهێنی پشتیوانی لە راپەڕینەكەیان لە عێراق بكەین . كەوابوو ئێمە هەموو هەلێك دەدەین بە نوێنەرانی كورد تا باسی كێشەی خۆیان بكەن ، بەلام نە لەو روانگەیە كە ئێمە پشتیوانی لە كێشەكەیان دەكەین . ئەڵبەتە پەیوەندییەكانی ئێمە لەگەڵ PDK بۆ یارمەتیدەری وەزیر، بەرێز "ئەسێرتۆن" و جێگری وەزیری كاروباری دەرەوە راپۆرت دەدرێت.
ئەگەر ئێمە سیاسەتی پێشوومان بگۆڕین و لە ئاستێكی بەرزتردا لەگەڵ نوێنەرانی PDK دیدار بكەین ، بێگومان ئەمە سەرنجی دەوڵەتی عێراق و ولاتانی عەرەبی دیكە رادەكێشێت و لە وانەیە وەك دەستێوەردان لە كاروباری ناوخۆی عێراق شرۆڤە بكرێت و خەسار لە باشتر بوونی پەیوەندی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و عێراق بدات . هەر چەشنە یارمەتییەك كە ئێمە بیدەین بە كەمینەیەك لە خەباتیدا بۆ ئۆتۆنۆمی دژی دەوڵەتێكی عەرەبی ، لەوانەیە ببێتە جێگای گومانی جیهانی عەرەب بە نیسبەت نیازەكانی ئێمە .
لە ئاكامدا ، من باوەڕ ناكەم بەرز كردنەوەی ئاستی دیدارەكانمان لە گەڵ نوێنەرانی PDK خزمەت بە ئامانجەكەمان بكات . ئەوەی كە باس كرا ، بە واتای ئەوە نییە كە ئێمە لە گەڵ سیاسەتی عێراق داین بە نیسبەت كورد یا بایەخی ئامانجە نەتەوەییەكانی خەڵكی كورد كەم بكەینەوە . هەڵوێستی ئێمە لە بنەڕەتدا ئەوەیە كە بێ لایەن بین بە نیسبەت هەر ناكۆكییەكی ناوخۆیی كە هەست دەكەین نابێت خۆمانی تێوەبگلێنین .

له کاتێکدا ئێمه له سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه نین که گۆڕانی سیاسه‌ته‌که‌مان به نیسبه‌ت PDK له‌م کاته‌دا زۆر به قازانجمان بێت به‌ڵام خۆشحاڵ ده‌بم به‌ڕێز "عه‌بدولڕه‌حمان "، به‌ڕێز "دزه‌یی" و نوێنه‌رێکی وڵاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له کاتێکی گونجاودا پێکه‌وه دیدار بکه‌ن
به‌ڕێز شه‌فیق قه‌زاز ، نوێنه‌ری PDK له ٩ی حوزه‌یران له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه وه‌رگیراوه و سێ نوێنه‌ری کوردی دیکه له هه‌مان رۆژدا بۆ لیژنه‌ی ئێمه بانگێهشت کراون له نه‌ته‌وه‌یه‌کگرتووه‌کان . ئه‌گه‌ر به‌ڕێزت یا سه‌رۆك "فرایزێر" کورته‌یه‌کی غه‌یره فه‌رمی له باره‌ی سیاسه‌تی ئێمه‌تان ده‌وێت به نیسبه‌ت کێشه‌ی کوردی عێراق ، ئاگادارم بکه‌نه‌وه .

له گه‌ڵ رێزمدا

لینوۆد هاڵتۆن[٦]

یارمه‌تیده‌ری وه‌زیر بۆ په‌یوه‌ندییه‌کانی کۆنگرێس

---

[٦] LINWOOD HOLTON

## چاره‌نووسی كورده‌كان

### ١٧ی نیسانی ١٩٧٥- ئه‌نجوومه‌نی نوێنه‌ران

به‌ڕێز " كۆچ[1] " له‌ ئه‌یاله‌تی نیۆیۆرك :

به‌ڕێز سه‌رۆكی ئه‌نجوومه‌ن ، له‌ ساڵی رابردوودا ، كورده‌كان شه‌ڕێكی خوێناوییان دژی ده‌وڵه‌تی عێراق كردووه‌ بۆ مافی ره‌وای ئۆتۆنۆمی . رێبه‌ری كورد ، مسته‌فا بارزانی به‌ ره‌تكردنی ئه‌و جۆره‌ ئۆتۆنۆمییه‌ سیاسییه‌ كه‌ عێراق به‌ڵێنی دابوو ، داوای له‌ خه‌ڵكه‌كه‌ی كرد له‌گه‌ڵ سوپای عێراق شه‌ڕ بكه‌ن كه‌ له‌لایه‌ن سۆڤیه‌ته‌وه‌ پۆشته‌ ده‌كرێت. كورده‌كان ئازایانه‌ شه‌ڕیان كرد و هه‌ندێك سه‌ركه‌وتنیان به‌ده‌ست هێنا ، به‌شێك له‌م سه‌ركه‌وتنه‌ به‌ هۆی ئه‌و چه‌ك و ته‌قه‌مه‌نییه‌ بوو كه‌ شای ئێران ناردبووی بۆ كورده‌كان . هانده‌ری شا بۆ ئه‌م یارمه‌تیدانه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ شا هه‌وڵ ده‌دات دوژمنه‌ سه‌رسه‌خته‌كه‌ی خۆی واتا عێراق له‌ڕێگای كورده‌كان لاواز بكات. په‌یماننامه‌ی جه‌زایر كه‌ ئه‌م دواییانه‌ له‌ نێوان ئێران و عێراق واژۆ كرا، هه‌ڵوێستی بێ به‌زه‌ییانه‌ی شای به‌ نیسبه‌ت كورده‌كان خسته‌ روو . شا له‌ سه‌ر ئه‌وه‌ رێككه‌وت كه‌ كۆتایی به‌ هه‌موو یارمه‌تێك به‌ كورد بهێنێ و له‌ ١ی ئاڤریلی ئه‌مساڵدا ، سنووره‌كانی به‌ رووی ئاواره‌ كورده‌كان داخست . له‌ ئاكامدا ، شا حوكمی مه‌رگی ئه‌و كوردانه‌ی واژۆ كرد كه‌ له‌ وڵاتی خۆیاندا مابوونه‌وه‌ .

تراژیدیای ئه‌م خیانه‌ته‌ له‌گه‌ڵ بێده‌نگی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان تێكه‌ڵ بووه‌ . له‌ كاتێكدا كه‌ نه‌ته‌وه‌یه‌كگرتووه‌كان زۆر به‌ بالای یاسر عه‌ره‌فات دا ده‌یخوێند ، به‌ ساردی له‌ گه‌ڵ كورده‌كان هه‌ڵسوكه‌وتی كرد و به‌توندی نوێنه‌ره‌ كورده‌كانی ره‌ت كردەوه‌ ، له‌ به‌ر ئه‌وه‌ كه‌ نوێنه‌ری بزووتنه‌وه‌یه‌كی بێ ده‌وڵه‌ت بوون ، ئه‌مه‌ دووره‌ڕوویییه‌ .

---

[1] Mr. KOCH.

کوردەکان تەنها ئەوەیان دەوێت بە ئاشتی و بەو شێوازە کە خۆیان پێیان باشترە بژین بەڵام کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر هەوڵەکانی ئەواندا راوەستاوە . ئێمە دەبێت هەرچی لە دەستمان دێت یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە کوردەکان بدەین ، چ ئەوانە کە ئاوارەی ئێران بوونە و چ ئەوانەی کە لە ژێر دەستی دەوڵەتی عێراقدان . ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بە پەناگای دوورخراوە سیاسییەکان ناسراوە ، دەبێت داواکارییەکەی رێبەری کورد ،مەلا مستەفا بارزانی قەبووڵ بکات ، ئەگەر بێت و داوای مافی پەنابەری بکات.

کورد کە گەلێکی شاخنشینی زموختە ، هەزاران ساڵە لە سەر خاکی خۆی دەژی . ئەم خاکە هی خودی کوردەکان بوو ، پێش ئەوەی نەوت خاکەکەیان ئەوەندە گرنگ بکات . لە راستیدا چەندە ناخۆشە کە لای هەندێ لە دەوڵەتەکان، نەوت لە چارەنووسی ئەم خەڵکە ئازایە و مافی ژیانیان گرنگترە.

لەم بەسەرهاتە دا ، خاڵی کۆتایی کە زۆر کاری کردۆتە سەر من ئەوەیە کە پێشمەرگەکانی بارزانی قەد دەستیان نەبردووە بۆ تیرۆریزم و ئەمە لە نێو ئەو بزووتنەوانەی کە خەبات بۆ رزگاری نەتەوەیی دەکەن ، بێ وێنەیە . لەم شەڕەدا بارزانی لیستی دیلە عێراقییەکانی بلاو کردووەتەوە و ئیزنی بە رێکخراوی خاچی سوور داوە سەردانیان بکات ، سەرەڕای ئەو هەڵسوکەوتە خراپەی دەوڵەتی عێراق لە گەڵ دیلە کوردەکان . کوردەکان ئەوەندە جورئەت و جەسارەتیان هەیە داکۆکی لە ئازادی خۆیان بکەن ، بێ ئەوەی دەست ببەن بۆ ئەم تاکتیکە سەرنجڕاکێش و دزێوانە . چەندە شەرمە بۆ شارستانییەت کە ئەوانەی کە دەست نابەن بۆ تیرۆریزم ، تووشی کارەسات دەبن ، بەڵام ئەوانەی کە دەستی بۆ ئەبەن ، بە فەرمی دەناسرێن .

## بارودۆخى كورد پێويستى به كۆنوانسيۆنى ژنێڤ ههيه

## ٨ى مايسى ١٩٧٨ - ئهنجوومهنى پيران

بهڕێز" پرۆكزماير[١] ":

بهڕێز سهرۆكى ئهنجوومهن ، گهلێك هۆكار ههيه بۆ ئهوهى بۆ دهبێ ئهنجوومهنى پيرانى ولاته يهكگرتووهكانى ئهمريكا كۆنوانسيۆنى ژينۆسايد پهسهند بكات . من گهلێك جار له بارهى ژينۆسايدهوه قسهم كردووه كه ئێستا له "كامبۆجيا" و " ئۆگاندا "بهڕێوه دهچێت و ئهڵبهته ههموومان باش ئاگادارى كۆمهڵكوژى دزێوى ٦ميليۆن جولهكهين به دهستى نازييهكان له ماوهى شهڕى دووههمى جيهانيدا . كۆنوانسيۆنى ژينۆسايد بهرههمى ههوڵى گهلێ له نهتهوهكانى جيهانه بۆ پێشگرتن له تاوانى ژينۆسايد و خودى پهيماننامهكهش ژينۆسايدى به تاوانێكى نێونهتهوهيى داناوه . بهلام به دڵنياييهوه يهكێ له گرنگترين هۆكارهكانى پهسهند كردنى كۆنوانسيۆنى ژينۆسايد ئهوهيه كه ژينۆسايد له وانهيه له داهاتوودا دووباره ببێتهوه. لهم رۆژانهى دواييدا رۆژنامهى" واشنگتۆن ستار[٢]" وتارێكى بلاو كردووهتهوه سهبارهت به بهسهرهاتى دڵتهزێنى رێبهرى كورد ، ژنهراڵ مستهفا بارزانى.

ژمارهى كوردهكان چهند ميليۆنه و له ناوچه شاخاوييهكانى عێراق ، ئێران ، سوريا و توركيا دهژين . ساڵههاى ساڵ كوردهكان بۆ دامهزراندنى ولاتى خۆيان له عێراق خهباتيان كردووه بهلام راپهڕينهكهيان ههرهسى هێنا كاتێ كه پشتيوانى ولاته يهكگرتووهكانى ئهمريكا له ساڵى ١٩٧٥بچڕا .

بۆ خهڵكى ئهمريكا چهنده سهخته وێناى ئهوه بكهن كه ژيان چۆن دهبێت ئهگهر ولاتێكيان نهبێت به ناوى ئهمريكا، بهلام وێنا كردنى ئهم جۆره ژيانه بۆ كوردهكان و ژنهراڵ بارزانى ئاسانه .

---

Mr. PROXMIRE. [١]
Washington Star [٢]

ژنەراڵ بارزانی لە ناوچە شاخاوییەکانی عێراق لە گوندێکی بچووك بە ناوی بارزان دەژێت . لە ١٩٣١ بارزان لەلایەن سەربازە عێراقییەکانەوە گەمارۆ درا و خاپوورکرا و پاش ئەوەش بارزان ١٤ جار کاول کرا .

ئەمڕۆ ژنەراڵ بارزانی لە ئەمریکا دەژی و ئاگادارە کە خزم و کەسە کانی لە نێو خاکی ئێران و عێراق لە کەمپەکاندا دەژین . کاربەدەستانی عێراق هەوڵیان داوە خەڵکی کورد بۆ باشووری وڵات دووربخەنەوە چوونکە لەوێ لە ژێر چاودێریدان و بەرەبەرە لە نا وکۆمەڵگادا دەتوێنەوە . گەلێ لەم بنەماڵانە لەناوچوونە ، پێشمەرگەکان کەشف کراون و کوژراون . ئەوەی کە بەڕێوەدەچێت کەمتر لە هەوڵدان بۆ قڕ کردنی ناسنامەیەکی کوولتووری نییە. بێ ئاگاداربوون لە زانیارییەکانی ناوچە ، ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە ئایا ئەم کوشتنانە بە تاك رووی داوە یا بە کۆمەڵ و سیستماتیك . ئێمە نازانین ئایا ژینۆساید ـ بەو شێوازە کە لە کۆنوانسیونی ژنێڤدا پێناسە کراوە ــ رووی داوە یا نا بەڵام دەزانین کە هەموو ئەم خەڵکە لە رووی ئەتنیکی و کولتوورییەوە رووبەڕووی ئازار و ئەزییەت بوونەتەوە و بەشێك لەم بەر پرسیارییەتییە لە ئەستۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە .

من داوادەکەم وتارەکەی رۆژنامەی "واشنگتۆن ستار " کە لە لایەن "لین رۆزیلینی[3] "یەوە نووسراوە( بە ناوی *دوایین شەڕی ژنەراڵ مستەفا بارزانی* کە لە لایەن چەند سەرچاوەیەکەوە پشتڕاست کراوەتەوە و لە ١٨ی نیسانی ١٩٧٨ بلاو بۆتەوە) دەستبەجێ لە دوای قسەکانی من بخرێتە بەردەستی هاوکارانم.

هەروەها من لەم هەلە کەڵك وەردەگرم و وەبیری ئەنجوومەنی پیران دەهێنمەوە کە بارودۆخی کوردەکان یەکێ لەو نموونە روونانەیە کە پێویستە بە گوێرەی کنوانسیۆنی ژینۆساید مامەڵەی لەگەڵ بکرێت . ئەم پەیماننامەیە ٣٠ ساڵ لەمەو بەر بووەتە ئەجێندای ئەنجوومەنی پیران . لە

---

[3] Lynn Rosellini

ماوەی ئەم ۳۰ساڵە دا واتا لەو کاتەوە کە سەرۆك ترۆمەن[٤] ئەو پەیاننامەیەی واژۆ کرد ، هەموو سەرۆکێك داوای لە ئەنجوومەنی پیران کردووە کنوانسیۆنی ژینۆسایدی پەسەند بکات . ئایزنهاور[٥]، کینیدی[٦] ، جانسۆن[٧] ، نیکسۆن[٨] ، فۆرد[٩] و ئەم دواییانە سەرۆك کارتێر[١٠] پشتیوانییان لەو پەیاننامەیە کردووە . داوا لە ئەنجوومەنی پیران دەکەم بە زووترین کات کونوانسیۆنی ژینۆساید پەسەند بکات .

---

[٤] President Truman
[٥] Eisenhower
[٦] Kennedy
[٧] Johnson
[٨] Nixon
[٩] Ford
[١٠] President Carter

## کۆچی دوایی ژنەراڵ مستەفا بارزانی

### ٧ی ئاداری ١٩٧٩ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " پرۆکزمایر[١] ":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت ئاماژە بە کۆچی دوایی ژنەراڵ مستەفا بارزانی بکەم کە بە ماوەی ٤٠ساڵ خەباتی کرد بۆ ئازادی گەلەکەی. سێ ساڵ پێش جارێکیان ژنەراڵ بارزانی داوای کردبوو لە نووسینگەکەمدا من ببینێت . بارزانی لە ڕێگای وەرگێڕێکەوە باسی ئەوەی کرد کە هاتووە سپاسی من بکات بە بۆنەی لێدوانەکانم سەبارەت بە کردوەوە سەرکوتکارانەکانی ڕژێمی عێراق و ئێران دژی کوردەکان و ژنان. بارزانی بە نەرمی و ڕاشکاوانە قسەی دەکرد و دەیگوت یەکێ لە گەورەترین بێ هیوابییەکانی ژیانی ئەو کاتە بووە کە سیاسەتی ئەمریکا لە لایەن "کیسینجێر"، وەزیری کاروباری دەرەوە گۆڕاوە و بووەتە هۆی سەرکوتی خوێناوی ڕاپەڕینەکەی دژی دەوڵەتی عێراق . بارزانی داوای یارمەتی بۆ ئاوارە کوردەکان کرد و پاشان ڕۆیشت.

داستانی دەوری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕاپەڕینی کورد ، داستانێکی ناخۆشە و یەکێ لە خراپترین نموونە ژئۆپلۆتیکییەکان و کایە سیاسییەکانی نێوان حکوومەتەکان و نەتەوەکانە . کاتێ کە بە ئازانجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو ، ئێمە یارمەتیمان بە ڕاپەڕینی کورد دا و کاتێ کە وەزیری دەرەوە ، کیسنجێر هەستی بەوە کرد دەبێ هاوپەیمانییەك لەگەڵ شای ئێران مۆر بکات کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتر نیگەرانی سنوورەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەکەی دەبوو ، وڵاتە یەکگرتووەکان لە ناکاو یارمەتییەکانی پچڕاند . خەڵکی کورد دەوری "سەرباز"یان لەم کایەی شەترەنجەدا گێڕا .

---

Mr. PROXMIRE. [١]

كاتىَ كه وەزيرى دەرەوە ، كيسينجيَر دەڵيَت "ناهيَڵيَت نيگەرانى مافى مرۆڤ بە سەر سياسەتى ولاتە يەكگرتووەكانى ئەمريكادا زاڵ بيَت" ، رەنگە بير لە خەڵكى كورد بكاتەوە كە چارەكە سەدەيەك خەباتيان كردووە بۆ سەربەخۆييەك كە سەرەتا ئەنجاميَكى باشى بۆ ويَنا دەكرا ، بەلاَم لە ئاكامى ريَكەوتنيَكى ديپلۆماتيكى خيَرا لەپشت پەردەوە خنكيَندرا.

بەريَز سەرۆكى ئەنجوومەن داوا دەكەم وتارەكانى" رۆژنامەى واشنگتۆن پۆست"(٣ى ئادارى ١٩٧٩) و " نيۆيۆرك تايمز" (١ى ئادارى ١٩٧٠) سەبارەت بە ژنەراڵ بارزانى بخريَتە بەر دەستى هاوكارانم.

## کوردەکان: بە دوور لە کوورەی تواندنەوە

## ١٤ی ئەیلوولی ١٩٧٩ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " رابێرت هـ مایکل[١]، "نوێنەری ئەیالەتی " ئیلینۆیز " لە ئەنجوومەنی نوێنەران:
بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن یەکێ لە گەورەترین ئەفسانەکان کە لـە ٥٠ ساڵی دووەمـی سـەدەی ٢٠دا تاوتوێ نەکراوە ، بیرۆکەی کوورەی تواندنەوەیە لـە کاروبـاری نـاوخۆیی و نێونەتەوەییـدا . شارەزایان دەڵـێن ئـاڵوگۆڕی خێـرای زانیـاری و راگەیاندنـە ئیلکترۆنیکییـەکان جیـاوازی نێـوان نەتەوەکان و گرووپە ئەتنیکییەکان لەناو دەبات ، دەڵێن هەمووکـەس دەیـەوێت شـێواز و بـیروڕا کۆنەکان لاببات و خۆی فڕێداتە نێو شەپۆلی نوێی پێشکەوتن ، بەو شێوازە کە ڕۆشنبیر و شـارەزا رۆژئاواییەکان پێناسەیان کردووە . باشە ، بەڵام ئەم شێوازە بەتەواوی نەگۆڕاوە . لە بـاتی ئـەوەی دنیا ببێتە کوورەیەکی گەورەی تواندنەوە ، ئێمە شەڕی عەشیرەتی خوێنـاوی لـە ئافریقـا و بـەرز بوونەوەی گرۆتینـی ناسیۆنالیـستی لـە نێـوان ئیـسکاتلەند و ویڵـز دەبیـنین. "ڤێتامییـەکان" ، "کامبۆجیاییەکان" و" صینییەکان" کەوتوونەتـە ململانـێ لـە گـەڵ یەکـدی و ئـەم ململانێیـە ئەوەندە کە هەوێنی سیاسی هەیە ، ئەوەندەش هەوێنی ئەتنیکی هەیە.
کوردیش کە گەلێکی کۆنە و سەربەرزە ، نایەوێت بکەوێتە نێو ئەم کـوورەی تواندنەوەیـە . کـورد شایانی ئەوەیە سەرنجی پێبدەین . من ئێـستا دەمـەوێت بـچمە نـاو وتارێـك بـە نـاوی کـورد و PLO(رێکخراوی ئازادی فەلەستین) کـە لـە رۆژنامـەی "پیوریـا ژۆرنـاڵ سـتار[٢] " لـە ٧ی ئەیلوولی ١٩٧٩ بڵاو بووەتەوە.

---

ROBERT H. MICHEL [١]
[٢] Peoria Journal Star

## کوردەکان: مندالّە هەتیوەکانی جیهان

## ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٩- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " داسشێلّ [١] ":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران ، لە سایەی قەیرانی هەنووکەی ئێران کە دیپلۆماتەکانی ئەمریکا بە بارمەتە گیراون ، بە بیروبۆچوونی من ئەوە گرینگە کە بزانین هەموو خەلّکی ئێران لە گەلّ بیروبۆچوونە ژەهراوییە دژە ئەمریکاییەکانی ئایەتوولاّ خومەینیدا نین ، بە تایبەت کەمینەی کورد لە باکووری رۆژئاوای ئێران . لە راستیدا هەر ئێستا کوردەکان شەڕی مان و نەمان دەکەن لە گەلّ خومەینی و گرووپە خوێنمژە توونـدئاژۆکانی . کوردەکـان لـە سـالاّنی رابـردوودا لایـەنگری ئەمریکا بوون و هەرچەند سۆز و هەسـتیان بـە هـۆی کۆتـایی پێهـاتنی یارمـەتی ئـەمریکا بـە خەباتەکەیان بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چەند سالّی رابردوودا کەم بۆتـەوە ، بـەلاّم هێـشتا کـورد وەك هێزێکـی گـرینگ لـە ئێرانـدا ماوەتـەوە . ئێـستا کـاتی ئـەوە هـاتووە هەلّـە و رەفتـارە نادادپەروەرانەکانی رابردوومان سەرڕاست بکەینەوە و لاپەڕەیەکی نوێ لـە گـەلّ کـورد لـە ئێـران بکەینەوە .

کورد کە گەلێکی زۆر چارەرەشە پتر لە یەك سەدەیە بۆ کوردستانێکی خـاوەن ئۆتۆنـۆمی خـەبات دەکات و بە درێژایی چەند سەدە تووشی داگیرکاری و سەرکووت بۆتەوە : سەرەتا لە سەر دەسـتی یۆنانییەکان ، پاشان لە سەر دەستی مەغۆلەکان و تورکەکان و بەریتانییەکان .

باشترین راپۆرت سەبارەت بە مێژووی تاریکی ئەم دواییانەی کورد ، وتارێکە کـە ١٦ی ئـەیلوول لـە رۆژنامـەی "واشـنگتۆن سـتار" لـە لایـەن "ئیـسمیت هێمپـستۆن [٢] " بـلاّو بۆتـەوە کـە رۆژنامەنووسێکی دانیشتووی واشنگتۆنە کە هاوینی ١٩٧٤ لەگەلّ پێشمەرگەکانی مەلا مـستەفا

---

[١] Mr. DASCHLE

[٢] Smith Hempstone

بارزانی له عێراقدا بووه . هاوکات بارزانی بەهاری رابردوو لـه واشـنگتۆن کۆچـی دوایـی کـرد . بەداخەوه رێبەرایەتی بارزانی و هەڵوێسته لایەنگرانەکانی به نیسبەت رۆژئاوا له کیسمان چوو.

## ڕەوشی خراپی کورد ژینۆسایدمان وەبیر دێنێتەوە

## ٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٢ = ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "پرۆکزمایێر":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٢ ڕۆژنامەی "نیۆیۆرك تایمز" نامەیەکی بڵاو کردەوە کە بۆ سەر نووسەری ڕۆژنامەکە نێردرا بوو و باسی ڕەوشی خراپی کوردی دەکرد. ئەم نامەیە لە وەڵامی ئەو شرۆڤەیە نووسراوە کە" وینسێنت کانبی[١] " لە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٢ سەبارەت بە فیلمی "یوول" بڵاوی کردبووەوە . فیلمی سینەمایی "یوول" بەسەرهاتی جوانێکی کوردی دەگێڕایەوە کە ئیزنی پێدرابوو بۆ چەند ڕۆژێك لە بەندیخانەوە بگەڕێتەوە ماڵ و بینیبووی گوندەکەیان بە دەستی هێزە تورکە دژەکوردەکان خاپوور کراوە . نووسەری نامەکە "ویرا بیۆدین سەیدپوور[٢]" ستایشی دەرهێنەری فیلمەکە ، "یلماز گونای" کردبوو هەم بە بۆنەی ئەوەی کە بارودۆخی کولتووری کوردی لە گەڵ ڕۆژئاوا بەراورد کردبوو و هەم بە بۆنەی ئەوەی ئامرازەکانی سەرکوتی لە تورکیای ئەمڕۆدا نیشاندابوو . لە نامەکەیدا نووسەر هەروەها هەوڵەکانی دەوڵەتی تورکیای نیشان دابوو بۆ لە ناوبردنی ناسنامەی کورد و دەیگوت تورکەکان ٨ تا ١٠ میلیۆن کورد لە وڵاتەکەیان بە فەرمی ناناسن . نووسەر هەروەها ئاماژەی بە ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی کردبوو کە بە گوێرەی ئەوە کۆمەڵناسی تورك، ئیسماعیل بیشکچی بە ماوەی ١٠ ساڵ خراوەتە بەندیخانە بە تاوانی ئەوەی وتوویەتی کورد گرووپێکی ئەتنیکی جیاوازە . هەروەها نووسەر ئاماژەی بەوە کردبوو کە تورکیا تەنها وڵاتێك نییە کە کورد سەرکووت دەکات. ڕاستە تورکیا شوێنێکی ترسناکە بۆ کورد بەڵام ئێران و سووریا

[١] Vincent Canby
Vera Beaudin Saeedpour [٢]

و عێراقیش بە هەمان ئەندازە ترسناكن و تەنانەت لە دەرەوەش گەلیّ لە كوردەكان بێدەنگن ، بە هۆی ئەوەی لە تۆڵەسەندنەوەی ئەم دەوڵەتانە لە بنەماڵەكانیان لە ناوخۆی وڵات دەترسن .
بەڕێز سەرۆكی ئەنجوومەن ئەم نامەیە ئەوەمان وەبیر دەهێنێتەوە كە ئازار و ئەزیەتی ترسناكی ئەتنیكی لە سەرانسەری جیهاندا روودەدات . بەداخەوە ئەوەشمان وەبیر دەهێنێتەوە كە بواری ژینۆساید هێشتا لە جیهانی ئەمڕۆدا هەیە و هەرچەند كە ئەمریكاییەكان لەم سەركووتانە بێزارن بەڵام گەلەكەمان هەرچی لە دەست هاتووە نەیكردووە بۆ كۆتایی پێهێنانی ئەم كردەوە دزێوە .
بەڕێز جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن، لە ساڵی ١٩٦٧وە من بەردەوام داوام لە ئەنجوومەنی پیران كردووە كۆنوانسیۆنی سزادان و پێشگیری لە ژینۆساید پەسەند بكات . لە كاتێكدا كە ئەم گەلاڵەیە لە ئەنجوومەنی پیران دا ماوەتەوە ، زیاتر لە ٨٠ وڵات ئەم كۆنوانسیۆنەیان پەسەند كردووە . بە كەمتەرخەمی لە پەسەندكردنی ئەم كۆنوانسیۆنە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ناتوانیّ هەڵبسێت بە جێبەجیّ كردنی ئەركی نێونەتەوەیی خۆی وەك ڕێبەرێك لە بواری مافی مرۆڤدا . لە روانگەی مافی مرۆڤەوە ، گرینگی ئازاردانی گرووپە رەگەزی ، ئایینی و ئەتنیكییەكان لە مافی ژیان كەمتر نییە.
لە كاتێكدا وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا خۆی لە پەسەندكردنی ئەم پەیماننامەیە دەبوێریّ ، هەزاران كەس لە گەڵ هەڕەشەی لە ناو چوون رووبەڕوون . ئێمە ناتوانین لەمە زیاتر چاوەڕوان بین . داوا لە ئەنجوومەنی پیران دەكەم هەر ئێستا دەست بە كار بێت .

## بارودۆخی کورد و پەیماننامەی ژینۆساید
## ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ - ئەنجوومەنی پیران[1]

بەڕێز " پرۆکزمایێر" :

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، راپۆرتی ئەم دواییانەی میدیاکان سەبارەت بە گیرۆدە بوونی کورد لە شەڕی ئێران و عێراق ، جارێکی دیکە رەوشی دژواری خەڵکی کوردی هێنایەوە بیرمان کە ماوەی چەند دەیە بە دەستی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان سەرکوت کراوە . ئەم باروودۆخە، پێویستی یەکجار زۆری پەیماننامەی ژینۆساید ئاشکرا دەکات.

نزیکەی ١٠ میلیۆن کورد لە ناوچە شاخاوییەکانی سەر سنووری عێراق ، ئێران و تورکیا دەژین . هەرچەند کە کوردستان لە نێوان سنووری ئەم دەوڵەتانەدا دابەش کراوە بەڵام دانیشتووەکانی نەتەوەیەکی جیاواز پێك دەهێنن ، بە زمانیکی جیاوازی هیند و ئۆرووپایی قسەدەکەن ، دابونەریتێکی جیاوازیان هەیە و لە رووی ئەتنیکییەوە لە خەڵکی دەوروبەری خۆیان جیاوازن .

کورد ئامانجی سەرکوتە سیستماتیکەکان ــ بە تایبەت لە عێراقدا ـ بووە ( و ئێستاش هەر هەیە) بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکەیان بنبڕ بکەن ، بڵاوەی پێبکەن و بیخنکێنن . گوندە کوردنشینەکان کاول کراون ، بنەماڵە کوردەکان لە یەك جیاکراونەتەوە ، کوردە وڵاتپارێزەکان و پێشمەرگەکان بەندکراون یا ئیعدام کراون . ئاوارە کوردەکان بە زۆر نیشتەجێ کراون و لە رەوشی ژیانی مان و نەماندان . روونە ئەم کردەوانە بۆ لە ناوبردنی کورد وەك گرووپێکی کولتووری دارێژراوە . روون نییە کە بە گوێرەی پێناسەی وردی پەیماننامەی ژینۆساید، خەڵکی کورد قوربانی ژینۆسایدن یا نا بەڵام بە هەرحاڵ روون و ئاشکرایە کە گەلێ لە کوردەکان بوونەتە قوربانی پێشێل کردنی تەواوی مافی مرۆڤ و ئەم پێشێلکارییانە سیاسەتی دەوڵەتەییە کە بە شێوازی سیستماتیك بەڕێوە دەچێت . ئەم کردەوانە بێ گومان لە ئاستی ژینۆساید دان .

---

[1] Senate

هیوادارم هاوکارانم له ئەنجوومەنی پیران له بیریان نەچێت که کردەوەی ژینۆساید هێشتا ئەمڕۆ روو دەدات . پێویستبوونی گارانتێك بۆ قەدەغه کردنی ژینۆساید ئێستاش له ئارادایه . پەسەند کردنی پەیماننامەی نێونەتەوەیی ژینۆساید ئەم پەیامه به هێزتر دەکات که کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئیدی تەحەموولی تاوانی دژی مرۆڤایەتی نییه . داوا له هاوکارانی سناتۆرم دەکەم بێ دواخستن، پشتیوانی خۆیان له پەسەند کردنی ئەم یاسایه دەربڕن .

## زیادەڕۆیی له بەکارهێنانی گازی کیمیایی له عێراق

## ٢٤ی ئاداری ١٩٨٨- کۆنگرێس

بەڕێز "لانتۆس[1]" :

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس، ماوەیەکی زۆر به سەر مۆتەکەی "جانستۆن[2]" ــ که تێیدا ٩١٣ پیاو ، ژن و منداڵ به هۆی گازەوە کوژران- تێنەپەڕیوە که بیروڕای گشتی ئەمریکا کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو وێنه ترسناکانەی که له عێراقەوە دێن و نیشان دەدات گازی "سیانید" ، گازی "موستارد" و گازی دەمار له لایەن دەوڵەتی عێراق دەژی خەڵکی خۆی بەکار هاتووە . له بەر ئەوەی که ناهێڵێن میدیاکان دەستیان به شوێنی ڕووداوەکه بگات ، ئێمه نازانین ئایا ژمارەی ئەو منداڵ ، ژن و پیرانه که له ئاکامی بەکارهێنانی زاڵمانەی گازی ژەهراوی له سەر دەستی کاربەدەستانی عێراق کوژراون ، ٣ هەزار کەسه یان ٥ هەزار کەس . هێزی دەریایی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئێستا عێراق و هاوپەیمانانی له کەنداوی فارس دەپارێزیت . حکوومەتی ئەمریکا دەبێت گوشار بخاته سەر ڕژێمی بەغداد و پێی نیشان بدات کیمیابارانکردنی خەڵکی مەدەنی له چاوی نەتەوە شارستانییەکانەوە قابلی قەبووڵ نییه . نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ به زووترین کات لیژنەیەك بنێرێت بۆ ناوچه تا لەم کۆمەڵکوژییه هۆڤانەیه بکۆڵێتەوە .

[1] Mr. LANTOS
[2] Jonestown

## پاسای شەرمەزار كردنی بە كارهێنانی چەكی كیمیایی لە لایەن دەوڵەتی ئێران و عێراق

۲۹ی ئاداری ۱۹۸۸- كۆنگرێس

بەڕێز "ئەتكینز[۱]" :

بەڕێز سەرۆكی كۆنگرێس، من دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم بە نیسبەت بە كارهێنانی چەكی كیمیایی لە لایەن ئێران و عێراق كە دژی یەكدی شەڕدەكەن . هەفتەی رابردوو ، بە سەدان خەڵكی بێ گوناح لە كوردستانی عێراق بە چەكی كیمیایی كوژراون . هەمووما‌ن راپۆرت و هەواڵەكانی ئەم رووداوەمان بینیوە . بنەماڵەكان لە سەر مێزی نان خواردندا مردوون ، دایك و باوكەكان منداڵەكانیان بە توندی لە ئامێز گرتووە تا لە گازی ژەهراوی بیانپارێزن ، وەكوو ئەوە وایە ئەسب سواری چوارەمی كتێبی "موكاشفاتی یوحنا " لە هەموو شاردا غاری دابێ و كۆمەڵێك مردووی بە شوێنی خۆیدا بە جێ هێشتبێ .

چەكی كیمیای ترسناكە و لە لایەن هەموو نەتەوەكانی جیهان شەرمەزار كراوە . پرۆتۆكۆلی ۱۹۲۵ی ژنێڤ بەكارهێنانی چەكی كیمیایی قەدەغە كرد و هیوادار بوو ئیدی قەد بەكار نەبردرێت بەڵام هەم ئێران و هەم عێراق لە شەڕی كەنداودا لەم چەكە ترسناكانە كەڵكیان وەرگرتووە . كەڵك وەرگرتن لە چەكی كیمیایی وەك ئامرازی شەڕ خۆی لە خۆیدا كارێكی دڕەندانەیە بەڵام وادیارە دەوڵەتی عێراق ئەم چەكەی دژی خەڵكە سڤیلەكەی خۆیشی بەكار هێناوە . ئەمە یەكەم جار نییە كە چەكی كیمیایی لە ناوچەی كوردستان بە كار دبردرێت . كوشتنی خەڵكی بێ گوناح هیچ پاساوێكی نییە و ئەو كۆمەڵكوژییە كە هەفتەی رابردوو رووی دا ، جێی داكۆكی نییە .

---

[۱] Mr. ATKINS

لەم هەفتەیە دا من گەلاڵەیەك تەسلیمی ئەنجوومەن دەکەم بۆ شەرمەزار کردنی بە کارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێران و عێراق .
داوا لە هاوکارانم دەکەم لەم هەوڵەدا دەنگی خۆیان بخەنە پاڵ دەنگی من بۆ ئەوەی- لانیکەم خەڵکی بێ گوناح- لە شەڕی کەنداو لەمە زیاتر نەبن بە قوربانی.
ئێمە نابێت لەمە زیاتر بێ دەنگ بین .

## ئیدانه کردنی دەستدرێژی عێراق بۆ سەر هەرێمی هەوایی تورکیا
## ٣٠ی ئاداری ١٩٨٨- کۆنگرێس

بەڕێز "پۆرتێر" [١]:

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس ، هەفتەی رابردوو عێراق بە هێرشی کیمیایی بۆ سەر خەڵکەکەی خۆی لە شارۆچکەی سنووری هەڵەبجە نەوەستاوە و هەرێمی هەوایی تورکیای بەزاندووە بۆ ئەوەی کەمپی پێشمەرگەکان بۆردمان بکات کە تەنها یەك کیلۆمەتر لە ناو خاکی تورکیادا بوون .

لە کاتێکدا کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لە شەڕی کەنداوی فارس بێ لایەن بمێنێتەوە بەلاّم هیچ گومان لەوەدا نییە کە نابێت لە بەرامبەر هێرش بۆ سەر تورکیا بێ دەنگ بێت .

بە گوێرەی مەنشووری ناتۆ ، هێرش بۆ سەر هەر هاوپەیمانێکی ناتۆ لە حوکمی هێرش کردنە بۆ سەر تەواوی ئەندامانی ناتۆ . دەبێت لە پێشەوە هۆشداری بدرێت بە دەوڵەتی عێراق کە هەرچەند کە هێرشی کیمیایی دەکاتە سەر خەڵکەکەی خۆی و بە رواڵەت کەس هیچ ناڵێت ، بەلاّم هێرش کردنە سەر هاوپەیمانێکی وەفادار وەك تورکیا خراپترین ئاکام و لێکەوتەی بەدواوە دەبێت . با قارەمانانی هێزی هەوایی عێراق کە هێرشیان کردوەتە سەر USS.STARK و هەڵەبجە بزانن کە بەم کارەی خۆیان دوژمنێکیان بۆ خۆیان درووست کردووە کە لە ئێران گەورەترە.

---

[١] Mr. PORTER

## ئیدانه کردنی کەڵك وەرگرتن له چەکی کیمیایی له لایەن عێراق
## ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٨٨ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "مایکێل [1]":
بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن ، خۆشحاڵم ئەمڕۆ هاوکارانم پشتیوانی خۆیان له پەسەند کردنی بڕیارنامەی ٤٠٨ دەردەبڕن . ئەم بڕیارنامەیە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی له لایەن عێراق شەرمەزار دەکات و داوا له سەرۆك دەکات درێژە بە هەوڵەکانی ئەمریکا بدات بۆ ئەوەی بەرهەمهێنان و بە کارهێنانی چەك له ئاستی نێونەتەوەییدا قەدەغە بکرێت .
جێگای داخە پەسەند کردنی بڕیارنامەیەك لەم جۆرە پێویست بێت ، بەڵام ئێمە ناتوانین پەرەسەندنی ترسناکی کەڵك وەرگرتن لەم چەکانە له شەڕی ئێران و عێراق پشتگوێ بخەین . ئێمە دەبێ له ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکادا بە فەرمی کەڵك وەرگرتن لەم چەکە ئیدانە بکەین و پشتیوانی خۆمان له هەوڵە بەردەوامەکان دەربڕین بۆ دووبارە کردنەوەی قەدەغەی ئەخلاقی و یاسایی کەڵك وەرگرتن له چەکی کیمیایی . چەند مانگ پێش کۆمەڵگای نێونەتەوەیی شۆکە بوو بە هۆی دیتنی ئەو بەڵگە روونانەی کە نیشانی دەدا عێراق دژی خەڵکی خۆی چەکی کۆمەڵکوژی بەکار هێناوە .
له ١٦ی ئادار عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر شاری هەڵەبجە کە ئێران داگیری کردبوو و پتر له ٢ هەزار کوردی سیڤیلی کوشت.
وێنەی سەیر و سەمەرەی خەڵکی سیڤیل کە له کاتی ئەنجامدانی کاری رۆژانەیاندا مردبوون و وشك ببوون ، هەموومانی هەژاند . بەڵام پێش ئەم رووداوە ، گەلێ نیشانە له دەستدا بوو کە توانایی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی له رۆژهەڵاتی نێوەڕاست رووی له پەرەسەندنە . ئێمە

---

[1] Mr. MITCHELL

ده‌زانین له سه‌ره‌تای ساڵی ۱۹۸۲ عێراق ده‌ستی کرد به تاقیکردنه‌وه‌ی چه‌کی کیمیایی و به هه‌ڵه به چه‌کی کیمیایی هێرشی کرده سه‌ر سوپای خۆی.

ئه‌م بڕیارنامه‌یه ستایشی "سه‌رۆك ره‌یگان[۲]" ده‌کات به هۆی ئه‌وه که کتوو پڕ ئه‌م کرده‌وه‌یه‌ی عێراقی وه‌ك پێشێلکردنی گه‌وره و تایبه‌تی یاسایی نێونه‌ته‌وه‌یی شه‌رمه‌زار کرد. پشکنه‌رانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان پێشتر رایانگه‌یاندووه که عێراق له ساڵی ۱۹۸٤ ، ۱۹۸٦ و سه‌ره‌تای ۱۹۸۷ دژی ئێران چه‌کی کیمیایی به‌کار هێناوه . هه‌ر هێرشێك له‌م په‌یوه‌ندییه‌دا پێشێل کردنی زه‌قی پرۆتۆکۆلی ۱۹۲۵ی ژنێڤه که عێراق واژۆی کردووه . وادیاره ئێرانیش چه‌ند ساڵ پاش ده‌ستپێکردنی تاقیکردنه‌وه‌کانی عێراق ، له ئاستێکی به‌رته‌سکتردا ده‌ستی کردووه به به‌رهه‌مهێنانی چه‌کی کیمیایی . به پێی راپۆرته‌کان ، ئێران له تۆڵه‌ی هێرشه کیمیاییه‌کانی عێراق ، چه‌کی کیمیایی به‌کار هێناوه ، له وانه له هه‌ڵه‌بجه.

هه‌تا کاتێك که هه‌ر دوولا هه‌روا چه‌کی کیمیایی به‌کار بهێنن ، مه‌ترسییه‌کانی چه‌کی کیمیایی له شه‌ڕی ۸ ساڵه‌ی که‌نداوی فارس زۆرتر ده‌بێت . ئێستا ئێران و عێراق له هێرشکردنه سه‌ر شاره‌کان ، له مووشه‌کی ئاسایی که‌ڵك وه‌رده‌گرن و ئه‌گه‌ر بتوانن ئه‌م مووشه‌کانه به کڵاوه‌ی کیمیایی ته‌یار بکه‌ن ، ره‌نگه خه‌ڵکی سڤیل له ناو شاره‌کاندا بکوژن و بریندار بکه‌ن .

په‌سه‌ند کردنی بڕیارنامه‌ی ٤۰۸ له ئه‌نجوومه‌نی پیران ، هه‌ڵگری په‌یامێکی به هێزه بۆ لایه‌نه‌کانی شه‌ڕی که‌نداو . بڕیارنامه‌که وه‌ك نموونه هێرشه کیمیاییه‌کانی عێراقی شه‌رمه‌زار کردووه و نیگه‌رانی خۆی ده‌ربڕیوه له به‌کارهێنانی به‌رده‌وامی چه‌کی کیمیایی له لایه‌ن ئێرانه‌وه . ده‌بێ ئه‌نجوومه‌نی پیران به توندی که‌ڵك وه‌رگرتن له چه‌کی کیمیایی له لایه‌ن هه‌ر وڵاتێکه‌وه بێ جیاوازی شه‌رمه‌زار بکات . هێرشه کیمیاییه‌کانی ئه‌م دواییانه‌ی عێراق سه‌مبولی سه‌رنه‌که‌وتنی کۆمه‌ڵگای نێونه‌ته‌وه‌ییه بۆ ئه‌وه‌ی که به شێوازی کارا رێگه له راگواستنه‌وه‌ی مادده‌ی کیمیایی و به‌کارهێنانی چه‌کی کیمیایی بگرێت که له لایه‌ن پرۆتۆکۆلی ۱۹۲۵ی ژنێفه‌وه قه‌ده‌غه کراوه .

---

[۲] President Reagan

له كاتێكدا كه نهتهوه یهكگرتووهكان بهردهوام بهكارهێنانی چهكی كیمیایی لـه لایـهن عێراقـهوه شهرمهزار كردووه ، بهڵام قهد هـیچ چهشـنه گهمارۆیـهكی نهخـستۆته سـهر ئـهو وڵاتانـهی كـه پرۆتۆكۆلی ژنێف پێشێل دهكهن .

## تاوتوێ کردنی گەلاڵەکان و بڕیارنامە هاوبەشەکان بۆ پێشگیری لە ژینۆساید

## ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " پێلْ "[١]:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، لە سەر سنووری تورکیا و عێراق ، هێما و نیشانەکانی تاوانێکی زۆر گەورە دەردەکەوێت . بۆ جاری دووەم لەم سەدەیە دیکتاتۆرێکی دڕندە گازی کوشندە بە کار دێنێت بۆ قەلاچۆ کردنی کەمینەیەکی ئەتنیکی جیاواز. ئەم جارە قوربانییەکە کەمینەی کوردی عێراقە و بکەری تاوان سوپای عێراقە .

کورد گرووپێکی ئەتنیکی جیاوازە کە ٢٠میلیۆنە و خاوەن مێژوویێکی کۆن و کولتوورێکی دەوڵەمەندە. هەر چەند کە گەلێ لە کوردەکان ئامانجیان کوردستانێکی سەربەخۆیە بەلام کورد تووشی چارەڕەشییەکی گەورە بووە و لە نێوان عێراق ، ئێران ، تورکیا ، سووریا و یەکێتی سۆڤیەتدا پارچە پارچە بووە.

هەرچەند کە هەڵسووکەوتی عێراق لە گەڵ کەمینەی کورد لە رابردوودا تۆزێك لە هەڵسوکەوتی دراوسێکانی باشتر بووە ، بەلام رەوشی کوردەکانی عێراق لەم چەند ساڵەی دواییدا بووە بە نەهامەتی و کارەسات . بە دەستپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق، خەباتکارانی کورد لە هەر دوو وڵات هەلیان بۆ رەخسا ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتر (نە سەربەخۆیی) بەدەست بهێنن . لە عێراق راپەڕینی کورد پێشکەوتنی زۆرتری بە خۆە بینی و کۆنترۆڵی زۆربەی ناوچە شاخاوییەکانی باکووری رۆژهەلاتی عێراق کەوتە دەست. بە هەرحاڵ بە گۆڕینی ئاراستەی شەڕ بە قازانجی عێراق لە سەرەتای ئەمساڵ ، سوپای عێراق هێرشێکی گەورەی دژی کورد ئەنجام دا. لەگەڵ ئەم هێرشەدا ، گوندە کوردنشینەکان لە سەرانسەری ناوچەکە بە دینامیت تەقێندرانەوە و گازی ژەهراوی دژی خەڵك بە کار برا. لە مانگی ئادار لە شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە ، ٥هەزار سڤیلی کورد

---

[١] Mr. PELL

تووشی گازی كیمیایی بوون .لە دوای ئاگربەستی ٢٠ی ئاب لە نێوان ئێران و عێراق ، سوپای عێراق چەك و تەقەمەنی و پاشكەوتی گازە كیمیاییەكانی بە تەواوەتی دژی كوردەكان بەكار هێنا. راپۆرتەكانی ئاوارەكان بەڵگەیەكی حاشا هەڵنەگرە سەبارەت بە بەكارهێنانی بەرفراوانی گازی كیمیایی . بە هۆی ئەوەی كە ناوچە بە رووی هەموو بیانییەكان داخراوە ، ئێمە تەنها دەتوانین پشت بە ژمارەی كوژراو وبریندارەكان ببەستین ، بەڵام روونە كە ژمارەیان دەیان هەزار كەسە.

هێرش بۆ سەر كورد هەروا كە باسمان كرد ، درێژەی هەیە. هیچ گومان لەوە دا نییە كە رژێمی سەدام حوسێن بە نیازە ئەم هێرشە بكات بە دوایین رێگاچارەی كێشەی كورد. لە كاتێكدا كە خەڵك تووشی گازی كیمیایی دەبن ، جیهان بێ دەنگە . ئەم بێ دەنگییە چەند هۆكاری هەیە : سەرچاوەی زۆری نەوتی عێراق ، هێزی سەربازی، و هیوای تێكنەچوونی وتووێژە هەستیارەكان كە بە ئامانجی كۆتایی پێهێنانی شەڕی ئێران وعێراق ئەنجام دەدرێت .

بە هەرحاڵ ئەم بێدەنگییە لە جێی خۆی دا نییە . نیو سەدە لەمەو پێش دنیا لە بەرامبەر هیتلێر دا بێ دەنگ بوو ، ئەوە بوو هیتلێر نزیك بوو هەموو جوولەكەكانی ئۆرووپا لە ناو بەرێت . ئێمە ناتوانین لە بەرامبەر ژینۆسایدێكی دیكەدا بێ دەنگ بین .

من ئەمڕۆ گەڵاڵە یاسایەكەم تەسلیمی ئەنجوومەن كردووە كە هەموو یارمەتییە ئابوورییەكان بە عێراق دەپچڕێنێت و پێویستی بەوە هەیە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دژی ئەو قەرزانە دەنگ بدات كە دامەزراوە ئابوورییە نێونەتەوەییەكان دەیدەن بە عێراق و ناردنە دەرەوەی نەوتی عێراق قەدەغە دەكات . ئەم كردەوانە بەردەوام دەبێت هەتا كاتێك كە عێراق بە كەڵك وەرگرتن لە گازی كیمیایی پرۆتۆكۆلی ١٩٢٥ی ژنێف پێشێل بكات و هێرش بۆ ژینۆسایدی خەڵكی كورد درێژەی هەبێ .

دەگوترێت ئێمە كاریگەرییەكی ئەوتۆمان لە سەر عێراق نییە ، لەوانەیە ئەمە راست بێت بەڵام بە بیروبۆچوونی من ، ئێمە دەبێت لە هەموو كەرەستەیەكی بەردەستمان كەڵك وەربگرین تا

سەرنجی ئەوان رابکێشین . رێژیمی عێراق رژێمێکی دیکتاتۆری دڕندەیە کە بە تێپەڕبوونی ساڵەها شەڕ وناکۆکی پتەو بووە . دەستگواشتن ، بە تەنهایی سیاسەتی ئەم رژێمە ناگۆڕێ و پێویستە بە زۆترین کات دەست بەکاربین.

## کەڵك وەرگرتنی زیادەڕۆیانەی عێراق له گازی کیمیایی

## ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨- کۆنگرێس

بەڕێز "پیێس"[1] :

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس ، دەمەوێت ناڕازیبوونی خۆم دەربـبڕەم بـه نیـسبەت کـەڵك وەرگرتنـی عێراق له گازی ژەهراوی دژی کەمینەی کوردی وڵاتی خۆی . راپۆرتەکان نیشان دەدەن کە عێـراق گازی ژەهراوی دژی ئێرانیش بەکار هێناوه . گازی ژەهراوی ٦٠ ساڵ پێش لـه لایـەن کۆمـەڵگای نێونەتەوەییەوه قەدەخه کرا له بەر ئەوەی که گازی ژەهراوی له جیهانی شارستانیدا قـابلی قبـوڵ نییه ، هەر بۆیه خەڵکی شارستانی دەبێ له هـەموو شـوێنێك ، عێـراق شـەرمەزار بکـەن : لـه کۆنگرێس، له ئەنجوومەنی پـیران ، لـه کۆشـکی سـپی ، لـه نەتـەوه یـەکگرتووەکان و لـه هـەر شوێنێکی دیکه که دەکرێ. پەیامی ئێمه دەبێ روون ، راشکاوانه و شیلگیرانه بێ .

به کارهێنانی چەکی کیمیایی له شەڕدا قابلی قەبووڵ نییه .

---

[1] Mr. PEASE

## کیمیاباران کردنی کورد

### ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "پۆرتێر"[١] :

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، عێراق بە کەڵك وەرگرتن لە گازی ژەهراوی "موستارد" بۆ سەرکوتی کەمینەی کوردی خۆی ، هەروا کە دەچێ زۆرتر مافی مرۆڤ پێشێل دەکات . وەزیری دەرەوە، شۆڵتز، عێراقی باش تێگەیاندووە کە درێژەدان بە کەڵك وەرگرتن لەم چەکانە و پێشێل کردنەکانی دیکەی مافی مرۆڤ خەسار لە پەیوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق دەدات.

دوایین هێرشی کیمیایی بێبەزەییانەی عێراق نیشانەی کێشەیەکی زۆر گەورەترە. ئەمڕۆ لانیکەم ١٥ دەوڵەت لەوانە لیبیا، عێراق ، سوریا و کۆریای باکوور چەکی کیمیایی بەرهەم دەهێنن. وادیارە گەلێ لە دەوڵەتان خەسارەکانی گازی موستاردی فۆسنگینز و (کلۆرین)[٢] یان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە بیر کردووە . پێویستە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەنگاو بنێت بۆ راوەستاندنی بڵاو بوونەوەی ئەم چەکانە .

من و "ئێك سکێلتۆن[٣] " داوا لە کۆبوونەوەی ٢٨٨٠ی کۆنگرێس دەکەین سیستمێکی نوێ بۆ ڕێگرتن لە پەرەسەندنی چەکی بایۆلۆجیکی و کیمیایی دابنێت بۆ ئەوەی سەرنجی راستەوخۆی جیهان بەرەولای گرنگبوونی بڵاو نەبوونەوەی ئەم چەکانە رابکێشێت. داوا لە ئەندامانی ئەنجومەن دەکەم لەم گەڵاڵە یاسایە پشتیوانی بکەن . لە هەمان کاتدا ئێمە دەبێ دڵنیابین کە وڵاتانێك وەك عێراق کە ئەم چەکە قەدەخەکراوانە بەکار دێنن ، لەگەڵ شەرمەزارکردنی توند لە لایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و ئەگەر پێویست بێ گۆشەگیر کردن ڕوویەڕوو دەبنەوە .

---

[١] Mr. PORTER
mustard phosgens and chlorine gas [٢]
IKE SKELTON [٣]

## ژینۆسایدی[1] کورد

### ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " بۆند[2]" :

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ئەو هەواڵ و ڕاپۆرتانەی کە لەم ڕۆژانەی دواییدا سەبارەت بە باکووری عێراق بیستوومانە ، لە ڕاستیدا زۆر ترسناکن . ڕوونە کە دەوڵەتی عێراق بە شێوازی سیستماتێك ، هێرشێك بۆ قەڵاچۆ کردنی کەمینەی کورد لەو وڵاتە بەڕێوە دەبات .

پاش واژۆبوونی ئاگربەست لە نێوان ئێران و عێراق لە ٢٠ی ئاب ، سوپای عێراق دەستی ئاوەڵا بووە و دەوڵەتی عێراق ئەم هێزە دژی خەڵکی خۆی بەکار دێنێت . لە ماوەی ٢ هەفتەی ڕابردوودا ، ئەو ئاوارانەی کە هاتوونەتە نێو خاکی تورکیا وتوویانە پتر لە هەزار کورد گوولەباران کراون و ناوچەیەکی بەرفراوان کەوتۆتە بەر هێرشی کیمیایی . بە هەواڵنێران ئیزن نادرێت سەردانی ناوچەکە بکەن ، بۆیە زانیارییەکانمان کرچوکاڵن . بە هەر حاڵ مەزەندە دەکرێت ژمارەی ئەو کەسانەی کە بە دەستی دەوڵەتی عێراق کوژراون ، گەیشتۆتە دەهەزار کەس و ژمارەیەکی زۆرتر بریندار بوونە . پتر لە ١٠٠هەزار کەسی دیکە ناچار کراون پەنا بۆ تورکیا ببەن . "تورگوت ئۆزاڵ" ، سەرۆك وەزیرانی تورکیا شایانی ستایشە لە بەر ئەوەی کە ئەو کەسانەی قبووڵ کردووە کە لە دەستی دەوڵەتی عێراق هەڵاتوون و لە ناوچە سنوورییە مەترسیدارەکان دووری خستوونەتەوە.

ئەمە یەکەم جار نییە کە ڕژێمی عێراق گازی ژەهراوی دژی خەڵکی خۆی بەکار دەهێنێت .لەم ڕۆژانەی دواییدا لە ١٦ی ئادار ، عێراق سەدان پیاو و منداڵی بێ گوناهی لە شاری هەڵەبجە کیمیاباران کردووە . وێنەکانی ئەم ڕووداوە ترسناکە ، جیهانی هەژاندووە .

---

[1] ژینوساید دەستەواژەیەکی یونانییە و بە واتای کۆمەڵکوژییە.(وەرگێڕ)

[2] Mr. BOND

بەرێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، خەڵکی شارستانی لەم وڵاتەو سەرانسەری جیهان ناتوانن بە سانایی بێدەنگ بن ، لە کاتێکدا کە تاوانگەلی ئەوندە مەزن دژی خەڵکی بی گوناه بەرێوە دەچێت . من لەم رۆژانەی دواییدا نیگەران بووم لەوە کە رێبەرانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی نیگەرانی خۆیان دەرنەبڕی لە بەرامبەر ئەم تاوانە .

دوێنێ زۆر خۆشحاڵ بووم کە سەرۆکی تێگەیشتووی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی ئەنجوومەنی پیران گەلاڵە یاسایەکی تەسلیمی ئەنجوومەنی پیران کردووە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچار دەکات دژی عێراق دەست بەکار بێت . ئەمە گەلاڵەیەکی باشە و من هیوادارم کە هاوکارانم بێ فیرۆدانی کات ، پەسەندی بکەن .

بە هەرحاڵ بە بیروبۆچوونی من پێویستە لەم پەیوەندییەدا هەنگاوی زیاتر هەڵبگیردرێت و دوا لە سەرۆك کۆمار دەکەم کردەوەی عێراق بە توندترین شێوە ئیدانە بکات و داوا لە هاوپەیمانەکانمان بکات کە ئەوانیش ئیدانەی بکەن . لەمە زیاتر داوا لە سەرۆك کۆمار دەکەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هان بدات تا سەبارەت بە کۆمەڵکوژی کورد لێکۆڵینەوە بکات و کردەوەکانی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئیدانە بکرێت .

بۆ چەندەمین جار لەم سەدەیە دا ، ئێمە بینیومانە کە هەندێ مرۆڤکوژ گروپێکی ئەتنیکی یان ئایینیان قەلاچۆ کردووە وەك کۆمەڵکوژییەکانی گروپی "ئیدی ئەمین لە ئووگاندا" [٢] ، کۆمەڵکوژی ٣ میلیۆن لە هاوڵاتیانی خۆی بە دەستی" پۆل پۆت" [٣] و لە هەمەوو خراپتر کۆمەڵکوژی ٦ میلیۆن جوولەکە بە دەستی" هیتلەر" . ئێمە نابێ بهێڵین ئەم رووداوانە دووپات بێتەوە . داوا دەکەم دوای قسەکانی من ئەم دوو وتارە بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم: یەکەم وتاری" جیم هۆگلەند[٤]" لە ژێر ناوی "بە هەڵەدا مەچن: ئەمە ژینۆسایدە" کە لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە

---

[٢] group-Idi Amin's massacres in Uganda

[٣] Pol Pot

[٤] Jim Hoagland

رۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" دا بلاو بۆتەوە و ئەوی دیکە وتاری" ویلیام سافیر" [°] لە ژێر ناوی "کۆمەڵکوژی کورد بەدەستی عێراق رابوەستێنن" کە لە ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە رۆژنامەی" نیۆیۆرك تایمز" دا بلاو بۆتەوە .

داوا لە هاوکارانم دەکەم ئەم وتارانە بخوێننەوە و نەهێڵن ئەم بابەتە بکەوێتە پەراوێزەوە.

[°] William Safire

## مەسعود بارزانی داواکارییەك تەسلیم به ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات

### ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨- ئەنجوومەنی پیران

لە دوای ڕووداوەکانی ئەم دوایانەی باکووری عێراق کە تێیدا چەکی کیمیایی لە لایەن سوپای عێراق دژی خەڵکی سڤیلی کورد بەکاربرا ، بەڕێز مەسعوود بارزانی ، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بە نوێنەرایەتی خەڵکی کورد داواکارییەکی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرز کردۆتەوە کە تێدا هاتووە :

" ئێمە داوا لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەکەین بڕیارنامەکانی ئەم دواییانەی خۆی جێبەجێ بکات سەبارەت بە هەڵگرتنی هەنگاوی خێرا دژی هەر دەوڵەتێك کە چەکی کیمیایی بە کار دەهێنێت .ئێمە هەست دەکەین پێویستە جیهانی شارستانی دەستێوەردان لەم بابەتە بکات کە هەتا ئاستی ژینۆساید چۆتە پێش و مافی مرۆڤی پێشێل کردووە . ئێمە لەم کردەوەیە زۆر بەداخین کە نموونەکەی بە دەگمەن لە سەردەمی نوێدا بینراوە . ئێمە دەرك بەوە دەکەین کە ئەنجوومەنی ئاسایش دەست وەرنادادتە کاروباری ناوخۆیی وڵاتان و دواکاری ئێمە بە هیچ شێوەیەك ئامانجی سیاسی لە پشتەوە نییە ، بەڵکوو سکاڵانامەیەکە بە نوێنەرایەتی خەڵکێکی سڤیل کە لە ناودەچێت ، ئەگەر پێش لە هێرشی ئیستای دەوڵەتی عێراق نەگیردرێت .

ئێمە هەست دەکەین ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم سیاسەتەی عێراق تەنها کاری نەکردۆتە سەر خەڵکی گەمارۆدراوی ئێمە و ئەگەر عێراق هەروا بێ هیچ نارەزایەتی دەربڕینێك درێژە بە سیاسەتی خۆی بدات ، لەوانەیە ببێتە نموونەیەك بۆ دەوڵەتەکانی دیکە کە ناتوانن ناکۆکییەکانیان بە شێوازی شارستانی چارەسەر بکەن . لە کەشوهەوای هەستیاری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و

شوێنەکانی دیکەی جیهان ، لەوانەیە هەندێ لە دەوڵەتەکان، بێدەنگی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەك رێگەپێدان بۆ ئەنجامدانی ئەم کردەوانە لێکبدەنەوە .

ئێمە دڵنیياین ( لە بەر خەڵکەکەمان و ئاشتی جیهانی ) کە ئەم سکالانامەیەی ئێمە پشتگوێ ناخرێت و ئەنجوومەنی ئاسایش هەڵدەسێت بە جێبەجێ کردنی ئەرکی خۆی لەم پەیوەندییە دا.

مەسعوود بارزانی

سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان

١ی ئەیلوولی ١٩٨٨ ، عێراق

*****

رێبەرایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی عێراق

کوردستان ، عێراق ، ١٥ی ئابی ١٩٨٨

بەڕێزان :

جەنابی "خاوێر پرێز دێکۆئیار" ، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان

جەنابی نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت· لە ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری بەریتانیا لە ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری کۆماری گەلی چین لە ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری فەرانسا لە ئەنجوومەنی ئاسایش

**بابەت : پەرەسەندنی شەڕی رەگەزی عێراق بۆ ژینۆسایدی کورد**

بەڕێزان :

وێڕای سڵاو و رێز ، ئێمە دەمانەوێت سپاس و پێزانینی خۆمان دەربڕین لە بەرامبەر هەوڵە چاکەکانی ئێوە بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕی ئێران و عێراق و رزگار کردنی خەڵکی ئەم دوو وڵاتە لە کارەساتە مرۆڤی و مادییەکانی ٨ساڵی رابردوو . هیواداریین دادپەروەری و ئاشتییەکی

درێژخایەن لە نێوان عێراق و ئێران بێتە ئاراوە و ئارەزووی خەڵکی عێراق بۆ ئازادی و دیمۆکراسی و مافی مرۆڤ بێتە دی .
ئیزنمان پێبدەن ئەم راستییەتان وەبیر بهێنینەوە ( هەروا کە پێشتر وەبیری ئێوەمان هێناوەتەوە ) کە شەڕێکی دیکە دژی کورد لە عێراق بەڕێوەیە کە دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٨١ەوە بەڕێوەی دەبەن. لەم شەڕە شۆڤینییەدا کە لە نیسانی ١٩٨٧وە شێوازی شەڕی ژینۆسایدی تەواوی بە خۆوە گرتووە ، سوپای عێراق چەکی جۆراوجۆری کۆمەڵکوژ ( بەتایبەت چەکی کیمیایی) بەکار دێنێت ، هەروا کە جیهان لە نێوەڕاستی مانگی مارسی ئەمساڵ دا بینی . ئێمە دەمانەوێت ئەوەش زیاد بکەین کە لە کاتێکدا کە ئەم شەڕە درێژەی هەیە ، کاربەدەستانی عێراق سیاسەتی تیرۆر و سەرکوتی خەڵکی عێراق - چ کورد ، چە عەرەب ، یان کەمینە ئەتنیکییەکانی دیکە - پەیڕەو دەکەن. دەوڵەتی عێراق ئەم شەڕە خوێناوییە دژی خەڵکێك بەڕێوە دەبات کە لە مافە بنەڕەتییەکانی خۆی بێبەش کراوە و تەنها داوای مافی نەتەوەیی خۆی دەکات کە بە گوێرەی هەموو کۆنوانسیۆنە نێونەتەوەییەکان و پەیماننامەکانی مافی مرۆڤ ، مافێکی رەوایە .
شایانی ئاماژە پێکردنە کە لە کاتێکدا کە میدیا نێونەتەوەییەکان لە زمانی پسپۆڕان و شارەزایانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە رایانگەیاندووە کە هێزەکانی عێراق لە شەڕی کەنداو و دژی خەڵکی سڤیل لە هەڵەبجە و شار و گوندەکانی دیکەی کوردستانی عێراق ، چەکی کیمیاییان بەکار هێناوە ، لە هەمان کاتدا دەوڵەتی عێراق دژی خەڵکی سڤیل لە گوندەکانی دیکەی کوردستان چەکی کیمیایی بەکار هێناوە . بۆ نموونە لە ٣٠ و ٣١ی مانگی تەموز ئەمساڵ ، هێزەکانی عێراق گوندەکانی چۆمی بالیسان[1] ، هیران[2] و سماقلۆی[3] هەڵکەوتوو لە باکووری هەولێریان بە

---

valley of Balisan[1]
Heeron[2]
Simaqooli[3]

چەكی كیمیایی بۆمباران كردووە . هەمان هێرش لە ٢ی ئۆگۆست لە گوندەكانی ئارای[٤] ، سەرۆ[٥] و زاروا[٦] لە نزیكی سنووری توركیا ئەنجام دراوە.

لە راستیدا بەكارهێنانی چەكی كیمیایی دژی خەڵكی ئێمە هەتا كاتی نوسینی ئەم داواكارییە هەروا بەردەوامە . وادیارە هیچ شتێك لە ئێستا و داهاتوودا ناتوانێ پێش لە كەڵكوەرگرتنی عێراق لە چەكی كیمیایی دژی خەڵكی كورد بگرێ ، مەگەر ئەوەی كە كۆمەڵگای جیهانی بەتایبەت ئەنجوومەنی ئاسایش هەندێ هەنگاوی جیدی تر لەم پەیوەندییەدا هەڵبگرێت.

ئێمە لەو بڕوایەداین كە دەوڵەتی عێراق تاوانگەلێكی مەزنی دژی كورد ئەنجامداوە كە دەكرێت وەك تاوان دژی مرۆڤایەتی لە قەڵەم بدرێت. دەوڵەتی عێراق شەڕی ژینۆساید بە كەرەستەگەلێكی جۆراوجۆر بەڕێوە دەبات، لەوانە:

١ ــ بەكارهێنانی بەرفراوانی چەكی كیمیایی لە ١٤ی نیسانی ١٩٨٧وە ، واتا كاتێك كە بۆ یەكەمجار عێراق گوندەكانی شێخ وەسان و دەیان گوندی دیكەی كیمیاباران كرد.

٢ ــ راگەیاندنی زۆربەی گوندە كوردنشینەكان و دەوروبەری شارەكان وەك ناوچەی قەدەخەكراو كە تێیاندا فەرمان بە هێزە چەكدارەكان دراوە تەقە لە هەموو مرۆڤ و تەنانەت ئاژەڵ و بوونەوەرێك بكەن .

٣ ــ كاول كردنی زیاتر لە ٣هەزار گوند و شار و شارۆچكە و دوورخستنەوەی زۆرەملێی دانیشتوانەكانیان . گرووپێك لەم خەڵكە ئاوارە و دەربەدەرە بۆ بیابانەكانی باشووری رۆژئاوای عێراق گوێزراونەتەوە ولەوێ لە كەمپە بە كۆمەڵەكان ، لە هەلومەرجێكی كۆمەڵایەتی یەكجار دژوار و خراپدا رایانگرتوون .

٤ ــ سووتاندنی كێڵگە و باخ و دارستانەكانی ئەم ناوچانە .

---

[٤] Arai
[٥] Sero
[٦] Zarwa

٥ ــ توندتر کردنی گەمارۆی ئابووری ناوچه قەدەخەکراوەکان به ئامانجی ئەوە کـه ژیـانی خـەڵك لەو شوێنه له ناو بەرن .

٦ ــ درێژەپێدانی سیاسەتی ئەشکەنجه وئێعدامی به کۆمەڵ که تێیدا به بیانووگەلێکی ساده وەك پەیوەندی سیاسی ، ئایینی و نەتەوەیی دەیان و هەندێ جار سەدان کەس، لەوانه منداڵ کوژراون. له سەروبەندی شالاوی سـەربازی بـۆ سـەر گونـده کوردنـشینەکان لـه پارێزگاکـانی کـەرکووك ، سلێمانی و هەولێر له بەهاری ساڵی پـار، کاربەدەسـتانی حکوومـەت دەیـان هـەزار بنەماڵـەیان دەستگیر کرد . پاشان بەساڵاچووان و منداڵەکانیان له یەك جیا کردەوه و لـه کەمپەکانـدا رایـان گرتن ، بەڵام پیاوەکان بۆ شوێنێکی نادیار راگوێزرانەوه که چارەنووسیان نادیاره. له هەمان کاتدا ژنەگەنجەکان بۆ شوێنەکانی دیکه راگوێزراونەتەوه و هەواڵگەلێکی باسنەکراو لـه بـارەی رەوشـی ئەوان به دەستی ئێمه گەیشتووه .

بەڕێز سکرتێری گشتی

بەڕێزان ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش

بەرەی کوردستانی عێراق که له ٦ حیزب پێکهاتووه ، داواتان لێ دەکات :

١ ــ گوشار بخەنه سەر عێراق تا دەستبەجێ کۆتایی بهێنێت به بەکارهێنانی چەکی کیمـایی دژی خەڵکی کوردستان .

٢ ــ دەست بەکار بن بۆ ئەوەی شەڕی رەگەزی ژینۆساید دژی خەڵکی ئێمه رابوەستێت و هـەموو کردەوەیەك بۆ دوورخستنەوه ، تەعریب و شێوازەکانی دیکەی گۆڕینی سیمای نەتەوەیی کوردستان وەلاوه بنرێت و ئیزن به خەڵکی خۆجێیی کوردستان بدرێت بگەڕێنەوه بۆ گوندەکانی خۆیان و رێگا چارەیەکی دیمۆکراتیك ، دادپەروەرانەو ئاشـتیخوازانه بـۆ کێـشەی کـورد بدۆزرێتـەوه. رێگـەمان پێبدەن بگەڕێینەوه بۆ ئەو بەڵێنانەی که کۆمەڵەی گەلان دایبوو بۆ پاراستنی مافه نەتەوەییەکانی خەڵکی کورد له کاتی لکیانی باشووری کوردستان به عێراقەوه .

خه‌ڵکی کوردی عێراق له ساڵه‌کانی ١٩٢٠وه تا ئێستا شه‌ڕی چه‌کداریان له گه‌ڵ ده‌وڵه‌ته یه‌ك لـه دوای یه‌که‌کانی عێراق کردووه . به هه‌ڵگیرسانی شه‌ڕی ئێران و عێراق له ساڵی ١٩٨٠ خه‌باتێکی نوێ له‌لایه‌ن کورده‌کانه‌وه ده‌ستی پێکرد و له کاتی شه‌ڕدا له پاڵ ئێران یان بـه یارمـه‌تی ئێـران شه‌ڕیان ده‌کرد . له ساڵی ١٩٨١تا ١٩٨٩ هه‌وڵه‌کانی حکومـه‌ت بـۆ تێکـشکاندنی بزووتنـه‌وه‌ی چه‌کداری کورد ، بۆته هۆی کوژرانی نزیکه‌ی ٨هه‌زار که‌س که گه‌لێك له‌وانه خه‌ڵکی سڤیل بوونـه و به‌بێ فه‌رق و جیاوازی به چه‌کی کیمیایی هێرشیان کراوه‌ته سـه‌ر لـه سـاڵی ١٩٨٨. هه‌رچـه‌نده شه‌ڕی کورد و ده‌وڵه‌ت له ساڵی ١٩٨٩ که‌م بۆته‌وه بـه‌ڵام چـالاکی چـه‌کداری کـورد به‌رده‌وامـه‌و ده‌وڵه‌ت ده‌ستی داوه به هه‌ندێ کار بۆ ئه‌وه‌ی پێشیان پێ بگرێت .

خه‌باتکارانی کورد به‌رده‌وام نه‌یارییه‌تی خۆیان له گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی ناوه‌نـدی راگه‌یانـدووه . لـه ٢٩ی ئابی ١٩٨٩ رێبه‌ری گرووپێك له خه‌باتکاران له ژنێف به چاپه‌مه‌نییه‌کانی راگه‌یاند که له عێراق هێرش ده‌که‌نه سه‌ر ئه‌و دامه‌زراوه بیانییانه که پشتیوانی له رژێمی عێراق ده‌که‌ن . هه‌تا کۆتـایی ساڵی ١٩٨٩ کێشه‌ی بزووتنه‌وه‌ی کورد و سه‌رکوتی ده‌وڵه‌ت هه‌روا بێ چاره‌سه‌ری ماوه‌ته‌وه .

رژێمی عێراق وه‌ك به‌شێك له هه‌ڵمه‌ته‌که‌ی بۆ له‌ناو بردنی راپه‌ڕینی کورد و پاك کردنه‌وه‌ی ناوچه‌ی ئه‌من له له پاڵ سنووره‌کانی له باکوور، درێژه ده‌دات به سیاسه‌تی راگوازتنی سه‌دان هه‌زار کورد. هاوکات له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی زۆربه‌ی ئه‌م کوردانه گوازراونه‌ته‌وه بۆ ناو یا نزیکی شار و شارۆچکه کوردنشینه‌کان له ده‌شته‌کاندا، به گوێره‌ی هه‌ندێ راپۆرتی پشتڕاستنه‌کراو، ژماره‌یه‌کی دیکه گوازراونه‌ته‌وه بۆ ناوچه غه‌یره کوردنشینه‌کانی عێراق. رژێمی عێراق ده‌ستی داوه به کاول کردنی به‌رفراوانی گونده کوردنشینه‌کان و هه‌ندێ له گونده‌کانی مه‌سیحییه‌کان و تورکمانه‌کان. رژێمی عێراق له ١٩٨٧ به‌رنامه‌ی کاول کردنی گوند و شار و شارۆچکه کوردنشینه‌کانی باکووری عێراقی توندتر کرد و نزیکه‌ی ٥٠٠ هه‌زار که‌س ئاواره و ده‌ربه‌ده‌ر بوون. به هۆی ئه‌وه‌ی کولتووری نه‌ریتیی کورد زیاتر له گونده‌کاندا ره‌نگ ده‌داته‌وه، ده‌ر کردنی زۆره‌ملێ و خاپوور کردنی گونده‌کان، کاریگه‌ری نه‌رێنی بووه له سه‌ر ژیانی نیو میلیۆن کورد.

بەرچاوترین نموونەی پێشیلکاریی مافی مرۆڤ له ١٩٨٨ روویدا که دەوڵەتی عێراق له هەڵمەتی تێکشکاندنی راپەڕینی دێرینی کورد، پاش ئاگربەستی ٢٠ی ئاب لەگەڵ ئێران کەڵکی له چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە و خەڵکی سڤیل وەرگرت. هێزەکانی عێراق هێرشیان کردووەته سەر گوندەکانی لای سنووری ئێران که بە گوێرەی بانگەشەکان کوردە راپەڕیوەکان خۆیان تێدا داڵدە دابوو. بە ماوەی چەند رۆژ له مانگی ئاب، هێزەکانی عێراق کەڵکیان له چەکی کیمیایی وەرگرت و کتوپڕ پاش ئەم هێرشانە لانیکەم ٦٠ هەزار کورد ئاوارەی تورکیا بوون.

دەوڵەتی عێراق هەوڵەکانی خۆی توندتر کردووە بۆ تێکشکاندنی راپەڕینی کورد له باکووری عێراق که بووەتە هۆی کوژرانی ٨ هەزار کەس (بە وتەی سەرچاوە کوردەکان) که زۆربەیان مەدەنین. هێزە چەکدارەکانی عێراق بە شێوەیەکی بەرفراوان چەکی کیمیاییان دژ بە خەڵکی سڤیل و هێزە چەکدارەکان له کوردستانی ئێران و عێراق بە کار هێناوە. له میانەی شەڕی ١٦ی ئادار له نێوان هێزەکانی عێراق و سوپای پاسدارانی ئێران له نێو و نزیکی شاری کوردنشینی هەڵەبجە له باکووری عێراق، ٦٠٠ کەس تا ٣ هەزار کەس بە هۆی چەکە کیمیاییەکانی عێراق کوژران.

له ٨ی ئەیلوول وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا رایگەیاند کۆمەڵێك بەڵگەی له دەستدایە که هێزەکانی عێراق چەکی کیمیاییان دژ بە کوردەکان بەکار هێناوە و کەڵك وەرگرتن لەم چەکانەی شەرمەزار کرد. لەو کاتەوە گەلێ گروپ لەوانە لیژنەیەکی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا، پزشکانی مافی مرۆڤ و تاقیکارانی بریتانیایی که نموونەی خاکەکەیان تاقی کردووەتەوە، ئەوەیان پشتڕاست کردووەتەوە که عێراق کەڵکی له چەکی کیمیایی وەرگرتووە. رژێمی عێراق حاشای له بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە کوردەکان کردووە.

رێکخراوی لیبۆردوونی نیونەتەوەیی(AI) له راپۆرتی ساڵی ١٩٨٨ی خۆیدا ئاماژەی بەوە کردووە که لانیکەم ١٧ منداڵی کوردی ١٤ تا ١٧ ساڵان له مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٨٧له سێدارە دراون. AI هەروەها راپۆرتی داوە که هێزەکانی ئاسایشی عێراق له تشرینی دووەمی ١٩٨٧ کوردە نەیارەکانیان ژەهرخوارد کردووە. هەروەها بە گوێرەی راپۆرتی

AI له ساڵی١٩٨٥، ٣٠٠ منداڵ و جوانی کورد دەستگیر کراون که تەرمی ٢٩ کەسیان تەسلیم به بنەماڵەکانیان کراوه که پێش کوشتنیان له کانوونی دووەمی ١٩٨٧ ئەشکەنجه دراون و ئاسەواری ئەشکەنجه به تەرمەکانیانەوه دیار بووه.

## ئاواره کوردهکان

## ١٥ی کانوونی دووهمی ١٩٩١ - ئهنجوومهنی پیران

بهڕێز"لیهەی[١]" :

له بهر ئهوهی ئیمکانی ههڵگیرسانی شهڕ له کهنداوی فارس ڕۆژ له دوای ڕۆژ پهره دهسێنێت ، من دهمهوێت سهرنج بدهمه بارودۆخی خهڵکێك که ئێش و ئازارهکانی به دهستی سهدام حوسهین له لایهن کۆمهڵگای نێونهتهوهییشهوه - لهوانه حکوومهتی بوش - پشتگوێ خراوه .

ئهمڕۆ نزیکهی ١٢ههزار ئاوارهی کورد له کهمپی "قیزیلتهپه" له تورکیا که تهنها سهد مایل له سنووری تورکیا و عێراق دووره له دۆخێکی نالهباردا دهژین . به گشتی ٣٠ههزار ئاوارهی کورد له نێو کهمپهکانی تورکیا له تهنیشت سنووری عێراقدا دهژین که ساڵی ١٩٨٨ له عێراق ههڵاتوون ، پاش ئهوه که سهدام حوسهین بهچهکی کیمیایی گوندهکانیانی بۆمباران کرد .

ههرچهند که ئهم هێرشه کیمیاییه نموونهی وهحشیگهری سهدام حوسهینه ، بهڵام تهنها یهکێکه له کردهوه زاڵمانهکانی سهدام حوسهین دژی کوردهکان. گوندهکانی ئهم کوردانه به تانك تهخت کراون و پاش ئهوه دانیشتوهکانیان ئهشکهنجه دراون و به کۆمهڵ دوور خراونهتهوه.

جهنابی سهرۆکی ئهنجوومهن ، کورد بهراستی گهلێکی له بیرکراوه ، لانیکهم له لایهن ڕێبهرانی جیهانهوه لهبیر کراوه. زیاتر له بیست میلیۆن کورد له جیهاندا ههیه، بهڵام هیچ وڵاتێك یان کیانێکیان نییه و له ههر شوێنێك دهژین له گهڵ ئازار و ئهزیهت بهرهوڕوو دهبنهوه.

ئهگهر شهڕ له کهنداوی فارس ههڵبگیرسێت ئاواره کوردهکانی سهر سنووری عێراق و تورکیا لهگهڵ مهترسییهکی گهوره ڕووبهڕوو دهبنهوه.ئهم ئاوارانه له کهمپه گهمارۆدراوهکاندا دهژین و ناتوانن لهو کهمپانه بێنه دهرهوه و ئهگهر شهڕ بهرهو لای ئهوان رابکێشرێت، هیچ ڕێگایێکیان

---

[١]Mr. LEAHY

نییە خۆیان بپارێزن . سێ ساڵ پێش كاتێك كە سەدام فەرمانی ئەوەی دەر كرد كوردەكان كیمیاباران بكرێن دەوڵەتی بوش بێ هەڵوێست بوو .

داوا لە دەوڵەتی بوش دەكەم لە دەستڕۆیشتوویی خۆی كەڵك وەربگرێت بۆ ئەوەی توركیا و دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و كۆمیسیۆنی باڵای نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ كاروباری پەنابەران گارانتی ئەوە بكەن كە ئەم خەڵكە ئازار چەشتووە جارێكی دیكە تووشی چارەنووسێكی وا ناخۆش نابن .

ئەگەر دەتەوێت نەبی بە قوربانی سەدام حوسەین ، دەبێ بیری نەوتت هەبێت، دەبێ كوێتی بیت نە كورد . كاتێ كە سەدام كوێتی داگیر كرد ، ڕێبەرانی جیهان لە ترسان دەلەرزین و نیو میلیۆن سەربازیان وەگەڕخست. ئەو كاتە سەرۆك بوش زانی كە هاوپەیمانە پێشووەكەی بووە بە هیتلەرێكی نوێ ، شێخەكانی كوێت پارەو دارایی خۆیان گوازتەوە بۆ عەرەبستانی سعوودی و چاوەڕوانی ئازادی كوێت بوون .

كوردەكان هیچ نەوتێكیان بە دەستەوە نییە ، كەوابوو كاتێك كە سەدام كیمیابارانی كردن و گوندەكانیانی لە باكووری عێراق خاپوور كرد و وڵاتەكەیانی كردە بیاوان ، هیچ كەس سەرنجێكی ئەوتۆی پێ نەدان ، لە ڕاستیدا هیچ سرنجێكیان پێ نەدرا . ئەمە یەكەم جار نەبوو كە كورد شتی وای دەبینی .

نزیكەی ۱۷میلیۆن كورد ــ كە نژادیان هیند و ئەورووپاییە و ئایینیان ئیسلامە ــ لە دەشت و تەپۆڵكەكانی سەر سنووری عێراق ، ئێران ، سوریا و توركیا دەژین . كاتێك كە ئیمپراتۆری عۆسمانی پاش شەڕی یەكەمی جیهان هەڵوەشایەوە ، بەڵێنی كوردستانێكی سەربەخۆ درا بە كورد ، بەڵام لە باتی ئەوە وڵاتەكەیان لە نێوان ٤ وڵات - و ناوچەیەكی بچووك لە یەكێتی سۆڤیەت - پارچە پارچە كرا و هەمووی ئەم دەوڵەتانە هەوڵیان داوە كولتووری كورد لەناو ببەن . توركیا( كە نزیكەی نیوەی كوردەكان لەو وڵاتەدا دەژین) كورد بە فەرمی ناناسێ و پێیان دەڵێت"توركە

شاخاوییەکان". له تورکیا قسەکردن به کوردی له دەرەوەی ماڵ قەدەغەیه و ئەو کەسانەی که بە کوردی قسه بکەن، دەخرێنه بەندیخانه .

کەوابوو ئەو راستییه که کوردەکانی عێراق له دەستی هێرشی کیمیایی سەدام پەنایان بۆ تورکیا بردووه له جێگای خۆیدایه . سەدام بڕیاری دابوو زەبرێکی توند له کوردەکان بوەشێنیت لە بەر ئەوەی که له شەڕی ئێران و عێراقدا لایەنی ئێرانیان گرتبوو . "ئەکرەم مایی" کە یەکێ لە رێبەرانی کوردە که هاتووە بۆ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی خەڵاتی مافی مرۆڤ وەربگرێت دەڵێت : " له ٢٨ی ئابی ١٩٨٨ عێراق دەستی به بۆمباران کرد و به چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر ٧٠ شوێن ، رەنگی کیمیاییەکه له نێوان سپی و زەرد بوو و بۆنی سیری دەدا . هەزارن ژن و پیاو و منداڵ کوژران و هەزاران کەسی دیکه هەڵهاتن بۆ تورکیا ".

نزیکەی ٣٠ هەزار لەم ئاوارانه له سێ کەمپدا نیشتەجێ کراون ، هەرچەند که تورکیا ئەوان بە مێوان دەزانێت و لەلایەن ئەوانەوە یارمەتییە نێونەتەوەییەکان رەت دەکاتەوە. ئەم ئاوارانە بە ماوەی ٢ ساڵ له خێوەت و ئاپارتمانه قەرەباڵغەکاندا دەژین و چەند بنەماڵە له ژوورێکدان . بە وتەی "ئەکرەم مایی" ئاوارەکان خۆراکیان هەیه بەڵام منداڵەکانیان ناتوانن بچنه قوتابخانە و کار بۆ گەورەکان نییه . "مایی" دەڵێت: " ئەوەی کە کورد بە راستی دەیەوێت ئەوەیە کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە کوردستانی عێراق درووست بکرێت ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا حکوومەتی سەدام برووخێنێت . پاش ئەوە کوردەکانی عێراق دەیانەوێت وەك پەنابەر له وڵاتانی رۆژئاوای ئۆرووپا و باکووری ئەمریکا وەربگیرێن".

نەتەوە یەکگرتووەکان قەد باسی کورد یان شاڵاوی ژینۆسایدی کوردی لە لایەن سەدامەوە نەکردووە ، تەنانەت هەتا ئەم دواییانە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا قەت نەیەویست ئەوان وەك پەنابەر وەربگرێت، بەڵام بەهەرحاڵ به وتەی "ئەکرەم مایی" لەم مانگەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رەزامەندی خۆی دەربڕیوە بۆ وەرگرتنی ٣٠٠بنەماڵە. "مایی" به عاجزییەوە دەڵێت :

" هێزەکانی عێراق هەر رۆژ هەزاران کورد دەکوژن و کەس باسی ناکات . ئەوان(مەبەستی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و دەوڵەتانی ئەوروپایە- وەرگێڕ) ئێستا باسی مافی مرۆڤ دەکەن ، مافی مرۆڤ ! گرینگ بۆ ئەوان مافی نەوتە نە مافی مرۆڤ ".

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن داوا دەکەم وتارەکەی ۲ی کانوونی دووەمی ۱۹۹۱ ی رۆژنامەی "بۆرلینگتۆن فری پرێس[۲]" لە ژێر ناوی "کوردە لە بیرکراوەکان" سەبارەت بە ئاوارە کوردەکان لە تورکیا بخرێتە بەر دەستی ئەندامانی ئەنجوومەن.

---

[۲] Burlington Free Press

## بارودۆخی کهنداوی فارس

## ۲۸ی شوباتی ۱۹۹۱- ئهنجوومهنی پیران

بهڕێز " پێڵ " :

بهڕێز جهنابی سهرۆکی ئهنجوومهن، وادیاره شهڕی کهنداو ئێستا کۆتایی پێهاتووه . ئهمه سهرکهوتنێکی سهرسووڕ هێنهره بۆ هێزهکانی ئهمریکا و هاوپهیمانهکانمان. دهمهوێت ستایشی کچ و کوڕه ئازاکانمان بکهم که بهم لێهاتووییه و بهم دهروهسبوونه له کهنداودا کاریان کرد. ههموو ئهمریکاییهك شانازی به دهوری ئهوان له رزگار کردنی کوێت دهکات . ههروهها زۆر خۆشحاڵین که کوشتهو بریندارهکانی ئهمریکا و هاوپهیمانان زۆر کهم بووه . له مێژوودا هیچ خهباتێکی سهربازیی ئهوهنده گهوره بهڕێوه نهچووه که زهبری ئهوهنده کاریگهری له دوژمن وهشاندبێت و خۆی کوشتهو برینداری ئهوهنده کهم بووبێت .به ههر حاڵ له ناخی دڵمهوه سهرهخۆشی له بنهماڵه و دۆستانی ئهو ۷۹ ژن و پیاوه دهکهم که له "شاڵاوی گهردهلوولی بیابان"دا گیانی خۆیان بۆ وڵاتهکهمان و بۆ ئازادی بهخت کرد. جیهان له ناخی دڵهوه ئهمهکداری قوربانی بوونی ئهوانه . ئێمه ههروهها هاوخهمی خۆمان له گهڵ خهڵکی کوێت دهردهبڕین به بۆنهی ئهو ئازار و ژانهی که چهشتوویانه . ئهوان کوێرهوهرییهکی له رادهبهدهریان له ۷ مانگی رابردوودا بینیوه .

ئێمه ههروهها نابێت قوربانیانی دیکهی سهدام له بیر بکهین واتا کوردهکان که به گازی کیمیایی هێرشیان کراوهته سهر و ههزاران گوندیان کاول کراوه . ههروهها دهمهوێت پێشنیارێك ئاراستهی خهڵك و سهربازه ئاساییهکانی عێراق بکهم . ئهوان قوربانییانی راستهقینهی سهدام حوسهینن . خهڵکی عێراق بوونهته ئامانجی بۆمبارانی ههوایی و شارهکانیان خزمهتگوزارییهکیان ههیه که هی ۱۰۰ ساڵ لهمهو پێشه . ههمووی ئهمانه به هۆی زێدهخوازییه شێتانهکانی سهدام حوسهینه. خهڵکی عێراق دهکرێن به سهربازی ئاسایی ، خواردنی باشیان پێ نادرێت و له لایهن خودی سوپاوه تهقهیان لێدهکرێت، ئهمانه قوربانی سهرهکی سهدام حوسهینن .

بە هەر حاڵ ئێستا ئێمە دەبێت سرنج بدەین بە بارووذۆخی پاش شەڕ . ئێمە سوودێکی ئەوتۆمان لە سەرکەوتنی هێزەکانمان وەدەست ناکەوێت ئەگەر نەتوانین ئێستا ئاشتی دەستەبەر بکەین . یەکەم شتێك کە ئێمە پاش شەڕ دەبێ سرنجی پێبدەین داهاتووی سیاسی عێراقە. بە بیروبۆچوونی من دەسەڵاتی سەدام حوسەین لە ڕۆژانی کۆتاییدایە . سەدام نەهامەتییەکی بێ وێنەی بە سەر وڵاتەکەیدا هێناوە : یەکەم لە ڕێگای شەڕی ٨ساڵە لە گەڵ ئێران کە لە ئەنجامدا ٢٥٠ هەزار کەس کوژران و وڵاتەکەی خستە نێو قەرز و قوڵەیەکی زۆرەوە . سەدام بۆتە هۆی رووخانی ژێرخانی وڵات ، لە ناوچوونی سوپا و کوژرانی هەزاران عێراقی . ئەمە ئەنجامانەیەکە کە هیچ ڕێبەرێك ناتوانێت تەحەمولی بکات.

ئێمە دەبێت هەرچی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی ئاڵترناتیڤێکی دیموکرات بۆ سەدام بدۆزینەوە . پێشتر هاوپەیمانییەك لە نێوان کورد ، عەرەبی شێعە و گرووپەکانی دیکەدا هەبوو کە بەرنامەیەکیان دارشتبوو بۆ ئاڵترناتیڤێکی دیموکرات بۆ عێراق ، ئاڵترناتیڤێك کە بتوانێت مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کەمینەی کورد دەستەبەر بکات کە ئازار و ژانێکی لە مێژینەی چەشتووە . ئێمە دەبێت پەرە بەم هەوڵانە بدەین و پێش لە هەموو شتێك نابێت رازی بین بەوەی کە ژەنەراڵێکی دیکەی سوننە جێگای سەدام بگرێتەوە تا رژێمێکی سەرەڕۆ پێك بهێنێت .

دەوڵەتی عەرەبستانی سعوودی پشتیوانی لە ئاڵترناتیڤی خۆی دەکات . هاوکات لە گەڵ ئەوەی من زۆر ستایشی هاوپەیمانە سعوودییەکەمان دەکەم بەڵام ئاڵترناتیڤەکەی ئەوان هیچ شتێك سەبارەت بە دیموکراسی نازانێت و بە کەڵکی ئێمە نایێت. دووەمین کاری گرنگی ئێمە لە جیهانی پاش شەڕ ئەوەیە کە گوازتنەوەی چەك و تەقەمەنی بۆ وڵاتانی رۆژهەڵاتی نێوەراست بەرتەسك بکەینەوە . زۆر ناخۆشە کە هەموو ئەو وڵاتانەی کە بوون بە بەشێك لە هاوپەیمانی نێونەتەوەیی دژی عێراق پێش لەوە چەکی پێشکەوتوویان دەدا بە عێراق. ئەم چەك فرۆشتنە بە عێراق لەوانەیە دەوڵەتی عێراقی بەرەو لای دەستدرێژی زۆرتر هاندابێت و بە دڵنیاییەوە ڕێژەی مەترسی عێراقی بەرزتر کردەوە. وڵاتانی رۆژهەڵاتی نێوەراست دەبێ سەرچاوەکانی خۆیان بۆ پێشکەوتن

تەرخان بكەن نە سەربازیچێتی . هۆكاری ئەوەی كە ناوچە ئەوەندە ناسەقامگیر بووە ئەوەیە كە ئەم دەوڵەتانە سەرچاوەكانی خۆیان بۆ بەشی بێ كەڵك و مەترسیداری سەربازی تەرخان كردووە . سەرئەنجام لە قۆناخی پاش شەڕدا ئێمە دەبێت هەوڵەكانمان دووقات بكەین بۆ ئەوەی رێگا چارەیەكی ئاشتیخوازانە بۆ كێشە ناوچەییەكان بدۆزینەوە ، وەك ناكۆكی عێراق و كوێت ، ناكۆكی عەرەب و ئیسرائیل ، شەڕی ناوخۆیی لوبنان و (بە بیرو بۆچوونی من) ئامانجە رەواكانی خەڵكی كورد .

بەڕێز سەرۆكی ئەنجوومەن ئەمە سەركەوتنێكی گەورە بوو بۆ ئەمریكا و نەتەوە یەكگرتووەكان . ئێستا ئێمە لەگەڵ كێشەیەكی نوێ رووبەڕوو بووینەتەوە. هیوادارم ئەو بوێری و پرۆفشینالێزمەی كە ژنان و پیاوانی ئێمە لە شەڕی كەنداودا نیشانیان دا، سیاسەتمەدارانی ئێمەش نیشانی بدەن .

## کورد ، تورك و قبرسییەکان : ئاژینی نوێی جیهانی، بۆ کێ[1] ؟

### ٧ی ئاداری ١٩٩١ــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" کرانستۆن[2]" :

بەڕێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، بۆ ئەو کەسانە لە ئێمە کە چ پێش لە داگیر کردنی کوێت لە ٢ی ئاگۆست و چ پاش ئەوە دژی سەدام بوون ، بارودۆخی دژواری ٣میلیۆن کوردی عێراق جێگای تایبەتی خۆی هەبووە . زۆر کەم خەڵك لە مێژووی هاوچەرخدا هەیە کە بە قەد کورد پشتگوێ خرابێ و زوڵمی سیستماتیکی لێ کرابێ . لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ "هێنری کسینجێر" ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و "شا"ی ئێران پشتیان لە هاوپەیمانیەکەیان لە گەڵ کورد کرد و ڕێگەیان بۆ سەرکوتی خوێناوی ئەوان خۆش کرد .

لەم ساڵانەی دواییدا دەیان هەزار کورد لە سەر دەستی سەدام و هێزە دڕەندەکانی خراونەتە بەندیخانە ، ئەشکەنجە کراون و کوژراون ، نیو میلیۆن کەس لە زێدی شاخاوی باوباپیرانی خۆیان لە کوردستان دەرکراون . لە ژمارەی ئەمڕۆی ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" دا ئەفسەری پێشووی خزمەتی بیانی، "دەیڤید أ کۆرن[3]" وتارێکی تێروتەسەلی سەبارەت بە بارودۆخی دژواری ئەم خەڵکە لە ژێرناوی "کوردەکانی عێراق پشتگوێ مەخەن ، سیاسەتێکی وەها هەڵە و کورتبینانەیە" نووسیوە. "کۆرن" دەنووسێت :

"کاتێ ڕێبەری کورد، جەلال تالەبانی لەم دواییانەدا سەردانی واشنگتۆنی کردووە هیچ کەس لە کارمەندانی وەزارەتی دەرەوە یا کۆشکی سپی لە گەڵی دانەنیشتووە ، دەوڵەتی ئەمریکا تەنانەت

---

[1] KURDS, TURKS, AND CYPRIOTS: A NEW WORLD ORDER FOR WHOM?

[2] Mr. Cranston

[3] David A. Korn

سەبارەت بە مافی مرۆڤیش قسەی لە گەڵ تاڵەبانی نەکردوە و یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافی مرۆڤیش لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دیداری نەکردووە . ڕێبەرانی دیکەی کوردی دانیشتووی واشنگتۆن بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە قسەکانیان تەنانەت لە تاستی خواری وەزارەتی دەرەوە بە هەند وەربگیردرێت" .

لە ڕوانگەی "کۆڕن"ەوە(کە منیش لە گەڵ بیروبۆچوونەکەی ئەودام) ئەم بێدەنگییەی حکوومەتی ئەمریکا بە هۆی پەیوەندییەکانی ئێمە لە گەڵ تورکیایە کە ئەویش دەستی داوەتە شاڵاوێك بۆ سەرکوت کردنی خەڵکی کوردی وڵاتی خۆی . "کۆڕن" هەروەها دەڵێت :

"دەوڵەتی تورکیا بە توندی لەوە نیگەرانە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەندە یارمەتی کوردەکانی عێراق بکات کە جۆرێك ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنن، ئۆتۆنۆمییەك کە دەوڵەتی تورکیا نایدات بە هاووڵاتیانی کوردی خۆی".

بەڕێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، هیچ کەس ناتوانێت حاشا لە گرینگی تورکیا وەك ئەندامی ناتۆ یان یارمەتییەکانی ئەم دەوڵەتە لەم شەڕەی دوایی کەنداودا بکات . بە هەر حاڵ پرسیارەکەی من ئەوەیە کە ئایا ئێمە تا ئێستا لە پەیوەندییە نزیکەکانمان لە گەڵ تورکیا باسی ئەو پێشێلکارییە بەڵگەمەندانەی مافی مرۆڤمان کردووە لە تورکیا یان داگیرکردنی بەردەوامی بەشێك لە قوبرس لە لایەن تورکیاوە .

سەرکەوتن لە کەنداوی فارس سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ یاسای نێونەتەوەیی بەڵام ئەوەندە کە نەتەوە یەکگرتووەکان دژی دەستدرێژی عێراق بۆ سەر کوێت دەنگی خۆی بەرز کردەوە ، ئەوەندەش پێویستە ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیارنامە دەربکات و داوا لە تورکیا بەکات لە قوبرس بچێتە دەرەوە . جیهان چاوەڕوانی ئەوەیە سەربازانی تورکیا لە دوورگەی قوبرس بچنە دەرەوە و ڕێز لە سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی قوبرس بگیردرێت .

## کورد و کوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکەم بە گوێرەی ڕێوشوێنی یاسایی نێونەتەوەیی هەڵسوکەوت بکات . داواکارم دەستی دۆستی بەرەو لای کورد درێژ بکەین و لە هەمان کاتدا بە تورکیا بڵێین کە جیهان چاوەڕوانی ڕێگاچارەیەکی دادپەروەرانەیە بۆ قوبرس .

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داوادەکەم وتارەکەی ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" و لێدوانەکەی ئەم دواییەی "پیتر گالبرەیس"[٤]، کارمەندی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران سەبارەت بە بارودۆخی دژواری کورد بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم .

وتەکانی "پیتر گالبرەیس ":

"ئەمڕۆ سەرنجی جیهان لە سەر دوایین قوربانیانی سەدام حوسەین چڕ بووەتەوە واتا خەڵکی کوێت . بە هەرحاڵ کورد یەکەمین و درێژخایەنترین قوربانی سەدام بووە. بەداخەوە زۆربەی ئەو شتانەی کە بە سەر کورددا هاتووە لە شوێنگەلێك ڕووی داوە کە بە هۆی سیاسی و جۆگرافیاییەوە ، میدیا جیهانییەکان دەستیان پێی ڕاناگات . من بە کورتی بەشێك لەو نەهامەتیان دەخەمە ڕوو کە بە سەر ٣میلیۆن کوردی کوردستانی عێراقدا هاتووە" .

لە پەیوەندی لە گەڵ کاروباری کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران سەبارەت بە شەڕی ئێران و عێراق ، من دوو جار سەردانی کوردستانی عێراقم کردووە : ساڵی ١٩٨٤ و ساڵی ١٩٨٧ . لە میانەی ئەم دیدارانەدا توانیم ڕەفتاری زۆر خراپی دەوڵەتی عێراق لە گەڵ خەڵکی کورد ببینم . لە ساڵی ١٩٨٨ بارودۆخی کوردەکانی عێراق ، دوو جار دزەی کردە ناو ویژدانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی : یەکەم جار لە ڕێگای ئەو ڕاپۆرتانە کە سەبارەت بە هێرشی کیمیایی بۆ سەر شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە بڵاو بووەوە و جاری دووەم لەکاتی کۆڕەوی بەرفراوانی ئاوارەکانی باکووری عێراق لە مانگی ئەیلوول . ئەم ئاوارانە بە سەرهاتی هێرشە کیمیاییەکانیان لەلایەن سوپای عێراقەوە دەگێڕایەوە .

---

[٤] PETER GALBRAITH

له په‌یوه‌ندی له گه‌ڵ ئه‌و گه‌ڵاڵه یاسایه که سناتۆر " پێڵ " بۆ گه‌مارۆدانی ئابووری عێراق (به هۆی که‌ڵك وه‌رگرتن له‌چه‌کی کیمیایی دژی کورد ) ته‌سلیمی ئه‌نجوومه‌نی کردبوو کۆمیته‌ی په‌یوه‌ندییه‌کانی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌نجوومه‌ن داوای لێکردم به سه‌رۆکایه‌تی لیژنه‌یه‌ك ، سه‌باره‌ت به که‌ڵك وه‌رگرتنی عێراق له چه‌کی کیمیایی راپۆرت بده‌م و به‌ڵگه‌نامه کۆ بکه‌مه‌وه .

لیژنه‌ی راستی دۆزینه‌وه‌ی ئێمه به‌ڵگه‌نامه و نیشانه‌ی زۆری دۆزییه‌وه سه‌باره‌ت به‌وه‌ی که عێراق دژی خه‌ڵکی سڤیل ، چه‌کی کیمیایی به‌کار هێناوه له هێرشێکی به‌رفراواندا که له ۲۵ی ئابی ۱۹۸۸ ده‌ستی پێکردووه . ئامانجی ئه‌م هێرشه ، تێکشکاندنی بزووتنه‌وه‌ی کورد بوو و گه‌یشته ئامانجی خۆی .

ئه‌م هێرشه کیمیاییانه به‌شێك بوو له سیاسه‌تی سه‌ربازی عێراق که مه‌به‌ستی چۆڵ کردنی گه‌لێ له ناوچه‌کانی کوردستانی عێراق بوو. هه‌ندێك له خاڵه‌کانی ئه‌م سیاسه‌ته بریتی بوون له :

۱ــ کاول کردنی گوند و شارۆچکه‌کانی سه‌راسه‌ری کوردستان

۲ــ دووباره نیشته‌جێ کردنی خه‌ڵکی کورد له شوێنه نوێ به‌کۆمه‌ڵه‌کان که له ژێر چاودێری سه‌ربازیدان

۳ــ دوورخستنه‌وه‌ی کورده‌کان بۆ شوێنه‌کانی ده‌ره‌وه‌ی کوردستان

٤ــ به‌کارهێنانی تاکتیکه تۆقێنه‌ره‌کان ، له‌وانه گازی کیمیایی بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵکه‌که له‌و شوێنانه که ده‌بێ چۆڵ بکرێن ، بچنه ده‌ره‌وه .

ئه‌م سیاسه‌ته به دڵره‌قییه‌کی زۆره‌وه جێبه‌جێ ده‌کرا و هیچ حیسابێك بۆ بیروڕای جیهان و یاسای نێونه‌ته‌وه‌یی نه‌ده‌کرا . لیژنه‌ی راستی دۆزینه‌وه‌ی ئێمه به‌و ئه‌نجامه گه‌یشت که به چه‌کی کیمیایی هێرش کراوه‌ته سه‌ر ٤۹ گوند . ئێمه له سه‌ر ئه‌و بڕوایه‌ین که ژماره‌ی گشتی ئه‌و گوندانه که به چه‌کی کیمیایی هێرشیان کراوه‌ته سه‌ر گه‌لێ له‌وه زۆرتره . له دوای هێرشی کیمیایی ، شالاوی سه‌ربازی به‌ڕێوه‌چووه و ئه‌و که‌سانه که زیندوو مابوون یان نه‌یانتوانیبوو خۆیان بگه‌یه‌ننه تورکیا به کۆمه‌ڵ کوژراون. به گوێره‌ی ئه‌و گفتوگۆیانه که ئێمه له گه‌ڵ خه‌ڵکه‌که دا ئه‌نجامان داوه ،

دەتوانین بەراورد بکەین کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ئەنجامی هێرشی کیمیاییدا و شاڵاوە سەربازییەکانی پاش ئەوە کوژراون و بریندار بوونە ، هەزاران کەسە . بەهەرحاڵ زانیارییەکانی ئێمە تەنها لەو کوردانەی عێراق وەرگیراوە کە پەنایان بۆ تورکیا هێنابوو . ئەگەر ئەو جۆرە شاڵاوە سەربازییانە کە لە ناوچە سنوورییەکاندا بەڕێوە چووە لە ناوچەکانی قووڵایی خاکی کوردستانی عێراقیش بەڕێوە چووبایا ، ژمارەی کوژراوە کوردەکان دەبوو بە دەیان یان سەدان هەزار کەس .

ژمارەی گشتی کوژراو بریندارەکان لە دەستی ئێمەدا نییە . ئێمە لە راستیدا بە دڵنیاییەوە نازانین لە ساڵی ١٩٨٨ەوە لە کوردستانی عێراق چی رووی داووە . سەربازە عێراقییەکان سنووری تورکیا و عێراقیان لە سەرەتای ئەیلوولی ١٩٨٨ەوە داخستووە و بێ دەنگییەکی کوشندە بە سەر کوردستانی عێراقدا زاڵ بووە . لە هەفتەی کۆتایی مانگی ئاگۆست و هەفتەی سەرەتای مانگی ئەیلوولی ١٩٨٨ ، نزیکەی ٦٥هەزار کەس لە ناکاو سنووری عێراق و تورکیایان تێپەڕاند . هەرچەند کە ئەم کەسانە لە گوندە جیاوازەکانی ناوچە شاخاوییەکانەوە هاتبوون بەڵام یەك جۆرە هێرشیان کرابووە سەر .

بە یارمەتیتان شتێك سەبارەت بە چۆنییەتی ئەم هێرشانە بڵێم . لە ئێوارەی رۆژی ٢٥ی ئاب ، فڕۆکە و هێلیکۆپتەرەکانی عێراق ، گوندەکانی ناوچەی زاخۆ، دهۆك و ئامێدییان بە چەکی کیمیایی بومباران کرد . بە وتەی یەکێ لە دانیشتووانی ئەم ناوچانە:

" فڕۆکەکان هەرجارێ ٤ تا٨ دانە بۆمبیان دەخستە خوارەوە . ئەم بۆمبانە کە بە "کانیستێری سەوز" [٥] ناسراون ، لە کاتی تەقینەوەدا دەنگێکی کەمیان هەبوو و پاش تەقینەوە هەورێك ئاسمانی شوێنەکەی دادەپۆشی کە رەنگەکەی سپی یا زەرد بوو . پاشان بۆنی توندی سیر ، پیوازی گەنیو ، سێو و جافەری(مەعدەنووس) لە ناوچە بڵاو دەبووە و ئەوانەی کە کەوتبوونە بەر کیمیایی ، بەرەبەرە یان کتووپڕ دەمردن .

[٥] green cannisters

تەرمی مردووەکان وشك ببوو و هەندێ جار شین و رەش ببوو . ژیان و مەرگ پەیوەندی بەوەوە هەبووە کە کەسەکە لە کوێ راوەستابوو و ئاراستەی با دەیگرت یا نا. لە ناکاو هاواری دایکێکم بیست کە منداڵەکانی ٢٠ هەنگاو لەو لاتر مردبوون و خۆی هیچی لێ نەهاتبوو" .

به وتەی ئەوانەی کە زیندوو ماون ، ئاژەڵەکان مردوون و پەلەوەرەکان لە ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارەوە . پاشان سەربازەکان جل و بەرگی تایبەتی دژە کیمیاییان لە بەر کردووە و هاتوونە ناو گوند . لە هەندێ شوێندا وەك گوندی" بازێ "[٦] ، هێزەکانی عێراق گوندنشینەکانیان داوەتە بەر دەسترێژی گوولە و پاشان تەرمەکانیان لە گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا شاردۆتەوە و بە بۆڵدیزر خاکیان کردووە بە سەریاندا . ئەم وەسفکردنە تێکەڵێك بوو لە سەدان گفتوگۆی ئێمە لەگەڵ ئاوارەکانی کەمپە سەرەکییەکان ( لە تورکیا ) . گفتوگۆکان دوو هەفتە پاش رووداوەکان ئەنجام دراون و هەموو چین و توێژێکی خەڵکی لە خۆ گرتووە لە کوردە خەباتکارە چەکدارەکان( پێشمەرگە ) بگرە تا ژن و پیاو و منداڵ . ئێمە کێشەمان نەبوو بۆ دۆزینەوەی شاهیدی رووداوەکان لە بەر ئەوەی کە لە راستیدا بە بەراوردی من نیوە هەتا سێ لە چواری ئاوارەکان ئەم رووداوانەیان بە چاوی خۆیان بینیوە کەمن وەسفم کرد.

بە گوێرەی سیستمی یاسایی ئێمە ، قسەکانی شاهیدانی عەینی باشترین بەڵگەیە . بەهەرحاڵ کۆمەڵێك لە نیشانە فیزیکییەکانی ئەم هێرشانە لە سەر جەستەی ئاوارەکان دیار بوو . تیمێك لە پزیشکە ئەمریکاییەکان کە ئاوارە برینندارەکانیان بینیوە ، کۆمەڵێك لە نیشانەکانی چەکە کیمیاییەکانیان لە سەر جەستەی ئاوارەکان بینیوە . تیمێك لە تەلەفزیۆنی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی "گوین رابێرتز" [٧] (کە پاشان فیلمەکەیان دەبینین ) چوونەتە ناو عێراق و پارچەی بۆمبە کیمیایەکانیان لە ژێر خاك دەرهێناوە . کاتێ کە لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ وەزیری دەرەوە ،" شۆڵتز" بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (لە لایەن عێراقەوە ) شەرمەزار کرد ، بە وتەی

---

[٦] the village of Baze
[٧] Gwynne Roberts

چاپەمەنییەکان به گوێرەی زانیارییه تەکنیکییەکانی بەردەست ئەم کارەی کرد. لە راستیدا لە کاتێکدا که کێشەی وەلامی گونجاو به عێراق به هۆی هێرشه کیمیاییەکانی له نێوان ئەنجوومەنی پیران (که خوازیاری گەمارۆدانی ئابووری عێراق بوو) و دەوڵەتی رەیگان ( که به هیچ شێوەیەك له گەڵ ئەوەدا نەبوو هیچ کارێك دژی عێراق بکرێت) هەروەها به توونـدی بەردەوام بوو ، هیچ جیاوازێکی بیروڕا له سەر ئەو راستییه له ئارادا نەبوو کە عێراق کەلکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە .

به یارمەتیتان دەمەوێت دوو خاڵی دیکه سەبارەت به کەڵك وەرگرتنی عێراق له چەکی کیمیایی دژی کەمینەی کوردی خۆی زیاد بکەم : یەکەم ئەوە کە ئەم هێرشانە لە ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ دەستی پێکردووە واتا ٥ رۆژ پاش جێبەجێ کرانی ئاگربەستی نێوان ئێران و عێراق . دووەم ئەوە که ئامانجی ئەم هێرشانه تەنها کوردە شەڕوانەکان(مەبەستی پێشمەرگەکانە- وەرگێڕ) نەبوون . شەڕوانەکان له مۆڵگەکانی خۆیان له باکووری عێراق بوون کە سەرزەمینێکی وشکی بێ دار و بەرگە و رەنگە بنکەکانیان له ئاسمانەوە دیاربن . به هەرحاڵ رژێمی عێراق هێرشی کردە سەر گوندەکانی نێو دۆڵەکان ، هەر بۆیە زۆربەی قوربانییەکان ژن، منداڵ و پیاوە سڤیلەکان بوون .

هێرشه کیمیاییەکانی عێراق زۆر توند بوو . عێراق دەیتوانی به بێ کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی و به کۆمەڵ نەکوشتنی بێ گوناح ، بزووتنەوەی چەکداری کوردی سەرکوت بکا بەلام لە باتی ئەوە دەوڵەتی عێراق خەڵکەکەی به دڕندانەترین و نامرۆڤانەترین شێوە سزا دا لە بەر ئەوە که وەك نەیاری خۆی سەیریانی دەکرد .

کیمیاباران تەنها بەشێك له سیاسەتی دژە کوردانەی عێراق بوو . له کاتی سەفەرەکەی من بۆ عێراق له ئەیلوولی ١٩٨٧ ، له سەر جادەی بەغداد ــ جلەولا ، دەربەندیخان ، سلێمانی و کەرکوك ، ٤٠ گوندی کوردنشینم ژمارد که لەم دواییانەدا کاول کرابوون . ئەم بەشەی خاکی کوردستان سەرزەمینێکی ترسناك بوو کە تەنها تیری داری کارەبا ، گۆڕستان و باخە بێ خاوەنەکانی تێدا مابوو .ئەم گوندانه له ناوچە دەستپێڕانەگەیشتووەکاندا نەبوون بەڵکوو لە سەر

جادە سەرەکییەکانی کوردستانی عێراق بوون . کە وابوو کاول کردنی ئەم گوندانە هیچ پاساوێکی سەربازی نەبوو ، بەڵکوو تەنها نموونەیەکی دیکەی سیاسەتی سزادانی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بوو .

ڕێبەرانی کورد بەڵگەنامەی ئەوەیان خستۆتەڕوو کە ٣٨٩٧ گوند کاول کراون و هەزاران قوتابخانە و سەدان کلیسا و مزگەوتی کۆن رووخێنراون . خەڵکی ئەم گوندانە لە هەندێ کەمپ لە نزیکی شارۆچکەکان نیشتەجێ کراون کە لە ژێر چاودیری سوپای عێراقدان و هەندێ جار بۆ بیاوانەکانی باشووری وڵات دوور دەخرێنەوە کە زۆر لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان دوورن . من ناتوانم ژمارەی قوربانیانی ئەم سیاسەتە مەزەندە بکەم بەڵام مەعقوولە ژمارەیان زۆر بێت . بەرنامەی دەرکردنی خەڵك بەتایبەت دڵڕەقانە بوو و کولتوورێکی دەوڵەمەند و کەوناری لە ناو برد .

سەرەنجام دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە کورد بووەتە قوربانی جۆرێك پێشێل کردنی مافی مرۆڤ کە رووبەڕووی هەموو خەڵکی عێراق بۆتەوە . ئەم کردەوانە بریتین لە کوشتن ، ئەشکەنجە ، دەستبەسەر کردن بە بێ حوکمی دادگا و بێبەش کردن لە ئازادییە بنەڕەتییەکان . یەکێ لە کردەوە نوێ و تایبەتەکانی دەوڵەتی عێراق ، ئەشکەنجە و کوشتنی منداڵەکانە بۆ ئەوەی دایك و باوکیان سزا بدات و و گوشاریان بخاتە سەر. رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی بەڵگەنامەی ئەوەی لە دەستدایە کە بنەماڵەکان لە بەرامبەر وەرگرتنەوەی تەرمی پارچە پارچە کراوی مێرمنداڵەکانیان پارەیان داوە بە دەوڵەت .

بە نیسبەت کوردەوە ، عێراق بە تەواوی مرۆڤکوژ بووە. بە هەرحاڵ بە گشتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر کاول کردنی کوردستانی عێراق و تەنانەت کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بە پارێزەوە کاردانەوەی نیشان داوە . هەروا کە گەلێ لە ئێوە دەزانن ، لە ساڵی ١٩٨٨ کتوپڕ پاش وەرگرتنی راپۆرتی بەکارهێنانی بەرفراوانی چەکی کیمیایی دژی کورد ، سناتۆر " پێڵ " و سناتۆر" هێڵمز" گەڵاڵەنامەیەکیان تەسلیمی ئەنجوومەن کرد بۆ ئەوەی کۆمەڵێك گەمارۆی ماددی و ئابووری بخرێتە سەر عێراق. ئەم گەڵاڵەنامەیە (

بەناوی پێشگیری لە ژینۆسایدی ١٩٨٨) یەك رۆژ دواتر لە لایەن ئەنجوومەنەوە پەسند کرا (کە کردەوەیەکی ئەوندە خێرا لە ئەنجوومەندا نموونەی نەبووە) بەڵام بەداخەوە نەبوو بە یاسا و بە هۆی بەرژەوەندییە ئابوورییە زۆر تایبەتەکانی ئەمریکا دژایەتی لە گەڵ کرا و ئیدارەی رەیگان بە تەواوی دژی راوەستا و لە ئاکامی مانۆڕە پارلمانیەکانی رۆژی کۆتایی خولی ١٠٠ی کۆنگرێسی ئەمریکا هەرەسی هێنا .

گەلالە یاسای پێشگیری لە ژینۆساید تەنها رووداوێك بوو کە لە جیهان دا قەوما بۆ ئەوەی وەلامێکی چڕوپڕ بدرێتەوە بە پێشێل کردنی مافی کورد و یاسای نێونەتەوەیی.لەم پەیوەندییەدا تەنها چەند ولات بوون کە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر چوونە پێش، لانیکەم شۆڵتز ، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا هێرشە کیمیاییەکانی شەرمەزار کرد .

کاتێ کە سەدام حوسەین کوێتی داگیر کرد لە سەر ئەو بڕوایە نەبوو کە جیهان کاردانەوەیەکی ئەوەندە توند نیشان بدات . لەوانەیە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم شێوازە بیرکردنەوەیەی سەدام، بێ هەلوێستی ئێمە بوویێ بە نیسبەت کیمیاباران کردنی خەڵکی عێراق کە پێشتر سەدام دەیکرد .

ئێستا کە سەربەخۆیی کوێت دەستەبەر بووە هیوادارم یەکەمین و درێژخایەنترین قوربانییانی سەدام لە بیر نەکەین واتا کوردەکان . هەتا کاتێك دیکتاتۆرێك سەرکردایەتی عیراق بکات مافی کورد لە عێراق بە هیچ شێوەیەك دەستەبەر نابێت. مانەوەی کولتووری کورد و تەنانەت مانەوەی فیزیکی کورد بەوە پەیوەستە کە بوار بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان خۆش بکرێت . کاتێك کە عێراق کەوتە ژێر چەتری پاراستنی زلهێزەکان(مەبەستی بریتانیایە- وەرگێڕ) ئۆتۆنۆمی کوردستان لە لایەن زلهێزەکانی پاش شەری یەکەمی جیهانی و کۆمەڵەی گەلانەوە گارانتی کرا بەلام بە هەرحاڵ کۆمەلگای نێونەتەوەیی نەیویست و توانایی ئەوەشی نەبوو ئەم گارانتییانە جێبەجێ بکات . لەوانەیە لە بارودۆخی پاش شەڕی( کەنداوی فارس) گارانتی نێونەتەوەیی دەستەبەر بکرێت لە نێو عێراقێکدا کە رێز لە مافی مرۆڤ و مافی سیاسی هەموو هاوولاتیانی عێراق بگرێت . ئۆپۆزیسیۆنی نایەکانگیری عێراق( لەوانە حیزبە سەرەکییەکانی کوردستان) لە سەر

بەرنامەیەكی سیاسی دیموكراتیك بۆ عێراقی پاش سەدام رێككەوتوون . بە بیروبۆچوونی من ئەمە سەرەتایەكی هیوابەخشە . من لە سەر ئەو بڕوایەم كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هاوپەیمانانی دەبێت هەرچی لە دەستیان دێت بیكەن بۆ ئەوەی ئالترناتیڤێكی دیموكرات لە عێراق پێكبێت ، ئالترناتیڤێكی وا باشترین هیوایە بۆ كورد .

من لە قۆناخی پاش هۆلۆكاست(شاڵاوی سووتاندنی جولەكەكان بە دەستی هیتلەر-وەرگێڕ) گەورە بووم و بە هۆی ئەوەی كە ئاگاداری ئەم رووداوە جیهانییە بووم باش لە بیرم دێت بیروڕای ئەوەی ئێمە ئەوە بوو كە نابێت شتێكی وا ئیدی قەد روویدات . واتاكەی ئەوەیە كە رووداوێكی جەهانمی وا نابێت جارێكی دیكە پشتگوێ بخرێت و سەرنجی پێنەدرێت .

هیچ كەس تراژیدیایەكی ئەوەندە گەورەی بە چاو نەبینیوە كە لە تەیلوولی ١٩٨٨ رووی داوە و بێ ناونیشان ماوەتەوە . من وێنای زۆرم لەو ٥ رۆژە هەیە كە لە سنووری عێراق و توركیا بووم : لە سەر شاخێكی بەرز ژنێك لە سەر كۆڵە كەلوپەلە بچووكەكەی دانیشتبوو كە هەموو دارونەداری بوو و بیری لە داهاتوویەكی بە تەواوی نادیار دەكردەوە . كەرەكان پاش ئەوەی لە لایەن خاوەنە ئاوارەكانیانەوە بەرەڵا كرابوون بە توورەكەی پڕ زەرق وبەرقەوە سەرگەردان دەگەڕان ، پیرەمەردێك دەگریا لە بەر ئەوەی هەواڵی مردنی منداڵە گەورە و بچووكەكانی خۆی بیستبووو . ئەمانە كۆمەڵێك وێنان كە تا ماوم قەد لەبیرم ناچێت . هیوادارم ئێمە نەهێڵین جارێكی دیكە ئێش و ژانگەلێكی وا بێ سەرنج و بێ وەڵام بمێنێتەوە.

## وڵاتێك بۆ کورد

### ٢٠ی ئاداری ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "بیلبرەی[١]" :

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن هەر ئێستا کە ئێمە لەم ئاسایش و راحەتییەداین، خەڵك لە باکووری عێراق بۆمباران دەکرێن . کوردەکان کە ئێستا بۆ سەربەخۆیی و رزگاربوون لە سەرەڕۆیی بەغداد شەڕ دەکەن ، بەڵێنی وڵاتێکی سەربەخۆیان پاش شەڕی یەکەمی جیهانی پێدرا ، بەڵام ئەم وڵاتەیان لێ زەوت کرا. ئێمە ئێستا بە تەواوی نازانین ئایا دەمانەوێت کۆماری عێراق ببێت بە ٢یان٣ وڵاتی سەربەخۆ یان نا . کورد کە لەم ساڵانەی دواییدا نەهامەتی زۆری بەسەر هاتووە ، پێویستی بە وڵاتێکی سەربەخۆیە . پێویستی بە وڵاتێکە کە تێیدا دڵەڕاوکێی ئەوەی نەبێت کیمیابارن بکرێت و منداڵ و ژن و پیاوی بکوژرێت .

کورد زۆر پێشتر لەوەی کە عەرەبەکان بێنە عێراق و تورکەکان فەلاتی ئاناتۆلی داگیر بکەن ، لە وڵاتی خۆیدا ژیاوە. کاتێ کە سوپای ئەسکەندەر چووە ئێران، خەڵکێکی عەشیرەتی بە ناوی کورد هەنگاو بە هەنگاو شەڕیان لەگەڵ کرد . کورد ٤ هەزار ساڵە لە سەر خاکی خۆی دەژی و ئێستا پێویستی بە یارمەتی ئێمەیە .

بەڕێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، سەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ یارمەتی کوردەکان بکات و نەتەنها فڕۆکەکانی عێراق بەڵکوو دەبێ ئەو کۆپتەرانەش بخاتە خوارەوە کە خەڵکی کوردیان پێ سەرکوت دەکرێت .

---

[١] Mr. BILBRAY

## بڕیارنامەیەك بۆ راوەستاندنی كۆمەڵكوژی كوردەكانی عێراق
## ٩ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" لڤین[١] "، نوێنەری ئەیالەتی "كالیفۆڕنیا" :

بەڕێز سەرۆكی ئەنجوومەن ، من ئەمڕۆ بڕیارنامەیەكم ئامادەكردووە كە داوا لە سەرۆك كۆماری ئەمریكا دەكات بە زووترین كات دەست بەكار بێت بۆ ئەوەی كۆمەڵكوژی كوردەكانی عێراق رابوەستێندرێت . ئێمە بۆ راوەستاندنی ئەم تراژیدیایە درەنگ دەست بەكار بووین . سەدان هەزار كورد لە زێدی خۆیان هەڵاتوون ، هەزاران كەس مردوون و هەزاران كەسی دیكە بە هۆی برسێتی ، نەخۆشی ، سەرما و سۆڵە و هێرشە زەوی و ئاسمانییەكانی سەدام حوسەین لە گەڵ مەترسی مەرگ رووبەڕوون.

دەستبەكارنەبوونی ئەمریكا بۆ خستنە خوارەوەی كۆپتەرەكانی سەدام كە بە شێوازی دلڕەقانە هێرشیان دەكردە سەر خەڵكی كورد ، پێشتر بووە هۆی كوژرانی ژمارەیەكی زۆر. ئەگەر ئێمە لەمە زیاتر دەستەوەستان بمێنینەوە هیچ كەس زیندوو نامێنێت تا لەو هەرێمە دژەفڕینە كەڵك وەربگرێت كە نەتەوە یەكگرتووەكان پێشنیاری كردووە .

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن ، سەرۆك بوش لەجێی خۆیدا جەختی لە سەر بیری ئەخلاقی هەوڵە گرینگەكانی ئەمریكا كردووەتەوە بۆ تێكشكاندنی سەدام حوسەین . نابێت سەرۆك بۆش بهێڵێت ئەم سەركەوتنە بە بە تەنها هێشتنەوەی كوردەكان كۆتایی پێبێت كە پێویستی یەكجار زۆریان بە یارمەتی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەیە .

---

Mr. LEVINE[١]

جه‌نابی سه‌رۆکی ئه‌نجوومه‌ن، ده‌قی ئه‌م بڕیارنامه‌یه ته‌سلیمی ئێوه ده‌که‌م و تکا له ئه‌ندامانی ئه‌نجوومه‌ن ده‌که‌م پشتیوانی بکه‌ن له هه‌نگاوی پاراستنی خێرای کورده‌کانی عێراق و یارمه‌تیدانیان .

ئه‌مه ده‌قی بڕیارنامه‌که‌یه :

- به هۆی ئه‌وه‌ی که سه‌دام حوسه‌ین له زه‌وی و ئاسمانه‌وه هێرشی دڕندانه‌ی کردووه‌ته سه‌ر خه‌ڵکی کوردی عێراق به تاوانی ئه‌وه‌ی که ئه‌م خه‌ڵکه دژی ئه‌م دیکتاتۆره راپه‌ڕینییان کردووه

ـ به هۆی ئه‌وه‌ی که له ئه‌نجامی ناکۆکی ناوخۆیی عێراق ، سه‌دان هه‌زار عێراقی که زۆربه‌یان کوردن ، ئاواره بوونه

ـ به له‌به‌رچاوگرتنی ئه‌وه‌ی که گه‌لێ له‌م ئاوارانه و هه‌روه‌ها ئه‌و گرووپه راپه‌ڕیوانه که هێشتا له عێراقدا ماونه‌ته‌وه به هۆی برسێتی ، سه‌رما وسۆڵه ، برین و نه‌خۆشی له گه‌ڵ مه‌ترسی مه‌رگ به‌ره‌وڕوونه

ـ به له‌به‌رچاو گرتنی ئه‌وه‌ی که کارمه‌ندانی پزیشکی هێزه فره‌ره‌گه‌زه‌کان له که‌نداوی فارس ده‌توانن به خێرایی پێداویستی ده‌رمانی خه‌ڵك دابین بکه‌ن

ـ به له‌به‌رچاو گرتنی ئه‌وه‌ی که عێراق هه‌روا سنووره‌کانی له سه‌ر هه‌وڵه سارێژکه‌ره نێونه‌ته‌وه‌ییه‌کان داخستووه و ناهێڵێت ئه‌م هه‌ولانه ئه‌نجام بدرێت

کۆنگرێسی ئه‌مریکا(به ره‌زامه‌ندی ئه‌نجوومه‌نی پیران) بڕیاری دا :

١ـ سه‌رۆك کۆماری ئه‌مریکا ده‌بێ ده‌ستبه‌جێ داوا بکات که هێزه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان له عێراق رێکخراوه خێرخوازییه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌کان بپارێزن وه‌ك خاچی سوور ، مانگی سوور ، سندووقی منداڵانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان و رێکخراوه‌کانی دیکه‌ی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان و رێکخراوه خێرخوازییه خۆویسته‌کان بۆ ئه‌وه‌ی بتوانن خزمه‌تی کورده‌کان و عێراقییه‌کانی دیکه بکه‌ن .

٢ــ سەرۆك كۆمار دەبێ لەو تیمە پزیشكییەی هێزە هاوپەیمانەكان كە لە كەنـداوی فارسـدان داوا بكات یارمەتی پزیشكی و خێرخوازی بدەن بە كوردەكانی عێراق لەو شوێنانەی كە زۆر پێویستە.

٣ــ سەرۆك كۆمار دەبێ داوا لە نەتەوە یەكگرتووەكان بكات هێزی ئاشتیپارێز لە عێـراق جێگیر بكات بۆ ئەوەی خەڵكی كورد و گرووپـەكانی دیكـە بپارێزێـت كـە هێزەكـانی عێـراق هێرشـیان كردونەتە سەر .

## ڕێکەوتننامەی سەبارەت بە کۆپتەرەکانی عێراق جێبەجێ بکەن

## ٩ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" کۆستمایێر[١]":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن ، ڕێکەوتننامەیەك لە نێوان" ژنەراڵ شوارزکۆف[٢] "و سوپای سەدام حوسەین مۆر کراوە بۆ ئەوەی کۆپتەرەکانی سەدام نەفڕن (مەگەر بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری مەدەنی) ، بەڵام لەم کۆپتەرانە بۆ لێدانی بۆمبی ناپاڵم و فۆسفۆری لە سیڤیلە کوردەکان کەڵك وەردەگیرێت کە یەکێك لە مەزنترین تراژیدیاکانی سەدەی بیستەمە کە لە پێش چاوی ئێمە بەڕێوە دەچێت . جەنابی سەرۆکی کۆنگرێس ، بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا ئەم ڕێکەوتننامەیە جێبەجێ ناکات ؟ ئەم سەرنەکەوتنەی سەرۆك کۆمار لە جێبەجێ کردنی ئەم پەیماننامەیە ( پاش ئەوەی کە بوش کوردەکانی عێراقی هاندا تا ڕاپەڕین بکەن ) جەخت کردنەوەی سەرۆك کۆمار لە سەر مەسەلەی ئەخلاق لە شەڕی کەنداوی کردووە بە بە گاڵتەجاڕ. ناوزەد کردنی سەدام حوسەین بە هیتلەر و پاش ئەوە بێدەنگ بوون لە بەرامبەر کوشتنی کوردەکان بە دەستی سەدام ، شەرمە بۆ ئەمریکا . بە سەرۆك بوش دەڵێم : "ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ بکە ، هەموو جیهان چاوەڕوانە و سەیر دەکات".

---

Mr. KOSTMAYER[١]
[٢]General Schwarzkopf

## ئاوارە عێراقییەکان

## ٩ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "لیهەی[1] ":
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت باسی بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەمڕۆ بکەم و ئەو تراژیدییە مرۆڤییە کە لە عێراق ڕوودەدات . سەدان هەزار کورد و شیعە و ئاوارەکانی دیکە لە دەستی سەرەڕۆیی سەدام هەڵهاتوون و پەنایان بۆ تورکیا و ئێران بردووە . بە گوێرەی ڕاپۆرتەکان هەزاران پیاو و ژن و منداڵ بریندار بوونە و ژمارەیەکی زۆریان لە سەر ڕێگا سەهۆڵبەستووەکانی عێراق بۆ تورکیا یان لە کەمپە قەرەباڵغ و چەپەڵەکانی تورکیا و ئێراندا لە ناو چوونە.
من ستایشی بڕیاری سەرۆك بوش دەکەم بۆ ناردنی خێرای خواردەمەنی و یارمەتییەکانی دیکە بۆ ئەم ئاوارانە ، لەوانە خستنە خوارەوەی کەلوپەل لە لایەن فرۆکە سەربازییەکانی ئەمریکاوە . بەڵام هەموومان دەزانین ئەم یارمەتیانە تەنها بەشی کۆمەڵێك لەم ئاوارانە دەکات . نەتەوە یەکگرتووەکان و دەوڵەتگەلێك وەك بەریتانیا و فەرانسەش بەرپرسیارن لە بەرامبەر کردەوە کۆمەڵکوژییە هۆڤانەکەی سەدام حوسەین دژی خەڵکی خۆی .
بەڵام هەروەك تراژیدیاکانی دیکە لە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی ، بەداخەوە یارمەتیدان بە هەزاران کەس لەم ئاوارە ئێش و ئازار چەشتووانە زۆر درەنگ و زۆر کەم بووە . بە گوێرەی زانیارییەکانی من ، سندووقی ئاوارەکان و کۆچکردووەکانی وەزارەتی دەرەوە کەمتر لە ٤٠ملیۆن دۆلار پارەی تێدایە . لە ڕاستیدا بەشێکی زۆری پارەی ئەم سندووقە تەرخان کراوە بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی هەزاران ئاوارەی برسی شاخی ئافریقا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و سەحرای ئافریقیا. ئەو برە پارەیە کە لەوانەیە تەرخان بکرێت بۆ یارمەتیدانی کورد و شیعەو کەسانی دیکە

---

[1] Mr. LEAHY

كە لە كوشتن ، ئەشكەنجە، درندەیی و برسێتی لـە عێـراق هـەڵهاتوون ، بەشـیان ناكـات . ئێمـە دەزانین ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هێشتا ناچارە بەشێكی زۆری یارمەتی خێـرا و كاریگـەری ئەم خەڵكە ئازارچەشتووە دابین بكات . تكا لە سەرۆك بوش دەكەم ئێستا یارمەتیەكی خێرا بدات بەم ئاوارانە .

وەك سەرۆكی كۆمیتەی شالاوی دەرەوە كە دەسەلاتم بە سەر سندووقی ئـاوارە و كۆچـكردووەكاندا هەیە ، بەڵێنی ئەوە دەدەم كە بە خێرایـی داخوازنامەیـەك تەسـلیمی سـەرۆك كۆمـار بكـەم بـۆ یارمەتیدانی خێرای ئاوارە عێراقییەكان.

ئێمە دەزانین كورد و شیعەكان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە بە هاندانی حكوومەتی بوش دژی سەدام حوسەین راپەڕینیان كردووە . سەرۆك (بوش) یش دەڵێـت قـەد كـارێكی وای نـەكردووە كـە ئـەم خەڵكە سەركوتكراوە واتێبگەن ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە قازانجی ئەوان دێتە مەیدان . بە هەرحاڵ باسەكەی ئێمە ، ئەم تەودرە لە خۆ ناگرێت و ئیدی گرینگ نییە ، با مێژوونووسان پاشان لە سەری بڕیار بدەن . ئەمە راستییەكی تاڵە كە ئەوانەی كە راپەڕینیان كردووە بەهایەكی یەكجار زۆریان داوە بۆ بوێری و ئازایەتی خۆیان . مانەوە لـە عێراقـی ژێـر دەسـەلاتی سـەدام حوسـەین، بەواتای كوشتنی زیاتر، ئەشكەنجەی زیاتر و برسێتی زیاترە . ئـەوان هـیچ چـارەیەكیان جگـە لـە هەڵهاتن نییە ، تەنها هیوایان ئەوەیە كۆمەڵگای جیهانی یارمەتیان بدات . ئەمە یەكێ لەو كاتە مێژووییانەیە بۆ ئەوەی ئەمریكا بێتە پێشەوە و نیاز پاكی و خێرخوازی خۆی نیشان بدات.

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن هەروا كـە لـە بیرمـان دێـت لـە ترۆپكـی بۆمبارانـەكانی "شـالاوی گەردەلوولی بیابان"، ئێمە رۆژانە میلیۆنێك دۆلارمان سەرف دەكرد ، با ئێـستا پـارەی رۆژێكـی ئەو شالاوە تەرخان بكەین بۆ رزگار كردنی گیانی ئەو كەسـانەی كـە ئەوەنـدە بوێریـان بـووە لـە بەرامبەر دەوڵەتەكەیان رابوەستن بـەو هیوایـە كـە دیكتاتۆرێـك بـڕۆخێنن كـە هێـشتا بـە سـەر ولاتەكەیاندا حوكم دەكات .

ئایا هیچ ئەمریکاییەك هەیە نەیەوێت یارمەتی ئەم ئاوارانە بدات لە کاتێکدا ئەم وێنانە دەبینێت، کاتێك کە دایکێك دەبینێت کە منداڵ رەش هەڵگەڕاوەکەی بە کۆڵەوەیە، کاتێك کە دەبینێت بنەماڵەکان بەسەر جۆگەلە سەهۆڵبەستووەکاندا تێدەپەڕن ، کاتێك کە دەبینێت منداڵەکان هاوار دەکەن و هەوڵ دەدەن لقە دارێکی بچووك بدۆزنەوە کە ئاگری بدەن و خۆیانی پێ گرم بکەنەوە، کاتێك کە دەبینێت بنەماڵەکان دێن و دەچن و هیوایان ئەوەیە رۆژی دواتر زیندوو بن و لە سەرماو سۆڵەدا نەمرن . ئایا تەنها یەك کەسی ئەمریکایی هەیە نەیەوێت یارمەتی ئەم ئاوارانە بدات، باوەڕ ناکەم .

ئێمە لە کاتی شەڕدا یارمەتیمان داوە . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پارەیەکی زۆری خەرج کردووە. با ئێمە بەشێکی بچووك لە و پارەیە تەرخان بکەین بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە هێشتا بە دەستی ئەو سەرکوتەوە دەناڵێنن کە ئێمە لە "شاڵاوی گەردەلوولی بیابان"دژی شەڕمان کردووە . ئەمە باشترین کارێکە کە ئەمریکا دەتوانێت بیکات، ئەمە شتێکە کە ئێمە دەتوانین بە باشی ئەنجامی بدەین . با جارێکی دیکە جیاوازی نێوان سەدام حوسەین و خۆمان بە جیهان نیشان بدەین . با یارمەتییان بدەین . ئەم کارە دەبێ بکرێت. هیوادارم بە زووترین کات ئەنجام بدرێت .

## تراژیدیای کورد

### ٩ی نیسانی ١٩٩١ ـ ئەنجوومەنی پیران

بە ڕێز "جۆرج[١]":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت باسی کێشەیەك بکەم کە چەند کەسی دیکە لە ئەندامانی ئەنجوومەن پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ باسیان کردووە و ئەویش تراژیدیای کۆڕەوی کوردە .
جێگای دەستخۆشییە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری داوە دان بەو راستییەدا بنێت کە رووداوەکانی عێراق خەریکە دەبێ بە یەکێ لە کارەساتە سیاسییە گەورەکانی سەردەم . بە هەرحاڵ یارمەتی ئێمە بۆ پەسەندکرانی ئەم بڕیارنامەیە تا ئەم کاتە کارێکی عاقڵانە بووە، لە پەیوەندی لە گەڵ رەهەندەکانی کێشەکە و هەروەها لە پەیوەندی لە گەڵ بەرپرسیاریەتی ئێمە لە بەرامبەر ئەم رووداوانە. لە مەزیاتر ئێمە هێشتا لە سەر هەنگاوەکانی دواتر چڕ بووینەتەوە، لە کاتێکدا کە دۆزینەوەی چارەسەرییەکی درێژخایەن پشتگوێ دەخەین .
هەموو هەڵسەنگاندنەکان جێی گومانن و ئێمە دەبێ بە پارێزەوە نزیکی هەڵسەنگاندنەکانی دەوڵەتەکانی دیکە ببینەوە. با وادابنێین نزیکەی ٣٠٠ هەزار کورد چوونەتە ناو خاکی تورکیا و هەمان ئەژماری دیکە لە ناوچە سنوورییەکانی عێراق و تورکیا کۆبوونەتەوە . ئێران پەنای بە ٣٠٠ هەزار کورد داوە و دەڵێت ئامادەیە جێگای ٢٠٠ هەزار کەسی دیکە بکاتەوە. ئێران هەروەها جێگای نزیکەی ٤٠ هەزار ئاوارەی خەڵکی ناوچەی باشووری عێراقی کردووەتەوە . سەرئەنجام لەوانەیە نزیکەی ١٥تا٢٠ هەزار کەس لە بەشی باشووری عێراق دا نیشتەجێ بن کە ئێستا لە لایەن هاوپەیمانانەوە کۆنترۆڵ دەکرێت .

---

[١] Mr. GORE

ئێستا کۆمەڵێك هەوڵی نێونەتەوەیی لە ئارادایە بۆ یارمەتیدانی ئەو کوردانەی کە هەڵهاتوون بۆ سەر سنووری تورکیا. ئەگەر ئەم هەولانە لە کاتی خۆی و بە قەدر پێویست نەبێت ، مەترسی روودانی کارەساتێك لە ئارادایە . ئەمە یەکێ لە بەرپرسیارییەتیە گرانەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەییە ، بە تایبەت دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان(و بە بیروبۆچوونی من بە تایبەت کوێت و عەرەبستانی سعوودی) کە هاوکاری ئاوارەکان بکەن.

لەگەڵ ئەمەشدا هەتا ئەو شوێنەی کە من ئاگادارم ، وەلامێکی بەوشێوەیە لە ئارادا نییە بۆ یارمەتیدانی ئەوانەی کە لە عێراقەوە هەڵهاتوون . ئێستا دەوڵەتی ئێران داوای یارمەتی نێونەتەوەیی دەکات و ئەم یارمەتییە دەبێت بە هەمان هەستی بەرپرسیارێتی و خێراییەوە دابین بکرێت کە ئێستا لە ئارادایە بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکانی سەر سنووری تورکیا . بە دڵنیاییەوە ئەگەر تەنها یەك کات هەبێت بۆ ئەوەی جیهان وەلامی داخوازی ئێران بداتەوە ، ئەوکاتە ئێستایە.

لە هەمان کاتدا ئێستا سەرنجەکان لە سەر پێشنیاری سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، "جان مەیجێر" چڕ بۆتەوە بۆ درووست کردنی ناوچەیەکی پارێزراو بۆ ئەوەی ئاوارەکان لە ئاسایش و ئارامیدا بن . ئەمە بیرۆکەیەکی شازە بەلام کۆمەڵێك ئاکام و لێکەوتەی بە دوواوە دەبێت و کۆمەڵێك کەند و کۆسپی لە سەر رێگایە. بۆنموونە من لەوە بەگومانم کە بکرێت کۆمەڵێك ناوچەی پارێزراو لە سەر سنووری عێراق لە گەڵ ئێران و تورکیا درووست بکرێت لەبەر ئەوەی هیچ ژێرخانێك لەو ناوچانەدا نییە و هیچ رێگایەك نییە بۆ ئەوەی پێداویستی ئەم ژمارە زۆرە ئاوارانە دابین بکرێت . ناوچەیەکی پارێزراوی وا دەبێت لە قوڵایی خاکی عێراقدا دروست بکرێت بۆ ئەوەی شارۆچکەگەلێکی تێدابێت کە بکرێت لەو شارۆچکانەدا هەوڵەکانی دابین کردنی پێداویستییەکان ئەنجام بدرێت .

کەوابوو بە بیروبۆچوونی من ئێمە دەبێت بیر لەوە بکەینەوە کە هەرێمێکی بەرفراوان لە قوڵایی ناوچە کوردنشینەکانی عێراق دابمەزرێنین کە هێزەکانی سەدام حوسەین دەستیان پێنەگات . ئەگەر

ئێمە کارێکی وابکەین ، پاراستنی سەدان هەزار پیاو ، ژن، و منداڵ بەوە گرێدراوە کە بتوانین کۆمەڵێك ناوچەی ئەمنی پارێزراو درووست بکەین و ئەم ناوچانەش بە بێ هاوکاری دەوڵەتی عێراق ناتوانێت بوونی هەبێت .

بە باوەڕی من چەند ئامراز لە دەستی ئێمە دایە: یەکەم ئەوە کە سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی هەیە لە رێگای بڕیارنامەی ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایش لەم کێشەیەدا دەستێوەردان بکات. دووەم لە رێگای بڕیارنامەی ٦٧٨ کە رێگەدەدات بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی بە کۆمەڵێك هۆ کە ئەم هۆکارانە نەتەنها بۆ دەرکردنی سەربازانی عێراقی لە کوێت ، بەڵکوو بۆ پاراستنی ئاسایش و ئاشتی نێونەتەوەیی لە ناوچە وەڕاست دەگەڕێت . بە دڵنیاییەوە کۆڕەوی بە کۆمەڵی خەڵك بەو شێوازەی کە ئێستا رووی داوە بە گوێرەی پێناسەی بڕیارنامەی ٦٧٨ هەڕەشەیە بۆ ئاسایشی ناوچە . سێیەم ئامراز، راگەیەندننامەی لێبووردنی گشتی خودی سەدام حوسەینە کە رێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی چاودێری بیانی بکرێت بە سەر جێبەجێ بوونی ئەم لێبوردنە گشتیە لە ناوچەی پارێزراو لە بەر ئەوەی کە کردەوەکانی سەدام حوسەین بە جوانی نیشانی داوە ئەم جۆرە لێبوردنانە جێگای متمانە نین . کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ لە بەرامبەر جێبەجێ بوونی ئەم لێبوردنە گشتییە خۆی بەبەرپرسیار بزانێت.

بە یارمەتیتان خاڵێکی دیکە لە بارەی ئەم ناوچە پارێزراوانە بهێنمە سەر زمان : ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ناوچەی پارێزراو کە ئاوارەکان تێیدا پارێزراو بن دەبێت بۆ هەندێك ناوچەی دوور لە سنووری کوردستانی عێراق درێژ بکرێتەوە و هەرچی لە سنووری عێراق و تورکیا نزیکتر بینەوە، دەسەڵاتی سەدام حوسەین لاوازتر و کەمتر دەبێت ، بەڵام هەرچی زۆرتر بەرەو قووڵایی خاکی کوردستانی عێراق بچینە پێش ، دەسەڵاتی سەدام حوسەین زۆرتر دەبێت و لە ئەنجامدا ئێمە دەبێت بە پارێزی زۆرترەوە هەڵسوکوت لەگەڵ سەدام بکەین . ئەگەر ئێمە کێشەکە نەگوازینەوە بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان و رێبەرایەتی نەکەین بۆ ئەوەی بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی ، پشتیوانی

( کۆمه‌ڵگای نێونه‌ته‌وه‌یی ) به‌ده‌ست بهێنین ، ناکرێت به شێوازی کاریگه‌ر ئه‌م قه‌یرانه‌ی ئێستا چاره‌سه‌ر بکرێت .

که وابوو ئێمه ده‌بێ ئاماده‌بین بۆ ئه‌وه‌ی کۆمه‌ڵێك گوشاری نوێ و قورس بخه‌ینه سه‌ر عێراق تا رازی بێت به داخوازییه‌کانی ئێمه له‌م بواره‌دا . به دڵنیاییه‌وه مه‌به‌ستی من ئه‌وه نییه نابێ ئێمه سه‌ربازه‌کانمان له ناوچه بکێشینه‌وه، به‌ڵکوو کۆمه‌ڵێك پێشنیاری دیکه‌م له م په‌یوه‌ندییه‌دا هه‌یه ، به تایبه‌ت له یه‌که‌مین هه‌نگاودا ده‌بێ داوای ئه‌وه بکه‌ین فڕینی کۆپته‌ره‌کانی عێراق کۆتایی پێبێت . سه‌دام حوسه‌ین ته‌نها له رێگای ئه‌م کۆپته‌رانه‌وه ده‌توانێت کورده‌کان به‌ره‌و شاخه‌کان راو بنێت ، ئه‌م راستییه پێشتر سه‌لمێندراوه.

جه‌نابی سه‌رۆکی ئه‌نجوومه‌ن رێوشوێنه‌کانی ئاگربه‌ست به روونی به کارهێنانی کۆپته‌ری سه‌ربازی بۆ ئه‌و ئامانجانه قه‌ده‌غه کردووه که عێراق ئێستا که‌ڵکی لێوه‌رده‌گرێت. وته‌بێژی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا له کۆنفراسه چاپه‌مه‌نییه‌که که پاش روونبوونه‌وه‌ی کۆمه‌ڵکوژی خه‌ڵك به‌رێوه‌چوو ، وتی "ئایا سیاسه‌تی ئێمه شه‌فاف نییه؟ به‌ڵێ".

جه‌نابی سه‌رۆکی ئه‌نجوومه‌ن له ئه‌نجامی سیاسه‌تی ئه‌مریکا له‌م بارودۆخه‌دا مافێکی تایبه‌ت دراوه به عێراق تا کۆپته‌ری جه‌نگی به‌کار بێنێت بۆ کۆمه‌ڵکوژی کورد . ئێمه ده‌زانین هه‌ر رۆژ کۆپته‌ره‌کان به‌کارده‌برێن ، ته‌نانه‌ت دوێنێش . ئێمه ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وه‌مان هه‌یه نه‌هێڵین ئه‌م کۆپته‌رانه بفڕن. هه‌موو که‌سێك ئاگاداره چی مه‌ترسییه‌ك له پێشه، به‌ڵام که‌س هیچ ناکات له به‌ر ئه‌وه که له سه‌رۆك کۆماری ئه‌مریکا ده‌ترسێ. سه‌رۆك کۆمار ده‌ڵێت ئه‌گه‌ر ئێمه کۆپته‌ره سه‌ربازییه‌کان بخه‌ینه خواره‌وه ، ده‌که‌وینه ناو لێژاییه‌ك که ده‌ستێوه‌ردانی زه‌مینی هێزه‌کانی ئه‌مریکای لێ ده‌که‌وێته‌وه و ده‌که‌وینه ناو شه‌رێکی ناوخۆییه‌وه.

سه‌رۆك کۆمار نابێ پێش له ئێمه بگرێت بۆ رزگار کردنی گیانی ئه‌م خه‌ڵکه. پێشنه‌گرتن له فڕینی کۆپته‌ره جه‌نگییه‌کانی عێراق ، هه‌ڵه‌یه . ئێمه ده‌بێت هه‌ر ئێستا پێش له فڕینی ئه‌م کۆپته‌رانه بگرین .

دووەم: دەبێ وەبیری عێراقی بهێنینەوە كە گوێڕایەڵنەبوون بە بڕیارنامەی ٦٨٨ لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان پێشنیارێك تەسلیمی ئەنجوومەنی گشتی بكات كە ئەندامییەتی عێراق لە نەتەوە یەكگرتووەكان هەڵبواسرێت یان ئەگەر زۆر پێویست بێت بە تەواوی هەڵبوەشێنرێتەوە . هەرچەند كە لەوانەیە بە بیروبۆچوونی هەندێ كەس ئەم كردەوانە مەترسییەكی ئەوتۆ بۆ سەدام حوسەین دروست نەكات بەلام بە بیروبۆچوونی من هەنگاوێكی سەرەتاییە بۆ ئەوەی لانیكەم هەندێ لە ئەندامانی گرنگی نەتەوە یەكگرتووەكان پرسیار بكەن كە ئایا عێراق(كە نەتەنها بۆ خەڵكی خۆی، بەڵكو بۆ ناوچەش هەڕەشەیە) دەتوانێت بە زوڵم و زۆرداری بە یەكگرتوویی بمێنێتەوە.

سێیەم: دەبێ نەتەوە یەكگرتووەكان هۆشداری بە عێراق بدات ئەگەر نەهێڵێت كێشەكە لە ڕێگای ئاشتیخوازانە چارەسەر بێت.

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن ئەم هەڵێنجاندنە كە ئێمە نابێت خۆمان بخەینە ناو كاروباری ناوخۆیی عێراق، لە كاتێكدا كە :

"ئێمە كۆنترۆڵی ٢٠٪ی هەرێمی زەمینی و ١٠٠٪ی هەرێمی هەوایی عێراقمان بە دەستەوەیە و بەیارمەتی هێزەكانی هاوپەیمانان دەتوانین ١٠٠٪ ی نەوتی هەناردەی عێراق بۆ دەرەوە كۆنترۆڵ بكەین و هەموو خەرجەكانمان لە داهاتی نەوتی عێراق كەم بكەینەوە و هەموو ئەو شتومەكانە كۆنترۆڵ بكەین كە لە ولاتانی دیكەوە دەچێتە ناو عێراق . كە وابوو ئەم بیرۆكەیە كە ئێمە نابێت دەستێوەردان لە كاروباری ناخۆیی عێراقدا بكەین بۆ ئەوەی پێش لە كوژرانی بە كۆمەڵی دەیان هەزار كەس بگرین ، ڕاست نییە .

چوارەم: ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ ڕوونی بكاتەوە كە ئێمە نامانەوێت بازنەی گەمارۆكانی سەر عێراق ئەوەندە بەرفراوان بكەینەوە كە زیان بە پێداویستییە ڕۆژانەكانی خەڵكی عێراق بگەیەنێت و ئەم گەمارۆانە تەنها بۆ كاتی دەسەلاتداری سەدام نابێت، بەڵكو بەردەوام

دەبێت هەتا كاتێك كە دەوڵەتێكی نوێ لە عێراق پێكبێت كە رێز لە مافی مرۆڤ و مافی سیاسی هاووڵاتیانی عێراق بگرێت .

پێنجەم : ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هەنگاوی هەڵگرتووە بۆ كۆتاییهێنان بە پەیوەندییەكانی لە گەڵ سەدام حوسەین و دەبێ هەوڵ بدات بۆ پێكهێنانی دادگایەكی نێونەتەوەیی راستیدۆزینەوە بۆ ئەوەی لێپرسینەوە لە گەڵ رەفتاری عێراق لە كوێت و لە راپەڕینەكەی ئێستادا بگرێت . بە بیروبۆچوونی من ئەگەر ئێمە بهێڵین ئەم تاوانانە شاراوە بمێننەوە ، دەبینین كە رێبەرانی جیهان رۆژێ لەرۆژان دەچنە بەغداد و تەوقە لە گەڵ سەدام یان هەر سۆپاسالارێكی خوێنرێژی بەعسی دیكە دەكەن كە بێتە جێگای سەدام و دامودەزگای ترۆر و سەركوتی( كە سەدام تەنها یەكێ لە دامەزرێنەرە سەرەكییەكانیەتی) سەدام بەرێوە ببات.

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن ، لێرە كۆمەڵێك كێشەی ئاڵۆزی یاسایی و ئەخلاقی هەیە. دەبێ لاپەرەیەكی نوێ لە یاسای نێونەتەوەیی بنووسرێتەوە. بە هەرحاڵ ئێمە با لە سەر راستیە بەرچاوەكان چڕ بینەوە . ژیانی هەزاران هەزار كەس لە دەستی ئێمەدایە. ئێمە دەسەڵات و یاسای نێونەتەوەییمان هەیە بۆ دەستێوەردانی نەتەوە یەكگرتووەكان لەم كێشەیەدا ،دەسەڵات و بڕیارەكانی ئەنجوومەنی ئاسایشمان هەیە بۆ پێناسە كردنی رێوشوێنەكانی پێشگیری لە كارەسات، دەسەڵاتی ئەوەمان هەیە ئەم رێوشوێنانە بسەپێنین بە سەر عیراقدا. ئەوەی كە ئێمە هێشتا نیمانە ، رێبەرایەتی ئەمریكایە كە بێ ئەوەش هەموو شتەكانی دیكە بێ كەڵك و بێ ئەنجام دەبێت . هیوادارم هێدی هێدی رێبەرایەتی ئەمریكا بێتە مەیدان .

## قەیرانی ئاوارەکان لە عێراقدا

### ٩ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" لیبرمەن[١] ":
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن من لە ١٢ی ژانویەی ئەمساڵ دەنگم دا بۆ پشتیوانی لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ شەڕکردن لە گەڵ سەدام حوسەین. من لە سەر ئەو بیر وباوەڕە بووم کە دەبێت کوێت ئازاد بکرێت . بەڵام ئێستا دەنگ دەدەم بەوە کە سەدام حوسەین لە ناو ببرێت . من لە لێدوانەکانی خۆم لەو ڕۆژە گرینگەدا لە ئەنجوومەنی پیران وتم "ئەخلاقی نێونەتەوەیی لە مەترسیدایە". سەرکەوتنی سەدام ، سەرکەوتنی بێسەرەوبەرەییە بەسەر سەرەوبەرەییدا ، سەرکەوتنی شەڕە بە سەر ئاشتیدا، سەرکەوتنی دیکتاتۆرییە بە سەر ئازادیدا و سەرکەوتنی بێ ئەخلاقییە بە سەر ئەخلاق دا.
ئێمە گەیشتینە ئامانجی خۆمان کە ئازاد کردنی کوێت و لە ناوبردنی توانایی سەدام بوو بۆ شەڕکردن لە گەڵ دراوسێکانی لە ساڵانی داهاتوودا . هەر بۆیە خەڵکی ئەمریکا و خەڵك و دەوڵەتانی وڵاتانی دیکە ئەمەکداری سەرۆك بۆش و سەربازە قارەمانەکانی ئێمەن کە هەموویان ئەرکی خۆیان بە باشترین شێوە ئەنجام دا .
بەڵام ئایا ئەخلاقی نێونەتەوەیی دەستەبەر بووە؟ ئایا سەدام حوسەین لە ڕاستیدا هەرەسی پێهێنراوە؟ ڕوخساری ماتی ئاوارەکان کە هەوڵ دەدەن لە ترۆریزمی سەدام حوسەین هەڵبێن و ڕوخساری بریندار، خوێناوی و سووتاوی منداڵانی کورد پێمان دەڵێت سەدام حوسەین بە بێ ئەخلاقییەوە هەروا درێژە بە کوشتنی خەڵکی بێگوناهی عێراق دەدات ، تەنانەت ئەگەر هەڕەشەی سەدام ئیدی لە سەر ئێمە نەمابێت .

---

[١] Mr. LIEBERMAN

سەدام ئیدی ناتوانێت لە گەڵ دراوسێكانی شەڕبكات . ئیدی كۆنترۆڵی چوارەمین سوپای مەزنی جیهان بە دەستی سەدام نییە بەڵام هێشتا كۆنترۆڵی یەكێ لە دڕندەترین سۆپاكانی جیهان دەكات و دەتوانێت هێرش بكاتە سەر خەڵكی بێ پاراستنی عێراق (كە هێرشیش دەكات) واتا كورد لە باكوور ، شیعە موسڵمانەكان لە باشوور و لە راستیدا هەر هاوولاتییەك كە بوێری دژایەتی دەسەلاتەكەی بكات . راپۆرت دراوە كە تەنها لە ماوەی هەفتەیەكدا هێزەكانی عێراق ٢تا٣ هەزار كەسیان لە گوندی قەرەهەنجیر كووشتووە . زیاتر لە ٢ میلیۆن كورد ئاوارە بوونە و ژمارەیەكی زۆری دیكە لە برسێتیدا دەمرن ئەگەر پێداویستییەكانیان دابین نەكرێ. كاتژمێر لە دوای كاتژمێر ژمارەیەكی زۆر لە كوردەكان لە زقم و سەرما، نەخۆشی ، برسێتی وبرینداری دەمرن كە هەمووی ئەمانە بەدەستی سەربازە عێراقییەكان دەكرێت.

لە بەرامبەر ئەم هەواڵە پڕئێش و ئازارانە دبێ بڵێین چارەسەریی كۆتایی لە كەنداو دەستەبەر نابێت مەگەر كاتێك كە سەدام لە سەر دەسەلات نەمێنێت و رژێمەكەی ئیدی دەست نەداتە كۆمەڵكوژیی خەڵكی بێگوناهی عێراق .

لە ماوەی شەڕی كەنداودا ، لە تەلەفزیۆنەكاندا بینیمان كە عێراقییەكان بۆمبارانەكانی هێزە هاوپەیمانەكانیان شەرمەزار دەكرد . ئێستا پەیمان بەوە برد ئەم شەرمەزاركردنە زۆرتر بە هۆی پروپاگەندەی حكومەتی عێراق بوو. لە راستیدا میلیۆنەها هاوولاتی عێراقی لە هەرەسهێنانی كۆتایی سەدام خۆشحاڵ دەبن . من دەزانم بۆچی ئێمە تەنها چەند هەفتە لەمەو پێش شەڕمان راوەستاند بەڵام خۆشبەختانە لە زۆربەی خاكی عێراق ، وەك قارەمان پێشوازی لە سەربازەكانی ئێمە كرا . هەندێ كەس خوازیاری كۆتایی پێهاتنی شەڕ بوون ( من بۆخۆم وا نەبووم ) بەڵام ئێستا روون بۆتەوە كە گەلێ لە خەڵكی عێراق لە راستیدا خوازیاری ئەوە بوون ئێمە زۆرتر بچینە پێش . ئەوان دەیانویست ئێمە لە شەڕی سەدام رزگاریان بكەین . بەڵام ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەرپرسیاری ئازاد كردنی عێراق نەبوو . گرتنی بەغداد بەشێك لە پلانی "شالاوی گەردەلوولی بیابان" نەبوو .

سەدام حوسەین پەی بەو راستییە برد کە سەربازەکان و تەنانەت کۆپتەرەکانی عێراق دەتوانن بە ئازادی لە سەراسەری عێراقدا چالاکی بکەن ( جگە لە باشووری ولآت کە لە دەستی ئێمەدا بوو) ، هەر بۆیە چالاکییەکانی خێراتر کرد . سەدام بە تەواوی کەڵکی لە راوەستانی شەڕ وەرگرت بۆ ئەوەی دەسەلآتی خۆی بە سەر ولآتدا پتەو بکات، دەسەلآتێك کە لە دوای شەڕ و لە ئەنجامی راپەڕینی کورد و شیعەکان (بە هاندانی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) لە گەڵ مەترسی رووخان رووبەڕوو ببوو .

ئێمە هەرەسمان بە سوپای سەدام هێنا ، کوێتمان ئازاد کرد ، بەشێك لە عێراقمان داگیر کرد و خەڵکی عێراقمان هاندا تا دژی سەدام حوسەین راپەڕین بکەن . هەمووی ئەمانە بە هۆی ئەوە بوو کە ئێمە جۆرێك شەڕاشۆییمان لە ناخی سەدامدا دەدیت کە پێشتر لەم سەدەیە هۆلۆکاستی خوڵقاند بوو و هەڕشەی لە ئاسایشی جیهانی شارستانی دەکرد . ئایا ئێمە مافی ئەخلاقی ئەوەمان هەیە لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی هەزاران پیاو، ژن و منداڵی بێ گوناهی عێراقی بە دەستی سەدام بێ دەنگ بین ؟

من لە ١٢ی کانوونی دووەم دەنگم دا بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی سەدام حوسەین تەنها لە بەر ئەوەی لەو بڕوایەدام کە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بە شوێن سەرکەوتنی یەکجارەکیدا بێت بە سەر سەدامدا. ئێمە دەبێت لە هەموو ئامرازە دیپلۆماتیك ، ئابووری و سەربازییەکان کەڵك وەربگرین بۆ ئەوەی سەدام لە سەر دەسەلآت لابەین . هەتا کاتێ دەسەلآتی سەدام مابێت ، ئاشتی و سەقامگیری بەتەواوی لە ناوچە ناچەسپێت .

ئەگەر ئێمە دەست بەکار نەبین ، ئەگەر ئەرکی خۆمان بە نیسبەت مرۆڤایەتی پشتگوێ بخەین ، ئەوکاتە هەروەها کە " وایت ئایزنهاوێر[٢]" سەبارەت بە سەرنەکەوتن لە شەڕ لەگەڵ شەرارەتدا وتوویەتی: " ویژدانی خۆمان خستۆتە ژێر پێ و لە روانگەی ئەوانەی کە رووبەڕووی زوڵم و زۆرداری بوونەتەوە ، ئێمەش شەریکی زاڵمەکانین" .ئێمە دەتوانین کاری زۆرتر بکەین بۆ شەڕکردن

---

Dwight Eisenhower[٢]

لە گەڵ شەرارەتی سەدام حوسەین (ودەبێ بیشیکەین) و پێشگرتن لە کوژرانی زیاتری خەڵکی بێ گوناه :

یەکەم : ئێمە دەبێ شالاّوی هەوایی خۆمان بەرفراوان بکەین بۆ گەیاندنی خۆراك، جل و بەرگ و خێوەت بەو ئاوارە زۆرانەی ناو و دەرەوەی عێراق . کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ بە زوترین کات وەلاّمێکی مرۆڤی بەم تراژیدییە مێژووییە بداتەوە .

دووم : سەرۆك کۆمار دەبێ رابگەیەنێت کۆپتەرەکانی عێراق دەخرێنە خوارەوە ئەگەر بفرن . ئەمە سیاسەتی ئێمەیە بە نیسبەت فرۆکەکانی عێراق و دەبێت بۆ کۆپتەرەکانیش بیگرینەبەر . کردەوەیەکی وەها خۆی لە خۆیدا نابێتە هۆی سەرکەوتنی راپەڕین بە سەر سەدامدا بەلاّم دەتوانین بە گرتنەبەری ئەم کردەوە سادەیە ، کۆتایی بە یەکێ لە ئامرازە دڕندەکانی سەرکوتی سەدام بێنین . ئێمە دەتوانین لە ماوەیەکی کورتدا گەلێ کەس لە مردن رزگار بکەین.

سێیەم : دەبێ یارمەتی بە پەسەند کردنی بڕیارنامەیەکی نوێ لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بدەین کە سەرۆك وەزیرانی بریتانیا ، جان مەیجر[3] پێشنیاری کردووە . ئەم رێگاچارەیە هەرێمێکی دژەفرین لە ناو خاکی عێراق بە چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان درووست دەکات بۆ دابین کردنی ئارامی و ئاسایش بۆ ئاوارەکان . بەلاّم هەرێمی دژەفرین بە بێ پاراستنی هێزی سەربازی درووست نابێت . ئارامی و ئاسایشی ئەم هەرێمە دژەفڕینە دەبێ لە رێگای بەکارهێنانی هێزی سەربازی بپارێزرێت بۆ ئەوەی ئەگەر رۆژێك دەستدرێژی کرایە سەر، وەلاّمی بدرێتەوە . شتێك کە ئێمە لە سەدام فێر بووین ئەوەیە کە سەدام رێز لە هیچ شتێك ناگرێت مەگەر ئەوە کە هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی لێ بکەیت یان هەر بە کردەوە هێزی سەربازی دژی بەکاربهێنێت .

چوارەم : ئێمە دەبێت هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی لە سەدام بکەین یان بە کردەوە هێزی سەربازی دژ بەکار بهێنین بۆ ئەوەی کۆمەڵکوژی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سڤیل تەنانەت لە

---

John Major [3]

دەرەوەی هەرێمی پارێزراو رابوەستێنین . له کاتێکدا که ئێمه نابێت خۆمان لـه روی سـەربازییەوە بخەینە ناو شەڕێکی ناوخۆیی له عێراقدا بەڵام بەرپرسیارین لەوەی که نەهێڵێن کۆمەڵکوژییـەکی نوێ روویدات . ئێمه ئەرکی ئەوەمان له سەر شانه که خەڵکی بێ گوناح له بەرامبـەر لەناوچـوون بە دەستی سوپایەکی مۆدێرن و میکانیزە بپارێزین.

پێنجەم : دەبێ له کاتی خۆیدا سیاسەتی هەرێمی پارێزراو بکرێت به سیاسەتی گەڕانەوەی کورد و ئاوارەکانی دیکه بۆ زێدی خۆیان . دەبێ نەتەوە یـەکگرتووەکان ڕێگایـەك بدۆزێتـەوە بـۆ ئـەوەی ئاوارەکان بگەڕێنەوە سەر زێدی خۆیان بێ ئەوەی تووشی دەستدرێژی گوللـەو بۆمبـاران ببنـەوە ، ئێمه ناتوانین بوونی کەمپی ئاوارەکان بۆ درێژخایەن تەحەمول بکەین . ئاوارەکانی عێـراق مـافی ئەوەیان هەیه بگەڕێنەوە زێدی خۆیان و له ئاشتیدا بژین .

شەشەم : ئێمه دەبێت بۆ عێراقی روون بکەینەوە که هەموو ئەو پارانـەی کـه بـۆ چارەسـەرکردنی کێشەی ئاوارەکان خەرجمان کردووە دەخەینـە سـەر قـەرزە نێونەتەوەییـەکانی عێـراق . سـەدام و دارودەستەکەی دەبێ بزانن هەر کردەوەیەك که ئەوان دژی خەڵکی خۆیان ئەنجامی بـدەن ، عێـراق له کۆمەڵگای نێونەتەوەیی گۆشەگیرتر دەکـات و سـەر لـه نـوێ ئاوەدانکردنـەوەی عێـراق پـاش دەخات. خۆشبەختانه باوەڕ ناکەم هەتا کاتێك کـه سـەدام لـه سـەر دەسـەڵات مابێـت ، عێـراق بتوانێت نەوتەکەی به ئاسایی بنێرێتە دەرەوە.

سەرەنجام ، ئەگەر سەدام بتوانێت له مانگەکانی داهاتوودا له سەر دەسەڵات بمێنێتەوە، ئێمه دەبێ بۆ له سەر دەسەڵات لابردنـی سـەدام نەتـەنها بـه درووشـم بـەڵکوو بـه کـردەوە پـشتیوانی لـه راپەڕیوانی کورد و ئەوانی دیکه بکەین که بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی رەوا له عێراق خەبات دەکەن . له کاتێکدا که دابین کردنی پێداویستی سەربازی و ماددی بۆ خەباتکارەکان کارێکی سادە نییـە بەڵام دەبێ له فکری دابین . لێرە کەسانێك هەن که دەڵێن هەموو ئەو قسەو باسانە سـەبارەت بـه وەی که دەبێ چی له گەڵ سەدام و ئاوارەکانی عێراق بکەین ، بێ ئەنجامە له بەر ئەوەی که ئێمـه هیچ بەرژەوەندییەکی بازرگانیمان بۆ دەستێوەردان لـه کاروبـاری نـاوخۆیی وڵاتێکـی سـەربەخۆدا

نییــه. راســته عێــراق ســهربهخۆیه بــهڵام ســهدام حوســهین ســهربهخۆ نییــه ، ئێمــه هــیچ بهرپرسیاریهتییهكمان نییه بۆ ئهوهی وهك سهرۆكی ولاتێكی رهوا حیساب بـۆ سـهدام بكـهین یـان ههڵسوكهتی لهگهڵ بكهین . سهدام مرۆڤكوژه ، تروریـستێكه كـه بـه زۆر بـه سـهر ولاتهكهیـدا حكوومهت دهكات و هیچ رهواییهكی نییه .

ههموو مافێك بۆ ئێمه پارێزراوه بۆ ئهوهی یارمهتی خهڵكی عێـراق بـدهین كـه دهیانـهوێت لـه دهستی ئهم تاوانباره رزگار بن و ببن به خاوهن دهوڵهتێكی رهوا له عێراقدا . ئێمه مافی ئـهوهمان ههیـه و بهرپرسیاریـشین لـه بهرامبـهر ئـهوهی لـه هێــز و دهسترۆیـشتوویی خۆیـان لـه نهتـهوه یهكگرتووهكان و له نێوان هاوپهیمانهكانمان كهڵك وهر بگرین تـا لـهرێگای بالادهسـتی سـهربازی خۆمان ، عێراق و جیهان له شهڕی سهدام رزگار بكهین له بهر ئـهوهی رێگـای دژواری ئاشـتی و ئاسایش له ناوچه به كوژرانی ههزاران ــ و لهوانهیه میلیۆنان ــ قوربانی بـێ گونـاه بـه دهسـتی سهدام دهستهبهر ناكرێت .

كوێت رزگار بوود بهڵام كاری كۆمهڵگای نێونهتهوهیی كۆتایی نایێت ههتا كاتێك كـه عێـراق لـه دهسهڵاتی سهدام حوسهین رزگار نهبووه .

## له کوشندەکانی عێراق

## ٩ی نیسانی ١٩٩١ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "دۆل" [١] :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، یەك دەیە پێش جیهان کۆمەڵکوژی خەڵکی لە کامبۆجیا بینی. ئەمڕۆ مانشێتی رۆژنامەکان کۆمەڵکوژی دزێوی عێراق وێنا دەکەن . هەموومان بە تراژیدیای ئاوارە کوردەکان لە باکوور و ئاوارە شیعەکان لە باشوور هەژاوین ، کەوابوو گەلێ لەم خەڵکە بێ پاراستنە ( ژن و منداڵ و گەورە) تەنها قوربانی شەڕ یا راپەڕین نین ، بەڵکوو قوربانی تراژیدیای سەدام حوسەینن بە تاوانی ئەوەی کە دژایەتی سیاسی سەدامیان کردووە. وەك خەڵکێکی مرۆڤدۆست ، ئێمەی خەڵکی ئەمریکا پەیوەست دەبین بە خەڵکی شارستانی جیهان بۆ کۆتایی پێهێنان بە کوشتنی خەڵك . ئێمە پەیوەست دەبین بە دەوڵەت و نەتەوەکانی دیکە بۆ یارمەتیدانی سەدان هەزار خەڵکی ئاوارە کە ئێستا لە سەر سنوورەکانی باکوور و باشووری عێراق کۆبوونەتەوە.

من ستایشی سەرۆك کۆمار دەکەم بۆ ئەوەی بڕیاری داوە ١١میلیۆن دۆلار بۆ یارمەتیدانی خێرای ئەم ئاوارە زۆرانە تەرخان بکات ، بە تایبەت خستنەخوارەوەی کەلوپەل لە رێگای فڕۆکەکانەوە بۆ ئاوارەکان کە دەربڕی پەیامی ئێمەیە . من وای بۆ دەچم سەرۆك کۆمار هەنگاوی زیاتریش هەڵدەگرێت بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی ئاوارەکان . لە هەمان کاتدا لە سەر ئەو بڕوایەم سەرۆك کۆمار مافی ئەوەی هەیە بڕیاری ئەوە بدات کە دەستێوەردانی سەربازی لەم رەوشە ئاڵۆز و تراژیدییەدا بکات .

---

[١] Mr. DOLE.

لە راستیدا جێگای داخە کە هەندی کەس ـ کە تەنها چەند هەفتە لەمەو پێش دەنگیان نەدەدا بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی هێزی سەربازی دژی دەستدرێژی ئاشکرا و دڕندانەی سەدام بۆ سەر وڵاتێکی دراوسێ خۆی و باسی مەترسییەکانی تێوەگلانی ئەمریکا لە زەلکاوی سیاسەتی عەرەبیان دەکرد ـ ئێستا دەنگ بۆ ئەوە دەدەن کە سەرۆك بوش راستەوخۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێوەگلێنێتە ناو کێشەکە. هیوادارم و لە سەر ئەو بڕوایەشم کە سەرۆك کۆمار هەروا لە بەرامبەر ئەم دەنگانە رادەوەستێ . ئەمجارە زەلکاوەکە جیدییە . خەباتی کورد و شیعەکان دژی سەدام حوسەین لەو رۆژەوە دەستی پێنەکردووە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شاڵاوی سەربازی دژی عێراق ئەنجامدا .

ئەگەر ئێمە بەهەر شێوەیەکی دیکە دەستێوەردانمان لە کێشەکە بکردبایا واتا ئەگەر هێزێکی زۆری سەربازیان بەکار نەهێنابایا، ئەم سەرکەوتنە خێرا و ئاسانەی ئێستا بە دەست نەدەهات و ئەمریکا دەکەوتە ناو شەڕێکی بێ کۆتایی دارزێنەر و جۆرێك بێ سەرەوبەرەیی باڵی بە سەر عێراقدا دەکێشا کە رێگای بۆ دستێوەردانی وڵاتانی دیکە ، وەك ئێران خۆش دەکرد و هەروەها کە چاودێرێکی زیرەك لە رۆژنامەی "نیۆیۆرك تایمز"دا نووسیویەتی (و من لە گەڵیدام) لە ئاکامی دەستێوەردانی ئەمریکا لەم کێشەیە ، سەرکوت و ئێش و ئازاری کوردەکان و عێراقییەکانی دیکە زۆر لەوە تراژیدیکتر دەبوو .

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داواکارم وتارەکەی رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ لە ژێرناوی "لە دەرەوەی شەڕی ناوخۆیی عێراق بمێننەوە " بخرێتە بەر دەستی ئەندامانی ئەنجوومەن کە پرۆفسۆر" شیبلی تەلهامی"[٢]، مامۆستای زانکۆی" کۆرنێل"[٣] "نووسیویەتی.

کۆمەڵێك ئاڵتەرناتیف هەیە لەم نێوەدا . ئێمە دەتوانین هەروەك پێشتر لە نەتەوە یەکگرتووەکان کەڵك وەربگرین بۆ گۆڕینی رەفتاری عێراق ، هەروەك چۆن ئەم هەفتەیە لە رێوشوێنەکانی

---

[٢] Prof. Shibley Telhami

[٣] Cornell University

ئاگربەستدا كۆمەڵێك شەرت و مەرجمان داناوە بۆ عێراق . بڕیارنامەی نوێ بێ هاوكاری كۆمەڵگای نێونەتەوەیی جێبەجێ ناكرێت . دەبێ ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا گارانتی ئەوە بكات كە یارمەتی مرۆڤدۆستانە بگاتە دەستی هەموو خەڵكی سەركوتكراوی عێراق لەوانە ئاوارەكانی ژێر چاودێری نەتەوە یەكگرتووەكان. لە كۆتاییدا دەبێ ئەوە بزانین كە ئەو شتانەی كە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەتوانێت بیكات ، سنووردارە هەرچەند كە هێزی ئەمریكا لە جیهانی ئەمڕۆدا بێ وێنەیە.

بەلام جەنابی سەرۆكی ئەنجومەن ، خۆتێوەنەگلاندن بە واتای ئەوە نییە كە ئێمە ئاگاداری رەوشەكە نین ، ئێمە زۆر بە وردی ئاگادارین، ئاگاداربوونی ئێمە لەو هەنگاوانەدا دەردەكەوێت كە سەرۆك كۆمار هەڵیگرتووە و ئەو هەولانە كە گەلێ لە گرووپە ناحكومییەكان و هاوولاتیان داویانە بۆ یارمەتیدانی ئاوارەكان . هەروەها خۆتێوەنەگلاندن بە واتای ئەوە نییە كە ئێمە هیچ كارێك نەكەین، كۆمەڵێك هەنگاو هەیە كە ئێمە دەبێ هەڵیبگرین. هەروەها كە هەموومان دەزانین ، "بەیكێر[٤]" وەزیری دەرەوەی ئەمریكا ئێستا لە ناوچەدایە و خەریكی ئاوتوێی كردنی ئەوەیە لە گەڵ دراوسێكانی عێراق كە چ هەنگاوێ گونجاوە و ئەنجامی دەبێت، "بەیكێر" سەردانی ئاوارە كوردەكانیشی كردووە.

نەتەوە یەكگرتووەكان پێشتر بڕیارنامەیەكی پەسەند كردووە و بەتووندی زیادەڕۆییەكانی ئە دواییانەی سەدامی شەرمەزار كردووە . قوورسایی یەكدەنگی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی و گوشاری بیرۆكەی گەمارۆ ئابوورییەكان لە سەر عێراق هەروا بەردەوامە و بە دڵنیاییەوە بە بیروبۆچوونی من ئەگەر ئێمە كۆمەڵێك هەنگاوی باش لە سەدام حوسەین نەبینین، نابێ گەمارۆكان هەڵگرین . هەروەها ئێمە دەبێ بە جیدی پێشنیارەكەی بەریتانیا لە بەرچاو بگرین بۆ دامەزراندنی ناوچەی پارێزراو لە ناو خاكی عێراق بە چاودیری نەتەوە یەكگرتووەكان.

---

[٤] Baker

لە گەڵ ئەمەشدا هەتا کاتێك کە ئاوارەکان لە ژێر مەترسی کومەڵکوژی سەدام دان ، ئێمە دەبێ پێداگری لەسەر ئەوە بکەین کە تورکیا و ئێران شوێنێکی ئەمنی کاتی بۆ ئاوارەکان درووست بکەن و خۆیشمان هەرچی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی کومەڵگای نێونەتەوەیی یارمەتی بە ئێران و تورکیا بدات کە باری ئەم هەموو ئاوارەیانە لەسەر شانە.

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، ئێمە سەرکەوتنێکی گەورەمان لە شەڕی کەنداو بەدەست هێنا بەڵام ئەو تراژیدیایە کە لە عێراق بەڕێوە دەچێت ، هێشتا هەڕەشەیەکی جیدیە بۆ ئاشتی ، سەقامگیری و ئاسایشی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و کەنداوی فارس . هەموو ئەمریکا لە هەوڵە سەرکەوتووکانی ئێمە لە شەڕی کەنداو بەشدارە : سەرۆك کۆمار ، کۆنگرێس و پێش هەموو شتێك خەڵکی ئەمریکا . با ئێمە لە ئامانج و بڕیارەکانماندا بۆ گەیشتن بە ئاشتییەکی بەرفراوانتر و درێژخایەنتر هەمان یەکێتیەمان هەبێت .

## کورد و ئاژینی نوێی جیهانی
## ٩ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

تاوتوێکردنی گەلاڵە یاسایەك بۆ چاکسازی لە یاسای یارمەتی ساڵی ١٩٦١ بۆ هەموار کردنی گەیاندنی پێداویستی پزیشکی و یارمەتیەکانی دیکە بە خەڵکی کورد بۆ سارێژ کردنی ئێش و ئازارەکانیان لە لایەن کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران:

بەڕێز "مۆینیهان" :

بەڕێز جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت پێشنیاری گەلاڵە یاسایەك بکەم بۆ تەرخان کردنی ٥٠ میلیۆن دۆلار یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کوردەکانی عێراق. ئەمە بە جۆرێك دەربڕی هەڵویستی کۆنگرێسە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە گوێرەی بەشی VII مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان ئامرازی کاریگەر بە کار بهێنییێت بۆ راوەستانی هێرشە نایاساییەکانی عێراق بۆ سەر خەڵکی سڤیل . هێرشەکانی ئەم دواییانەی دەوڵەتی عێراق — و بەرپەرچدانەوەکانی ئێمە — کۆمەڵێك پرسیاری بنەڕەتی درووست کردووە سەبارەت بەوە کە ئایا ئێمە دەمانەوێت ئاژینێکی نوێی جیهانی پاش قەیرانی داگیرکردنی کوێت بە دەستی عێراق پەیڕەو بکەین یا نا؟

بە گوێرە مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان ( بە تایبەت مادەی ٢٧) هەندێك رووداو لە چوارچێوەی ناوخۆی هەر وڵاتێکدان و لە دەرەوەی لێوەشاوی ئەنجوومەنی ئاسایشن . بەڵام ئەم مادەیە بۆ باسەکەی ئێمە وەڕاست ناگەڕێت . ٢ میلیۆن کوردی عێراق لە دەستی سەربازانی عێراق هەڵهاتوون . ئەم ئاوارانە چوونەتە ناو خاکی ئێران و تورکیا و کێشە و ناسەقامگیریان بۆ ناوچە درووست کردووە ، کە وابوو گومان لە وەدا نییە کە ئەم رووداوانە بە گوێرەی مادەی ٣٩

هەڕەشەن بۆ ئاشتی . لە راپۆرتەکەی "ئالان ریدینگ[1]" بۆ رۆژنامەی "نیویۆرك تایمز" کە سەرلەبەیانی ئەمڕۆ بلاو بۆتەوە ، هاتووە کاربەدەستانی تورك وتوویانە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن ژمارەی ئەو کوردانەی کە لە عێراق هەڵهاتوون لە هەفتەکانی داهاتوودا بگاتە یەك میلیۆن کەس و دابین کردنی پێداویستییە هەمیشەییەکانی ئەم ژمارە زۆرە لە دەرەوەی توانایی کۆمەڵگای نێونەتەوەییە . ئەوان دەڵێن ئاوارەبوونی ٣٠هەزار کەس کێشەیەکی مرۆڤییە بەلاّم ئاوارە بوونی یەك میلیۆن کەس کێشەیەکی سیاسیە . بە گوێرەی راپۆرتەکان ، چاوەڕوان دەکرێت ١/٥ میلیۆن ئاوارەی کورد بچنە ناو ئێران.

لەمە زیاتر یاسای نێونەتەوەیی ئێستا لە گەڵ شەڕێکی ناوخۆیی بەرەورووییە . بە گوێرەی پەیماننامەی چوارەمی ژنێڤ لە ساڵ ١٩٤١ بۆ پاراستنی خەڵکی سڤیل لە کاتی شەڕ، هێرشکردنە سەر کەسانێك کە بەشداریان لە شەڕدا نەکردووە بە تەواوی قەدەغەیە . ئەم قەدەغەبوونە تەنانەت بۆ کاتێکیش کە شەڕ تایبەتمەندی نێونەتەوەییشی نییە ، وەڕاست دەگەڕێت .

عێراقیش وەکوو هەموو دەوڵەتانی دیکە دەکەوێتە ناو ئەم پەیماننامەیە . ئەم هێرشە دڕندانە بۆ سەر خەڵکی سڤیل پتر لەوەی کە بێ ئەخلاقی بن ، نایاساییین . ئەنجوومەنی ئاسایش بە دەستپێشخەری فەرانسا هەنگاوی یەکەمی لەم پەیوەندییەدا هەڵگرتووە . ئەوان لە راستیدا گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە ئەم بارووددۆخە هەڕەشەیە بۆ ئاشتی و فەرمانیان داوە بە سوپای عێراق ئەم هێرشانە رابوەستێنێت و عێراقیش بە گوێرەی مادەی ٢٥ی مەنشوور دەبێ رابیوەستێنێت . ئەگەر عێراق سەرپێچی بکات ، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێت ئەو کارە جوانەی کە بۆ دامرکاندنەوەی قەیرانی کەنداوی فارس، کردی بۆ ئەم قەیرانەش بیکات و دەبێ ئامرازەکانی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان بە کار بهێنێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لەبەرامبەر هەڕەشە لە سەر ئاشتی رابوەستێت . ئامرازەکان لە بەردەستدان : یاسای نێونەتەوەیی ، مادەی ٣٩ی مەنشوور ، مادەی ٤١ی مەنشوور ( سەبارەت بە گەمارۆکان) و مادەی٤٢ (

---

[1] Alan Riding

سەبارەت بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە). بۆ نموونە مادەی ٤٢ ڕێگەدەدات بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی لە کاتێکدا کە گەمارۆکان کاریگەری ئەوتۆیان نەبێت . ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێت فەرمان بە کۆپتەرەکانی عێراق بدات هێرشەکانیان رابوەستێنن و ئەگەر عێراق سەرپێچی بکات ، ئەنجوومەنی ئاسایش فەرمان بە هێزە هاوپەیمانەکان لە ناوچە بدات کە هەندێ لە کۆپتەرەکانی عێراق بخەنە خوارەوە .

کاتێك کە سەدام حوسەین کوردەکانی بە چەکی کیمیایی لە ساڵی ١٩٨٨ بە کۆمەڵ کوشت ، یەکێ لە گرینگترین پەیماننامە نێونەتەوییەکانی پێشێل کرد کە پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێف بوو سەبارەت بە قەدەغەبوونی کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی . ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ کارێکی نەکرد بۆ پێشگیری لەم رووداوە ، بە پێچەوانەوە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەتا ئەو رۆژە کە عێراق کوێتی داگیر کرد ، دژی گەمارۆدانی ئابووری عێراق راوەستا. بە هەرحاڵ لە قەیرانی دووەمی( شەڕی کەنداو) دا بینیمان کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە توندی جەختی لە سەر جێبەجێ کرانی یاسای نێونەتەوەیی دەکردەوە . حکوومەتی ئەمریکا ئامرازەکانی مەنشووری بە کارهێنا و بە تەواوی گەمارۆی ئابووری خستە سەر عێراق . قەیرانی ئێستا ئەم پرسیارەمان رووبەڕوو دەکاتەوە کە ئایا ئەم دەروەسبوونە بەنیسبەت ئاژینی نوێی جیهانی، دەرکردنی سەربازانی عێراق لە کوێتی لێ دەکەوێتەوە یا نا . من پشتیوانی لە داواکاری سەرۆك کۆمار دەکەم بۆ گەڕانەوە بۆ سەروەری یاسا و هیوادارم ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە بە کارەکانی بدات ، ئەگەر بەراستی لە سەر ئەو بیروباوەڕەیە کە دەکرێت بەشی V I I ی مەنشوور بەکار ببرێت بۆ جێبەجێ کردنی سەروەری یاسا .

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن باوەڕ ناکەم ئەو بڕە پارمەتییە کە ئەم یاسایە تەرخانی کردووە ، بەس بێت لە بەر ئەوە کە پێشتر خەرجی دابینکردنی پێداویستییەکانی ٢میلیۆن ئاوارە ١٠ هێندەی ئەو بڕە پارەیە بووە کە ئەم یاسایە تەرخانی کردووە ، بەلام ئەم سەرەتایەکە .

من پیرۆزبایی له حكومەتی ئەمریكا دەكەم بۆ بڕیارەكەی بۆ دەستپێكردن و ناردنی یارمەتی و هیوادارم بە ئەنجامی خۆی بگات .

دڵنیام كە هەروەها كە قسەكانی بەڕێز "گۆر" نیشان دەدات ئێمە یاسایەكی نێونەتەوەییمان هەیە كە ئەمڕۆ بەكار دەبردرێت . ئەم یاسایە بەشێكە لە كۆنڤانسیۆنی چوارەمی ژنێڤی ١٩٤٩ كە سەبارەت بەو ناكۆكیانەیە كە جەوهەری ناوخۆییان هەیە . هەروا كە جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن دەزانێت كۆنڤانسیۆنی ژنێڤ كۆمەڵێك پەیماننامە لەخۆ دەگرێت كە بەدوای جەنگی جیهانی دووەم پەسەند كرا بەو مەبەستە كە تاوانەكانی شەڕ كە دەوڵەتی ئاڵمانیای نازی و دەوڵەتانی دیكە پاش جەنگی جیهانی دووەم ئەنجامیان دابوون ، ببێ بە ئەجیندای دادگاكانی "نۆرێمبێرگ "[٢] .

ئەم كردەوانەی عێراق پێشێل كردنی یاسای نێونەتەوەییە كە ئەمڕۆ هەیە و لە زۆربەی ساڵانی ئەم نیوسەدەی دواییە هەر بووە . من وەبیری سەرۆكی ئەنجوومەن دەهێنمەوە ( هەرچەند كە پێویست وەبیر هێنانەوە ناكات ) كە وەك پەیماننامەیەك ، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ بە دوای ئەم كێشەیە دابچێت . ئێمە ئەو پەیماننامەیەمان واژۆ كردووە و بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی ئێمە، هەموو پەیماننامەیەك لە حوكمی یاسای باڵای وڵاتە . ئێمە لەم پەیوەندییەدا هیچ ڕێگاچارەیەكی دیكەمان نییە جگە لەوەی كە یاسا جێبەجێ بكەین . سەركەوتن شتێكی هەمیشەیی نییە ،بەڵام دەبێ هەوڵی بۆ بدەین .

پرسیارەكە ئەوەیە كە كاتێك كە باسی ئاژینی نوێی جیهانی دەكەین چی لە مێشكی ئێمەدایە لەبەر ئەوەی لە ماوەی ئەم ساڵانەدا ڕووداوگەلێكی بەرچاومان بینیوە بەڵام نەمانویستووە وەڵامیان بدەینەوە بە هۆی ئەوەی ناوەرۆكی مەنشووری نەتەوە یەكگرتووەكان بە تایبەت مادەی ٢ی بەشی ٧ دەڵێت " ئەو ڕووداوانە كە لە بنەڕەتدا لە چوارچێوەی ناوخۆیی وڵاتێكدان ، لە دەرەوەی لێوەشاوەیی ئەنجوومەنی ئاسایشە". ئێمە ویستوومانە بە سادەیی ئەو ڕووداوانە

---

[٢] Nuremberg tribunals

پشتگوێ بخەین کە پێویستی بە وەڵامدانەوەی ئێمە هەبووە ، هەروەك کێشەی سەربازانی عێراق کە ئێستا ٢ میلیۆن کوردی عێراقیان ئاوارەی ناوخۆ و دەرەوەی عێراق کردووە .

کوردستان ناوچەیەکی گەورەیە کە بەسەرهاتێکی ناخۆشی بووە و لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران ، عێراق و تورکیا ( لە ئیمپراتۆری عۆسمانی کۆن ) دا هەڵکەوتووە کە سنوورەکانیان پاش پەیماننامەی "سیڤر" – کە کۆتایی بە شەڕی نێوان هاوپەیمانان و ئیمپراتۆری عۆسمانی هێنا — دیاری کرا. دەمەوێت وەبیرتان بێنمەوە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩١٧ شەڕی رانەگەیاند دژی ئیمپراتۆری عۆسمانی بەڵام دژی ئالمانیا، نەمسا و هەنگاریا راگەیاند . لە ئەنجامدا ئێمە هیچ بەشدارییەکمان لەم پەیماننامەیەدا نەکرد بەلام لە قۆناخی دواتردا بینیمان کەوتووینەتە ناو کێشەکە. هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەم بارودۆخەی ئەمڕۆ لە پێشەوە پێشبینی دەکرا و قابلی قبووڵ نییە کە ئالۆزییەکی مرۆڤایەتی تەنها بەدەربڕینی نیگەرانی کۆتایی پێبێت .

بە رێبەرایەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بوو کە کۆنڤانسیۆنی ١٩٤٩ی ژنێڤ پەسەند کرا . کۆنڤانسیۆنی چوارەمی ژنێڤ سەبارەت بە پاراستنی خەڵکی سڤیلە لە کاتی شەڕدا . ئەم کۆنڤانسیۆنە هێرشکردن بۆ سەر خەڵکی سڤیلی بە تەواوی قەدەغە کردووە کە بەشداریان لە شەڕدا نەکردووە . ئایا ئەم قەدەغەبوونە دەکرێت بۆ" ناکۆکییە چەکدارییەکان کە جەوهەری نێونەتەوەییان نییە"بەکار ببردرێت. بەڵێ ئەم قەدەغەبوونە بۆ بارودۆخگەلێك وەك ئەو هەڕەشەیە کە ئێمە ئێستا لە گەڵیدا رووبەڕووین ، وەڕاست دەگەڕێت ، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە لە ئەنجامی ناکۆکێکی نێونەتەوەییدا سەری هەڵداوە .

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، من بە نوێنەرایەتی لە لایەن بەڕێزان داماتۆ[٣] ، " پێل "[٤] ، "گۆر"[٥]،" بینگمەن "[٦]، "فۆرد"[٧]،" لیبەرمان"[٨]،" ویلستۆن"[٩]، "لڤین"[١٠] و" ساربانز "[١١]

---

D'AMATO [٣]
PELL [٤]
GORE [٥]

گەلاڵەیەکم ئامادە کردووە بۆ چاکسازی لە یاسای یارمەتی بیانی ١٩٦١ بۆ هەموار کردنی دابین کردنی پێداویستی پزیشکی و یارمەتییەکانی دیکە بە خەڵکی کورد بۆ کەم کردنەوەی ئێش و ئازارەکانیان. ئێمە بە گوێرەی پرنسیپە مرۆڤی و یاساییەکان کار دەکەین، ئێمە نابێت بێ دەنگ رابوەستین، ئیمە بەرپرسیارین بە نیسبەت یاساکانمان . کۆنوانسیۆنی ١٩٤٩ی ژنێڤ پەیماننامەیەکە کە ئێمە واژۆمان کردووە کە بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی ئەمریکا لە حوکمی یاسای بەرزی وڵاتدایە و من ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە ئێمە نەمانەوێت جێبەجێی بکەین .

ئەمە دەقی گەلاڵە یاساکەیە:

بەشی الف ــ یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کورد : فەسڵی ٩ی بەشی ١ی یاسای یارمەتی بیانی ١٩٦١ (سەبارەت بە یارمەتیدان بەکارەساتە نێونەتەوەییەکان) چاك کرا و ئەم بەشە نوێیە بە کۆتاییەکەی زیاد کرا:

ئا ــ کۆنگرێس بڕیاری دا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بە خێرایی یارمەتی بە خەڵکی کورد و ئاوارەکانی دیکەی عێراق بدات کە کەوتوونەتە بەر هێرشی سەربازانی عێراق .

ب ــ بەڕێوەبەری ئاژانسی پێشکەوتنی نێونەتەوەیی دەبێ :

١ــ بە گوێرەی دەسەڵاتەکانی ئەم بەشە ، یارمەتی مرۆڤدۆستانە بدات بە خەڵکی کورد

٢ــ یارمەتییە پێشکەشییەکانی ڕێکخراوە نادەوڵەتییەکان کۆ بکاتەوە بۆ یارمەتیدانی کورد و ئاوارەکانی دیکە کە لە عێراق هەڵهاتوون .

٣ــ هاوکاری بکات لە گەڵ ئاژانسە ناحکومییەکاندا بۆ دابین کردنی ئەم یارمەتیانە.

---

BINGAMAN[٦]
. FORD[٧]
LIEBERMAN[٨]
WELLSTONE[٩]
[١٠] LEVIN
[١١] SARBANES

٤ــ ڕێگە بە فەرماندەری گشتی ئیدارەی گوازتنەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەدرێت هەموو ئامرازە هەوایی و دەریاییەکان بەکار ببات بۆ گوازتنەوەی یارمەتییە پزیشکییە حکومی و ناحکومییەکانی ئەمریکا بە ئاوارەکان.

٥ــ جگە لەو پارەیە کە ئەم فەسڵە تەرخانی کردووە، ٥٠ میلیۆن دۆلاری دیکە لە لایەن سەرۆکی ئەنجومەنەوە تەرخان دەکرێت بۆ جێبەجێ کردنی برگەی ١و٢ی ئەم گەلاڵەیە یاسایە

٦ ــ ئەو بڕە پارەیە کە بۆ جێبەجێ کردنی پاراگرافی ١ تەرخان کراوە هەتا کاتی پێویست لە بەردەستدا دەبێت

٧ ــ ئەو دەسەڵاتە کە یاسای یارمەتی بیانی ١٩٦١ داویەتی بۆ گوازتنەوەی پارە لە نێوان ژمارە حیسابەکان، نادرێت بەو پارەیە کە بۆ جێبەجێ کردنی پاراگرافی ١ تەرخان کراوە.

٨ ــ یارمەتییەکانی ئەم بەشە ناکەوێتە ناو بازنەی ڕێوشوێنەکانی دیکەی ئەم یاسایە .

٩ــ بە لەبەرچاوگرتنی گرنگی ئەم یارمەتییە مرۆڤدۆستانەیە ، کۆنگرێس پێداگری لەسەر سەرۆك دەکات لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێی عێراق دەست بکات بە وتووێژ.

١٠ــ یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان دەبێ بە گوێرەی ڕێوشوێنەکانی ئەم بەشە بدرێت بە ئاوارە سڤیلەکانی عەربستانی سعوودی ، کوێت و باشووری عێراق کە لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە داگیر کراوە.

١١ــ یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکانی ئەم بەشە، ئەم شتوومەکانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێت بەڵام دەتوانێت لەمەش زیاتر بێت: بەنزین ، گاز و سووتەمەنی ، پێداویستییەکانی پاڵاوتنی ئاو ، پێداویستییەکانی خۆپاراستن، پێداویستییەکانی پێشگیری لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە پەتاکان و پاراستنی گشتی، دەواو دەرمان ، خۆراك و جل وبەرگ

بەشی ج:بە نیسبەت هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر کورد و خەڵکی سڤیلی دیکەی عێراق ، کۆنگرێس لە سەر ئەو بڕوایەیە کە :

تا : هێرشکردنە سەر خەڵکی سڤیل لە عێراق پێشێل کردنی مادەی ٣ی کۆنڤانسیۆنی چوارەمی ژنێڤە لە ١٢ی ئابی ١٩٤٩ سەبارەت بە پاراستنی خەڵکی سڤیل لە کاتی شەڕدا

ب : هێرشکردنە سەر خەڵکی سڤیلی لە عێراق ، مەترسییە بۆ ئاشتی و سەقامگیری ناوچە

ج : وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ داوا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کۆمەڵێك رێوشوێن بگرێتە بەر تا بە گوێرەی بەشی VII ی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان پێش لەم هێرشانە بگرێت.

## گەیاندنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە کورد کەمترین کارێکە کە ئێمە دەتوانین بیکەین

### ٩ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" ویلسۆن ":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن من سپاسی سناتۆرەکانی ئەیالەتی نیویۆرک دەکەم بۆ ئامادەکردنی ئەم گەڵاڵە یاسایە کە ڕێگا هەموار دەکات بۆ دابین کردنی پێداویستی پزیشکی و یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکانی دیکە بۆ خەڵکی کورد و ئاوارەکانی دیکەی عێراق لەو ناوچەیە کە هێزە هاوپەیمانەکان گرتوویانە .

بە تاوانی ئەنجامدانی ڕاپەڕینێکی کورتخایەن ، خەڵکی کورد لە زێدی خۆیان دەرکراون و بە دەستی هێزەکانی سەدام حوسەین بە کۆمەڵ کوژراون. سەدان هەزار کورد ــ خەڵکی سڤیل و هێزە چەکدارەکان ــ هەوڵ دەدەن لە دەستی ژینۆسایدی سەدام حوسەین هەڵبێن . ئەو ئاوارانەی کە لەسەر سنووری عێراق کۆبوونەتەوە، خۆراکیان نییە ، دەواو دەرمانیان نییە و سەرما و ترس هیلاکی کردوون . ئەم گەڵاڵە یاسایە هەنگاوی یەکەمە ، بەڵام هەنگاوێکی گرنگە کە سیاسەتی ئەمریکا دەخاتە ناو ڕێگایەکی ڕاست و ئەخلاقی. ئەو ٥٠ میلیۆن دۆلارە کە ئەم گەڵاڵە یاسایە بۆ یارمەتی مرۆڤدۆستانە تەرخانی کردووە ، کەمترین کارێکە کە ئێمە دەتوانین بیکەین . بەداخەوە بە ٥٠ میلیۆن دۆلار ناکرێت هەموو پێداویستییەکانی ئاوارەکان دابین بکرێت .

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی پێشتر کاردانەوەیان نیشان نەدا کاتێ کە سەدام حوسەین کوردەکانی عێراقی بە کۆمەڵ کوشت یا سەرجەم مافە بنەڕەتییەکانی ئەوانی پێشێل کرد بەڵام ئەمجارە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیاریەتییەکی تایبەتی هەیە و هەلێکی تایبەتیشی بۆ ڕەخساوە .

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چالاکانە کورد و شیعەکانی هاندا دژی سەدام ڕاپەڕن و لە ئەنجامی بۆمبارانەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ــ کە بە پێ ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان ،

عێراقی گەڕاندووەتەوە بۆ سەردەمی پێش لە قۆناخی پیشەسازی ـــ هەلومەرجێك هاتۆتە پێش کە عێراق بکەوێتە ناو شەڕێکی ناوخۆیی و بێ سەرەوبەرەیی. لە یەکەم قۆناخەکانی راپەڕین ، سەرۆك بۆش بەم راستییە گەیشت کە پاش ئاگربەست سەدام نابێت کەڵکی سەربازی لە هێزی هەوایی عێراق وەربگرێت و بەڵێنی دا تەقە لە هەر فڕۆکەیەك بکەن کە خەڵك سەرکوت بکات بەڵام کاتێ کە راپەڕیوانی کورد و شیعە دڕندانە سەرکوت کران و خەڵکی سڤیل بە کۆمەڵ کوژران ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سیاسەتی خۆی گۆڕی و کاتێك کە هێزەکانی سەدام بە شێوازێکی بەرفراوان بە کۆپتەری سەربازی خەڵکی سڤیلیان دایە بەر دەستڕێژ ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بی دەنگ بوو . سەرۆك بوش هۆکاری بێ دەنگ بوونی ئێمە لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی سەدام حوسەین بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە نایەوێت لە کاروباری ناوخۆیی عێراق دەستێوەردان بکات بەڵام ئێمە بە توندی دەستێوەردانمان کردووە ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوازێکی بەرفراوان عێراقی بۆمباران کردووە ، داگیری کردووە و ١٠٠هەزار سەرباز و هەزاران خەڵکی سڤیلی کوشتووە. ئێستا هێزەکانی ئەمریکا ٢٠ ٪ ی خاکی عێراقیان داگیر کردووە و کۆنترۆڵی ١٠٠ ٪ی هەرێمی هەوایی عێراقیان لە دەستدایە . ئێمە دەتوانین هەموو داهاتە نەوتیەکان و کڕین و فرۆشتنی چەك لە لایەن عێراق کۆنترۆڵ بکەین . ئێمە بە تەواوی تێوەگلاوین. من دڵخۆشم بە هەوڵەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یارمەتیدانی قوربانیانی راپەڕینی ناوخۆیی عێراق . کۆمەڵگای ئەورووپا ١٨٠ میلیۆن دۆلار یارمەتی تەرخان کردووە و نەتەوە یەکگرتووەکان بەنیازە دیپلۆماتێکی پایەبەرز وەك هاوئاهەنکاری هەوڵە مرۆڤدۆستانە بەرفراوانەکان دیاری بکات . هیوادارم وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەوری رێبەرایەتی لەم تراژیدیایە بگێڕێت ، لانیکەم وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێت لە رێگای یارمەتیکردن و بەشداری کردنی سەربازانی ئەمریکا لە چالاکی هێزەکانی ئاشتیپارێزی چەند رەگەز ئەم هەوڵانە هان بدات.

یەکێ لە هۆکارەکانی ئەوەی من دژی ئەم شەڕە بووم ئەوە بوو کە لەوە دەترسام حکومەتی ئەمریکا هیچ ئیستراتژییەکی نەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی درێژخایەن لە رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا، لەوە دەترسام حکوومەتی ئەمریکا دەستکەوتی سیاسی ئەوتۆی نەبێت لەم شەڕەدا . ئەو گەلاڵە یاسایە کە سناتۆر "مۆینیهان" و سناتۆر "داماتۆ" پێشنیاریان کردووە سەرەتایەکە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە .

سەرەنجام جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم بە نیسبەت ئەوەی کە ئەو برە پارەیە کە ئەم گەلاڵە یاسایە تەرخانی کردووە دەبێ کاریگەری نەرێنی نەبێت لە سەر ئەو برە پارەیە کە ئێستا بۆ یارمەتیدانی کارەساتی ئاوارەکان خەرج دەکرێت.

## بارودۆخی تراژیدیکی کوردەکانی عێراق

### ١٠ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" کنێدی[١] ":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، ئێستا قەیرانێك هەیە کە تێیدا هەزاران کوردی عێراق بە هۆی نەخۆشی و برسێتی لە بەردەم مەرگی کتووپڕدان . ئەمە بارودۆخێکی تراژدیکە کە دەکرێت پێشی لێ بگیرێت . ئێستا زۆرتر ئەمریکا سەرزەنشت دەکرێت بە بۆنەی ئەو نەهامەتییە کە بەسەر ئەم خەڵکە بێ گوناهەدا هاتووە . ئێمە هەنگاومان هەڵگرت بۆ رووخاندنی سەدام حوسەین بەڵام نەمانتوانی ئەم خەڵکە ئازایە بپارێزین کە دژی سەدام راپەڕینیان کرد و لە ئەنجامدا بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان لانیکەم ٣٠ هەزار خەڵکی سڤیل بە دەستی سوپای عێراق کوژراون .

بۆ گەلێ لە ئەمریکاییەکان ئەمە ئەنجامێکی قابلی قبووڵ نییە بۆ شەڕێك کە بۆ مافی مرۆڤ و ئازادی کراوە . بە سەرنەکەوتن لە وەڵامدانەوە بە هاواری یارمەتی خەڵك ، هەڵەیەکی ئەخلاقی روویداوە . ئێستا ئێمە بەرپرسیارین ئەم هەڵەیە سەرراست بکەینەوە . دەبێ هەرێمێکی پارێزراو درووست بکەین بۆ پاراستنی ئەم خەڵکە ئازار چەشتووە و یارمەتی پێویست بدرێت بە منداڵان و گەورەکان تا لە مردن رزگاریان بێت و دەبێ سەدام حوسەین تێبگەیەندرێت کە ئەم دڕندەییە هەم لە ناوخۆ و هەم لە دەرەوەی عێراق ، بە زەرەری دەبێت . ئەگەر ئێمە پێش لەم تراژیدییە مرۆڤییە نەگرین ، لەگەڵ مەترسی هۆلۆکاستێکی نوێ رووبەڕوو دەبینەوە . ئەگەر ئێمە کار نەکەین بۆ سڕینەوەی ئەم رسواییە ئەخلاقییە، خەڵکی ١٠٠ ساڵی دیکە باسی فیلمێکی نوێ دەکەن بەناوی " هەڵپەڕین لە گەڵ کورد دا".

ئێستا ئێمە لە بارودۆخێکداین کە دەتوانین کاریگەریمان هەبێت لە سەر رووداوەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، با ئەم هەلە لە کیس نەدەین، با قوربانیانی راستەقینەی ئەم شەڕە رزگار بکەین .

---

[١] Mr. KENNEDY

## گەلاڵە یاسایەك بۆ تەرخان كردنی ۱۵۰ میلیۆن دۆلار بۆ یارمەتیدانی ئاوارە كورد و شیعەكان

۱۰ی نیسانی ۱۹۹۱ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" دیكز [۱]":

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن، ئەمرۆ من یاسایەك دەخەمە ڕوو بۆ تەرخان كردنی ۱۵۰ میلیۆن دۆلار بۆ یارمەتیدانی ئاوارە كورد و شیعەكان كە لە عێراق هەڵهاتوون .هەروەها كە هەمووتان بە دڵنیاییەوە دەزانن ، پتر لە یەك میلیۆن كورد و شیعە لە دەستی ژینۆسایدی سوپای عێراق هەڵهاتوون . ژن ، منداڵ ، گەورە و بچووك هەروا بوونەتە ئامانجی شاڵاوی دڕندانەی سەدام حوسەین دژی خەڵك . ئەوانە كە خۆشبەخت بوونە و توانیویانە لە مردن ڕزگاریان بێت، ئێستا لەگەڵ برسێتی ، سەرماوسۆڵە و نەخۆشی بەرەوڕوون . بە هۆی ئاڵۆزبوونی كەش و هەواكە ، ئێمە نازانین چەند ئاوارە بەرەو ڕێگا شاخاوییەكانی باكوور و ڕۆژهەڵاتی عێراق هەڵهاتوون بەڵام ڕوونە كە زۆر پێویستیان بە یارمەتی هەیە. دوو ڕۆژ پێش ، وەزیری دەرەوە ، جەیمز بەیكێر ، ڕاستەوخۆ بارودۆخی ترسناكی ژیانی ئاوارەكانی بینی . ڕوونە كە بارودۆخی ژیانی ئەم ئاوارانە بووەتە مایەی دڵساردی وەزیری دەرەوە ، هەروا كە بووەتە مایەی دڵساردی هەموومان كە ئێستا لێرەین . بە بیروبۆچوونی من ، سەرۆك وەزیرانی پێشوویی بەریتانیا ، "مارگارێت تاچێر [۲] "ڕاستی وتووە كە :" نامەعقوول نییە ، ئەگەر لە ڕێگای فرۆكەوە ، خۆراك ، خێوەت و بەتانی بگەیەنینە دەستی ئاوارەكان ". ئەمە لە ڕووی سیاسییەوە شتێكی ئاڵۆز نییە، ئێمە دەبێت هەر ئێستا دەست بەكار بین .

---

Mr. DICKS [۱]
Margaret Thatcher [۲]

شایانی ئاماژە پێكردنە كە بەریتانیا پێشتر ٤٠ ملیۆن دۆلاری تەرخان كـردووە بـۆ یارمەتیـدانی ئاوارەكان . ئەم گەلاڵە یاسایە رێگا خۆش دەكات بۆ ئەوەی سـەرۆك كۆمـار هاوخـەمی خـەڵكی ئەمریكا دەرببڕێت و هەروەها نەرمونیانی ئێمە نیشان بدات بۆ كـاركردنی خێـرا پـێش ئـەوەی بارودۆخی ئاوارەكان لەوە خراپتر بێت . ئـەم یاسـایە دەسـتبەجێ ١٥٠ ملیـۆن دۆلار دەدات بـە سەرۆك كۆمار تا وەك یارمەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە هەوڵە نێونەتەوەییەكان خەرجی بكات . ئێمە ناتوانین تەنانەت یەك رۆژی دیكە بێكار دابنیشین ، ژیانی هەزاران كەس بە هـەنگاو هەڵگرتنی ئەمریكاوە گرێدراوە ، تكاتان لێ دەكەم پشتیوانی لەم یاسایە بكەن .

## وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کوێی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دایە ؟
## ١٠ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "مەکوین[١]":
جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، پرسیارێکم هەیە: وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کانوونی دووەم و شوبات بەملاوە لە کوێیە؟
لە کاتی دەستپێکردنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەن تا ئێستا کە دەکاتە یەك کاتژمێر ، پتر لە هەزاران کەس مردوون ، ئاوارە کوردەکان هەوڵ دەدەن خۆیان لە کۆپتەرە جەنگییەکانی سەدام حوسەین دوور بخەنەوە . ڕەوشی ئێستای ئەمریکا لە گەڵ ٣٠ ڕۆژی پێش جیاوازە و ئێمە هێشتا توانایی ئەوەمان هەیە کۆتایی بەم بارووددۆخە بێنین بەڵام نایکەین . ئێمە لە ناوچەداین و ئاوی بۆتڵمان بۆ ٥٠٠هەزار سەرباز هەیە ، خۆراکی تەواومان بۆ ٥٠٠هەزار سەرباز هەیە ، دەواودەرمانی تەواومان بۆ ٥٠٠هەزار سەرباز هەیە، بەتانی، خێوەت و ئامرازی هاتووچۆی پێویستمان هەیە، فڕۆکەی (130C)مان هەیە، نەقشە و کۆپتەر و فڕۆکەوانمان هەیە ، توانایی ئەوەمان هەیە ئەم یارمەتییانە بگەیەنینە دەستی ئاوارەکان، بەڵام نازانم بۆ نایکەین .
ئەو فڕۆکەوان و سەربازانە کە لە ناوچە گەڕاونەتەوە، دەڵێن چاویان پڕ بووە لە گریان کاتێ کە بینیویانە ئەو ئاوارە هەزارانە لە بەرچاوی ئەوان دەستڕێژی گوللەیان کراوەتە سەر و ئەوان (فڕۆکەوان و سەربازەکانی ئەمریکا)نەیانتوانیوە هیچیان بۆ بکەن ." ئیوفۆریا[٢]" سێ هەفتە پێش لە ئەنجامی سیاسەتێکدا پاکتاو کرا کە من ناتوانم دەرکی بکەم .من لە سەرۆکی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا پرسیار دەکەم ئێمە کێین و چیمان دەوێت. ئەمڕۆ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویستی بە ڕێبەرایەتی کردن هەیە ، ئەو ڕێبەرایەتییە کە جۆرج بوش لە ٢ی ئاگۆست

---
McEWEN[١]
euphoria[٢]

هەتا ٣ی مارس کردی  و لە مێژوودا بێوێنە بوو . بە باوەڕی من هیچ کەسێکی دیکە جگە لە بوش نەیدەتوانی ڕێبەرایەتی هێزە هاوپەیمانەکان بگرێتە دەست (لە سوریا بۆ ئیسرائیل و لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ چین) تا لە بەرامبەر دیکتاتۆری ڕۆژهەڵاتی نێوڕاست ڕابوەستن . بۆ جۆرج بوش و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەمە قۆناخێکی درەوشاوە و زێڕین بوو . ئێستا کە وڵاتی ئێمە هیچ ناکات دەبینین سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا هەنگاو بەرەوپێش هەڵدەگرێت ، سەرۆك کۆماری فەرانسا هەنگاو هەڵدەگرێت ، هەر دوێنێ ٥ فرۆکە یارمەتی لە لایەن فەرانساوە ناردراوە بۆ ناوچە ، دەبینین وەزیرانی هەموو دەوڵەتانی ئەورووپایی ئەمڕۆ سەر لە بەیانی باسی دەست بەکاربوونیان دەکرد بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان .

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێکار دانیشتووە و من نازانم هۆکارەکەی چییە؟ داوا لە دەوڵەتەکەمان دەکەم یارمەتی ئاوارەکان بکات و ئەو سەربازانە کە لە ناوچەکەدان ، ئەم یارمەتیانە بگەیەننە دەستی ئاوارەکان. من داوای دەستێوەردانی سەربازی ناکەم ، داوای هەڵگیرسانی شەڕ ناکەم، من هیچ ئارەزوویەکەم نییە بۆ ناردنی سەرباز بۆ ناوچەکە، نامەوێت مارینزەکانی ئەمریکا بکەونە ناو کێشەی سوننە و شیعە و کوردەکان.

بە بیروبۆچوونی من سەدام لە رووخاندایە . ئێمە دەبوایا ١٢ کاتژمێرمان بۆ سەدام دیاری بکردبایا دەسەڵات بەجێ بهێڵێت ، بەڵام ئەمە مێژوویە ، سەدام هێشتا لە سەر دەسەڵاتە، ئێمە هەرێمی هەوایی عێراقمان لە دەستدایە، ئەگەر ئێمە بهێڵین سەدام لە هێزی هەوایی خۆی کەڵك وەربگرێت، گوناهبارین . ئەمە هەرێمی هەوایی ئێمەیەو هەتا ساڵێکی تریش هەروا دەبێت . ئێمە دەبێت بە سەدام بڵێین کۆپتەرەکانت مەفرێنە، جارێکی دیکە هێزی هەوایی بەکار مەهێنە و خەڵکەکەتی پێ سەرکوت مەکە . ئێمە دەبێ بەتانی و خێوەت ، خوراك ، دەواو دەرمان و ئاوی بوتڵ لە ڕێگای فرۆکەوە بخەینە خوار بۆ ئاوارەکان . ئەم خەڵکە ئازایە لە گەڵ منداڵەکانیان چاوەڕوانن و هەر ڕۆژ بە هەزار کەسیان لە کاتژمێرێکدا بە هۆی برسێتی دەمرن .

## ئاوارەکانی عێراق پێویستیان به یارمەتی خێرا هەیه

## ١٠ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەرێز "گرین[١] "، نوێنەری ئەیالەتی نیۆیۆرك :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، دەمەوێت نیگەرانی قوڵی خۆم دەربـبڕم بەنیـسبەت سـەرنەکەوتنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پێشگرتن لە هێرشه بێ جیاوازییەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ سـەر کورد و شیعەکان . من پشتیوانی دەکەم لە بڕیاری سەرۆك کۆمار بۆ لێدانی فڕۆکە سەربازییەکانی عێراق و لە سەر ئەو بڕوایەم کە دەبێ ئەم سیاسەتە بۆ کۆپتەرەکانیش بگرێتە بەر . بە هۆی ئـەوە کە سەربازەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستیان کردووە بە چوونە دەرەوە لـە بنکـەکانی خۆیان لە باشووری عێراق ، گەلێ لە هاووڵاتیانی سڤیلی باشووری عێـراق لـە شـەپۆلێکی نـوێی کۆمەڵکوژی ڕژێمی سەدام حوسەین دەترسن .

ئێمە دەبێ شانازی بەوەبکەین کە لە ڕێگای هێز و بڕیاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، ئەرکی خۆمان بەجێ هێنا بەنیسبەت کوێت لە کەنداوی فـارس بـەڵام ئەمـە بـە واتـای ئـەوە نییـە کـە بەرپرسیاریەتی ئێمە بە نیسبەت خستنەڕووی نیگەرانییەکانی دیکـەمان لـە ناوچـە کۆتـایی پـێ هاتووە . کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کە پشتیوانی لە بڕیاری دەرکردنی عێراق لە کوێت کرد ئێـستا بە یەك دەنگ داوای ئەوە دەکات کە ئەو سەدان هەزار کورد، شیعە و خەڵکی دیکە کە لە عێراق هەڵهاتوون ، لە کاتی گەڕانەوە نابێت لـە گـەڵ ئەشـکەنجەی سـەدام ڕووبـەڕوو ببنـەوە . میراتـی ترسناکی هەڵسوکەوتی ڕێبەرانی عێـراق لـە گـەڵ نـەیارانی خـۆی ئـەوەمان نیـشان دەدات کـە ئاوارەکان پێویستیان بە پاراستنی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەیە .

---

[١] Mr. GREEN

هەرچەند کە لەوانەیە زۆر کەم و زۆر دەرەنگ بێت بەڵام دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوازی سەربەخۆ یان لە رێگای نەتەوە یەکگرتووەکان ، دەستبەجێ دەست بەکار بێت بۆ ئەوەی هەرچی لە دەستی دێت بیکات بۆ یارمەتیدانی هەموو ئەو ئاوارانەی کە پێویستی خێرایان بە یارمەتی مرۆڤدۆستانە هەیە . دەبێ لە رێگای یارمەتیدانێکی بەرفراوان ، پێش لە مردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئاوارەکان بگیردرێت ، دەبێ ئەم کارە بە خێرایی ئەنجام بدرێت .

هەڵسەنگاندنەکان نیشان دەدات لانیکەم یەك میلیۆن کەس لە ماوەی ئەم چەند رۆژەی دواییدا لە سەر سنووری ئێران و تورکیا کۆبوونەتەوە. دەوڵەتی ئێران و تورکیا پێویستیان بە یارمەتی بەرفراوانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەیە بۆ چارەسەر کردنی قەیرانی ئاوارەکان و داوا لە ئۆزاڵ ، سەرۆك کۆماری تورکیا دەکەم سنووری وڵاتەکەی بە رووی ئاوارەکان بە کراوەیی بهێڵێتەوە .

## ئێستا قەت کاتی ئەوە نیە دەست لە کورد بشۆین

## ١١ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "گلیکمان[١]" :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، هەواڵە نێوخۆییەکانی دوێنێ شەو ، ترۆر وتراژیدیایەکی تاریکمان وەبیر دەهێنێتەوە کە پاش داگیرکرانی کوێت لە لایەن عێراقەوە سەری هەڵداوە .

لە کاتێکدا کە ئێمە سەبارەت بە ئاگربەست وتوووێژ دەکەین و داوا دەکەین سەرکوتی کوردان رابوەستێت ، لە کاتێکدا کە ئەو یارمەتییە مرۆڤدۆستانیە کە گەیشتۆتە سەر سنووری عێراق تێری ئاوارەکان ناکات و دەبێ هەزاران سەرباز رەوانەی ناوچە بکرێن و لە کاتێکدا کە هەمووی ئەمانە روودەدات ، منداڵەکان لە ئامێزی دایك و باوکیان گیان دەسپێرن . "ئیدمۆند بۆرك[٢]" دەڵێت :" تەنها شتێك کە بۆ سەرکەوتنی شەڕ (خراپە) پێویستە ئەوەیە کە پیاوچاکەکان هیچ نەکەن ". من دەڵێم شتێك کراوە بەڵام هەروەك گەلێ لەو کەسانەی کە کارە دڕندانەکان دژی خەڵك دەبینن و دەیخوێننەوە ، ئێمە وتەکەی "بۆرك" شرۆڤە دەکەین و دەڵێین :"تەنها شتێك کە بۆ سەرکەوتنی شەڕ(خراپە) پێویستە ئەوەیە کە ژن و پیاو درەنگ دەست بەکاربن ، زۆر درەنگ".

وادیارە کوردەکان بەلای ئەمریکاوە ئەوەندە گرنگ نین کە بین بە ئەجێندا . بە دڵنیاییەوە نازانم ئێمە دەبێ چی بکەین بەڵام دڵنیام کە کارێکی دراماتیك دەبێ ئەنجام بدرێت ، ئەگەرنا لەناوچوونی کەمینەیەکی ئایینی لەو بەشەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە چاوی خۆمان دەبینین . کوشتنی خەڵك بە هۆی ئایینەوە، شتێکی نوێ نییە لە جیهاندا.

جەنابی سەرۆك ، بە دڵنیاییەوە ئێوە دەتوانن بۆ رزگار کردنی کوردەکان هەمان بەرپرسیاریەتی و هاوئاهەنگیتان هەبێ کە بۆ رزگار کردنی کوێت هەتانبوو .

---

[١] Mr. GLICKMAN
[٢] Edmund Burke

## چى بەسەر پرەنسیپەكاندا هاتووە
## ١١ى نیسانى ١٩٩١- ئەنجوومەنى پیران

بەڕێز "دێكۆنسینى ":

جەنابى سەرۆك ، شەڕى كەنداوى فارس سەركەوتووانە كۆتایى پێهاتووە بەڵام هیتلەر(مەبەستى سەدامە- وەرگێڕ) هێشتا هەر لە سەر دەسەڵاتە . ئەمڕۆ ئێمە لە عێراق لە گەڵ قەیرانێكى ئەخلاقى بەرەوڕووین . هەروەها كە" ا . م رۆزینتاڵ " هەفتەى پێشوو لە رۆژنامەى" نیۆیۆرك تایمز"دا نووسیویەتى :" كۆمەڵكوژى جوولەكەكان جارێكى دیكە روودەدات. ئەم جارە كۆمەڵكوژى ، ئەشكەنجە و كاروانى مەرگ لە عێراق روو دەدات و بكوژەكان ناوگەلى جۆراوجۆریان لە سەر قوربانییەكان داناوە . كورد و شیعەكان پێمان دەڵێن هێزەكانى سەدام تف دەكەنەسەر روومەتیان و ریشى پیاوەكان دەسووتێنن و رۆژێك پێش لە كوشتن دەستدرێژى دەكەنە سەر ژنەكان ".

ئەو كاتە من لە ئەنجوومەنى پیران دەنگەم نەدا بە بەكارهێنانى هێزى سەربازى دژى عێراق و لە سەر ئەو بڕوایە بووم كە هێشتا كاتى گەمارۆدانى ئابوورى سەر عێراق نەهاتووە . هەروەها بۆم روون نەبوو كە ئەم شەڕە لە سەر دەسەڵات لابردنى سەدام و كۆتایى پێهاتنى تەواوى دەسەڵاتى ئەم دیكتاتۆرە لە عێراق مسۆگەر بكات . لە گەڵ ئەمەشدا لە ناخى دڵمەوە پشتیوانیم كرد لە سیاسەتى سەرۆك كۆمارى ئەمریكا بۆ هێرش كردنە سەر عێراق و وەك ئەندامى " كۆمیسیۆنى تەرخانكردنى پارە بۆ بەرگرى" بە توندى پشتیوانیم كرد لە دابینكردنى پارەى پێویست بۆ هێزەكانمان بۆ ئەنجامدانى ئەم كارە . سەرۆك بوش و سەربازانى ئازاد و كارامەى ئەمریكا سەركەوتنێكى سەربازى پرشكۆیان بە دەست هێنا لە كەنداوى فارس . كوێت ئازاد كرا و عێراق بەڵێنى داوە ئاگربەستى داسەپاوى نەتەوە یەكگرتووەكان لە گەڵ شەرت و مەرجە سەختەكانى قبوڵ بكات . لە گەڵ ئەمەشدا وادیارە ئەم سەركەوتنە بەتاڵە و كار هێشتا تەواو نەبووە .

سەرۆك بۆش پێش و لە كاتی شەڕ بە ئاشكرا باسی پێویستبوونی ئاژینی نوێی جیهانی كـرد و بـە درووستی پێداگری لە سەر پرەنسیپە ئەخلاقییەكان كردەوە نە نەوت. بوش وتی قازانجی ئێمـە لـە ناوچە ، ئازاد كردنی كوێت و رزگاربوون لە دەستی دیكتاتۆری عێراقـە كـە یاسـای نێونەتـەوەیی پێشێل دەكات و هێرش دەكاتە سەر وڵاتانی دیكە . بە وتەی سەرۆك بـوش ، دەوڵـەتی ئێمـە لـە سەر بنەمای ئەم پرەنسیپانە دامـەزراوە و خـەڵكی ئـەمریكا باوەڕیـان پێیـەتی . سـەرۆك بـوش هەروەها داوای لە هەمـوو خوڵكی عێراق كرد سەدام( كە هیتلەری ئەمڕۆیـە) لـە سـەر دەسـەڵات لاببەن .

لە ١٥ی شوبات لە لێدوانێكدا لە"بنكەی سیستمی موشەكی رایتۆن [١]"، سەرۆك بـوش داوای لـە سوپای عێراق و خەڵكی عێراق كرد كۆنترۆڵی شتەكان بگرنەدەست و سەدام حوسـەینی دیكتـاتۆر ناچار بكەن بچێتە لاوە و بڕیارنامەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان جێبەجێ بكات . بـەڵام كـاتێ كـە خەڵكی عێراق وەڵامی داواكاریەكـەی ئـەویان دایـەوە ، سـەرۆك بـوش وەك رۆناڵـد رەیگـان لـە كۆیتەرێك هاتەدەر و وەك كەڕەكان دەستی گرت بە گوێیەوە و وتی:"بەڵێ ، نابیسم چی دەڵـێن". ئەو پیاوە كە داوای دەكرد دەستدرێژی عێراق لە سەر هۆكارگەلی ئەخلاقی كۆتایی پێبێـت خـۆی كردووە بە كەڕ، بە كوێر و بە لاڵ . چاوی ئەوەی نییە ئەو هەزاران ژن و منداڵە عێراقییـە ببینـێ كە پاش ئەوەی لە لایەن هێزەكانی عێراقەوە هێرشیان كراوەتە سەر ، كەوتوونەتە نەخۆشخانەكانی ئەمریكا . گوێی ئەوەی نییە هاواری یارمەتی كوردەكان ببیسێت بـۆ رووخانـدنی سـەدام و دەم و زمانی ئەوەی نییە وەڵامی ئەو پرسیارەی جیهان بداتەوە كە دەوڵەتێك كە ئەوەندە بە پەرۆشەوە بۆ كۆتایی پێهێنانی دەستدرێژییەك شەڕی كرد، چۆن ئەوەندە بـە هێواشـی وڵامـی دەسـتدرێژییەكی دیكەی هەمان رژیم دەداتەوە .

میـدیاكان بڵاویـان كردووەتـەوە كـە سـەرۆك كۆمـار و راوێـژكارە هەواڵگرییەكـەی مۆچـیاری كوردەكانیان كردووە دژی سەدام راپەڕینی چەكداری بكەن. ئەم شتە دوور نییـە لـە راسـتی . لـە

---

[١] Raytheont

ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠، CIA چەکی دابین کرد بۆ گروپێکی دیکە لە کوردەکانی عێراق بۆ ئەوەی دژی سەدام شەڕ بکەن . وتارێکی رۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" بە تێروتەسەلی ئاماژەی بەوە کردووە کە رادیۆیەکی نهێنی بۆ عێراق پاش داگیرکرانی کوێت ، خەڵکی عێراق لەوانە کورد و شیعەکانی هانداوە دژی سەدام راپەڕین بکەن . کارمان بەوە نییە کە ئایا هیچ پەیوەندییەکی راستەقینە لە نێوان حکوومەتی ئەمریکا و کوردە راپەڕیوەکاندا هەبووە یا نا ، بەڵام ئەم کردەوە بوێرانەیەی کوردەکانی عێراق و ئەوانی دیکە لە قسەکانی سەرۆك کۆمار ئیلهامی گرتبوو ، سەرۆك کۆماری خۆمان . ئەم خەڵکە کە لەمێژە دەچەوسێنەوە بەهای خۆی لە شەڕدا سەلماند و پێشکەوتنێکی بەرچاوی لە ماوەی تەنها چەند هەفتەدا بە دەست هێنا . کوردەکان کەڵکیان لە بێ سەرەوبەری نێو گاردەکانی کۆماری سەدام وەرگرت و شارە سەرەکییەکانی کەرکوك و هەولێریان گرت . هەروەها داوای یارمەتیان کرد ، هەموو جۆرە یارمەتیەك بەڵام جارێکی دیکە هیچ کەس وەڵامی نەدانەوە. لە راستیدا دەوڵەتێك بەرەی ژێرپێی ئەوانی کێشایەوە کە تەنها چەند هەفتە پێشتر ئەوانی هاندابوو دژی سەدام حوسەین چەك هەڵبگرن .

من ئەو نیگەرانیانە دەرك دەکەم کە پشتیوانی کردن لە کوردە راپەڕیوەکان دەمانخاتە ناو باروودۆخێکی تر وەك ئەوەی ڤیەتنام بەڵام بە هەر حاڵ ئێمە دەتوانین لە رێگای کۆمەڵێك شێوە و کاناڵی خەلقکارانەی دیکە یارمەتی کوردە راپەڕیوەکان و ئەوانی دیکە بدەین، بێ ئەوەی هێزەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تێوە بگلێنین .

ئێمە لە ١٩٧٥ چەکمان دا بە کوردەکان . پاش راوەستانی شەڕ لە مانگی رابردوو ئێمە دەمانتوانی بە هێزی ئاسمانی ، راپەڕیوەکان بپارێزین و رێگا نەدەین بەوەی کە سوپای عێراق کۆپتەرەکانی دژی راپەڕیوەکان بەکار بهێنێ. پاش ئەوە عێراق بەڵێنەکانی خستە ژێر پێ لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوە کە تەنها بۆ مەبەستی گوازتنەوەی کاربەدەستانی حکوومەت و پێداویستیە مەدەنییەکان کەڵك لە کۆپتەرەکانی وەردەگرێ ، بەڵام چەکی خستە سەر ئەم کۆپتەرانە و هێرشی

کرده سەر خەڵکەکەی خۆی، تەنانەت "ژنەراڵ شوارزکۆڤ" دانی بەوەدانا کە لەم بارەیەوە لە لایەن عێراقەوە فریو دراوە ، کەوابوو ئایا ئێمە هەست ناکەین دەبێ وەڵام بدەینەوە .

هەروەها راپۆرت دراوە کە رێبەرایەتی کورد بە فەرمی داوای لە حکوومەتی بوش کردووە رێگە بەوە بدات هێزە هەواییە خۆویستەکان لە "میگ[٢]" ەکانی عێراق بدەن . نازانم ئایا ئەم داخوازیە ئەمڕۆ پشتڕاست دەکرێتەوە یا نا بەڵام ئەوە کە پێویستە، ئەوەیە ئێمە کۆمەڵێك بەرنامەی خۆڵقکارانە دابڕێژین بەڵام ئەم بەرنامەڕێژییە تا ئەمڕۆ نەکراوە . لە راستیدا دەوڵەتی ئەمریکا تەنانەت داواکارییە سەرەتاییەکانی رەت کردەوە بۆ یارمەتیدانی ئەو ئاوارانە کە لە ترسی ژینۆسایدی سەدام بەرەو تورکیا و ئێران هەڵهاتوون و ئەو کەسانەی کە بە دەستی هێزە تایبەتەکانی سەدام بە کۆپتەر کوژراون . فەرانسا و بەریتانیا بوون کە ئەم کێشەیانە لە نەتەوە یەکگرتووەکان خستە بەرباس نە دەوڵەتی ئێمە . هەروەها ئێستاش دەوڵەتی بەریتانیایە کە داوا دەکات هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی و پارێزراو بۆ کوردەکان لە باکووری عێراق دروست بکرێت . ئێمە سەرئەنجام هەر دەبێ یارمەتیان بدەین بەڵام با تا لەمە درەنگتر نەبووە دەست بەکار بین .

کوا ئەو رێبەرایەتییە کە سەرەتا بە شێوازێکی سەرکەوتووانە بە شوێن شەڕدا دەچوو و گەیاندیە ئەنجام و سوپای عێراقی لە کوێت دەرکرد . کوا رێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ؟ ئێمە رێبەرایەتی جەنگمان گرتە دەست بەڵام رێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئاشتی چی لێدێت ، ئەمە جەنگی پرەنسیپەکان بوو . ئێمە چووینە نەتەوە یەکگرتووەکان و باسی ئامانجەکانی خۆمانمان کرد بە گوێرەی ئەم بیر و باوڕە گەورانە . بەڵام بۆ دەوڵەتی ئەمریکا پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ لە نەتەوە یەکگرتووەکان ناخاتە روو لە کاتێکدا کە سەدام خەڵکەکەی خۆی ژینۆساید دەکات . ئایا تا ئێستا هیچکام لە سەرۆك کۆمارەکانی پێشووی ئەمریکا ، ئەم سیاسەتانەیان بەرێوە بردووە کە ئێستا دەوڵەتی جۆرج بوش بەرێوەی دەبات .

---

Iraqi Migs[٢]

من وای بۆ دەچم ئێمە ناگەینە ئەنجامێکی مەنتیقی . سەربازەکانی عێراق کوردەکان و شیعەکانی عێراقیان بە تاوانی کورد بوون و شیعە بوون دایەبەر دەستڕێژی گوللە و کیمیاباران . ئەمانە هەمان ئەو سەربازە ئازانەن کە لە کاتی هێرشی هێزەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان ورد بوون و هەڵهاتن . ئەم گاردە کۆمارییە ترسنۆکانە، ئازان گازی فۆسفات بدەن لە ژن و منداڵی بێ پاراستن ، لێدانی ئامانج لە پشتەوە ئاسانە .

سەرۆك کۆمار لەباتی ئەوەی یارمەتیەکی زۆری کوردەکان بدات بۆ شەڕ دژی سەدام ، دۆلار دۆلار یارمەتیان دەدات و بە زۆر نزیکەی ۱۰ ملیۆن دۆلاری بۆ یارمەتیدانی ئەم نیو ملیۆن کوردە ئاوارە و ئاوارەکانی دیکە تەرخان کردووە لە کاتێکدا کە سەدان ملیۆن دۆلار پێویستە بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە .

دوو ساڵ پێش من و سناتۆر "بێد" توانیمان ٥ ملیۆن دۆلار تەرخان بکەین بۆ ئەو ئاوارە کوردانە کە لە دوایین هێرشی کیمیایی سەدام حوسەین هەڵهاتبوون بۆ باشووری تورکیا . لە کاتێکدا کە کۆنگرێس و وەزارەتی دەرەوە وڵامی داواکاری دەوڵەتی تورکیایان دایەوە بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە ، بەداخەوە دەوڵەتی تورکیا نەیهێشت ئەم یارمەتیە و یارمەتییە نێونەتەوەییەکانی دیکە لە نێوان ئاوارەکاندا دابەش بکرێت .

دوو رۆژ پێش ، وەزیری دەرەوە، "بەیکێر "بە خۆشییەوە چوو بۆ سنووری تورکیا و عێراق تا لە نزیکەوە کێشەی ئاوارەکان ببینێ . من پیرۆزبایی پێ دەڵێم بۆ چوونی بۆ ئەم شوێنە و دیتنی ئەم خەڵکە. منیش پێشتر سەردانی کەمپی ئەو ئاوارە کوردەکانم لە رۆژهەڵاتی تورکیا کردووە کە کیمیاباران کرابوون و لە وڵاتی خۆیان ئاوارە ببوون . من لەوێ بوومە و دەزانم "بەیکێر" چی بینیوە. بارودۆخی ئەم کەمپانە هەمووتان لە ناخی دڵەوە دەهەژێنێت . من دەزانم ئەم سەفەرەی "بەیکێر" لە خولەکەکانی کوتاییدا خرابووە سەر بەرنامەی کارەکەی، ئەویش بە هۆی ئەو گوشارەی کە بۆ ئەم بابەتە تایبەتە خرابووە سەر حکوومەتی ئەمریکا .

ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌تی ئه‌مریکا تۆزێك پێشبینی و به‌رنامه‌ی له پێشه‌وه هه‌بوایه، له‌وانه‌یه ئه‌مڕۆ ئێمه له‌گه‌ڵ ئه‌م کێشه دڵته‌زێنه‌ی ئاواره‌کان رووبه‌ڕوو نه‌باین . ئێستاش ئه‌و پێشبینی و به‌رنامه‌یه له ئارادا نییه له به‌ر ئه‌وه‌ی که ئێستاش ده‌وڵه‌تی ئه‌مریکا سیاسه‌تی ده‌ره‌وه‌ی خۆی له سه‌ر بنه‌مای رابردوو دامه‌زراندووه و هیچ پێشبینییه‌ك و به‌رنامه‌یه‌کی درێژخایه‌نی نییه .

من به‌راستی تووڕه‌م ، داوا له حکومه‌تی بوش ده‌که‌م هه‌تا ئه‌و شوێنه‌ی که پێی ده‌کرێ به سه‌دام بڵێت ژینۆسایدی خه‌ڵکه‌که‌ی خۆی له ماوه‌یه‌کی دیاریکراودا رابوه‌ستێنێت ئه‌گه‌رنا ئه‌گه‌ر پێویست بکات له لایه‌ن هێزه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان له سه‌ر ده‌سه‌ڵات لاده‌برێت . ئه‌م کرده‌وه‌یه پاساوهه‌ڵگره له به‌ر ئه‌وه که بڕیارنامه‌ی ٦٧٨ی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان رێگه‌ی به‌وه داوه که له هه‌موو ئامرازه پێویسته‌کان بۆ زیندوو کردنه‌وه‌ی ئاشتی و ئاسایشی ناوچه که‌ڵك وه‌ربگیردرێت .

کرده‌وه درندانه به‌رده‌وامه‌کانی سه‌دام دژی کورد و شیعه و هێزه ئۆپۆزۆسیۆنه‌کانی دیکه ناهێڵێت ئاشتی له ناوچه بچه‌سپێت . کرده‌وه‌کانی سه‌دام ، وڵاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا و ده‌وڵه‌ته هاوپه‌یمانه‌کانی دیکه‌ی ناچار کردووه هێزی سه‌ربازی له ناوچه پیاده بکه‌ن . هه‌روه‌ها هێزه هه‌لپه‌ره‌سته‌کانی ئێران و سووریاش بۆ به‌رژه‌وه‌ندییه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌کانی خۆیان له‌م بێ سه‌روبه‌ره‌ییه‌ی عێراق که‌ڵك وه‌ر ده‌گرن. ئه‌م ره‌وشه له درێژخایه‌ندا به زه‌ره‌ری ئاشتی و سه‌قامگیری ناوچه‌یه که ئامانجی یه‌که‌می ئێمه‌یه .

سه‌ربازانی ئێمه ئێستا له عێراق دان . هه‌ندێ که‌س ده‌ڵێن ئێمه ناتوانین له کاروباری ناوخۆیی عێراقدا ده‌ستێوه‌ردان بکه‌ین ، ئه‌مه له کاتێکدایه که ئێمه ئێستا له عێراقین ، ئێمه له گه‌ڵ هێزێکی سه‌ربازی به‌رچاو له ناو عێراقدایین ، وانییه له ده‌ره‌وه‌ی عێراق بین و بڵێین ده‌چینه ناو عێراق یا داگیری ده‌که‌ین ، ئێمه ئێستا له ناو عێراقین . سه‌ربازانی ئێمه به راپۆرتێره‌کانیان وتووه هه‌ستیان به بێ ده‌سه‌ڵاتی و بێ هیوایی کردووه کاتێ سه‌یری هێزه‌کانی گاردی کۆماری عێراقیان کردووه که به تانك و تۆپ هێرشیان کردۆته سه‌ر نه‌خۆشخانه‌کان و خه‌ڵکی سڤیل له که‌مپی

ئاوارەکاندا کە لە شوێنە چاڵەکاندا و لە پاڵ جادەکانـدا کۆبوونەتـەوە. ئەمەیـە ئـەو شـتەی کـە سەربازانی ئێمە کە ئێستا لە عێراقدان ، بە میدیاکان و خەڵکی ئەمریکای دەڵێن .
کاپیتانێکی سوپای ئەمریکا لە" تۆلیدۆ [٣] " لە ٣١ی ئادار بە رۆژنامەی "واشـنگتۆن پۆسـت"ی وتووە کچێکی ساوای ١٨ مانگان ئەوەندە لە نزیکەوە بە دەمانچە لـە سـینگی درابـوو کـە بـە ئاسانی بارووتی گولەکە لە سەر لاشەی دەبینرا . سەربازێکی دیکە بێ دەسـەڵاتی و بـێ هیـوایی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت "هیچ سەربازێك لێرە نییە کە نەیەوێت کارەکە تەمام بکات ، ئێمە لـە مانە بێزارین " . مولازم "جاناتان سانتی[٤]" باسی ئەو خەڵکەی عێراق دەکات کە ئەو بینیویەتی بەرەو وڵاتانی دیکە هەڵدێن و بەم شێوەیە نیگەرانی خۆی دەردەبڕێـت :"ئەگـەر سـەدام لـە سـەر دەسەڵات بمێنێت ، ئەم خەڵکە بەڕاستی لە ناو دەچن . باوەڕ ناکەم سـەدام بهێڵێـت ئـەم خەڵکـە زیندوو بمێنن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق". لە راستیدا سەربازانی ئێمە هەست دەکەن نەیانهێشتووە ئەوان ئەو ئەرکە تەواو بکەن کە بۆ ئەنجامدانی نـاردرابوون ، ئـەرکێك کـە ئـەوان زۆر بـە باشـی دەیانتوانی ئەنجامی بدەن .
ئەگەر سەرۆك کۆمار سەرپێچی لە دەرکردنی ئەم ئۆلتیماتۆمە بە سەدام حوسەین بکـات ، دەبـێ سیاسەتی حکوومەتی ئەمریکا و ئامانجەکانی داهاتووی لە ناوچە بە تەواوی بۆ خەڵکی ئـەمریکا و جیهان روون بکاتەوە . کوا ئەو ئاژینە نوێیە جیهانییە ؟ روانگەی سەرۆك کومار بۆ ئەم ناوچەیە چییە ؟ ئایا ئێمە هیچ بەرنامەیەکمان هەیە بۆ داهاتوو یان هیچ نەخـشە رێگایـەکمان بـۆ دیـاری کردنی ئاراستەی رۆیشتنەکەمان ؟ ئایا سەرۆك بۆش سەربازانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەر چاو دەگرێ کە ئێستا لە هەرێمی قەڵخان دان لە باکووری عێراق و بەم جـۆرە پاسـاو بـۆ کـار نەکردنی خۆی دەهێنێتەوە .

---

[٣] Toledo
[٤] Jonathan Santy

ئایا سەرۆك کۆمار دەتوانێت پیرۆزبایی بەم سەربازە ژن و پیاوانە بڵێت بۆ ئەوەی لە کانوونی دووەم و شوبات شەڕی باشیان کردووە بەڵام هێشتوویانە سەدام خەڵکی خۆی کیمیاباران بکات ، ژینۆساید بکات و لەو پەڕی دڕندایەتیدا لە مارس و ئاڤریلی هەمان ساڵ لە سەر دەسەڵات بمێنێتەوە. هەروەها تکا لە سەرۆك بۆش دەکەم لانیکەم لە دەسەڵاتی خۆی کەڵك وەربگرێت بۆ ئەوەی کێشەی مافی مرۆڤ و ئۆتۆنۆمی کوردەکان ببێ بە بەشێك لە وتوویژەکانی ئاشتی ناوچە .
خەڵکی کورد نابێ جارێکی دیکە فەرامۆش بکرێن هەرواکە پێشتر فەرامۆش کراون . لە راستیدا سەرۆك بۆش دەتوانێت داوای بەرفراوانتر کردنی هەرێمی پارێزراو لە باکووری عێراق بکات ، دەتوانێت داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کیانێکی سەربەخۆی نیمچە ئۆتۆنۆمی کوردی لەم هەرێمە درووست بکات . ئەم هەرێمە کە ئاسایشەکەی دەتوانێت لە لایەن هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە مسۆگەر بکرێت ، دەبێت بە وڵاتێك بۆ کوردەکان و پەناگەیەك بۆ خەڵکێك کە لە سەراسەری مێژوویاندا تەنها چەوسێنراونەتەوە و دوژمنایەتییان بینیوە.
هەروەها ئەمە چارەسەری کێشەی ئاوارەکان لە ئێران و تورکیا ئاسانتر دەکات . ئاوارەکان دەگەڕێنەوە ئەگەر هەرێمێکی پارێزراویان هەبێت کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەگەر پێویست بکات لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بپارێزێت . ئەم هەوڵە خەرجی زۆری دەوێت بەڵام ئێمە دەبێت ئەو پرەنسیپە بپارێزین کە ئەم وڵاتە لەمێژە لە سەری بنیاد نراوە، ئێمە ئەم پرەنسیپەمان لە کۆتایی مانگی شوبات پاراست واتا کاتێك کە ئەم شەڕە بە ئەنجام گەیشت .
من دەرك بەوە دەکەم کە هەڵگرتنی ئەم هەنگاوە کۆمەڵێك نیگەرانی لە ناو دەوڵەتی تورکیا و دەوڵەتانی دیکەی ناوچە درووست دەکات بەڵام جارێکی دیکەش ئەمە کێشەیەکی ئەخلاقییە ، ئەمە دووست و دوژمنەکانمان دیاری دەکات . لە کۆتاییدا مافی مرۆڤ دەبی رێزی لێ بگیردرێت ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێ لە جیهاندا لە بەرامبەر پێشێل کردنی مافی مرۆڤ رابوەستێ (و راوەستاوە) لە بەر ئەوەی کە قەد سازشی لە سەر مافی مرۆڤ نەکردووە ، بە تایبەت لە رۆژهەڵاتی ئۆرووپا و یەکێتی سۆڤیەت . کاتێك کە باسی مافی مرۆڤ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

دەکرێت ئێمە لەکوێین؟ بە باوەڕی ئێمە وەك خەڵكی ئـەمریکا ، ئێمـە پێویـستمان بـە روانگـە و ڕێبەرایەتی هەیە لە پەیوەندی لە گەڵ مافی مرۆڤدا .

جەنابی سـەرۆك ئەگـەر دەوڵـەتی ئـەمریکا ئەمـە نـەکات ، گلـۆپێکی سـەوزی مەترسـیداری هەلکردووە بۆ سەدام و مافی مرۆڤ جارێکی دیکە دەبێت بـە قوربـانی بازرگـانی و ئـەوە نیـشان دەدەین کە مافی مرۆڤ تەنها لە ئۆرووپا و شوێنەکانی دیکە هەیە نـەك لـە ئێـرە . ئێمـە شـەڕی پرەنسیپمان بردەوە و دەمانتوانی لە وتووێژەکاندا باسی مافی مرۆڤ بکەین بەڵام ئێستا کـە شـەڕ سەرکەوتوانە کۆتایی پیهاتووە و عێراق لە کوێت دەرکراوە ، کێشەی مافی مرۆڤ لە کوێیە ؟ هیچ باسێکی نییە . سـەرۆك کۆمـاری وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا باسـی ناکـات و نابێـت بـە پرەنسیپێکی بنەڕەتی ئەخلاقی هەروا کە لە پەیوەندی لە گەڵ مامەڵە کـردن لـە گـەڵ سـەدامدا نەبوو بە پرەنسـیپێکی بنەڕەتی ئەخلاقی . بەم شێوەیە ئێمـە بـە و کەسـانە کـە لـە شـوێنەکانی دیکەی جیهاندا سەرکوت دەکـرێن و دەچەوسـێنرینەوە دەڵـێین وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا توانایی ئەوەی نییە کێشە دژوار و ئەستەمەکان چارەسەر بکات کە بە ئاسانی بە چـەك چارەسـەر ناکرێت . ئێمە رۆژێ بە مافی مرۆڤ دەڵێین بەڵێ و رۆژێکی دیکە دەڵێین نەخێر . مافی مرۆڤ تەنها بۆ خەڵکی کوێتە تا وڵاتەکەیان بۆ بگەڕێتەوە ؟ بەڵێ .

ئەم کۆنگرێسە بە تێکڕای دەنگ پشتیوانی لە کردەوەکەی سـەرۆك بـوش کـرد بـەڵام هیتلـەر ( سەدام حوسەین) هێشتا لە سەر دەسەڵاتە . پرەنسیپی مافی مرۆڤ لە کوێیە تا دژی سەدام بـەکار ببرێت ؟ ئێمە بە تەواو نەکردنی ئەرکەکەمان شتانێکی دیکە لە دەست دەدەین . بردنەوەی شەڕی سەربازی شتێکە و لە دەستدانی ئاشتی شتێکی دیکەیە .

## یارمەتی مرۆڤدۆستانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ئاوارەکانی عێراق

## ١١ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "بینگامان[١] ":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، ئێمە لە ماوەی هەفتەی رابردوودا بینیمان بارووودۆخی ئاوارە کوردەکانی عێراق خراپتر بووە . وەڵامی ئەم پرسیارانە کە ئایا ئێمە دەبوایا کردەوەی سەربازیمان لە "شالاوی گەردەلوولی بیابان" درێژە بدایا یا نەمانهێشتبایا هێزەکانی عێراق بۆ سەرکوت کردنی کوردەکان لە هێزی هەوایی کەڵکیان وەرگرتبایا دەهێڵینەوە بۆ مێژوو . بە هەرحاڵ ئێمە ئەمڕۆ لێرە دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر ئاوارە کوردەکاندا کۆمەڵێك بەرپرسیارێتی هەیە یان نا . ئێمە بەرپرسیارین یارمەتی ئەم خەڵکە بدەین و هەرچی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی ئەم خەڵکە برسی نەبێت ، لە سەرماو سۆڵەدا نەمرێت و بە هۆی نەخۆشی لە ئەنجامی بارووودۆخی چەپەڵی کەمپە سنوورییەکان نەمرێت . ئێمە بەرپرسیارین نەتەنها بە هۆی ئەو کارەی کە لە کەنداوی فارسدا کردمان بەڵکوو بە هۆی ئەوەی کە بۆچی ئێمە ئەم کارەمان کرد؟ لەبەر ئەوەی کە لێرە لەبەرچاوی ئەم ژن و پیاو و مندالانە کە لە بارووودۆخێکی ترسناکدا لە سەر سنوور دەژین ، ئاژینی نوێی جیهانی لە راستیدا دەستپێدەکات .

ئێمە خۆمان دەگرین و دەڵێین دەستدرێژی قابلی تەحەموول نییە بەڵام ئێستا دەبێ دڵەکانمان بکەینەوە و بڵێین دەمانەوێت بەرپرسیاریەتیەکانمان هەروەك کاتی شەڕ، لە کاتی ئاشتیشدا جێبەجێی بکەین . ئەو کاتە بە سەرچوو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداری نەکات لە

---

Mr. BINGAMAN[١]

يارمەتيدانی ئەم ئاوارانە و دەبێ بەهەمان شەوق و گڕوتينەوە كە يارمەتی سەربازی كرد ، دەبێ يارمەتی مرۆڤدۆستانەش بدات .

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن ، هەتا ٢٧ی ئادار هێزەكانی عێراق هەرەسيان بە شيعەكان لە باشوور هيناو دەستيان كردەوە بە هێرش بۆ سەر كوردەكان لە باكوور. هەتا ١ی ئاڤريل، كوردە راپەڕيوەكان ناچار كران پاشەكشە بكەن. لە ٥ی ئاڤريل نەتەوە يەكگرتووەكان بڕيارنامەی ٦٨٨ی پەسەند كرد و داوای لە عێراق كرد هێرشەكانی دژی كورد رابوەستێنێ و لە گەڵ راپەڕيوەكان بكەويتە ناو ديالۆگ . لە هەمان رۆژدا يەكەم گرووپی ئاوارەكان سنووری توركيايان تێپەڕاند. دلۆپی ئاوارەكان لە ماوەی چەند رۆژی سەرەتای ١ی ئاڤريل بە خێرايی بوو بە شەپۆل ، لەگەڵ ئەوەشدا كارێكی ئەوتۆ نەكرا بۆ يارمەتيدانيان . هەتا ٨ی ئاڤريل (دووشەمبەی رابردوو) توركيا و چەند وڵاتێكی ديكە ٦٧ مليۆن دۆلاريان بۆ ئاوارەكان تەرخان كرد كە ١١ ميليۆن دۆلاری يارمەتی سەرۆك بوش بوو كە لە ٥ی ئاڤريل پێشنياری كردبوو . لە ٨ی نيسان وەزيری دەرەوە "جەيمز بەيكێر "بارووذۆخی ترسناكی ئاوارەكانی بە چاوی خۆی بينی . لە هەمان كاتدا يەكێ لە يارمەتيدەرانی كۆميسۆنی كاروباری پەنابەرانی نەتەوە يەكگرتووەكان رايگەياند يارمەتييەكانی نەتەوە يەكگرتووە كان كەمە و بە هيچ شێوەيەك بەشی ئاوارەكان ناكات . كۆمەڵگای ئۆرووپا وەڵامی دايەوە و خێرا ١٨٠ ميليۆن دۆلاری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان كرد .

وڵاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكاش لەم دوو رۆژەی دواييدا هەوڵی داوە بۆ يارمەتيدانی ئاوارەكان. هێزی هەوايی وڵاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكا يارمەتيە مرۆڤدۆستانەكانی كۆمەڵگای نێونەتەوەيی لە هەواوە دەخستە خوارەوە بۆ ئاوارەكان و ئێستاش هەوڵەكان بۆ كۆكردنەوەی يارمەتی زۆرتر و گەياندنی بە دەستی ئاوارەكان بەردەوامە . وڵاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكا لە بەرامبەر بارووذۆخی ترسناكی كوردەكان بەرپرسيارە بەڵام تازە درنگە و ئەنجامدانی ئەم كارە هەروا ئاسان نييە .بە گوێرەی راپۆرتەكان ١/٥ ميليۆن ئاوارەی كورد چوونەتە ناو خاكی توركيا و ئێران يان هەوڵ دەدەن بچەنە ناو خاكی توركيا و ئێران و لەبەر ئەوەی كە ژمارەی ئاوارەكان رووی لە زيادی

کردووە یارمەتییەکان بەشیان ناکات و وەڵامی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە گوێرەی گەورەبوونی کارەساتەکە نییە .

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن ئەگەر ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی ئەوەندە یارمەتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بدات بۆ دەرکردنی سەدام لە کوێت بە دڵنیایەوە دەتوانێ بەهەمان ئەندازەش یارمەتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بدات بۆ دابین کردنی خۆراك و خێوەت بۆ ئەم ئاوارە بێ دەرەتانانە . ئێمە دەتوانین یارمەتی ئەم خەڵکە بدەین و دەبێ یارمەتیان بدەین بەڵام بۆ ئەم ئامانجە پێویستیمان بە رێبەرایەتی هەیە ، رێبەرایەتییەك کە تا ئێستا لە حکوومەتی ئەمریکادا نەمانبینیوە . بۆ نموونە پێویستمان بەو رێبەرایەتییەك هەیە کە لە شالاوی "گەردەلوولی بیابان" و "قەڵخانی بیابان"دا هەمانبوو . دەبێ هەر ئێستا هەولێکی بەرفراوان دەست پێبکات بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان ، ئێمە دەبێ سەرنجی کۆمەڵگای نیونەتەوەیی چڕ بکەینەوە لە سەر بارودۆخی خراپی ئاوارەکان هەروەها کە سەرنجی کۆمەڵگای نێونەتەوەییمان چڕ کردەوە لە سەر بارودۆخی خراپی خەڵکی کوێت .

جەنابی سەرۆك ، لێرەیە کە ئاژینی نوێی جیهانی دەست پێدەکات . کاردانەوەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر هەڕەشەیەك (وەك ئەوەی سەدام ) شتێکە ونیشاندانی کاردانەوە بە خەڵکی ئازارچەشتوو شتێکی دیکەیە . هیوادارم ئێمە بە هەمان یەکگرتوویی و هاوئامانجییەوە کە لە شالاوی گەردەلوولی بیاباندا هەمانبوو ، کاردانەوەمان هەبێ و تکا لە سەرۆك بوش دەکەم لەم بوارەدا رێبەرایەتی هەبێ .

## ژینۆسایدی سەدام حوسەین

## ١١ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "داماتۆ[١]" :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ، ئەمڕۆ ئێمە یادی ڕووداوێکی ناخۆش دەکەینەوە لە بارەگای کۆنگرێس کە ئەویش یادکردنەوەی ٦ میلیۆن کەسە کە گیانیان لە هۆلۆکاستدا لەدەست داوە. ئەو هەستانە کە بۆ ئەم ڕووداوە دەربڕاوە ، قەد لە بیرمان ناچێت.

جەنابی سەرۆك ناچارم پێتان بڵێم حەپەساوم ، هەژاوم و تۆقاوم لە بەر ئەوەی کە نازانم چۆن دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی جارێکی دیکە بەرەو دواوە چووبێ و ڕێگە بەوە بدات ژینۆساید ڕوویدات ، ڕێگە بەوە بدات دەزگای مرۆڤکوژی سەدام پیاو ، ژن ، منداڵ و خەڵکی سڤیل بکوژێت لە بەر ئەوەی شیعەن یان کوردن ، لە بەر ئەوەی لایەنگری لەو کەسانە دەکەن کە دەیانەوێت کۆشکی سەرکوت بڕووخێنن .

ئەمڕۆ بێ دەنگی جیهان ڕوخسارێکی دزێوتری بە خۆوە گرتووە لە بەر ئەوەی کە هیچ پاساوێك بۆ ئەم بێدەنگییە نییە. خەڵك ناتوانن بانگەشەی ئەوە بەکەن ئەم ڕووداوانە نابینن یان ئاگاداری نین، کەوابوو ئەم یادکردنەوە جوانە و هەموو یادکردنەوەکانی دیکە کە ئێمە بۆ ڕێزگرتن لە قوربانیەکانیان دەیگرین هەتا کاتێك کە ئێمە نەتوانین لە بەرامبەر سەدام ڕابوەستین لە ڕاستیدا بێ کەڵکە . من نامەوێت بچمە ناو ئەو باسە تایبەتە کە دەبێ یا نابێ هەرێمێکی پارێزراو درووست بکرێت بۆ پاراستنی ژن و منداڵی بێگوناه. بە بیروبۆچوونی من ئەمە کارێکی تا ڕادەیەك باشە ، بە باوەڕی من دەبێ هێزە هاوپەیمانەکان لەو هێزە گەورەیە کە لە ناوچە هەیانە کەڵك وەربگرن بۆ ڕاوەستاندنی ماشینی کوشت و کوشتاری سەدام و دەبێ زۆر بە ڕاشکاوی بە

---

[١] Mr. D'AMATO

سەدام و ژنەراڵەكانی بگوترێت كە ئەگەر دەتانەوێت هێزی خۆتان دژی خەڵكی بێگوناح بەكاربێنن ، ئێمە هێزتان تێكدەشكێنین . ئەمە دەنگ و كردەوەی راستی و دادپەروەری نیە. ئێمە چۆن دەوێرین باسی ئەوە بكەین دەمانەوێت یادی ئەو كەسانە بەرز رابگرین كە لە هۆلۆكاست یان ژینۆسایدەكانی دیكەدا كوژراون و قەد فەرامۆشیان ناكەین لە كاتێكدا كە لەراستیدا بە پێچەوانەی ئەوە دەجولێینەوە. ئێمە هەمان شت دەكەین بەلام بە شێوازێكی زۆر قێزەونتر لە بەر ئەوەی پشت لەو شتانە دەكەین كە لە شاشەی تەلەفزیۆنەكانمانەوە دەیبینین .

بەڵێ جیهان لەوانەیە بانگەشەی ئەوە بكات ٥٠ ساڵ پێش ئێمە هیچ زانیارێكمان نەبوو ، نەماندەزانی ، قەد هیچ بیرۆكەیەكمان نەبوو ، باشە ئایا ئێستا هیچ بیرۆكەیەكمان هەیە ؟ ئایا ئێستا هەست بە باشتربوون دەكەین ،لە بەر ئەوەی كە دەمانەوێت ١٠ ملیۆن یا ٢٠ ملیۆن یا ٣٠ ملیۆن یا ٥٠ ملیۆن دۆلار بۆ یارمەتیدانی ئاوارەكان تەرخان بكەین . ئایا دەتوانین هەست بە باشتربوون بكەین و بڵێین كێ دەزانێ ، لەوانەیە ئێمەش كەسێكمان هەبێت لە سەدام خراپتر بێت .

## ژینۆسایدی عێراق رابوەستێنن
## ١١ی نیسانی ١٩٩١- کۆنگرێس

بەڕێز " پێل " :
جەنابی سەرۆك کارەساتێکی بی وێنە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی ئێستا لە عێراق روودەدات .
پتر لە ٣ میلیۆن کوردی عێراقی بە هۆی سەرماوسۆڵە، برسێتی و هێرشی سەربازی سوپای عێراق لە گەڵ مەترسی جیدی مردن رووبەڕوون . بینەران ، لەوانە کۆمەڵێك لە ئەندامانی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس باسی تاکتیکەکانی عێراقیان کردووە ، لەوانە بۆمباردمانی بەربلاوی شارۆچەکە کوردنشینەکان بە تۆپ و کۆپتەر و کۆمەڵکوژی خەڵکی سڤیل لەو ناوچانە کە دیسان لە لایەن سۆپاوە گێڕاونەتەوە و بەکارهێنانی چەکە قەدەغەکراوەکان وەك تۆپی فۆسفۆری و ناپاڵم .
چەند میلیۆن کورد لە شارەکانی باکووری عێراق هەڵهاتوون و پەنایان بردۆتە چۆم و شاخە بەرزەکان و ئێستا چوونەتە خاکی تورکیا و ئێران . بە هۆی ئەوەی رژێمی بەعس بە شێوازی سیستماتیك هەموو گوندەکانی کوردستانی کاول کردووە ، ئاوارەکانی ناو عێراق هیچ پەناگایەکیان نییە و دەستیان بە هیچ سەرچاوەیەکی خوراك لەم ناوچە کشتوکاڵییە دەوڵەمەندەدا ناکات.
ئێمە دەبێ یارمەتی بەو چەند میلیۆن کوردە بدەین کە لە سەر سنووری عێراق و تورکیا، لەناو خاکی تورکیا، لەسەر سنووری عێراق و ئێران و لەناو خاکی ئێران دان. من ستایشی هەوڵەکانی ئێران و تورکیا دەکەم بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بەڵام دەبێ کاری زۆرتر لەم پەیوەندییەدا بکەن .
قابلی قبووڵ نییە ئێمە ئەم خەڵکە برسیە کە لەگەڵ هێرشی سەربازی بەرەوڕوون لە سەرماوسۆڵەدا بهێڵینەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەوەی نەهێڵێت باری ئابووری

ئهم ناوارانه تهنها له كۆڵی توركیا وئێران بێت بهڵكوو له كۆڵی ههموو كۆمهڵگای نێونهتهوهیی بێت.
كۆمهڵگای نێونهتهوهیی دهبی ئێستا كاری جیدی بكات بۆ رێگرتن له كوژرانی خهڵك . ئێمه دهبێت به سهدام رابگهیهنین كوژرانی خهڵكی سڤیل قابلی قبوڵ نییه و دهبێ رابوهستێ. بۆ ئهم ئامانجه من بهكارهێنانی هێزی گهمارۆكانی نهتهوه یهكگرتووهكان به باشتر دهزانم و ئهگهر پێویست بكات بۆ رزگار كردنی گیانی خهڵك ، نهتهوه یهكگرتووهكان دهتوانێ ئهو كۆپتهر و تۆپانه له ناوببات كه بهوانه هێرش دهكرێته سهر خهڵكی عێراق . به ههرحاڵ دهبێ ئهوهش بڵێم كه من دژی بهكارهێنانی هێزی زهمینی ولاته یهكگرتووهكانی ئهمریكام .
ولاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا كۆمهڵێك بهرپرسیارییهتی ههیه بهنیسبهت ئهوهی كه ئێستا له ناوخۆی عێراق روودهدات . كۆمهڵكوژی خهڵك یهكێ له ئهنجامه نهخوازراوهكانی دهستێوهردانی سهربازی ئێمهیه له عێراقدا. لهمه زیاتر له رێگای ئهو لێدوانانهی كه به شێوازی نهخوازراو كورد و شیعهكانی هێنایه سهر ئهو باوهڕه كه ولاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا یارمهتیان دهدات، راپهڕینی عێراق له لایهن حكوومهتی ئهمریكاوه هاندرا . له كاتێكدا كه ولاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا یارمهتی ئۆپۆزیسیۆنی دهوڵهتی ئانگۆلا، ئهفغانستان و كامبۆجیا دهدات ، دهرك پێكراوه كه عێراقییهكانیش گهیشتبوونه ئهو باوهڕه كه لێدوانهكانی سهرۆكی ئهمریكا به واتای ئهوهیه كه ئهمریكا یارمهتیان دهدات.
له شهڕی دووهمی جیهانی تا ئێستا ئهوهنده خهڵك بهم خراپییه نهكهوتوونهته ناو مهترسییهوه. ئێمه دهبێ ههر ئێستا دهست بهكار بین بۆ راوهستاندنی كۆمهڵكوژی . گیانی پتر له ١ میلیۆن كهس بهوه گرێدراوه كه ئێمه له رۆژانی داهاتوودا چی دهكهین.

## بڕیارنامەی ٩٩ی ئەنجوومەنی پیران سەبارەت بە پاراستنی ئاوارەکان لە عێراق

## ١١ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز مۆیلینهان[١] بە نوێنەرایەتی لە لایەن بەڕێزان "جۆرج"[٢]، " پێڵ "[٣]، "لێهەی"[٤]،" سان فۆرد"[٥]،"داماتۆ"[٦]، "میشێل"[٧]، "دۆل"[٨]، "پەکوود"[٩]، "کرانستۆن"[١٠] و خاتوون" کاسیباوم"[١١] ئەم بڕیارنامەیەی ئامادە کردووە کە تاوتۆێ کراوە و بڕیاری لە سەر دراوە .

بڕیارنامەی ٩٩ی ئەنجوومەنی پیران

- بەهۆی ئەوەی کورد ، شیعە و خەڵکی دیکەی سەراسەری عێراق راپەڕینێکیان دژی دەوڵەتی سەدام حوسەین دەست پێکردووە

- بە هۆی ئەوەی لە سەرەتای راپەڕینەوە، دەوڵەتی عێراق بەبێ جیاوازی هێزێکی زۆری دژی خەڵکی سڤیل لە سەراسەری وڵات بەکار هێناوە، لەوانە بەکار هێنانی چەکگەلێك وەك ناپاڵم و

---

Mr. MOYNIHAN[١]
Mr. GORE[٢]
Mr. PELL[٣]
, Mr. LEAHY[٤]
Mr. SANFORD[٥]
[٦] Mr. D'AMATO
Mr. MITCHELL[٧]
Mr. DOLE[٨]
Mr. PACKWOOD[٩]
Mr. CRANSTON[١٠]
Mrs. KASSEBAUM[١١]

چەكی فۆسفۆری و هەزاران كەسی كوشتووە و ئاوارە كردووە و گیانی ١ میلیۆن كەسی خستۆتە ناو مەترسی

- بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ بڕیارنامەی ٦٨٨ی پەسەند كردووە و تێیدا سەركوتی خەڵكی عێراقی شەرمەزار كردووە و رایگەیاندووە كە ئەم سەركوتە هەڕەشەیە بۆ ئاسایش و سەقامگیری ناوچەو داوای لە دەولەتی عێراق كردووە بە خێرایی كوتایی بەم سەركوتە بێنێت و پێداگری كردووە كە عێراق دەستبەجێ رێگە بدات بەوەی كە رێكخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییەكان دەستیان بگات بەو كەسانەی كە پێویستیان بە یارمەتییەو داوای كردووە عێراق لە گەڵ سكرتێری گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان هاوكاری بكات بۆ ئەوەی بە خێرایی وڵامی پێداویستییە زۆر پێویستەكانی ئاوارەكان بدرێتەوە .

- بەلەبەرچاو گرتنی ئەوە كە نەتەوە یەكگرتووەكان و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەك رێبەری هاوپەیمانیی نێونەتەوەیی دژی داگیركاری سەدام ، بەرپرسیاریەتی و توانایەكی بێ وێنەیان هەیە بۆ باشتر كردنی رەوشی خراپی ئاوارەكانی عێراق

١- ئەنجوومەنی پیران بە توندی كردەوە سەربازییە دڕەقە بەردەوامەكانی عێراق ، كۆمەڵكوژی هەزاران خەڵكی بێ گوناح و پێشێل كردنی تەواوی ریسا نێونەتەوەییەكانی مافی مرۆڤ و كۆنڤانسیۆنی چوارەمی ژنێڤی ١٩٤٩ شەرمەزار دەدات .

٢- ئەنجوومەنی پیران داوا لە حكوومەتی ئەمریكا دەكات پشتیوانی لە دیمۆكراسی و مافی مرۆڤ و یاسای نێونەتەوەی بكات لە عێراقدا .

٣- ئەنجوومەنی پیران لە سەر ئەو باوەڕەیە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەرپرسیاریەتی ئەخلاقی هەیە لە بەرامبەر دابینكردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی بەردەوام بۆ ئاوارە عێراقییەكان و پێداگری دەكات لە سەر ئەوەی كە سەرۆك كۆمار درێژە بە هەوڵەكانی بدات بۆ كۆكردنەوەی پشتیوانی نێونەتەوەیی لەو كەسانەی كە لە دەستی سەركوتی عێراق هەڵهاتوون .

٤- ئەنجوومەنی پیران ستایشی یارمەتییەكانی توركیا و ئێران بە ئاوارە عێراقییەكان دەكات و تەشویقیان دەكات بە هەموو شێوەیەكی گونجاو درێژە بە یارمەتییەكانیان بدەن و جەخت لە سەر بەشداری ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكاتەوە لە هەوڵە نێونەتەوەییەكان بۆ یارمەتیدانی ئاوارەكان .

٥- ئەنجوومەنی پیران بە خێرایی داوا لە سەرۆك كۆمار دەكات گوشار بخاتە سەر ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ ئەوەی ڕێگای كاریگەر بگرنەبەر بۆ فریاكەوتنی ئاوارە عێراقییەكان ( هەروا كە لە بەشی ٤ی بڕیارنامەی ٦٨٨دا هاتووە) و بەشی VII مەنشووری نەتەوە یەكگرتووەكان جێبەجێی بكات و بەگوێرەی بڕیارنامە ٦٨٨ داوا لە عێراق بكات بە زووترین كات كۆتایی بە سەركوتی خەڵكی سڤیلی عێراق بهێنێت . ئەو ڕێگانەی كە ئەنجوومەنی ئاسایش لەم پەیوەندییەدا دەتوانێت بیگرێتە بەر بریتین لە :

١ـ دامەزراندنی ناوچەی پارێزراوی كاتی بۆ داڵدەدەانی ئاوارە عێراقییەكان كە لە دەستی سەربازانی عێراق هەڵهاتوون

٢ـ درێژەدان بەو ڕەوتە كە ڕێگا خۆش دەكات بۆ ڕاگەیاندنی لێبووردنی گشتی دەوڵەتی عێراق بۆ هاوولاتیانی عێراق و جێبەجێ بوونی تەواوی ئەم لێبووردنە

٣ـ دانانی گەمارۆی ئابووری لە سەر عێراق

٤ـ بەكارهێنانی ئامرازی كاریگەر بۆ پاراستنی ئاوارەكان بە گوێرەی مادەی ٤٢ی مەنشووری نەتەوە یەكگرتووەكان

## هەوڵە فریاگوزارییەکان  لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا
## ١١ی نیسانی ١٩٩١ ـ ئەنجوومەنی پیران

خاتوون "میکۆلسکی"[1] :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن من دەمەوێت دەربارەی پشتیوانی لە هەوڵی فریاگوزاری زۆرتر قسەبکەم . من ئەمڕۆ نامەوێت باسی ئەو سیاسەتە بکەم کە ئێمە دەبێ پشتیوانی چالاکانە بکەین لە راپەڕین لە عێراق یا پشتیوانی بکەین لە کوردستانێکی سەربەخۆ یان بزووتنەوە جوودابیخوازەکان لە ئافریقا . ئەم کێشە ئاڵۆزانە دەهێڵمەوە بۆ کاتێکی دیکە  بەڵام برسێتی و مردن بە هۆی سەرما و سۆڵە کێشەیەکی ئاڵۆز نییە. وەك ئەمریکاییەك  ئێمە ناتوانین بێکار دابنیشن و وێنەی ئاوارە کوردەکان و میلیۆنەها خەڵکی برسی لە سوومالیا، ئیتیۆپیا و سوودان پشتگوێ بخەین .

ئەمڕۆ ئیمە دەیان تەن کەلوپەل و پێداویستیمان لە ناوچە هەیە کە دەتوانین یارمەتی ئاوارەکانی پێ بدەین وەك خێوەت، خۆراك، فرۆکە و مووەلیدە . ئێمە بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان پێویستیمان بە راوێژ نییە، کاتی لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردنمان نییە. ئێمە دەزانین کە ئەوان پێویستیان بە یارمەتییە . تەنها کێشەی ئێمە ئەوەیە کە چۆن ئەم یارمەتییە بگەیەنینە دەستی ئاوارەکان . داوا لە کارمەندانی "ئاژانسی پێشکەوتنی نێونەتەوەیی" و وەزارەتی بەرگری دەکەم لە هەموو خۆڵقکاری و توانایی خۆیان کەڵك وەرگرن بۆ دۆزینەوەی رێگایەکی خێرا و کاریگەر بۆ تەسلیم کردنی پێداویستییەکان بە ئاوارەکان .

---
[1] Ms. MIKULSKI

## تەسلیمبوونی حكوومەتی ئەمریكا بە عەرەبستانی سعوودی مەترسیدارە

## ١١ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز"لڤین[١]" ، نوێنەری ئەیالەتی" كالیفۆرنیا":

جەنابی سەرۆك ،خاتوون" لۆری میلرۆی[٢] "لە وتارێكدا بە ناوی " عەرەبستانی سعوودی لە عێراق لە رێگا لایداین " كە لە ژمارەی دوێنێی رۆژنامەی"والستریت جۆرناڵ[٣] "دا بڵاو بۆتەوە بەڵگەو داكیومێنتەكانی كاریگەری عەرەبستانی سعوودی لە سەر سیاسەتی ئەمریكا لە رۆژهەڵاتی نێوەراست ئاشكرا كردووە. خاتوون "میلرۆی" دەڵێت حكوومەتی ئەمریكا رەزامەندی خۆی دەربڕیوە بەنیسبەت پلانێكی عەرەبستانی سعوودی بۆ كودیتای سەربازی دژی سەدام . كاتێ كە كودیتاكە هەرەسی هێناوە ، عەرەبستانی سعوودی دەستپاچە بووە و هۆشداری داوە بە حكوومەتی ئەمریكا كە رەنگە فەندامیتاڵیستە ئیسلامییەكان دەست بەسەر راپەڕینی باشووری عێراقدا بگرن . بەوتەی خاتون "میلۆری" عەرەبستانی سعوودی هەتا رادەیەكی زۆر بەرپرسیارە لە بەرامبەر بەتەنها هێشتنەوەی بێ ویژدانانەی كوردەكان و نەیارانی دیكەی عێراق .

پاش ئەوەی حكوومەتی ئەمریكا خەڵكی عێراقی هاندا راپەڕین بكەن و گلۆپی سەوزی بۆ هەڵكردن كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا یارمەتیان دەدات، حكوومەتی ئەمریكا بە بۆنەی نیگەرانییەكانی عەرەبستانی سعوودی سیاسەتی خۆی گۆڕی و راپەڕیوانی باكوور و باشووری عیراقی بەتەنها هێشتەوە و ئەوان بوونە قوربانی سوپای سەدام . سەركووتی كوردەكان بێ گومان یەكێ لە تراژیدیكترین لاپەڕەكانی مێژووی ئەمریكایە كە دەكرا رێی لێ بگیرابایا.

---

[١] Mr. LEVINE

Laurie Mylroie [٢]

Wall Street Journal[٣]

هەروەها خاتوون "میلۆری" ئاماژەی بەوە کردووە که تەسلیم بوونی ئـەمریکا بـە عەرەبـستانی سعوودی بە درێژایی مێژوو کەندو کۆسپ بووە لە سەر رێگای بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ناوچه . ئەم قەیرانە ئێستاش لە راستی بەدەر نییە . ئێستا کاتی ئەوە هاتووە سیاسـەتی ئـەمریکا لـە رۆژهەڵاتی نێوەراست بـە گـوێرەی بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکا بێـت ( لەوانـە هانـدانی بایەخـە دیمۆکراسیەکان) نە بەرژەوەندی رژێمێکی پاشایەتی خۆبەخێوکەر .

## بارووددۆخی کورد: هیچ ماقوولێیەك نییە لە بێ دەنگیدا

۱٦ی نیسانی ۱۹۹۱ — ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "پیتێرسۆن[۱]"، نوێنەری ئەیالەتی فلۆریدا :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ئەمڕۆ ئێمە شاهیدی ئێش و ئازاری منداڵانین . ئێمە بە سەرهاتی زوڵمێکی لە رادەبەدەرمان بیستووە و لە ترسدا ڕێگاکەمان لێ ون بووە. ئێمە دەبێ ئاوڕێك بدەینەوە و سەیری منداڵەکان بکەین ، تەنها ئەوەندە ، هیچی دیکە پێویست نییە. من بڕیارنامەیەکم سەبارەت بە کورد ئامادە کردووە بۆ ئەوەی سەرۆك کۆمار هان بدەین هەنگاوی خێرا هەڵبگرێت بۆ رزگارکردنی گیانی منداڵان و تێرکردنیان و ڕێبەرایەتی ئەخلاقی و تاکتیکی بگرێتە دەست لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا .

بە هۆی ئەوەی کە دوو میلیۆن کورد لە دەستی سەدام هەڵهاتوون و یەك هەزار کەس لە رۆژێکدا دەمرن ، ئیتر بە فیڕۆدانی کات لە جێی خۆیدا نییە . ئێمە وەك نەتەوەیەك، وەك حکوومەتێك و وەك مرۆڤێك لە گەڵ تاقیکردنەوەی بایەخەکانمان ڕووبەڕووین . هەرکاتێك ئێمە لە بەرامبەر هاواری یارمەتی خەڵکی کورد بێ دەنگ بین، ویژدانی خۆمان خستۆتە ژێر پێ ، هەر کاتێك ئێمە رووی خۆمان لە ئازار و ژانەکانیان هەڵگەڕێنینەوە، خیانەت بە مێژووی خۆمان دەکەین . هیچ ماقوولێەك نییە لە بێدەنگی دا .

ئەمرۆ ئێمە تکا لە سەرۆك کۆمار دەکەین وەك گرینگترین کاری ولاتی ئەمریکا سەیری بارووددۆخی کوردەکان بکات و ڕێبەرایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات بۆ هەوڵدانی دوو لایەنە بۆ پاراستن و فریاکەوتنی خەڵکی کورد. لەکاتێکدا کە ئێمە تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی شەرمەزار دەکەین کە وەبیرهێنەری رەشترین قۆناخەکانی مێژووی شارستانییەتەکەمانن ، نابێت لەم پەیوەندییەدا کەمتەرخەم بین .

---

[۱] Mr. PETERSON

## وەڵامی ئەمریکا بە هۆلۆکاستی[1] دووەم

## ١٦ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "راوینێل[2] ":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن بۆ وامان بە سەر هاتووە ؟ ئەمە هەفتەی سێیەمە کە دەبینین هۆلۆکاستی دووەم لە بەرامبەر چاومان لە عێراق روو دەدات بەڵام بەداخ و شەرمەوە هێشتا وەڵامی ئەمریکا بە چارەڕەشی ، مەرگ و هیلاکی ئەو منداڵانە، ئەو ژنە دووگیانانە، ئەو ژن و پیاوە بە ساڵاچوو و نەخۆشانە کە وەك ئاژەڵ لە چیا بەفرگرتووانەدا دەناڵێنن و ئازار دەکێشن، وەڵامێکی گونجاو نەبووە . بۆ ئەدەبیاتی لێدوانی رێبەرەکانمان ئەوەندە داکۆکیکارانەیە(لەخۆ) و داوای لێبووردن دەکەن؟ ئایا مەرگی ئەم منداڵانە و ئەم خەڵکە بێگۆناحە قۆرسایی ناکات بە سەر ویژدانماندا؟ ئەڵبەتە کە قۆرسایی دەکات . بۆ" گوس پاگونیس" یا "شوارتزکۆف" یێك[3] نییە لە تورکیا یارمەتیە مرۆڤدۆستانە بەرفراوانەکان بە رێکخستن بکات ؟ بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ،" بەیکێر" پێداگری ناکات لە سەر دەوڵەتی ئێران و تورکیا کە فریاگوزارییەکانیان زیاد بکەن ؟ بۆ نەخۆشخانەکان ، هەتیوخانەکان ، پزیشکەکان و کارمەندە یارمەتیدەرەکان بە گوێرەی پێویست بەکارنەهێنرێن.

ئایا ئێمە تا ئێستا لە هیچ شەڕێکی گەورەدا سەرکەوتوو بووین کە لە ئەنجامیدا شانازی و شەرەفمان وەك گەلێکی دڵسۆز و میهرەبان لە تراژیدیایەك کە بووە بە ژینۆساید لە دەست چوویێت.

---

[1] وشەی هۆلۆکاست بە واتای سووتاندنە و لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بەو شاڵاوە دەگوترێت کە نازییەکان بە سەرکردایەتی هیتلەر بۆ قەلاچۆ کردنی جوولەکەکان لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوەیان برد کە تێیدا بە میلیۆنەها جولەکە لە کۆرەکاندا سووتێنران. وەرگێڕ

[2] Mr. RAVENEL

[3] Gus Pagonis or Schwartzkopf

## ستایشی سەرۆك كۆمار بە بۆنەی خۆتێوەگلاندن لە عێراق

## ١٦ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی نوێنەران

خاتوون" كنيلی[١] ":

به خۆشییەوه ئەوەنده كه ئێمه ئاگادارین خەڵكی هێژای ئێمه ئەوه رووداوانه كه له تەلەفزیۆنەكاندا دەبینن له ژیانی خۆیان بۆیان گرنگتره . ئەمەش هۆكاری ئەوەیه كه من ئەمڕۆ سەر لەبەیانی هەڵساوم بۆ ئەوەی ستایشی سەرۆك كۆمارەكەمان بكەم به بۆنەی ئەوەی كه جارێكی دیكه دەستێوەردانی كردووه له بارووددۆخی عێراقدا .

هیچ گومان لەوەدا نییه كه ئەوەی كه به سەر كوردەكاندا دێت، یەكێ له ناخۆشترین شتەكانه كه ئێمه له مێژووی هاوچەرخدا بینیومانه، له هەمان كاتدا خەڵكی ئێمه ئەوەنده شانازی به سەربازەكانمان دەكەن له كاتی گەڕانەوەیان بۆ وڵات . ئێمه شانازی كردنەكانمان له خۆشحاڵییەكانماندا دەردەبڕین . له هەمان كاتدا خەڵكی هێژای ئێمه ئەم ئاوارانه دەبینن ، ئێش و ئازارەكانیان دەبینن . كەوابوو به بیرو بۆچوونی من كاری راست و درووست ئەوەیه ئێمه هێزی سەربازیی خۆمان به كار بهێنین بۆ یارمەتیدانی ئەم خەڵكه . جەنابی سەرۆك كۆمار جارێكی دیكه سپاستان دەكەم بۆ تێوەگلاندنمان له كێشەی عێراق .

---

MRS. KENNELLY[1]

## دەبێ کاری خێرا بکرێت بۆ پاراستن و رزگار کردنی کوردەکان

## ١٦ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" هۆیەر[١] ":

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن منیش هەروەك گەلێ لە هاوکارەکانم لە سەر ئەو بڕوایەم کە حکوومەتی ئەمریکا دەبێ بە خێرایی و بە بڕیارەوە کار بکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کوردەکان . پاش شەڕی دووەمی جیهانی ، ئیمە وەك کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بڕیارمان دا تەنها بە قسە ژینۆساید شەرمەزار نەکەین (کە پێشتریش شەرمەزار کراوە) بەڵکوو پێکەوە بە کردەوە دژی ژینۆساید رابوەستین .

ئەم دواییانە سەدام حوسەین لەگەڵ هیتلەر بەراورد کراوە . بە بیروبۆچوونی من ئەم لێکچوونە رۆژ لە دوای رۆژ تەواوتر دەبێت . ئێمە ترۆری سەدام دژی خەڵکی خۆی دەبینین ، دەبینین کە خەڵك هەڵدێن و ئاوارە دەبن .

جەنابی سەرۆك راشکاوانە دەڵێم ئێمە زۆر درەنگمان کردووە ، زۆر درەنگ وڵامان داوە، بەڵام زۆر درەنگ نەبووە بۆ ئەنجامدانی کاری راست و ئێمە ئێستا وەڵام دەدەینەوە . هیوادارم سەرۆك کۆمار و ئەم کۆنگرێسە و ئەم وڵاتە لە هەمان شێلگیری و توانایی هێزە هاوپەیمانەکان کەڵك وەربگرن لە کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بۆ پاراستن و رزگار کردنی خەڵکی بێ گوناح.

جەنابی سەرۆك ئێمە درەنگ دەست بەکاربووین بەڵام نابێ لەمە زیاتر درەنگ بکەین .

---

[١] Mr. HOYER

## وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا نابێ بێ ههڵوێست بێ له کاتێکدا که کۆمهڵگای نێونهتهوهیی ژینۆساید قهدهغه دهکات

## ۱۷ی نیسانی ۱۹۹۱ - ئهنجوومهنی نوێنهران

بهرێز "کنیدی ":

جهنابی سهرۆك، جیهان بهردهوامه له بینینی کۆمهڵکوژی خهڵکی کورد به دهستی سهدام حوسهین . ئهوهی که سهدام نهیتوانی له رێگای کیمیاباران و بۆمباران کردن به دهستی بهێنێت، ئێستا ههوڵ دهدات لهرێگای برسی کردنی خهڵك و ئاواره کردنیان له ناو سهرما وسۆڵهدا به دهستی بهێنێت . پتر له یهك ههزار ئاوارهی بێ گوناح ههر رۆژله ناوچه شاخاوییهکاندا دهمرن ، زۆربهی ئهم قوربانیانه منداڵی ژێر ٥ ساڵن .

ئهگهر ئاژینی نوێی جیهانی واتای ههیه ، وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا نابێ بێ ههڵوێست بێت له کاتێکدا که کۆمهڵگای نێونهتهوهیی ژینۆساید قهدهغه دهکات .

سهرۆك کۆماری ئێمه پاش ئهوه که خهڵکی عێراقی به توندی هاندا راپهڕین بکهن ، سهرئهنجام ههڵسا بۆ یارمهتیدانیان . دهبێ پیرۆزبایی له سهرۆك کۆمار بکهین به بۆنهی بڕیارهکهی دوێنێی بۆ فریاکهوتن و یارمهتیدانی فراوانتری کوردهکان له باکووری عێراق . بهڵام ههوڵهکانی ئێمه بۆ چهسپاندنی ئاشتی له عێراق له مانگێکدا کۆتایی پێنایێت و تهنها له هێڵی ۳٦ راناوهستێت. ئاشتی تهنها کاتێك دهچهسپێت که کورد و شیعهکان بگهڕێنهوه بۆ زێدی خۆیان بهبێ ئهوهی ههڕهشهی کۆمهڵکوژیان لێ بکرێت و راپرسی بهم خهڵکه ئازارچهشتووه بکرێت که چ جۆره حکوومهتێکیان دهوێت.

جهنابی سهرۆك ، وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا وهك رێبهری ئهخلاقی جیهانی ئازاد دهبێ به زووترین کات بڕیارنامهیهك له نهتهوه یهکگرتووهکاندا پهسهند بکات و داوا بکات گهمارۆکانی

سەر عێراق هەڵنەگیرێت هەتا کاتێـك کـە خـەڵکی عێـراق خـۆراك و ئاسایـشیان هـەبێت و لـە هەڵبژاردنێکی ئازاددا بەشداری بکەن . ئەمە هەمان شتە کە سەربازانی ئێمە شەڕی بۆ دەکـەن ، هەمان شتە کە خەڵکی عێراق بە هیوایینی و هەمان شتە کە ئاشتی و سەقامگیری راستەقینە لـە ناوچەدا دەستەبەر دەکات .

## سەدام حوسەین ، كارەساتێكی ناسرووشتی

## ١٧ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" لیبەرمان":

جەنابی سەرۆك، دوێنێ سەرۆك كۆماری ئەمریكا سیاسەتێكی ڕاگەیاند بۆ دامەزراندنی هەرێمی پارێزراو لە ناو خاكی عێراق بۆ دابەشكردنی ڕێكوپێكی خۆراك ، دەواو دەرمان، جل و بەرگ و خێوەت بۆ ئاوارە كوردەكان . ئەم هەرێمە پارێزراوە (لانیكەم بە شێوازی كاتی) لە لایەن وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هێزە هاوپەیمانەكان دەپارێزێت.

ئەمە هەنگاوێكی گرنگ وپڕشكۆیە كە بە عاقارێكی ڕاست و درووستدا دەچێت . هەفتەی پێش من لێرە خوازیاری زیادبوونی یارمەتییەكانی ئێمە بە كوردەكان بووم و وتم هەرێمی پارێزراو سەرناگرێت مەگەر بەو مەرجە كە هێزی سەربازی زەمینی و هێزی هەوایی، ئەم هەرێمە لە بەرامبەر هێرشی سەدام بپارێزێت. هیوادارم ئەم فریاگوزارییە نێونەتەوەییە نوێیە بە خێراترین كات بگاتە دەستی ئاوارەكان . ئەمە كارەساتێكی زۆر گەورە و بەرفراوانە و دەبێ هەوڵێكی فریاگوزاری مرۆڤدۆستانەو بێ وێنەی بۆ بدرێت .

بەڵام كێشەكە لە برسێتی، نەخۆشی و بێ سەرپەنایی ئاوارەكان گەورەترە. كێشەكە دەگەڕێتەوە بۆ كردەوەكانی سەدام حوسەین . ئەمە هەوڵێكی فریاگوزاری ئاسایی نییە. ئێمە لەگەڵ ئاكامەكانی بوومەلەرزەیەك، گەردەلوولێك یان كارەساتێكی سرووشتیی دیكە بەرەوڕوو نین . ئێمە لەگەڵ كارەساتێكی ناسرووشتی بەناوی سەدام ڕووبەڕووین و بە پێچەوانەی بوومەلەرزەیەك یان گەردەلوولێك كە دێت و دەچێت ، سەدام هەروا هەتا ئەمڕۆ خەڵكەكەی دەچەوسێنێتەوە . سەدام هۆكاری مەرگی كوردەكانە ، سەدام دەبێ بچێت و دەكرێ و دەبێ كاری زۆرتر بكرێت بۆ لابردنی . دامەزراندنی هەرێمی پارێزراو تەنها ڕێگاچارەیەكی كاتییە . كوردەكان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان. كوردەكان ماڵ ، كێڵگە، ژیان و كولتووری خۆیان هەیە لە گوندەكانی خۆیان لە عێراقدا (

لانیکەم لەو گوندانەی کە بە دەستی سەدام حوسەین نەڕووخێنراون) بەڵام دەترسن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان . ترسی ئەوان شتێکی سرووشتییە لە بەر ئەوەی کە لەوە دەترسن بە دەستی سەدام بکوژرێن . ئەو راستییە کە مرۆڤێك ئەوە هەڵبژێرێت لەگەڵ برسێتی، تینوویەتی، ئاوارەیی و نەخۆشیدا بەرەورِوو بێتەوە بەڵام لەگەڵ سەدام حوسەین بەرەورِوو نەبێتەوە، خۆی بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە سەدام چەندە دڕندەیە و چەندە بەلای ئێمەوە گرنگە کە لە سەر دەسەلاَت لایببەین . ئێمە دەبێ کاری زۆرتر بکەین بۆ رزگار کردنی خەڵکی سەرکوتکراوی عێراق لەم چارەنووسە رەشە. ئێمە دەبێ هیوایان پێ بدەین، هیوایەك کە ئێستا بوونی نییە .

بریا ئێمە زووتر دەست بە کار ببایین ، بریا ئەو کۆپتەرانەمان بخستبایا خوارەوە کە خەڵکیان پێ سەرکووت دەکرا، بریا داوامان بکردبا هێرشەکان بۆ سەر خەڵکی سڤیل کۆتایی پێ بێت و ئەگەر سەرپێچیان لە هۆشدارییەکانی ئێمە کردبا هێزی هەواییمان بەکار هێنابایا . لەوانەیە ئەم کردەوانە پێشی لەوە بگرتبایا هێزەکانی سەدام بەسەر راپەڕینی خەڵکدا سەربکەوتنایا و ئێمە بمانتوانیبایا رێگریمان بکردبایا لە کۆمەڵکوژی خەڵکی بێ گوناح و لەوانەیە پێشمان لە ئاوارە بوونی بە کۆمەڵی زۆری خەڵك بگرتبایا.

تەنانەت ئێستاش ئێمە دەبێ بۆ سەدام و دارودەستە سەرکووتکەرەکەی روونی بکەینەوە کە ئیدی ناتوانن خەڵك بە کۆمەڵ بکوژن . کوردەکان ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان مەگەر کاتێك کە دڵنیابن لەوەی کە ئیدی لەگەڵ مەترسی سەدام بەرەورِوو نابنەوە .

پێویست ناکات ئێمە خۆمان بخەینە ناو شەڕێکی زەمینی یا شەڕێکی ناوخۆییەوە بۆ یارمەتیدانی خەڵکی بێ گوناح دژی لایەنێك کە مرۆڤکوژە . بەڵام ناتوانین وا نیشان بدەین کە هیچ بەرژەوەندییەکمان نییە لە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی عێراقدا. راگەیاندننامەکەی دوێنێی سەرۆك کۆمار سەلماندی کە ئێمە کەوتووینەتە ناو کاروباری ناوخۆیی عێراق و دەبێ زۆرتریش بکەوینە ناوی .

خەڵکی عێراق خوازیاری یارمەتی ئێمەن ، سەربازانی ئێمە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەوەی کە گەلێك لە خەڵکی عێراق وەك رزگاریدەر سەیریانی کردووە. رژێمی تاوانباری عێراق شایانی رێزگرتن و سەرنجپێدانی ئێمە نییە . ترۆریستێك (بە ناوی سەدام) وڵاتێك بەرێوە دەبات و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کە لە نەتەوە شارستانییەکان پێکهاتووە، ناتوانێت رێگە بەمە بدات . ئێمە دەبێ لە هەموو ئامرازە مەعقولە ئابووری، دیپلۆماسی و سەربازییەکان بۆ رووخاندنی رژێمی سەدام کەڵك وەربگرین .

ئەمریکا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی دەبێ سیاسەتێکی چڕوپڕ بگرێتە بەر بۆ ئەوەی یەك جار بۆ هەمیشە بە سەر سەدامدا سەربکەوێ و تەسلیمی دادپەروەری بکات بە هۆی تاوانەکانی . خەڵکی ئەمریکا و عێراق داوای دادپەروەرییەکی وادەکەن ، ئەخلاقی کۆمەڵگای نێونەتەوەییش داوای هەمان شت دەکات .

## ڕۆژی یادکردنەوەی هۆلۆکاست

## ١٧ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەرێز "سیمۆن[١] ":

جەنابی سەرۆك دەمەوێت چەند وتەیەك سەبارەت بە ڕۆژی یادکردنەوەی هۆلۆکاست پێشکەش بکەم کە ڕۆژی ١٢ی ئاڤریل بوو . ڕۆژی یادکردنەوەی هۆلۆکاست وەبیرهێنەری ئەو دڕندایەتییەیە کە دژی مرۆڤ بەڕێوە چوو و پێویستە ئەوە وەبیری خۆمان بهێنینەوە کە ئەهامەتی دژی مرۆڤایەتی هێشتا داوێنی ئێمەی لە سەرەتای سەدەی ٢١ بەرنەداوە .

ئەو چەند میلیۆن کەسە کە بەدەستی ڕژێمی نازی کوژران و ئازار و ئەشکەنجە دران ، نابێ قەد لەبیرمان بچنەوە. یادی ئەوان دەبێ لە دڵ و ڕۆحماندا هەر زیندوو بمێنێت ، هەرواکە دەبێ شەرارەتی راسیزم(ڕەگەزپەرەستی) لە بیرمان نەچێتەوە . هەموو ئەورووپا کەوتە نێو ئاگری ترسناکی جەنگی دووەمی جیهان و گەلێ مرۆڤ بە هۆی ئایین یان ڕەگەزیانەوە تووشی ئازار و ئەشکەنجە بوونەوە، بەڵام نە بەقەد جوولەکەکان. هەروەها کە هەموومان باش دەزانین کۆمەڵگای جووولەکەی ئۆرووپا قەڵاچۆ کراو ، هیتلەر توانی ٦ملیۆن جوولەکە بکوژێت .

ئەمڕۆ ئێمە لە کاتێکدا هۆلۆکاست وەبیر دەهێنینەوە کە هێرشێکی دڕندانەی دیکە لە سەر مرۆڤایەتی دەبینین ، ئەویش هێرشی دڕندانەی سەدام حوسەین بۆ سەر خەڵکی کوردە . ڕاستە پێوەر و ئاستی ئەم هێرشە لەگەڵ هۆلۆکاستی نازییەکان قابلی بەراورد نییە بەڵام لە رووی ترس و تۆقانەوە زۆر لەیەك دەچن . لە کامبۆجیا لە ناوەڕاستی ١٩٧٠" پۆلپۆت[٢] " ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی خۆی بە کۆمەڵ کوشت کە مێشکی مرۆڤ دەتەقێنێت . پاش ئاشکرابوونی ئەم

---

[١] Mr. Simon

[٢] Pol Pot

ژینۆسایده ، کۆمەڵگای نێونەتەوەیی شەرمەزاری کرد و پەیمانی بەست بێ هەڵوێست نەبێت و ڕێگە نەدات ئەم تاوانانە رووبدات یان بێ سزادان بە سەربچێت .

ئێمە ئێستا لە عێراق لە باروودۆخێکداین کە تێیدا سەدام حوسەین تۆڵە لەو کەسانە دەسێنێتەوە کە نەیاری دەسەڵاتەکەینی واتا شیعەکان لە باشوور ، کوردەکان لە باکوور و سوونەکان کە بەشداریان لە راپەڕیندا کردووە. بە هەمان شێوە کە رەنگە ئێمە بزانین ٤٥ ساڵ پێش چی رووی داوە ، بە هەمان شێوەش دەبێ بزانیین ئێستا چی روودەدات و دەست بە کار بین پێش لەوەی کە زۆر درەنگ بێت . هێرشە سەربازییەکانی سەدام دژی کوردەکان بۆتە هۆی کۆڕەوێکی گەورە کە ئاکامەکەی تراژیدییەکی گەورەی لێکەوتۆتەوە .

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ رێبەرایەتی جیهان بگرێتە دەست بۆ ئەوەی بە زووترین کات یارمەتی پێویست بگەیەنێتە دەستی کوردەکان. من لێرە لە ئەنجوومەنی پیران دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی هاوکارانم و خەڵکی ئەمریکا و لە خودا دەپاڕێمەوە جیهان ئیدی کردەوەگەلێکی وەها دڕندانە بە خۆیەوە نەبینێت.

لە کاتێکدا کە هەنگاوی گەورە لەم پەیوەندییەدا هەڵگیراوە بەلام دژایەتی کردنی جوولەکەکان هێشتا لە جیهاندا هەر ماوە. رۆژی یادکردنەوەی هۆلۆکاست کاتێکی گرنگە بۆ وەبیرهێنانەوەی دڕەندایەتییەکان دژی جوولەکەکان و ژینۆساید ، راسیزم و شەڕی داگیرکەران لەبەر ئەوەی کە یادکردنەوەی بە کۆمەڵی ئێمە لە هۆلۆکاست پێش لە هۆلۆکاستەکانی داهاتوو دەگرێت . ئێمە قەد ناتوانین هۆلۆکاست لە بیر بکەین .

## دیداری پیتر گالبریس[1]، ئەندامی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران لە باکووری عێراق

## ١٧ی نیسانی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" مۆینیهان[2]" :

جەنابی سەرۆك، هاوکارانم ئاگادار دەکەمەوە کە بەڕێز" پیتر گالبریس"، ئەندامی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی بە تەواوی ژیانی خۆی خستۆتە نێو مەترسی.

لە هەفتەی "جەژنی پیرۆز" واتا ٣٠ـ ٣١ی ئادار بە بەڕێز گالبریس لە رووباری دیجلە (کە دەکەوێتە سنووری عێراق و سووریا ) دەرباز بووە کە لە ژێر بۆمباردماندا بووە . گالبریس دوو شەوی ترسناکی بە قارەمانێتی لە نێوان کوردەکانی ئەو ناوچەیە تێپەڕاندووە کە یەکێ لەم شەوە جەهەنەمیانە لە شاری دهۆك بووە کە لە لایەن پێشمەرگە کوردەکانەوە گیرابووە ولە ژێر بۆردمانی بەرداوامی هێزەکانی سەدام حوسەیندا بووە . لەم بۆمبارانانەدا لە تۆپی فسفۆڕیش کەڵك وەرگیراوە . بەڕێز گالبریس لەو پەڕی لە خۆبردوویيدا لەگەڵ رێبەرە کوردەکان دیداری کردووە و لەگەڵ ئاوارەکان قسەی کردووە و کاولکارییە وێنانەکراوەکانی ناوچە و ئەو خەڵکەی بینیوە و تۆماری کردووە .

بە هەرحاڵ گالبریس هیچی بە سەر نەهات و لە رێگای سووریاوە گەڕایەوە بۆ ئەمریکا و راپۆرتێکی بەڵگەمەندی سەبارەت بە بارووددۆخی ناوچە لە تەلەفزیۆنەکان و رۆژنامەی" نیۆ

---

[1] Peter Galbraith

[2] Mr. MOYNIHAN

ریپابلیك[3] "بۆ رای گشتی ئـەمریکا بـڵاو کـردەوە ، ئەڵبەتـە زانیـاری زۆرتـری داوە بـە خـودی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران .

له هەر رێکخراوێکدا ، بە دڵنیاییەوە جۆرێك پێزانین هەیە بۆ ئـەم جـۆرە کارانـە کـە لـە ئـەرکی سەرشان زۆرترە وەك میدالیایی سەربازی و خەڵاتی مەدەنی . ئێمە شتێکی لـەو جۆرەمـان نییـە کە بیدەین بە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران. ئەم کەموکۆڕییە لە لایەن ئێمـەوە نییـە. یـەکێك لـە هۆکارەکانی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە لە مـاوەی ۲یـا۳ی سـەدەی رابـردوودا ئێمـە کەسـێ وەك "گـالّبریس" مـان نـەبینیوە . گـالّبریس لەوپـەڕی لـە خـۆبردوویی و خـەمخواردن بـۆ ئاسـایش و حەوانەوەی خەڵکێکی زۆرلێکراو تووشی کێشەو گرفتی زۆر بووە .

---

[3]New Republic

## با دان به قسەكانياندا بنێن

### ١٨ى نيسانى ١٩٩١ - ئەنجوومەنى نوێنەران

بەڕێز "ئۆكسلی[١] ":
جەنابى سەرۆك دەمەوێت سەرنجى هاواكارانم رابكێشم بۆ لای ئەو وتارەى كە رۆژنامەنووس و توێژەر ، "بێن واتێنبێرگ[٢]" سەبارەت بە دووڕوويى هەندێ لە رەخنەگرانى تايبەتى سياسەتەكانى سەرۆك بوش لە كەنداوی فارس نووسيويەتی . داوا لە هاوكارانم دەكەم سەرنج بدەنە ئەم وتارە .
هەندێ لە كەسايەتيە ديمۆكرات و ليبراڵەكان وتوويانە حەپەساون ، دڵسارد بوونە و عاجزبوونە بە هۆی ئەوەی كە سەرۆك بوش يارمەتی كوردەكانی نەداوە بۆ رزگار كردنيان لەم نەهامەتييە سەربازييە . ئەوان دەڵێن دەبێ ئێمە هەر ئێستا كارێك بكەين. زۆر باشە بەڵام ئايا ديمۆكراتەكان و ليبراڵەكان لايەنگرى دەستێوەردانى ئەمريكان لە شەڕە ناوخۆييەكاندا؟ لە ڤێتنام وا نەبوو ، تێوەگلان لە شەڕی ناوخۆيی هۆكارى سەرەكی ئەم دژايەتييە نەبوو. ئێمە وتمان ك ئەمريكا نابێت دەستێوەردان بكات تەنانەت ئەگەر يەكێ لە لايەنە خراپەكانی ئەم شەڕە ناوخۆييە هێزێكی كۆمۆنيستی داگيركەر بێ كە لە لايەن دوژمنی ناوكی ئێمە واتا يەكێتی سۆڤيەتەوە پشتيوانی لێبكرێت ، لە نيكاراگوا هەروەها . لەمە زياتر ئەم جارە كێشەكە لە پەنای گوێمانە . بەڵام سياسەتی ديمۆكرات و ليبراڵەكان ئەوە نەبووە كەئەمريكا دەبێ خۆی لە شەڕی ناوخۆيی وڵاتان دووربگرێ .

---

Mr. OXLEY [١]
Ben Wattenberg [٢]

## یاسایی یارمەتی فریاگوزاری بۆ ئاوارە عێراقییەکان

## ٢٣ی نیسانی ١٩٩١ ــ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" دیکسۆن[١]" :

جەنابی سەرۆك دەمەوێت سەرنجی ئێوە بەرەولای ئەو گەلاڵە یاسایە رابکێشم کە هەفتەی پێشوو لە ژێر ناوی یاسای فریاگوزاری خێرا بۆ ئاوارە عێراقییەکان تەسلیمی کۆنگرێسم کردووە بۆ گەیاندنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی خێرا بۆ ئاوارە ئازارچەشتووە کوردەکان و ئاوارەکانی دیکەی عێراق .

ئەم یاسایە داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەکات هەنگاوەکانیان خێراتر بکەن بۆ یارمەتیدانی ئاوارە ئازارچەشتووە کوردەکان و ئاوارەکانی دیکەی عێراق و کۆمەڵکوژی دڕندانەی خەڵکی عێراقی بەدەستی سەدام شەرمەزار کردووە . هەزاران پیاو، ژن و منداڵی عێراقی مردوون و ئێستاش بە هۆی سەرما و سۆڵە ، برسێتی و نەخۆشی هەر رۆژ دەمرن . وەك مرۆڤ ئێمە ناتوانین بێ هەڵوێسیت دابنیشین و تەنها سەیری رووداوەکان بەکەین .

یاسای یارمەتی فریاگوزاری بۆ ئاوارە عێراقییەکان جەخت لە سەر پشتیوانی کۆنگرێس دەکاتەوە بۆ یارمەتی و فریاگوزاری مرۆڤدۆستانە بۆ ئاوارەکان . هەروەها پشتیوانی لە بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات کە سەرکووتی خەڵکی عێراقی شەرمەزار کردووە و داوای کردووە ئەم سەرکوتە کۆتایی پێبێت . ئەم بڕیارنامەیە پێداگری کردووە لە سەر ئەوەی کە دەوڵەتی عێراق بە زووترین کات رێگە بەوە بدات رێکخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییەکان دەستیان بگات بەو کەسانەی کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە و لەگەڵ سکرتێری

---

Mr. DIXON[١]

گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هاوکاری بکات بۆ ئەوەی بە خێرایی وەڵامی پێداویستییە زۆر پێویستەکانی ئاوارەکان بدرێتەوە .

ئەمە دەقی گەڵاڵە یاسای ١٣١ی کۆنگرێسە :

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کۆنگرێس، کۆمەڵکوژی دڕندانەی خەڵکی عێراق و پێشێلکردنی بەرفراوانی مافی ئەوانی بە دەستی سەدام حوسەین و سەربازەکانی شەرمەزار کردروە، بەتایبەت کەمینەی کورد لە باکورر و شیعەکان لە باشورر

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ ، بڕیارنامەی ٦٨٨ی پەسەند کردووە کە تییدا سەرکووتی خەڵکی عێراق شەرمەزار کراوە و لەسەر ئەوە جەخت کراوەتەوە کە ئەم سەرکووتە هەڕەشەیە بۆ ئاسایش و ئاشتی ناوچە و داوا لە عێراق کراوە بە زووترین کات کۆتایی بەم سەرکووتە بهێنێت و لەسەر ئەوە پێداگری کردووە کە عێراق رێگە بەوە بدات رێکخراوە نێونەتەوەییە مرۆڤدۆستەکان بە خێرایی دەستیان بگات بەو کەسانەی کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە و داوای کردووە کە عێراق لەگەڵ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هاوکاری بکات تا بە زووترین کات وەڵامی پێداویستییە زۆر پێویستەکانی ئاوارەکان بداتەوە .

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە سەرۆك کۆماری ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت هەر چەشنە هێرشێك بۆ سەر ئاوارەکان و شالاَوی یارمەتیدانی ئاوارەکان هۆشداری داوە بە دەوڵەتی عێراق .

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە سەدان هەزار ئاوارە پاش شەڕی ناوخۆیی عێراق لە دەستی تیرۆری سەدام حوسەین لە زێدی خۆیان هەڵهاتوون و بە هیلاکییەوە بەدوای شوێنێکی ئارامدا گەڕاون و بە پێی مەزەندەکان ١/٧ میلیۆن کەس لە عێراق ئاوارە بوونە یان لە رووی ناچارییەوە پەنایان بردووە بۆ ولاَتانی دراوسێ .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە سەدان پیاو ، ژن و منداڵ بـه هـۆی سـەرماو سـۆڵە، برسـێتی و نەخۆشی مردوون .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە كه وڵاتانی دراوسێی عێراق وەك توركیا و ئێران كەمپی كاتییـان دروست كردووە لەناو سنووری خۆیان بۆ ئاوارەكانی باكوور و باشووری عێراق و هـەزاران ئـاوارەی دیكە كە لە مەودای ۲۰٦ مایلی سنووری عێراق و توركیا كۆبوونەتـەوە و ئاوارەكـانی باشـووری عێراق لەو ناوچەیەدان كە پێشتر لە لایەن هێزە هاوپەیمانەكانەوە گیراوە و ئێستا لە دەستی هێـزە ئاشتی پارێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان و لیژنـەی چاودێری كردنـی نەتـەوە یـەكگرتووەكان بـە سەرعێراق ـ كوێت ( UNIKOM)دان .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ، وڵاتـانی ئەورووپـایی و وڵاتـانی دیكـە و نەتـەوە یـەكگرتووەكان و رێكخـراوە خۆویـستە ناحكوومییـەكانی دیكـە پـشتڕاستیان كردووەتەوە كە ئاوارەكان پێویستی یەكجار زۆریان بە دەواودەرمان، خێوەت و خۆراك، بـەتانی و ئاو و هەوڵی فریاگوزاری بەرفراوانی نێونەتەوەیی هەیە.

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا و نەتـەوە یـەكگرتووەكان تیمـی پسپۆڕیان ناردووە بۆ ناوچـەی كەنـداو كـە رەهەنـدەكانی قەیرانەكـە و پێویـستییەكانی كـورد ، ئاسووری ، كەلدان ، شیعەو ئاوارەكانی دیكەی عێراق هەڵبسەنگێنێت .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا داوای پتر لـە ٥٠٠میلیـۆن دۆلار پارەی كردووە بۆ یارمەتیدانی نزیكەی ١/٧ میلیۆن ئاوارەی عێراقی لە ئێران، توركیـا، سـوریا و ئۆردۆن .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە نەتەوە یەكگرتووەكان بەڵێنی داوە كە ١٠میلیـۆن دۆلار تـەرخان بكات بۆ یارمەتیدانی خێرای ئاوارەكان و وڵاتانی بەخشێنەری دیكەش بەڵێنێكی وایان داوە .

ــ به لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە كه كۆنگرێس لە هەوڵە مرۆڤدۆستانەكانی توركیا و وڵاتانی دیكە و "شالاوی دابین كردنی حەسانەوە"ی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ دابـین كردنـی خـۆراك و

پێداویستییەکانی ئاوارەکان و هەوڵە فریاگوزاریە مرۆڤدۆستانەکانی فەرانسا ، بەریتانیا ، ئاڵمانیا و وڵاتانی دیکە پشتیوانی دەکات بەڵام لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ هەوڵی هاوئاهەنگی نێونەتەوەیی زۆرتر بدرێت لەم پەیوەندییەدا

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کۆنگرێس زۆر نیگەرانە و بەرپرسیارە بە نیسبەت دابینکردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی زیاتر بۆ خەڵکی سەرکوتکراوی عێراق

کەوابوو کۆنگرێس :

١ـ پشتیوانی لە یارمەتی فریاگوزاری مرۆڤدۆستانە دەکات بۆ ئاوارە عێراقییەکان.

٢ـ پێشنیار دەکات وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتی زۆرتر بدات بە هەوڵە فریاگوزارییە نێونەتەوەییەکان .

## کورد و شیعەکان لە گەڵ تراژیدیایەکی مرۆڤی ڕووبەڕوون

## ٢٤ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی نوێنەران

خاتوون "کینلیی ":

جەنابی سەرۆك ، من دەمەوێت نیگەرانی قووڵی خۆم دەربڕم بەنیسبەت ئەو تراژیدیە مرۆڤییە کە ڕووبەرووی ئەو کورد و شیعانە بۆتەوە کە هەوڵ دەدەن لە تیرۆری سەدام حوسەین و هێزەکانی هەڵبێن . لە هەمان کاتدا ستایشی سەرۆك بوش دەکەم بۆ ڕاگەیاندننامەکەی هەفتەی پێشووی سەبارەت بە بەرفراوان کردنی هەوڵە فریاگوزارییەکان بۆ کوردەکان لە باکووری عیراق . ئەمە پیشاندەرەی گۆڕانکارییەکی باش و ئەرێنییە لە سیاسەتی حکوومەتی ئەمریکا بە نیسبەت کوردەکان .

لە هەموو شەڕێکدا تراژیدیای مرۆڤی هەیە . هەڵسوکەوتی دڕندانەی (سەدام) لە گەڵ کورد و شیعەکان بە خێرایی دەبێ بە گەورەترین تراژیدیا. ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە توانیویانە لە دەستی هێزەکانی سەدام هەڵبێن بە هۆی برسێتی ، سەرماوسۆڵە و نەخۆشی مردوون .

٩مانگ پێش ئێمە بە خێرایی و شێلگیرانە هەنگاومان هەڵگرت بۆ وڵامدانەوەی دەستدرێژییەکەی عێراق ، ئێمە کوێتمان ئازاد کرد ، ئێمە هەموومان شانازی بە هەوڵەکانی هێزە سەربازە ژن و پیاوەکانمان دەکەین بەڵام جارێکی دیکە دەبێت بە خێرایی و شێلگیرانە هەنگاو هەڵبگرین بۆ ڕزگارکردنی ئەو خەڵکە کە لەگەڵ مەترسی مەرگ بەرەوڕوون .

ئاوارە شیعەکان کە هەڵهاتوون بۆ ناوچەی باشووری عێراق کە لە دەستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دایە ، سەرنجی ئێمە بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشن . بە هەر حاڵ ئەوانیش بە دەستی هەمان نەهامەتییەوە دەناڵێنن کە کوردەکان تووشی بوونە و بە ئێش و ئازارێکی زۆرەوە بەرەو سنووری ئێران و کوێت هەڵهاتوون .

من پشتیوانی لە درێژكردنەوەی گەمارۆكانی سەر عێراق (جگە لە خۆراك و دەواو دەرمان) دەكـەم و پێشوازی لە هەوڵە درێژخایەنەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان دەكەم بۆ پاراستنی كورد و شـیعەكان لە بەرامبەر هێرش و تۆڵەسەندنەوەكانی دەوڵەتی عێراق .
هەروەها پشتیوانی لە هەوڵدانی زیاتر دەكەم بۆ پاشەكشە پێكردنـی عێـراق . هـەر وەك هـەموو شەڕەكانی دیكە لەم شەڕەشدا خەڵكی بێ گوناح هەروا دەبن بە قووربانی ئێش و ئـازار . ئـەركی مرۆڤدۆستانەی ئێمەیە هەوڵ بدەین بۆ كۆتایی پێهاتنی ئەم ئیش و ئازارە.

## بارووده‌ۆخی خراپی كورده‌كان

۲۵ی نیسانی ۱۹۹۱ - ئه‌نجوومه‌نی پیران

به‌ڕێز" لیبه‌رمه‌ن" :

جه‌نابی سه‌رۆك هه‌واڵه‌كان سه‌باره‌ت به‌ كورده‌كانی عێراق هه‌روه‌ها ترسناكن . به‌ گوێره‌ی راپۆرته‌كان ۵۰۰ئاواره‌ی كوردی عێراق هه‌ر رۆژ له‌ سه‌ر سنووری توركیا و عێراق ده‌مرن . ئه‌م رووداوه‌ ترسناكه‌ ئاكامی دڕنده‌یی سه‌دام حوسه‌ینه‌ و به‌ وته‌ی كتێبی پیرۆز ، هێزی شه‌یتان له‌ پشت ئه‌م كاره‌ساته‌یه‌ . هه‌رچه‌ند كه‌ بارودۆخی ئه‌و ۸۵۰ هه‌زار كورده‌ كه‌ له‌ نزیكی سنووری توركیان خراپه‌ به‌ڵام بارودۆخی ئه‌و ۱/۵میلیۆن كورده‌ كه‌ له‌ سه‌ر سنووری ئێرانن زۆر خراپتره‌ .

ئێمه‌ نازانین هه‌ر رۆژ چه‌ند كورد له‌ سه‌ر سنووره‌كان ده‌مرن . ته‌نها ده‌توانین وێنا بكه‌ین كه‌ ئه‌م تراژیدییه‌ گه‌وره‌یه‌و داهاتووی ئه‌و ئاواره‌ شیعانه‌ی باشووری عێراق كه‌ تا ئێستا له‌ لایه‌ن هێزه‌كانی وڵاته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكاوه‌ ده‌پارێزرێن ، تا راده‌یه‌ك نادیاره‌ له‌ به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ هێزه‌ ئه‌منییه‌كانی عێراق لیستێكیان ئاماده‌كردووه‌ له‌و كه‌سانه‌ كه‌ ده‌بێ ته‌سلیمی هێزه‌ سه‌ربازییه‌كانی سه‌دام بكرین. ئایا ئه‌م كه‌سانه‌ رووبه‌ڕووی مه‌رگ نابنه‌وه‌ ئه‌گه‌ر سوپای ئه‌مریكا پاشه‌كشه‌ بكات ؟ له‌وانه‌یه‌ گه‌لێ له‌و ئاوارانه‌ی كه‌ تا ئێستا مردوون ، ئه‌مڕۆ زیندوو ببان ئه‌گه‌ر بۆ نموونه‌ كۆمه‌ڵگای نێونه‌ته‌وه‌یی له‌وانه‌ وڵاته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا زووتر به‌ هاواری ئاواره‌كانه‌وه‌ بهاتبا و ئه‌گه‌ر ئێمه‌ له‌ رێگای هێرشی هه‌وایی بۆ سه‌ر كۆپته‌ره‌ سه‌ربازییه‌كان و تانكه‌كانی سه‌دام پێشمان له‌ كۆمه‌ڵكوژی ترسناكی خه‌ڵكی بێ گوناح به‌ ده‌ستی سه‌دام پاش شه‌ڕی كه‌نداو بگرتبایا . ئه‌م هه‌نگاوانه‌ له‌وانه‌یه‌ هاوسه‌نگی ستراتیژیكی هێزه‌كانی به‌ قازانجی هێزه‌كانی نه‌یاری سه‌دام تێك بدایا، به‌ڵام گیانی هه‌زارن كه‌سی رزگار ده‌كرد و پێشی له‌ ئاواره‌ بوونی به‌رفراوان و پڕترس و تۆقانی كورده‌كانی بۆ توركیا و ئێران ده‌گرت .

بەڵام رابردوو رۆیشتووە ، ئێمە دەبێ لە بیری ئەمرۆدا بین . سەرۆك کۆمار دەستی بەکار کردووە بۆ یارمەتیدانی ئاوارە کوردەکان و ئەمە نیشانەیەکی ئەرێنییە . ئێمە ئێستا لە شوێنە گونجاوەکان، کەمپ بۆ ئاوارەکان دروست دەکەین و رۆژ لە دوای رۆژ خۆراك و پێداویستی زۆرتریان لە ئاسمانەوە بۆ دەخەینە خوارەوە و رێژەی مەرگ و میر رۆژ بە رۆژ کەمتر دەبێتەوە .

بەڵام دەبێ کاری زۆرتر بکرێت . ئێمە دەبێ درێژە بە یارمەتیدانی کوردە ئاوارەکانی سەر سنووری ئێران بدەین . حکوومەتی ئەمریکا لە دانووستاندایە لە گەڵ ئێران بە ناوبژیوانی سویسرا ، بۆ ئەوەی ئێمە چۆن هاوکاریان بکەین. سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە لە مێژە کۆمەڵێك ناکۆکیمان لە گەڵ ئێران هەیە ئەم دانووستانانە دەبی خێراتر بکرێ بۆ ئەوەی ئێمە رێبەرایەتی هەوڵە نێونەتەوەییەکان بگرینە دەست بۆ یارمەتیدانی کوردە لێقەوماوەکان. ئەم کارەساتە ئەوەندە گەورەیە کە سیاسەتی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی خستۆتە پەراوێزەوە .

هەرچەندە ئێمە یارمەتی ئێران دەدەین بۆ دابینکردنی خۆراك ، جل وبەرگ و خێوەت بۆ ئەو هەزاران ئاوارە کوردە کە لە دەستی دیکتاتۆری سەدام حوسەین هەڵهاتوون ، بەڵام دەست لە نیگەرانییە رەواکانمان هەڵناگرین بە نیسبەت دەوڵەتی ئێران. لەوانەیە هاوکاری کردن لەم بوارە مرۆڤدۆستانەیە بۆشایی نێوان ئێران و ئەمریکا پڕ بکاتەوە و ئێران یارمەتیمان بدات بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی بارمەتە گیراوەکان لە لوبنان . ئێمە لە رووی ئەخلاقییەوە بەرپرسیارین بۆ ئەوەی یارمەتی زۆرتری کوردەکان بدەین و ئەم بەرپرسیاریەتییە دەبێ سیاسەتی ئێمە لە رۆژان و هەفتەکانی داهاتوو دیاری بکات .

ئێمە هەروەها دەبێ پلانێکی درێژخایەنمان هەبێ بۆ دابینکردنی ئاسایشی کوردەکان . ئێمە ناتوانین شاری خێوەت درووست بکەین و کوردەکانی تێ بکەین و بە جێیان بهێڵین بێ ئەوەی کە لە کردەوە کوشندەکانی عێراق لە رۆژانی داهاتوو بیانپارێزین . دەگوترێت هێزەکانی عێراق لە نزیك کەمپە نوێکان لە بۆسەدان. ئەگەر ئێمە رۆژێك ئەو کەمپانە بە جێ بهێڵین ، چی دەبێت؟ ئایا هێزەکانی ئاشتیپارێزی نەتەوە یەکگرتووەکان دەتوانن ئەم کەمپانە لە بەرامبەر سوپای سەدام

بپارێزن ؟ دەبی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا سیاسەتی خۆی بە نیسبەت پاراستنی کوردەکان لە بەرامبەر هێرشەکانی سەدام لە داهاتوودا بە شێوازیکی روونتر دیاری بکات .

سەرۆك کۆماری ئەمریکا کارێکی باشی کردووە چالاکی هێزە چەکدارەکانی عێراقی لە ناوچە پارێزراوەکانی ئێمە قەدەغە کردووە ، بەڵام ئێمە دەبێ لەوە دڵنیا بین کە جارێکی دیکە هێرش ناکرێتە سەر ناوچەی پارێزراو. ئێمە هەروەها دەبێ ئەوە بزانین کە ناوچەی پارێزراو (هەرچەندە کە ئێمە بە تەواوی بیشیپارێزین) تەنها ڕێگاچارەیەکی کاتییە . کوردەکان دەبێ بە ئاسایشەوە بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان ، ئامانجی ئێمە دەبی ئەوە بێ کە یارمەتییان بدەین بە ئاسایشەوە بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان . من لە سەر ئەو بڕوایەم کە هەتا کاتێك کە سەدام و حیزبی بەعس لە سەر دەسەلات بن ئەم ئامانجە جێبەجێ ناکرێت.

ئێمە نابێت گۆڕانکاری رواڵەتی و سەمبۆلیك بکەین . سیاسەتی ئەمریکا دەبێ شەفاف رابگەیەندرێت : سەرۆك بۆش دەبێ بە راشکاوی بڵێت ئێمە دەمانەوێت سەدام و هێزەکانی لە سەر دەسەڵاتی عێراق نەمێنن . بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئێمە دەبێ سیاسەتی ترسنۆکانەی خۆمان بە نیسبەت کۆمەڵگا و ڕێبەرانی عێراق لە دەرەوەی وڵات بگۆڕین . ئێمە لە ترسی ئەوەی کە سەدام لێمان نەڕەنجێت تا ئێستا هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ ڕێبەرانی سیاسی عێراق لە دەرەوەی وڵات درووست نەکردووە . تەنها ئەم مانگە نەبێت کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە گەڵ ئەم ڕێبەرانە دیداری کردووە بۆ باس و تاوتوێ کردنی کێشە سیاسییەکان کە زۆرتر پەیوەندی بە نیگەرانییە مرۆڤایەتیەکانەوە بووە . ئەم پەیوەندییانە دەبێ بەردەوام بێت و فراوانتر بکرێت . ئێمە دەبێ کار بکەین بۆ پەروەردە کردنی ڕێبەرایەتی داهاتووی عێراق ، ڕێبەرایەتییەك کە لایەنگری دیمۆکراسی، ئابووری بازاڕی ئازاد و رێز گرتن لە مافی مرۆڤ لە عێراق بێت.

ئێمە هەروەها دەبێ بە کردەوە پشتیوانی لە هێزە نەیارەکانی عێراق بکەین و بەڕاستی پارە و چەکیان بدەینێ . ئێمە ئەوەندە پشتیوانی زارەکیمان لەوان کرد (چەند مانگ پاش داگیرکرانی

کوێت بە دەستی سەدام) کە ئەوان دژی سەدام راپەڕینییان کرد بەڵام ئەگەر بەکردەوە پشتیوانیان لێ بکەین ، ئەنجامەکە زۆرتر دەبێت.

ئەگەر ئێمە بەڕاستی دەمانەوێت سەدام لە سەر دەسەڵات نەمێنێت دەبێ کاری زۆرتری بۆ بکەین . بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەبێ هەموو هەنگاوێك هەڵبگرین . ئەمە تەنها بە قازانجی ئەمریکا تەواو نابێت بەڵکوو بە قازانجی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و خودی خەڵکی عێراقە . ئەو هەواڵانە کە باس لەوە دەکەن کە سەدام لە گەڵ هەندێ لە رێبەرە کوردەکان رێککەوتووە لە هەندێ روانگەوە جێگای هیوایە . بەڵام من زۆر بە گومانم لە قسە و نیازەکانی سەدام ، هەروا دڵنیاشم کە گەلێ لە کوردەکانیش بە گومانن . من ناتوانم بە سانایی متمانە بەسەدام بکەم . ئێمە ناتوانین پشت بە قسەکانی سەدام بوەستین بۆ داڕێژانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بە نیسبەت عێراق.

بە نیسبەت پەیوەندی لە گەڵ رژیمی عێراق ، ئێمە دەبێ روونی بکەینەوە کە هیچ وتووێژێکی ئاساییمان لە گەڵ رژیمی عێراق نابێت. هەتا کاتێك کە ئێمە کۆنترۆڵی هەرێمی هەوایی عێراقمان لە دەستدا بێت دەتوانین بەکاربەدەستانی عێراق بڵێین کە دەتوانن چی بە نەوت و سۆپاکەیان بکەن و نەکەن . ئەمە سیاسەتێکی باشە لە بەر ئەوەی قبوولمان کردووە کە دەسەڵاتدارانی عێراق ترۆریستن و رەوایەتیان نییە . لە راستیدا گەلێ لە کاربەدەستانی عێراق تاوانباری شەڕن و دەبێ لە دادگای تاوانەکانی شەڕدا دادگایی بکرێن و نابێ قەد ئەوە لە بیر بکەین کە ئێمە سەردەمێك پەیوەندیمان لە گەڵیان هەبووە .

هەتا کاتێك رژیمی سەدام لە سەر دەسەڵات بێت گەمارۆکانی ئێمە لە سەر ناردنە دەرەوە و بردنە ناوەوەی شتومەك بۆ عێراق دەبێ بەردەوام بێت. گەمارۆکان چەکێکی ئەوەندە بە هێز نەبووە کە بتوانێ سەدام لە کوێت دەر بکات بەڵام بەردەوامبوونی ئەم گەمارۆانە ، پەیامێکە بۆ سەدام کە ئێمە دەسەڵاتی سەدام تەحەموول ناکەین . هەر چەند ئێمە ژیان بۆ سەدام ئاسانتر بکەین ، بەهەمان رێژە سەدام بە هێزتر دەبێت. بە گوێرەی راپۆرتە هەواڵییەکان سەدام هیوادارە لە ٥٤مین

ساڵرۆژی له دایك بوونیدا ، گهمارۆكان له سهرناردنه دهرهوهی نهوتی عێراق ههڵبگیردرێت . ئهمه خهڵاتی رۆژی له دایكبوونه كه به باوهڕی من نابێ بیدهین به سهدام . تكا له سهرۆك كۆمار دهكهم هێزی "ڤیتۆ"ی[1] ئهمریكا به كار بهێنێت بۆ ئهوهی سهدام به خهڵاتی رۆژی له دایكبوونی شاد نهبێت .

جگه له كهڵك وهرگرتن له گهمارۆكان وهك چهكێك دژی سهدام، ئێمه دهبێ باڵادهستی ههوایی خۆمان نیشان بدهین و كهڵكی لێوهرگرین بۆ ئهوهی وهڵامی كردهوهكانی سوپای عێراق دژی خهڵكی سڤیل له ناوچهكانی ژێر دهستیان بدهینهوه . ئهگهر ئێمه باشووری عێراقمان بهجێ هێشت ، دهبێ ئامادهبین بۆ ئهوهی وهڵامی خێرا بدهینهوه به ههر كارێكی سهركوتكهرانه كه هێزهكانی سهدام پاش ئێمه ئهنجامی بدهن .

ئهگهر باكووری عێراقمان به جێ هێشت ، دهبێ به هێزی ئاسمانی وهڵامی ههرچهشنه جموجۆڵێكی سهربازی بدهینهوه كه دژی خهڵكی سڤیل بكرێت . دهبێ عێراق له ژێر چهتری پاراستنی هێزی ئاسمانی ئهمریكا بهێنێتهوه تا خهڵكی بێ گوناح نهكوژرێن . ئهمه كارێكی ئاسان نییه و كۆمهڵێك كهند و كۆسپ له سهر رێگایه بهڵام ئهركی سهرشانی ئێمهیه و دهبێ جێبهجێی بكهین ئهگهر ههروا بهو پرنسیپانه وهفادار بین كه ئێمهی خسته ناو جووڵه بۆ ئهوهی دژی هێزهكانی سهدام له كوێت چهك ههڵبگرین.

ئێمه دهبێ ئهم كارانهی خوارهوه ئهنجام بدهین:

ــ گهیاندنی یارمهتی مرۆڤدۆستانه به ئاواره كورد و شیعهكان

ــ پاراستنی گیانی ئاواره كورد و شیعهكان له بهرامبهر دهستدرێژی سوپای عێراق

---

[1] ڤیتۆ: وشهیهكی لاتینییه به واتای "من ناهێڵم". له رووی سیاسییهوه بهو مافه دهوترێت كه ئهندامانی ههمیشهیی ئهنجوومهنی ئاسایشی نهتهوه یهكگرتووهكان ههیانه بۆ ئهوهی ههر بڕیارنامهیهكیان كه پێباش نهبوو نههێڵن پهسهند بكرێت. وهرگێڕ

ـــ درێژه‌پێدانی کۆنترۆل کردنی هه‌رێمی ئاسمانی عێراق

ـــ درێژه‌پێدانی گه‌مارۆکان له سه‌ر ناردنه‌وه ده‌ره‌وه و هاوردنه ناوه‌وه‌ی شتومه‌ك له لایه‌ن عێراق ، جگه له ده‌واو ده‌رمان بۆ هاووڵاتیانی عێراقی

ـــ پشتیوانی زۆرتری دیپلۆماتیك ، ئابووری و سه‌ربازی له هێزه نه‌یاره‌کانی عێراق

ـــ به‌رپرسیاربوونی به‌رده‌وام به نیسبه‌ت لابردنی سه‌دام حوسه‌ین و گرووپه‌که‌ی له سه‌ر ده‌سه‌ڵات و ته‌سلیم کردنیان به دادگای تاوانه‌کانی شه‌ڕ .

ئه‌مریکا ده‌بی سیاسه‌تێکی وه‌ها بگرێته‌به‌ر . ئه‌مه ئه‌و سیاسه‌ته‌یه که من پێداگری ده‌که‌م له سه‌ری که ئه‌مریکا بیگرێته به‌ر و به قازانجی وڵاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکایه . بۆ به‌رژه‌وه‌ندی نه‌ته‌وه‌یی ئێمه نابێ ته‌نها له سه‌ر ده‌ستکه‌وته مادی ، سیاسی و سه‌ربازییه‌کان حیساب بکه‌ین . رووخاندنی هێزه شه‌یتانییه‌کان که هه‌ڕه‌شه له سه‌قامگیری جیهانی شارستانی ده‌که‌ن ، زیندووکردنه‌وه‌ی ئه‌خلاقی نێونه‌ته‌وه‌ییه .

رووخاندنی ته‌واوی رژیمی سه‌دام له عێراق یه‌کێ له‌و کرده‌وه مرۆڤدۆستته راسته‌قینانه‌یه که خه‌ڵکی ئه‌مریکا، خه‌ڵکی عێراق و هه‌موو خه‌ڵکی به‌ویژدانی جیهان ده‌یانه‌وێت جێبه‌جێ بکرێت .

## ئەگەر سەدام هیتلەرە ، ئێمەش دەبێ پشتیوانی لە كوردەكان بكەین

٢٥ی نیسانی ١٩٩١ ــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "كرانستۆن ":

جەنابی سەرۆك سپاسی سەرۆكی هێژای كۆمیتەی پەیوەندییەكانی دەرەوە دەكەم . تكا دەكەم ولاَتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە توندترین شێوە پشتیوانی بكات لە خەڵكی كورد و نەیارەكانی دیكەی حكومەتی عێراق . هەروەها دەمەوێت سەرنجتان رابكێشم بەرەولای تراژیدیای كوردەكان كە لە كەمپە قەرەباڵغەكانی باكووری عێراق لە بارودۆخێكی ترسناكی مرۆڤی دان . ئەمە كوردەكانن كە ئێوە لە تەلەفزیۆنی CN N دا دەیانبینن .

كوردەكان لەو شوێنانە دەژین كە دەوڵەتی عێراق پێیان دەڵێت "شارەكانی سەركەوتن" و ٥٠ شاری وا هەیە. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنە متمانە پێكراوەكان ، ١ ملیۆن خەڵكی لەبیركراوی برسی لەم شارانەدا دەژین كە لە راستیدا لە كەمپ دەچن نەك لە شار .

جەنابی سەرۆك یەكێ لە ئامانجە سەرەكییەكانی شەڕی كەنداوی فارس كۆنترۆڵ كردنی سەدام حوسەین بوو كە سەرۆك بۆش لە گەڵ" ئادۆلف هیتلەر" بەراوردی كردووە . باشە "ئادۆلف حوسەین" هێشتا لە سەر دەسەڵاتە و هێشتا دیكتاتۆری رەهای عێراقە و هێشتا لە رێگای گاردی خوێنرێژ و سەركوتكەری كۆماری بە سەر عێراقدا حوكم دەكات . كردەوە زاڵمانەكانی سەدام دژی كورد ، چ پێش و چ پاش شەڕی كەنداو ، لە داگیركردنی كوێت خراپترە. ئێمە نابێت رێگا بدەین سەدام كۆمەڵكوژییەكی هۆڤانە بقەومێنێت .

داوا لە سەرۆك بوش دەكەم روونی بكاتەوە كە ولاَتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە تەواوی بەرپرسیارە لە بەرامبەر كوردەكان و كەسانی دیكە كە دژی سەدام راپەڕینیان كردووە و ئێمە و هێزە هاوپەیمانەكان، عێراق بەجێ ناهێڵین هەتا كاتێك كە سەدام لە سەر دەسەلات مابێت یان هەتا كاتێك كە رێبەرانی كوردستانی خودموختار پێمانبڵێن كە مانەوەمان ئیدی پێویست نییە .

به گوێرەی دەنگ و باسەکانی ئەمڕۆ  کوردەکان هەوڵ دەدەن لە گەڵ سەدام ڕێکبکەرن بۆ ئەوەی ژینۆسایدی سەدام رابوەستێت . سیاسەتی ئەمریکا نابێت کارێك بکات کە لە بایەخی ناماجەکانی کورد کەم بکاتەوە و تکا لە سەرۆك بۆش دەکەم هەرچی لە دەستی دێت  بیکات بۆ ئەوەی سەدام تێبگات  ئێمە  لەگەڵ ئامانجی کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی و پلۆرالیزمی فرەحیزبی هاوهەڵوێستین. لە کاتێکدا کە ئاوارە کوردەکان لە ناو ترس و تۆقاندان و پێویستیان بە یارمەتی ئێمە هەیە ، ئێمە ناتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە ئاوارەکان بەراستی دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانیان . راستییەکەی ئەوەیە کاتێك کە وەزارەتی دەرەوەی سەرۆك رەیگان و سەرۆك بوش لە گەڵ دیکتاتۆری عێراق گەرم بوون سەدام گوندەکانی کوردەکانی خاپوور دەکرد. ئەوان گوندەکانیان خاپوور کرد بە هەمان شێوە کە هیتلەر شارۆچکەی" لیدیسە" لە چکسلاڤاکیای(Czechoslovakian town of Lidice) لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانی خاپوور کرد . ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەبێ هەرێمێکی پارێزراو لە باکووری عێراق بۆ ئاوارەکان دروست بکەن . ئێمە دەبێ هەنگاو هەڵبگرین بۆ یارمەتی فریاگوزاری بۆ ئەو ٨٠٠ هەزار کوردەی کە لە کەمپەکان و مەزراکانی نزیکی سنووری تورکیا دەژین . ناوێت چاوی خۆمان ببەستین لە ئاست بارووذۆخی خراپی ئەو ١/٥ میلیۆن ئاوارەیە کە لە سەر سنووری ئێرانن .

جەنابی سەرۆك  ساڵەهای ساڵ  هێزە دیمۆکراتە پارتیزانەکان کە دژی دیکتاتۆری سەدام خەباتیان دەکرد، چاوەڕوانی یارمەتی و پشتیوانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون . تەنانەت لە دژوارترن کاتەکانی تیرۆری سەدامدا  لە شەقامەکانی بەسرە و شاخەکانی کوردستان ، ژنان و پیاوانی ئازا و بوێر بە شێوازی نهێنی خەباتیان دەکرد بۆ ئەو بیروکەی دیمۆکراسی و مافی مرۆڤە کە "جفرسۆن" و "لینکۆڵن" [٢] خەباتیان بۆ کردووە . بەداخەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

[٢] مەبەستی ئەو پرەنسیپە دیموکراتییانەیە کە توماس جفرسۆن(١٨٢٦-١٧٤٣)، سییەمین سەرۆك کۆمار و نووسەری راگەیاندننامەی سەربەخۆیی ئەمریکا و ئابراهام لینکۆڵن(سەرۆك کۆماری

ئەمساڵ نەیتوانی وەڵامی هاواری یارمەتی شەڕوانانی ئازادی عێراق بداتەوە و ئەمە جاری یەكەم نییە كە دیمۆكراتەكانی عێراق لە ئاكامی كردەوەكانی ئەمریكا هەست بە دڵساردی دەكەن .
لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ هێنری كسینجێر، وەزیری دەرەوە و شای ئێران پشتیان لە هاوپەیمانە كوردەكەیان كرد و ڕێگایان بۆ سەركوتی خوێناوی ئەوان خۆش كرد . كسینجێر پاشان وەڵامێكی بێ بەزەییانەی دایەوە بەو گلەیی و سكالاّیانە كە بە نیسبەت ئاكامە پڕ لە قوربانیدانەكەی ئەم سیاسەتەی ئەوان دەكرا و وتی " سیاسەت كاری پڕوپاگەندای ئایینی نییە ". لەم ساڵانەی دوایی دەیان هەزار كورد بە دەستی سەدام و هێزە سەركوتكەرەكانی زیندانی كراون ، ئەشكەنجە كراون و كوژراون.
ئێمە بەهۆی ڕەچاو كرنی بارودۆخی توركیا و خودی سەدام ، بە شەرمەوە لە بەرامبەر ئەم كردەوە سەركوتكارانەی سەدام بێ دەنگ بووین . ئەمڕۆ نوێنەرانی لیژنەی پزیشكان و مافی مرۆڤ دەڵێن هەر ڕۆژ هەزار ئاوارە تەنها لە سەر سنووری عێراق و توركیا دەمرن . ئێران بانگەشەی ئەوە دەكات ڕۆژێ ١٠ میلیۆن دۆلار بۆ فریاكەوتنی ئاوارەكان خەرج دەكات بەڵام تا ئێستا ئەمریكا هیچ یارمەتییەكی ڕاستەوخۆی بەم خەڵكە نەداوە . سەرۆك بوش بە شێوازێكی كارامە و باش سەرنجی بیروڕای جیهانی بەرەولای داگیركردنی كوێت بە دەستی سەدام ڕاكێشا بەڵام نەیتوانی هەمان نیگەرانی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی بەرەولای قوربانییانی سەدام لە عێراق رابكێشێت .جەنابی سەرۆك ئەمە ئاژینی نوێی جیهانی نییە، ئەمە ئازایەتی نوێی جیهانە بۆ پاراستنی یەكپارچەیی عێراق .

---

ئازادیخوازی ئەمریكا) پشتیوانیان لێدەكرد وەك ئازادی و مافی یەكسانی و خۆشبەختی بۆ هەموو مرۆڤێك . وەرگێڕ

## دروستکردنی کەمپ بۆ ئاوارە کوردەکان

## ٢٩ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "گیکاس[١]":

جەنابی سەرۆك ، من نامەیەکم نووسیوە بۆ سەرۆك کۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە تێیدا پشتیوانی تەواوی خۆم دەربڕیوە لە کردەوەکانی سەرۆك کۆمار و کردەوەکانی هاوپەیمانەکانمان بۆ دروست کردنی کەمپ بۆ ئاوارە کوردەکان و ئاوارەکانی دیکە بە ئامانجی دابینکردنی ئاسایش و حەسانەوە و خۆراك و ماڵ بۆیان . من بۆ سەرۆك کۆمارم نووسیوە ١٠٠٪ پشتیوانی لێدەکەم ئەگەر بڕیار بدات لە داهاتوویەکی نزیك یان دوورتردا هێزی سەربازی بەکار بهێنێت بۆ مسۆگەر بوونی ئاسایشی ئەم کوردانە و خەڵکی ئاوارەی دیکە. ئەگەر سەدام بوێرێت تەنانەت هێرش بکاتە سەر هێزە هاوپەیمانەکان یان هێزەکانی ئەمریکا ، ئێمە دەبێ توانایی ئەوەمان هەبێ بە توندی وەڵامی بدەینەوە و بۆ هەمیشە لە سەر دەسەڵات لایببەین.

---

Mr. GEKAS[1]

## فریاکەوتنی ئاوارەکوردەکان

### ٣٠ی نیسانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "مازۆلی[١]" :

جەنابی سەرۆك ئەمڕۆ پاش کەمێك ، ئەنجوومەنی پیران ئاوتوێی گەڵاڵە یاسای ٢١٢٢ دەکات کە گەڵاڵە یاسایەکی بە پەلەیە بۆ یارمەتیدانی ئاوارە کوردەکان کە لە کەمپەکانی ئێران و عێراق و تورکیان . ئەم گەڵاڵەیە داوای ٤٠٠ میلیۆن دۆلار دەکات بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە نێونەتەوەییە خێرخوازەییە فریاگوزارییەکانی دیکە. ئەڵبەتە ئێمە هیواداریین ( پاش ئەوەی کە نەهامەتی ئەم خەڵکەمان بە ڕوونی لە تەلەفزیۆنەکاندا بینی ) بۆ هەمیشە نەهامەتییەکانیان کۆتایی پێبێت و بارووددۆخیان سەقامگیر بێت و زۆربەیان (ئەگەر هەموویان نەتوانن ) بگەڕێنەوە سەر زێدی خۆیان و ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێ بکەنەوە . بەڵام گەلێ لەم ئاوارانە بە چەند هۆکار ناتوانن بگەڕێنەوە زێدی خۆیان. کەوابوو وەك سەرۆکی "کۆمیسۆنی یاسای نێونەتەوەیی کۆچ و ئاوارەبوون" داوام لە ئیدارەی ژمێریاری گشتی کردووە تیمێك بنێرێت بۆ کەمپەکان بۆ ئەوەی نەتەنها پێداویستییەکانی ئاوارەکان هەڵبسەنگێنێت ، بەڵکوو زانیاری کۆ بکاتەوە سەبارەت بە وەی کە ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەوەی هەندێ لەم خەڵکە یا هەموویان نیشتەجێ بکات یا نا . وادیارە نابێ و ناتوانین هەموو ئاوارەکان نیشتەجێ بکەین بەڵام لەوانەیە ناچاربین هەندێکیان لە شوێنەکانی دیکە لە دەرەوەی زێدی خۆیان نیشتەجێ بکەین . من پاشان ڕاپۆرتی پێشڤەچوونی ئەم ڕەوتە دەدەم بە کۆنگرێس.

---

Mr. MAZZOLI[1]

## با "کوردەکانی ئەمریکا" رزگار بکەین

### ۳۰ی نیسانی ۱۹۹۱= ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "کۆستمایر[۱]":

جەنابی سەرۆك ، بەڕێز "لیسلی گیلب[۲]" رۆژی یەکشەمبە وتارێکی لە رۆژنامەی "نیویۆرك تایمز" لە ژێر ناوی " سەیری ناوخۆی وڵاتیش بکەن " بڵاو کردۆتەوە کە تێیدا باسی بارودۆخی دژواری میلیۆنەها کەس لە خەڵکی ئەمریکای کردووە کە بێ خانوون ، نەخوێندەوارن ، برسین و پشتگوێ خراون . ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانایی ئەوەی هەیە کوردەکانی عێراق بپارێزێ ( و دەبێ بیانپارێزێتیش) و تێریان بکات و نیشتەجێیان بکات ، ئایا ناتوانێت هەمان کار بۆ میلیۆنەها کەس لە هاووڵاتیانی خۆمان بکات کە گەلێکیشیان منداڵن ؟

---

Mr. KOSTMAYER [۱]
Mr. Leslie Gelb [۲]

## کەوتنە پێشەوە لە کات بۆ رزگار کردنی کوردەکان

## ۳۰ی نیسانی ۱۹۹۱- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" دۆرگان "، نوێنەری ئەیالەتی "داکۆتای باکوور[1]" :

جەنابی سەرۆك هەفتەی پێشوو کۆمیتەی خۆراك کۆبوونەوەیەکی گرت بۆ تاوتوێ کردنی بارودۆخی دژواری ئاوارەکانی جیهان و وەلامدانەوە بەو پرسیارە کە ئایا ئێمە توانیومانە وەکوو پێویست کار بکەین ، بەو ئەنجامە گەیشتین کە نەخێر نەمانتوانیوە.

ئیدارەی ژمێریاری گشتی GAO پشتڕاستی کردۆتەوە کە ژمارەی ئاوارەکان لە سەراسەری جیهان لە دووقات زیاتر بووە واتا لە ۷ میلیۆن گەیشتۆتە ۱۵تا۱٦ میلیۆن. ئەم ژمارەیە لە ئەنجامی قەیرانی ئاوارەکان لە عێراق ، تورکیا و ئێران ئێستا گەیشتۆتە پتر لە ۱۸ میلیۆن. لە هەمان قۆناخدا، بە وتەی GAO بودجەی فریاگوزاری ئێمە بۆ ئاوارەکان لە سەراسەری جیهان دەورووبەری ۲۰۰ میلیۆن دۆلار بووە کە لە راستیدا کەم بۆتەوە. ئەمە بە واتای ئەوە نییە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەوتۆتە پاش ولاتانی دیکە . ئێمە لە دەیەی ۱۹۸۰ نزیکەی ۱۰ بیلیۆن دۆلارمان لە ناوخۆ و دەرەوەی ولات خەرج کردووە بۆ هەموو جۆرێك یارمەتیدانێك بە ئاوارەکان . ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروەها بەخشەندەترین ولات بووە لە جیهاندا و یەکێ لە چوار رێکخراوی سەرەکی فریاگوزاری نێونەتەوەیی بووە بۆ ئاوارەکان .بە هەرحاڵ بە بیروبۆچوونی من کێشەی رووله گەورە بوونی ئاوارەکان پێویستی بەوە هەیە کە ئێمە یارمەتی زۆرتر بدەین . هەروەها لەو باوەڕەدام کە ئێمە دەتوانین یارمەتی زۆرتر بدەین بێ ئەوەی بودجەکەمان کەموکورتی تێبکەوێت .

---

[1] Mr. DORGAN of North Dakota

تەرخان کردنی بڕێ لە پارەی بەشی ئاسایشی دەرەوەی وڵات بۆ یارمەتیدان و تێرکردنی ئاوارەکـان دەتوانێ ژیانی کۆمەڵێك مرۆڤ رزگار بکات و نەهامەتییە مرۆڤایەتییەکان کەم بکاتەوە بێ ئەوەی هیچ کێشەیەك لە بودجەکەماندا درووست بێت . کۆتایی پێهاتنی شەڕی سارد بە واتای ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین بە پارێزەوە بودجە بۆ ئەم شتانە تەرخان بکەین . هەروەها دەبـێ جـەخت لـە سـەر ئەوە بکەمەوە کە هیچ کێشەیەك لە سەر ئامارەکان ( زۆر و کەم بوونی پارە یا ژمارەی ئاوارەکان ) نییە بەڵکوو کێشەکە لە سەر رزگار کردنی ژیانی خەڵکە .

هەر ئێستا میدیاکانی جیهان سەرنجی خۆیان لە سەر قەیرانی ئاوارەکان لە عێراق چـڕکردۆتەوە و دەبێ هـەرواش بێـت . دەمـەوێت بـچمە نـاو وتارەکـەی رۆزینـبلات[٢] ، بەڕێوەبـەری رێکخـراوی نێونەتەوەیی ئاوارەکان لە ژێر ناوی " کەوتنە پێشەوە لە کات بۆ رزگار کردنی کوردەکان " کە لە ١٩ی نیسانی ١٩٩١ لە رۆژنامەی "کریستییەن ساینس مانیتۆر[٣] "دا بڵاو بۆتەوە .

بەڕێز" رۆزینبلات "ئەو هەواڵانـەی پـشتڕاست کردۆتـەوە کـە ئێمـە هەفتـەی پێـشوو بیـستمان سەبارەت بە سەرنەکەوتنی هۆشدارییەکانی پێشوو و وەڵامی خێرای کۆمـەڵگای نێونەتـەوەیی بـە قەیرانی ئاوارەکان. کۆنگرێس هەفتـەی داهـاتوو هـەوڵی فریـاگوزاری زۆرتـر دەدات بـەڵام دەبـێ وەڵامی ئەو پرسیارەش بدەینەوە چۆن دەمانەوێت هەوڵێکی فریاگوزاری نێونەتەوەیی بە رێکخـستن بکەین بۆ ئەوەی بتوانین پێش لە مەرگ و ئێش و ئازاری ئاوارەکوردەکان لە کەمپەکاندا بگرین .

بەڕێز "رۆزینبلات" هەروەها تکای کردووە قاتوقڕی ترسناك لە شاخی ئەفریقا لە بیر نەکـەین کـە هەڕەشە لە ژیانی میلیۆنەها کەس دەکات و ئەوە مسۆگەر بکەین کـە کۆمـەڵگای نێونەتـەوەیی پارەی ئەو کارەساتە(کە لە سەروبەندی قەومیندایە ) کەم ناکاتەوە . ئێمە نابێ لە زگـی خـەڵکی رۆژهەڵاتی ئەفریقا بگرینەوە و بیدەین بە ئاوارەکانی سەردەستی سەدام .

---

Mr. Rosenblatt[٢]

The Christian Science Monitor [٣]

## ئاوارە كوردەكان: كاتێ ئێمە ئێرە بەجێ بهێڵین چی روو دەدات

### ٦ی مایسی ١٩٩١ - ئەنجوومەنی پیران

بەرێز "لڤین ":

جەنابی سەرۆكی ئەنجوومەن هەر ئەمریكاییەك كە وێنەی ئاوارە كوردەكانی ناو شاخەكانی ببینێ، دەهەژێ و و داخ بە دڵ دەبێ . بارودۆخی چەپەڵ، نەخۆشی، زگچوون ، بەدخۆراكی و برسێتی ، كوردەكانی لە گەڵ مەترسی مەرگ رووبەڕوو كردووە كە لە دەستی سوپای سەدام هەڵهاتوون .

بەڵام جەنابی سەرۆك هەندێ لە ئەمریكاییەكان هەستی خۆیان بە شێوازی جۆراوجۆر دەردەبڕن . با لە قسەكانی مولازم "پاتریك لیسۆر [١]" دەست پێبكەم كە سەرلەبەیانی ئەمرۆ لە رۆنامەی "واشنگتۆن پۆست"دا بلاو بۆتەوە . ئەم خاتوونە نیگەرانی خۆی دەربڕیوە بە نیسبەت بارودۆخی ئاوارە كوردەكان لە ئوردوگای خێوەتنشینی نزیك زاخۆ لە عێراق كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دروستی كردووە . مولازم "لیسۆر" دەڵێت : "خۆشحاڵم لێرە كاردەكەم بەڵام وا هەست دەكەم هەندێ بەرخ دەبەم بۆ قوربانی كردن . ئێمە ئێستا ئاوارەكان دەپارێزین و جارێ بارودۆخەكە باشە بەڵام كاتێ ئێمە لێرە برۆین چی روو دەدات ". ئێستا كێشەی كورد و ئێمە كێشەی كاتە . كێشەكە ئەوەیە سەدام حوسەین نایەوێت وەڵامی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی بداتەوە بەڵام ئێمە لەمە زیاتر ناتوانین خۆمان لەم كێشەیە بدزینەوە . من تازە لە ناوچەی سنووری توركیا و عێراق گەڕاومەتەوە و لەگەڵ سناتۆر نێكسۆن و سناتۆر" راب [٢] " لە نزیكەوە تراژیدیای كوردەكانمان بینیوە .

---

[١] Lt. Patricia Lessor

[٢] Senators EXON and ROBB

ئێمە لە سەر ڕێگای گۆڕستانی خواری یەکێ لە کەمپەکان ڕاوەستا بووین و سەیری بنەماڵەیەکمان دەکرد کە گۆڕی کچە منداڵەکەی هەڵدەکەند . ئێمە سەردانی نەخۆشخانەی هۆڵەندامان کرد لە ناو کەمپەکە و چەند منداڵێکمان بینی کە مردبوون و لە تەنیشت دایکیان دانرابوون. سەرەڕای سەرنەکەوتنی سەدام لە شەڕی کوێت ، ئەمانە نیشانەی سەرکەوتنی هەوڵەکانی سەدامە بۆ ئەوەی جارێك بۆ هەمیشە کوردەکان لە ناوببات .

لە گەرماوگەرمی ئەم تراژیدییە دڵتەزێنەدا کۆمەڵێك هەوڵ لە ئارادایە بۆ سارێژ کردنی ئێش و ئازاری کوردەکان. ئێمە یارمەتی لۆجستیکی سوپای ئەمریکا و ئاکامە لە مەرگ ڕزگارکەرەکانیمان بینی . کاتێك کە سەرئەنجام فەرمان درا ئەرکی پاراستنی ژیانی کوردەکان جێبەجێ بکرێت ، سوپای ئەمریکا بە شێوازێکی کارامە خۆراك، ئاو، بەتانی و خێوەتی گەیاندە دەستی ئاوارەکان.

شاری گەورەی خێوەت بە خێرایی درووست دەکرێت، دەیان هەزار کەس لە مەرگی بەرەبەرە لە ئەنجامی برسێتی، نەخۆشی ، سەرما، بەفر و پاشان گەرماو وشکی هەوا ڕزگاریان بووە. ڕێژەی مەرگ ومیر ئێستا کەم بۆتەوە بەڵام مەترسی بڵاو بوونەوەی نەخۆشیە پەتاکان هێشتا لە ئارادایە. لە ترسی تۆڵەی سەدام حوسەین پتر لە میلیۆنێك کورد گوند و شارەکانیان بەرەو ناوچە شاخاوییە بەرزەکان بەجێ هێشتووە .هەر ئێستا بۆ ڕزگار کردنی خەڵك لە مردن ، ئامانجی سەرەکی سوپای ژیانپارێزی ئێمەو کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئەوەیە کوردەکان ڕازی بکەن لە شاخەکان بچنە دەرەوە و ئەوانیش ئێستا لە شاخەکان دێنە خوارەوە و بە یەك هۆ دەچنە ناو ئەم شارە خێوەتیانە ، ئەویش ئەوەیە متمانەیان کردووە بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە تۆڵەسەندنەوەی سەدام دەیانپارێزێت . ئەمە پەیامێکە کە ئاوارەکان بە دەیان جار بۆ ئێمە باسیان کردووە بەڵام متمانە نەکردنێکی گەورە هێشتا لە ئارادایە : ئایا کوردەکان لە شارە خێوەتیەکان وەك خانووی کاتی کەڵك وەر دەگرن و ئایا لە شارەکانی خۆیاندا ئاسایشی هەمیشەییان دەبێت ؟

له ژمارهی رۆژی ههینی رۆژنامهی "نیویۆرك تایمز"دا نووسراوه پیاوێکی گهنج که تازه گهڕاوهتهوه بۆ گوندهکهیان( که له ژێر چهتری پاراستنی هێزی نهتهوه یهکگرتووهکاندایه) له وهڵامی ئهو پرسیارهدا که ئایا ئێستا ههست به ئاسایش دهکهیت وهڵامێکی چاوهڕوانکراوی داوهتهوه و وتوویهتی :" راستیهکهتان دهوێت نا، دڵنیا نیم سهدام شتێکمان به سهر نههێنێ ".
دهوڵهتی ئێمه تا ئێستا راینهگهیاندووه تا کهی کوردهکان له لایهن ولاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا و هێزه هاوپهیمانهکانهوه دهپارێزرێن . بهڕێوهبردنی ئیدارهی ناوخۆیی کهمپه خێوهتییهکان کهوتووهته ئهستۆی نهتهوه یهکگرتووهکان بهڵام هێزهکانی نهتهوه یهکگرتووهکان ئهرکی مهدهنی جێبهجی دهکهن نه پاراستنی سهربازی کهمپهکان .
شتێکی روونه که پاراستنی ئاسایشی سهربازی کهمپهکان و ناوچهکانی دهوروبهری زۆر پێویسته . دوو رێگا ههیه بۆ دهستهبهر کردنی ئهم ئاسایشه : هێشتنهوهی هێزی هاوپهیمانان و ولاته یهکگرتووهکان له ناوچه یا ههوڵدان بۆ چالاکی سهربازی نهتهوه یهکگرتووهکان که تا ئێستا وێنهی نهبووه . نهتهوه یهکگرتووهکان تا ئێستا هێزی پارێزهری بۆ هیچ ولاتێك رهوانه نهکردووه مهگهر له سهر داوای خۆدی ئهو ولاته . بهڵام بارووددۆخی عێراق پێویستی بهوه ههیه که نهتهوه یهکگرتووهکان کۆمهڵێك ههنگاوی نوێی ههڵبگرێت. پێویسته نهتهوه یهکگرتووهکان کۆمهڵێك پرهنسیپی یاسایی نوێ دابرێژێت . ئهم پرهنسیپه نوێیانه دهبێ رێگا بهوه بدهن ئاوارهکان له ناو خودی ولاتێکی سهربهخۆدا بپارێزرێن ، تهنانهت ئهگهر ئهو ولاته رازی نهبێت به دوو مهرج: یهکهم له رێگای هێزی پارێزهری نهتهوه یهکگرتووهکان یارمهتی به ئیدارهی کاروباری پهنابهران بدرێت و دووهم له شوێنێك که کێشهی ئاوارهکان له ئهنجامی بڕیارنامهی نهتهوه یهکگرتووهکان درووست بووه ئهم بڕیارنامهیه رێگای بهوه دابێت که هێزی سهربازی دژی ئهو ولاته بهکار ببرێت.
ئهگهر ئاژینی نوێی جیهانی ههیه دهبێ لێره و ئێستا دهست پێبکات واتا له سهر سنووری عێراق و تورکیا، با سهدامیش رازی نهبێت. پاش درهنگ کردنێکی زۆر ئێستا ولاته

یهکگرتووهکانی ئهمریکا و هێزه هاوپهیمانهکان به شێوازێکی گونجاو وهڵامیان داوهتهوه و دهستپێشخهرییان کردووه بۆ سارێژ کردنی ئێش و ئازاره زۆرهکانی خهڵکی کورد .

ئێمه به گوێرهی کارامهیی، دڵسۆزی و ههستی بهرپرسیاریهتی ئهخلاقی دهبێ یارمهتی ئاوارهکان بدهین. ئێستا کاتی ئهوهیه نهتهوه یهکگرتووهکان دهست بهکاربێت و ههنگاوی گرنگ ههڵبگرێت بۆ گهیشتن به جیهانێکی رێکوپێکی ئاشتیخوازانه . جیهانی شارستانی له رێگای نهتهوه یهکگرتووهکانهوه دهبێ ئاسایش و ئارامی کوردهکان له بهرامبهر سهدام حوسهین مسۆگهر بکات.

بۆ هێزهکانی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا گرنگه که به زووترین کات له عێراق بێنه دهرهوه . سهربازانی ئێمه دهیانهوێت بگهڕێنهوه بۆ وڵات و من سهرزهنشتیان ناکهم . به ههرحاڵ ئهگهر شتێکی وا رووبدات ، نهتهوه یهکگرتووهکان ناچاره ئهو ئهرکه سهربازییه لهئهستۆ بگرێت که ئێستا لهئهستۆی وڵاته یهکگرتووهکان و هێزه هاوپهیمانهکانه واته پاراستنی "ههرێمی دژهفڕین" بۆ ئاوارهکان .

سهرۆك "هاری ترۆمهن[٣]" له ساڵه دژوارهکانی نێوان کۆتایی جهنگی جیهانی دووهم، دهسهڵاتی ئهم وڵاتهی به دهستهوه بوو . له ١٩٤٦ سهرۆك ترۆمهن وتی :" ئێمه گهیشتووینهته سهر ئهو قهناعهته که دهستهبهر بوونی ئاشتی له نێوان وڵاتان ، پێویستی به رێکخراوی نهتهوه یهکگرتووهکان ههیه که له ههموو وڵاتانی ئاشتیخوازی جیهان پێکبێت بۆ ئهوهی ئهگهر پێویست بێت ، بتوانین به یهکهوه هێزی سهربازی بهکار بهێنین بۆ مسۆگهر کردنی ئاشتی".

جهنابی سهرۆك ، پێویستبوونی کهڵك وهرگرتن له هێزی سهربازی نێونهتهوهیی هێشتا ههر له ئارادایه و ههروهها خواست و داخوازی بۆ بهکارهێنانی هێزهکانی ئاشتیپارێزی نهتهوه یهکگرتووهکان هێشتا ههر ههیه. ئهگهر له راستیدا دهمانهوێت ئهو بهرپرسیارییهتییه جێبهجێ بکهین که ئێستا له سهر سنووری عێراق و تورکیا له ئهستۆی ئێمهیه، دهبێ دهست به کار بین .

---

[٣] President Harry Truman

## یاسای فریاگوزاری و یارمەتیدانی ئاوارە کوردەکان

## ۹ی مایسی ۱۹۹۱ ــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" بامپێرز"[١]:

ئەنجوومەنی پیران یاسایەکی پەسەند کردووە بۆ فریاگوزاری کوردەکان کە من بە توندی پشتیوانی لێدەکەم . تراژیدیای ئاوارە کوردەکان یەکێ لە ترسناکترین تراژیدیەکانی مێژووە و ئێمەش وەك هاوولاتی ئەمریکا کە کۆمەڵێك بەهامان هەیە ، ئەرکی ئەخلاقیمانە پشتیوانی لێبکەین و وادیارە ئامادەین ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەین .

بەلام جەنابی سەرۆك هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە من بە توندی پشتیوانی لەم کارە دەکەم، دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە خەڵکی ولاتی ئێمە بە گشتی و خەڵکی" لویزیانا" و "میسیسیپی" بە تایبەتی بە توندی بە دەستی گەردەلوولێکی گەورەوە دەناڵێنن و گەلێ لە دانیشتوانی ئەم ناوچانە لە راستیدا بۆ سێیەمین ساڵ هەموو شتێکی خۆیان لە دەست داوەتە.

ساڵی پار ئێمە لە گەلالـە یاسایەك دا ٦٠٠میلیۆن دۆلارمان تەرخان کرد بۆ یارمەتیدانی زیانلێکەوتوانی ئەم کارەساتە و چەند هەفتە پێش وەزارەتی کشتووکاڵ ، ۳۸میلیۆن لەو ٦٠٠میلیۆن دۆلارەی وەك قەرز دا بە جووتیاران . بەهەر حاڵ باوەڕ ناکەم گەلێ لەم خەڵکە تەنانەت بیانەوێت ئەم قەرزە وەربگرن بەڵکوو دەیانەوێت یارمەتی بدرێن و هۆکاری ئەوەی کە من و سناتۆر کۆچران[٢] دەنگمان نەدا بە یاسای فریاکەوتنی کوردەکان ئەوە بوو کە نامانەوێت ئەم دووانە پێکەوە تێکەڵ بکرێت . ئێمە نامانەوێت وەك یارمەتیدەرێك هەڵسوکەوتیان لە گەڵ بکەین ، بەلام دەبێ بە خێرایی لە ناوچە زیانلێکەوتووەکانی ئەم سێ ئەیالەتە یارمەتی ئەو جووتیارانە بدەین کە ئاماژەم پێکردن .

---

Mr. BUMPERS [١]

[٢] Senator COCHRAN

## گەلاڵە یاسای فریاگوزاری بۆ ئاوارەکان

## ٩ی مایسی ١٩٩١ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" کێنێدی" :

جەنابی سەرۆك  من بە توندی پشتیوانی دەکەم لە یاسای ٢١٢٢ بۆ فریاگوزاری ئاوارەکان . ئەم گەلاڵە یاسایە ٤میلیۆن دۆلاری ترخان کردووە بۆ یارمەتیدانی خێرای ئەو ١/٥میلیۆن کوردە کە لە ئێران، تورکیا و عێراق لە بارودۆخێکی دژواردان . جیهان تا ئێستا بە دەگمەن قەیرانێکی ئەوەندە گەورەی ئاوارەکانی بە خۆوە بینیوە کە تێیدا ژن و پیاو و منداڵ لە زێد و وڵاتی خۆیان بەم شێوازە تراژیدیکە ئاوارە بن .

تکا لە هاوکارانم دەکەم دەنگی خۆیان بخەنە پاڵ دەنگی من بۆ ئەوەی ئەم یاسایە پەسند بکرێت بۆ تەرخان کردنی ئەم بڕە پارەیە بۆ ئاوارەکان و ئەوە مسۆگەر بێت کە یارمەتی مرۆڤدۆستانەی خێرا دەگاتە دەستی خەڵکی کورد کە لە مێژە دەچەوسێنرێنەوە و ئازار و نەهامەتی دەچێژن .

## پەسەندکردنی یاسای فریاگوزاری بۆ کوردەکان
## ۹ی مایسی ۱۹۹۱- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "پێڵ" :
جەنابی سەرۆك ئەم یاسایە ڕێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات کە خەڵکی کورد کە لە ئەنجامی سیاسەتە دڕندەکانی ڕژێمی سەدام حوسەین ئاوارە بوونە بە شێوازێکی بنەڕەتی یارمەتی بدرێن .
پتر لە ۲میلیۆن کورد لە سەر سنووری عێراق و تورکیا و ئێران ئاوارە بوونە. هەموومان کەوتوینەتە ژێر کاریگەری توندی وێنە تەلەفزیۆنییەکانی ئەو منداڵانەی کە هەروا بە سەر زەویدا کەوتوون و چاویان بڕیوەتە داهاتوویەکی نادیار. پاش درەنگخستنێکی زۆر ، کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئێستا هەڵساوە بە دابین کردنی پێداویستییەکانی ۸۰۰ هەزار ئاوارەی عێراقی لە سەر سنووری تورکیا. هەروا پێویستییەکی زۆر هەیە بە یارمەتیدانی ژمارەیەکی زۆر لە ئاوارەکانی سەر سنووری ئێران و عێراق و ئەمە پێش لە هەموو شتێك پێویستی بە هاوکاری زۆرتری دەوڵەتی ئێران هەیە . ئەم یاسایە یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کوردەکان دابین دەکات .
بە هەرحاڵ کێشەیەکی گەورەتر هەیە کە ئەویش یارمەتی سیاسی و سەربازییە . هەتا کاتێك سەدام حوسەین لە سەر دەسەڵات بێت ، کوردەکان لەگەڵ کۆمەڵکوژی سوپای عێراق بەرەوڕوون . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکانی ئێستا بەشێکی بەرچاو لە باکووری عێراقیان بەدەستەوەیە . ئەم هەرێمە پارێزراوە ـ کە هیوادارم بەرفراوانتر بکرێت و شاری دهۆکیش لە خۆبگرێت ـ دەتوانێ جێگای یەك میلیۆن ئاوارەی کورد بکاتەوە . بۆ ئەوەی جێگای هەموو ئاوارەکان بێتەوە دەبێ هەرێمی پارێزراو بەرەو ڕۆژهەڵات و باشوور بەرفراوانتر بکرێت .
ئەمە بارودۆخێك نییە کە ئێمە بتوانین بە ئاسانی خۆمانی لێ بدزینەوە . ئەگەر ئێمە لە ناوچە بکشێینەوە ( لە کاتێکدا کە سەدام هەروا لە سەر دەسەڵاتە) کوردەکانیش دەبێ بکشێنەوە ئەگەرنا لە گەڵ مەترسی مەرگ بەرەوڕوو دەبنەوە، کە وابوو هیوادارم لە ئاستی دیپلۆماتیکدا

زۆرترین گرنگی بەوە بدرێت کە هێزێکی نێونەتەوەیی (باشتر وایە لە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکاندا بێت) بۆ پاراستنی خەڵکی کورد لە بەرامبەر سوپا و هێزەکانی ئاسایشی عێراق پێکبهێنرێت.

ئەگەر وتووێژەکانی ئێستای رژێمی بەغداد و کوردەکان رێککەوتننامەیەکی ئۆتۆنۆمی لێ بکەوێتەوە ، دەبێ بە رێگایەك بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق بکشێتەوە بەڵام تەنها کاتێك دەتوانین ئەمە بکەین کە گارانتی متمانە پێکراوی نێونەتەوەیی بۆ جێبەجێ بوونی ئۆتۆنۆمی(کوردستان) لەئارادا بێت، لەوانە بەکارهێنانی هێزی سەربازی ئەگەر هات و عێراق رێوشوێنەکانی رێکەوتنامەکەی خۆی لە گەڵ کورد پێشێل کرد.

سەرنجام نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە سەدام سەرچاوەی کێشەکەی ئێمەیە لە ناوچە . بەداخەوە ئێمە بۆ لە سەر دەسەڵات لابردنی سەدام هەلەکەمان لە کیس دا و ئێستا سەدام زۆر بەهێزترە لەوەی ٢مانگ پێش . سەدام حوسەین و رژێمەکەی بە توندترین شێوە یاسا نێونەتەوەییەکانیان پێشێل کردووە کە کۆمەڵکوژی کوردەکان و داگیرکردنی کوێت دوو لە نموونەکانیەتی . تا ئێستا عێراق تەنانەت شەرت و مەرجەکانی بڕیارنامەی٦٨٧ی نەتەوە یەکگرتووەکانی سەبارەت بە ئاگربەست جێبەجێ نەکردووە. لەوانە دیلە کوێتییەکان بە تەواوی ئازاد نەکراون و نەگەڕاونەتەوە وڵاتی خۆیان. هەروەها لیستی ئەو چەکە کۆمەڵکوژانەی عێراق کە تەسلیم بە نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە ، ناتەواوە . رژێمێکی وا ناتوانێت خۆی لە گەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بگونجێنێت. رژێمی عێراق رژێمێکی چەپەڵە و دەبێ هەروا هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت . کۆمەڵگای نێونەتەوەیی نابێ وەك دەسەڵاتدارانی رەوای عێراق هەڵسوکەوت لە گەڵ سەدام حوسەین و حیزبی بەعس بکات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێ جەخت لە سەر ناڕەوابوونیان بکاتەوە .

## فریاکەوتن و پاراستنی کوردەکانی عێراق و ئاوارەکانی دیکە کە لە ترسی سەرکوتی سەدام حوسەین هەڵهاتوون

## ١٤ی مایسی ١٩٩١ ــ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "ئابێرکرامبێل[١]"، نوێنەری ئەیالەتی" هاوایی" :

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن ئەمڕۆ من بە نوێنەرایەتی لە لایەن لێژنەیەکەوە، پشتگیری تەواوی خۆم دەردەبڕم و ڕێزم هەیە بۆ بڕیاری کەڵکوەرگرتن لە هێزی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ فریاگوزاری و پاراستنی کوردەکانی عێراق و ئاوارەکانی دیکە کە لە دەستی سەرکوتی سەدام هەڵهاتوون . بەتایبەت خۆشحاڵم بە دەرکردنی بڕیاری ناردنی هێزەکانی ئەمریکا بۆ ناوچە بۆ پاراستنی جادەکان و شوێنی ژیانی کاتی ئاوارەکان .

من لە سەر بڕوایەم هەموو ئەمریکاییەك (هەر ڕوانگەیەکی سیاسی کە هەبێ ) هەر ئەم بیروڕای منەی هەیە و ستایشی سەرۆك کۆمار و حکومەتی ئەمریکا دەکات بۆ پێشگیری کردن لە مەرگ و نەهامەتییەکی ئەوەندە گەورە . من وای بۆدەچم ئەم بڕیارەی کۆنگرێس بۆ تەرخان کردنی پارە بۆ ئەم مەبەستە نیشان دەدات ئێمە خەڵکیکی دڵسۆزین و خۆشحاڵ دەبین بە دابین کردنی خوراك، دەواو دەرمان و خێوەت بۆ ئاوارەکان و یارمەتیدانی هەموو لێقەوماوان.

ڕەهەندەکانی ئەم کارەساتە ئەوەندە گەورەیە و مەترسیەکە ئەوەندە کتووپڕە کە جگە لە هێزی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ هێزێکی دیکە ناتوانێت لە بەرامبەریدا ڕابوەستێت. بە بیروبۆچوونی من دەبێ زۆرتر وەڵامی پێداویستیەکانی ئاوارەکان بدرێتەوە و لەم هەلە کەڵك وەربگیرێت لە بەر ئەوەی ئێمە تا ئێستا قەت ئەوەندە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە هێز نەبووینە.

جەنابی سەرۆك کەوابوو جگە لەو هەنگاوانەی کە باسم کرد ئێمە دەبێ:

---

Mr. ABERCROMBIE[1]

١ــ پێوەری یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان بە ئاوارە کوردەکانی عێراق چ لە ناوخۆ و چ لە دەرەوەی عێراق بەرفراوانتر بکەین و داوای یارمەتی زۆرتر لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەین لەم پەیوەندییەدا .

٢ــ هێزە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە کار بێنین بۆ بەرفراوانتر کردن و وەڵامدانەوەی خێرا بە دەستدرێژی سوپای عێراق بۆ سەر هێڵی ٣٦ و هەموو خاکی کوردستانی عێراق کە پێکهاتووە لە پارێزگای کەرکوك ، سلیمانی، هەولێر، دهۆك و بەشێك لە پارێزگای بەعقوبە کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی چیای حەمرین و ئەو بەشەی پارێزگای موسڵ کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە .

ئەو کەسانە کە لەم رۆژانە دا سەیری تەلەفزیۆن دەکەن دەزانن ئەمە واتای ئەوەیە کە ئێمە ناچارین ئەم هەرێمە بچووکەی ئاوارەکان لە باکووری عێراق بەرفراوان بکەین و هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراقی بخەینە ناوی.

٣ــ پێویستە ئێمە لە سەرچاوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یارمەتییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کەڵك وەربگرین بۆ ئاسانکردنی گەڕانەوەی ئاوارە عێراقییەکان کە پاش راپەڕینی ئاداری ١٩٩١ لە زێدی خۆیان ئاوارە بوونە و هەروەها ئەوانەی کە پێشتر لە لایەن رژێمی سەدام ناچار کراون لە باشووری عێراق نیشتەجێ بن .

٤ــ سەرپەرشتی هەوڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەین بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ لە عێراق کە رێز لە مافی هەموو هاووڵاتیانی عێراق بگرێت وەك کورد، ئاشووری، تورکمان، کەلدانی و کەمینەکانی دیکە

٥ــ ئێمە دەبی هەنگاو هەڵبگرین بۆ ئەوەی بارودۆخی خراپی کوردەکانی عێراق بکەین بە ئەجێندای کۆنفرانسی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەراست

جەنابی سەرۆك ئەم هەنگاوانە بەرپرسیارێتی ئێمە بە نیسبەت سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست(کە لە ئاکامی دەستێوەردانی ئێمە لە ناوچە دروست بووە) بەرجەستە دەکات کە ئەرکە

ئەخلاقییەکانی ئێمە قبووڵی کردووە. نیگەرانی بە نیسبەت دادپەروەری و مافی مرۆڤ ، بەها دیمۆکراتیکەکان و دڵسۆزی، فاکتۆر گەلێکن کە ئێمە ناتوانین وەك شتێکی لاوەکی سەیریان بکەین بەڵکوو دەبێ لە دڵی هەموو مرۆڤێکدا بێت . پشتگوێ خستنی ئەم فاکتۆرانە ناوچە تووشی ئاڵۆزی و بی سەروبەرەیی هەمیشەیی دەکات و تەنها لە رێگای بە فەرمی ناسینی ئەم ئامانجە هەرگیز نەمرانەیە کە ئاشتی و سەقامگیری دەستەبەر دەبێت .

جەنابی سەرۆك لەوانەیە باش بێت پرسیار بکرێت بۆ دەبێ ئێمە سەرنج بدەینە خەڵکێك کە پێش شەڕی کەنداو هیچ کەس ناویانی نەبیستووە. وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەم شەڕە کۆتایی پێ نەهاتووە و کۆتایی پێ نایێت . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە یارمەتیدان بە دەرکردنی عێراق لە کوێت ، دەروازەکانی ئازادی کردووەتەوە، ئەو ئازادییە کە هەموو خەڵکی ناوچە ئامەزرۆیەتی. ئەم خەڵکە هەوڵ دەدەن بگەن بەو دادپەروەرییە کە ئێمە دەڵێین دەتوانین دابینی بکەین بۆ ئەمیرەکان و ئەو کوێتیانە کە ئێستا داوایان لێدەکرێت میسر بەجێ بهێڵن و بۆ نموونە لە هۆتێلە لۆکسەکانی ئەوێ بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان .

کوردەکانیش داوای هەمان شت دەکەن . ئێمە ناتوانین خۆمان لەم شەڕە دوور بگرین ، ناتوانین خۆمان لەم قەڵەمڕەوە دووربگرین ، مەگەر ئەو کاتە کە خەڵکی عێراق سەروەری خۆیان لە وڵاتەکەیان بەدەست بهێننەوە کە لە رۆژی بە دەسەڵات گەیشتنی سەدامەوە لێیان زەوت کراوە . ئەمڕۆ سەدام لە سەر دەسەڵاتە و تا ئەوکاتە کە ئێمە ناوچە بەجێ بهێڵین لە سەر دەسەڵاتیش دەمێنێ ، مەگەر ئەوەی ئەو هەنگاوانە هەڵبگرین کە دەستنیشانم کرد.

جەنابی سەرۆك ئێمە ناتوانین بە بەهانەی ئەوەی کە شەڕ کۆتایی پێهاتووە، خۆمان دوور بگرین . شەڕ کۆتایی پێ نەهاتووە، تێبینییە گرنگەکەی من ئەوەیە کە ئێمە کەوتووینەتە ناو باروودۆخێك کە تێیدا هەزاران هەزار کورد لە گەڵ رژێمی مرۆڤکوژی سەدام بەرەوڕوون ، ئایا ئێمە بۆ ئەمە شەڕمان کرد ؟ بۆ ئێمە رزگار کردنی خەڵکمان نەکرد بە ئامانج؟ ئەگەر ئەمە ئامانجی ئێمە نەبوو، ئەی چی بوو ؟ ئەگەر ئێمە داوامان لە خەڵکی عێراق نەکردبایا دژی سەدام راپەڕین بکەن

لەوانەیە ئەمڕۆ بۆ رزگار کردنی خۆمان شتێکمان بۆ وتن هەبایا بەڵام ناتوانین شتی وا بڵێین بەهۆی ، ئەوەی کە داوامان لێکردن دژی سەدام راپەڕن . جەنابی سەرۆك ئەم بانگەوازەی ئێمە هۆکاری راپەڕینی خەڵکی عێراق بوو و هەروەها هۆکاری ئاوارە بوونی خەڵکی کورد بۆ سنووری تورکیا و ئێران بوو .

جەنابی سەرۆك ئێمە دەبێ هەنگاو هەڵبگرین بۆ ئەوەی نیشان بدەین وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەرکی ئەخلاقی خۆی بە نیسبەت کوردەکان جێبەجی دەکات و پاشان شەڕ کۆتایی پێبێت . تەنها رێگا بۆ کۆتایی پێهاتنی شەڕ ئەوەیە سەدام لە سەر دەسەڵات لابرێت و یارمەتی بەو خەڵکە بدرێت کەدژی سەدام راپەڕینیان کردووە.

## هەوڵە نێونەتەوەییەکان بۆ پاراستنی کوردەکان

## ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩١ ــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " جان کێری"[١] :

جەنابی سەرۆك له ٧٢ کاتژمێری رابردوودا بینیمان کە چ پێشوازییەکی بێ وێنە لە هێزە سەربازییەکانمان کرا کە لە "شاڵاوی گەردەلوولی بیابان"دا بەشدار بوون . لە واشنگتۆن دی سی گەورەترین رێورەسمیان بۆ گێرا ، لە نیۆیۆرك هەموو رێکۆردەکانی پێشووتر شکێنران ، ئەمە جەژنی سەرکەوتنی سەربازی بوو بە سەر عێراقدا . هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان داگیرکەرانیان لە کوێت وەدەرنا هەروا کە بەڵێنیان دابوو. ئەمە شاڵاوێکی زۆر پڕشکۆ بوو و ئێمە پێشوازی لەو کەسانە دەکەین کە ئەوەندە ئێمەیان سەربەرز کرد.

ئەو سناتۆرانە کە قسەیان کرد ئەم سەرکەوتنەیان وەك سەرکەوتنی ئازادی بەرجەستە کرد ،راستە ئەمە سەرکەوتنێکی سەربازی گەورە بوو بەڵام شەڕ بۆ ئازادی تازە دەستی پێکردووە . راپۆرتەکان سەبارەت بە پێشێلکارییە بەردەوامەکانی مافی مرۆڤ لە کوێت نیشان دەدات ئێمە دەبێ هەروا بە هەمان شێوە نیگەران بین بە نیسبەت ئازادی خەڵکی کوێت. لە مەزیاتر هەرچەند خۆشحاڵم کە هێزە سەربازییەکانمان بە سلامەت گەڕاونەتەوە بۆ وڵات بەڵام خۆشترین کات بۆ من ئەو کاتەیە کە ئاوارە کوردەکان بگەڕێنەوە بۆ باکووری عێراق . جەنابی سەرۆك هیوادارم و تکادەکەم لە بیریان نەکەین.

لە ژمارەی ئەمڕۆ سەر لە بەیانی رۆژنامەی" واشنگتۆن پۆست "دا وتارێکی بەڕێز "سەدرەدین ئاغاخان"[٢] ، نوێنەری سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووکان لە" ئاژانسی نێونەتەوەیی پرۆگرامە

---

Mr. KERREY [١]
Mr. Sadruddin Aga Khan [٢]

مرۆڤدۆستانهکان" له عێراق ، کوێت و ناوچه سنوورییهکانی عێراق ـ ئێران بڵاو بۆتهوه که دهمهوێت بۆ ئهنجامی وتهکانم کهڵکی لێوهرگرم .

بهڕێز" ئاغاخان" ئاماژهی بهوه کردووه که نهتهوه یهکگرتووهکان دهیهوێت به ئامانجی پاراستنی ئازادی خهڵکی کورد هێزی پارێزهر له عێراق جێگیر بکات.

ئهم ۵۰۰ گارده به گوێرهی ڕێککهوتننامهی ۲۳ی مایسی نهتهوه یهکگرتووهکان له گهڵ عێراق و له چوارچێوهی ئهو ڕێککهوتننامهیه که له ۱۸ی ئاڤریل له بهغداد واژۆ کراوه کار دهکهن. ئهمه نۆپهراسیۆنێکی مرۆڤدۆستانهیه که تهنها کاتێك سهرکهوتوو دهبێت که نهتهوه یهکگرتووهکان به توندی و به هێزهوه پشتگیری لێ بکات . بهداخهوه ههوڵه فریاگوزارییه خۆویستهکان زۆر وهڵامدهری پێداویستییهکانی ئاوارهکان نهبووه. وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا دهبێ سهرپهرهشتی کۆمهڵگای جیهانی بکات بۆ سهرڕاست کردنهوهی کهموکۆڕییهکان. ئهگهر ئازادی ئهم ئاوارانه ببێته قوربانی لهخۆڕازی بوونی ئێمه ، ئهنجامێکی تاڵ و تراژیدیکی لێ دهکهوێتهوه. تێڕوانیینی بهڕێز" ئاغاخان" بۆ ئهم شێوازه وڵامدانهوه نوێیه شایانی پشتگیری ئێمهیه . قسهکانی بهڕێز ئاغاخان زۆر سهرنجراکێشه و هیوا بهخشه . بهڕێز ئاغاخان دهڵێت :

قسهو باس له سهر دهستێوهردانی مرۆڤدۆستانه ، لهم دواییانه گهرموگوڕتر بووه و ڕهزایهتی زۆرتری له سهره . جهنابی سهرۆك ، ئێمه نهتهنها ههلی ئهوهمان بۆ ڕهخساوه (له ڕێگای ئهم ههولانه) که ئهوکارهی که دهستمان پێکردووه تهواوی بکهین بهڵکوو فێری ئهویش دهبین که چۆن ههر له سهرهتاوه بۆ پێشگرتن له ههڵگیرسانی شهر کهڵك له هێزی سهربازی وهربگرین.

## كوردەكان بە تەنیا جێمەهێڵن

## ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٩١- ئەنجوومەنی پیران

بەرێز" پێڵ " :

جەنابی سەرۆك ، پتر لە ٢ مانگە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هێزە هاوپەیمانەكانمان ژیانی خەڵكیان لە باكووری عێراق پاراستووە. ژنان و پیاوانی سەربازی ئێمە ، خەڵكی برسیان تێر كردووە، نەخۆشەكانیان چارەسەر كردووە و داڵدەی دەربەدەربووەكانیان داوە .لە هەموو گرنگتر سەربازانی ئێمە، كورد ، كەلد و ئاشوورییەكانیان پاراستووە لە بەرامبەر كۆمەڵكوژی تەواوی سوپای سەدام كە هەرەسی هێناوە بەڵام هێشتا لە مرۆڤكوژییدا چالاكە.

ئێستا بە هەرحاڵ كاری هێزە هاوپەیمانەكان وادیارە رووی لە كۆتاییە و بێ دانانی رێوشوێنی پێویست بۆ پاراستنی خەڵكی ناوچە، دیسان لە گەڵ تراژیدیایەكی دیكەدا بەرەورپوو دەبنەوە كە جاری یەكەم ئێمەی خستە ناو باكووری عێراق .

دوو مانگە رێبەرایەتی كورد لە گەڵ سەدام لە بەغداد وتووێژ دەكات . ئەم وتووێژە وادیارە بە رێككەوتننامەی ئۆتۆنۆمی كۆتایی پێدێت كە لە ئەنجامدا بەشێك لە داهاتی نەوتی كەركووك دەدرێ بە كوردەكان و رێگایان پێ دەدرێت چاپەمەنی، رادیۆ و تەلەفزیۆنی خۆیان هەبێت .

بە گوێرەی راپۆرتی رۆژنامەكان ، كوردەكان دەیانەوێت لە ماوەی ٣مانگی داهاتوودا هەڵبژاردنێكی دیمۆكراتیك لە ناوچەی خودمووختار بەرێوەببەن و لە ماوەی ٦مانگ تا یەك ساڵ ، هەڵبژاردنی دیمۆكراتیك لە هەموو عێراق بەرێوە دەچێت. ئەگەر هەڵبژاردنێكی وا بەرێوە بچێت ، شتێكی باشە . سەدام حوسەین لە قۆناخەكانی پێشووی لاوازبوونیدا ( وەك سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ و لە میانەی شەری ئێران و عێراق) لە گەڵ رێبەرانی كورد وتووێژێكی بەرچاوی كردووە . بە هەرحاڵ ئەگەر رژێمی سەدام بەهێزتر ببێت ، رێككەوتنامەكە دەخاتە ژێر پێ و دیسان دەست

دەکاتەوە بە کوشتار. هیچ هۆیەك لە ئارادا نییە تا وا بیربکەینەوە بارووددۆخەکە لە گەڵ رابردوو جیاوازە .

سەدام نەتەنها دەیەوێت هێزە بیانییەکان لە عێراق بچنە دەرەوە بەڵکوو دەیەوێت کۆمەڵگای نێونەتەوەییش ئاوڕ لە عێراق نەداتەوە . سەدام دەزانێت هەتا کاتێك کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی تێوەگلاوی کێشەی کورد بێت، شتی وا روو نادات کەوابوو ستراتیژییەکی شەفافی گرتۆتە بەر کە بریتییە لە سازش لە گەڵ کورد ، دەرکردنی هێزە نێونەتەوەییەکان لە عێراق ، لادانی ئاراستەی سەرنجی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە کوردەکان و گۆڕینی بەرەو شتەکانی دیکە و پاشان هەڕەشە کردن لە هێزە کوردەکانی نەیاری سەدام و ئەو خەڵکە کە پشتیوانیان لێ دەکەن.

هیچ هۆکارێك لە ئارادا نییە بۆ ئەوەی ئێمە بە قازانجی ستراتژییەکەی سەدام هەنگاو هەڵبگرین . ئێمە دەبێ بزانین ناتوانین متمانە بە سەدام ( کە بە وتەی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە" ئادۆلف هیتلەر" خراپترە) بکەین جارێکی دیکە خەڵکی کورد سەرکوت نەکات و ئازاریان نەدات . پاراستنی خەڵکی کورد دەبێ کۆڵەکەی سەرەکی سیاسەتی ئێمەبێ لە باکووری عێراق .

کوردەکان ئێستا بە هۆی ئەو هەنگاوانەی کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دژی عێراق هەڵی گرتووە لە مەترسیدان. بە زەبر وەشاندن لە سوپای سەدام ئێمە بارودۆخێکمان درووست کردووە کە راپەڕینی کوردی کردووە بە شتێکی مسۆگەر . لەمە زیاتر بە هەرحال ئێمە لە رێگای لێدوانە گشتیەکانی سەرۆك بوش ، چالاکانە کوردەکانمان هاندا تا دژی سەدام راپەڕین بکەن و بەڵێنی پشتیوانی سەربازیمان پێدان( لە رێگای ئەو رادیۆ نهێنییە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دایمەزراندبوو) و وتمان ئەگەر هێزی ئاسمانی عێراق چالاکی بکات لێی دەدەین . ئێمە ناتوانین و نابێت بەرپرسیارێتی خۆمان لە بەرامبەر خەڵکێك کە لە ئەنجامی کردەوەکانی ئێمەدا کەوتوونەتە ناو مەترسی پشتگوێ بخەین. راپەڕینەکانی پاش شەڕی زەمینی دژی عێراق ، ئەنجامی راستەوخۆی شەڕ بوو و ئێمە ناتوانین خۆمان لە بەرپرسیاریەتییەکانمان بدزینەوە .

کوردەکان به کۆمەڵ دژی سەدام راپەڕینیان کرد. له ١٩٨٠ راپەڕینێکی زۆر بچووکتر بووه هۆی ئەوەی سەدام به شێوازێکی بەرفراوان پتر له ٦٠ گوند به چەکی کیمیایی بۆمباران بکات . ئەم جاره هەموو شارەکان بەشێك بوونه له راپەڕین و هەمووشیان له بەردەم تۆڵه سەندنەوەی سەدام دان . هەتا کاتێك که سەدام و رژێمەکەی له سەر دەسەڵات بێ ، کوردەکان له مەترسیدان .

ئەم راستیه وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکای لەگەڵ هەڵبژاردنی یەکێ لەم دوو رێگا ناخۆشانه رووبەڕوو کردووەتەوه : دۆزینەوەی رێگایەك بۆ مانەوەی هێزه نێونەتەوەییەکان له عێراق یان بەتەنیا هێشتنەوەی کوردەکان له بەرامبەر چارەنووسێکی دڕندانه . له بەر ئەوەی که به بیروبۆچوونی من رێگاچارەی دووەم ، نامرۆڤانه و نائەخلاقییه ، ئێمه هیچ رێگاچارەیەکی دیکەمان نییه جگه له مانەوه له باکووری عێراق .

ئێمه دەبێ له گەڵ ئەندامانی دیکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوه یەکگرتووەکان کاربکەین بۆ پێکهێنانی هێزێکی نێونەتەوەیی له ژێر چاودێری نەتەوه یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی کوردەکان . ژمارەی ئەم هێزانه دەبێ گەڵێ لەو ٥٠٠ سەربازەی نەتەوه یەکگرتووەکان زۆرتر بێت که ئێستا به رەزامەندی رژێمی عێراق لەوێن و کاریان تەنها پاراستنی کارمەندانی رێکخراوه نێونەتەوەییه فریاگوزارییەکانه . پێکهێنانی جۆره هێزێکی نێونەتەوەیی گونجاو کاتی دەوێت .

له هەمان کاتدا ئێمه نابێ ئەوەنده به پەرۆش بین بۆ هاتنەدەرەوه له باکووری عێراق. سەربازانی ئێمه به تەواوی پارێزەری ژیانن . پێموایه ئەوەنده که ئێمه دەمانەوێت ئەوان بگەڕێنینەوه بۆ وڵات، خویان نایانەوێت بگەڕێنەوه له بەر ئەوەی دەزانن ئەگەر ناوچەکه به جێ بهێڵن هەرچیان کردووه به خێرایی به فیڕۆ دەچێت.

## کوردهکان له بیر مهکهن

## ۲ی ئابی ۱۹۹۱- ئهنجوومهنی نوێنهران

بهڕێز" بیلبرای":

جهنابی سهرۆکی ئهنجوومهن سبهینێ ۳ی ئاب، کۆنگرهی نهتهوهیی کورد له ئهمریکای باکوور له" واشنگتۆن دی سی" کۆبوونهوهیهك دهگرێت بۆ باس و تاوتوێ کردنی ستراتیژی داهاتوو به ئامانجی چارهسهر کردنی قهیرانی بهردهوامی کورد له باکووری عێراق . من زۆر شانازی دهکهم بهوهی که بانگهێشت کراوم بۆ ئهم کۆبوونهوهیه .

ههرچهند که ئێمه ئیدی شهوانه وێنهی ئاواره مردووهکان، کهمپه خێوهتییهکان و خستنه خوارهوهی خۆراك بۆ ئاوارهکان له فرۆکهکانهوه نابینین بهڵام هێشتا کۆمهڵێك کێشه ماوه که دهبێ چارهسهری بکهین . ههرچهند که ئێمه ئێستا هێزی "کردهوهی خێرا"مان له تورکیا ههیه بهڵام هێشتا ناتوانین ئاسایشی ئهم ئاوارانه مسۆگهر بکهین . کردهوهکانی رابردووی دهوڵهتی عێراق نیشان دهدات که کوردهکان له گهڵ مهترسی سهدام رووبهڕوون .

گرینگترین کێشهی ئێمه ئهو راستییهیه که هێشتا خهڵك دهترسن . گهمارۆ ئابوورییهکانی ئێمه له سهر عێراق پێویسته و له جێی خۆیدایه . به ههرحاڵ دهبێ کۆمهڵێك رێگا بدۆزینهوه بۆ تهسلیم کردنی پێداویستهکانبه ئاوارهکان. سهرهنجام ئهوه که سهدام هێشتا له سهر دهسهڵاته و ههتا کاتێك سهدام له سهر دهسهڵات بێت ، هیچ کهس بهتایبهت کوردهکان ئاسایشیان نابێت .

هیوادارم هاوکارانم دهنگی خۆیان بخهنه پاڵ دهنگی من بۆ پشتیوانی کردن له چالاکیه بهردهوامهکانی بهرهی کورد و هیوادارم خهباتیان له بیر نهکهین .

## قوربانییە نەخوازراوەکانی شەڕی کەنداو
## ١٢ی ئاداری ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " پێڵ " :

جەنابی سەرۆك مانگی رابردوو یەکەمین ساڵیادی راگەیاندنی سەرکەوتن لە شەڕی کەنداوی فارس بوو لە لایەن سەرۆك جۆرج بوشەوە . بە دڵنیاییەوە ئێمە شانازی بە هێزە ئازاکانی ئەمریکا دەکەین کە لە کەنداو خزمەتی ولاتەکەیان کردووە. بە هەرحاڵ ئێستا یەك ساڵ پاش راگەیاندنی ئازادی کوێت لە لایەن سەرۆك بوشەوە ، نەتەنها سەدام هێشتا لە سەر دەسەلات ماوە بەڵکوو ئێمەش قوربانییە نەخوازراوەکانی شەڕمان لە بیر کردووە . دوا بە دوای شەڕ سەدان هەزار کەس سەربە هەموو گرووپە کەمینەکان ئاوارەبوون وەك فەلەستینییەکان، کوردەکان ، شیعەکان و کەلد و ئاشوورییە مەسیحیەکان .

ئەم کێشە مرۆڤییە مەزنترین جۆری ئاوارەیی لە مێژووی هاوچەرخدا درووست کرد .لە کۆتایی شەڕی کەنداو تا ئێستا پتر لە ٥ میلیۆن کەس ئاوارە بوونە. کۆڕەوی بەکۆمەڵی کوردەکان لە عێراق (کە میدیاکان سەرنجی زۆرتریان پێدا) و دەرکردنی هاوولاتیانی غەیرە کوێتی لە کوێت تەنها بەشێك لە قەیرانی هەنووکەی ئاوارەکانی کەنداوە.

سەرەڕای ئەوەی دەوڵەتی کوێت دڵنیایی داوە کە ئیدی کەس دەرناکرێت ، بەلام سەدان هەزار میسری، یەمەنی، فەلەستینی و هی ولاتانی دیکە لە کوێت دەرکراون بێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوەیەکی یاساییان لەگەڵ بکرێت. لە راستیدا بنەماڵەی "ئەلسەباح" (کە بە سەر کوێتدا دەسەلاتدارن ) لە بیریان چووە کە کاتێ کە ئەوان لە ولات نەمابوون و هەڵهاتبوون ، ئەم خەڵکانە لە بەرامبەر رژێمی زاڵمی عێراقدا راوەستابوون .

لە کاتی شەڕ سەرۆك بوش کەمینەکانی عێراق وەك کوردەکان و شیعەکانی هاندا تا دژی سەدام راپەڕین بکەن و سەدام و حیزبی بەعس بڕوخێنن . راپەڕین نەیتوانی دوڵەتی عیراق بڕۆخێنی و

سەدام دژکردەوەیەکی خێرا و دڕندانەی نیشان دا . سەدام بەو تانك و هێزە زەمینییە کە هێشتا لە دەستیدا مابوو ، ڕاپەڕینی جەماوەری خەڵکی بە هێزی سەربازی دڕندەی خۆی تێشکاند .
لە گەڵ ئەمەشدا جۆرج بوش پاش ئەوەی لە بانگەوازێکدا کورد و شیعەکانی بۆ ڕاپەڕین دژی سەدام هاندا ، نەیتوانی لە کاتی پێویستدا یارمەتییان بدات و لە ئەنجامدا شەپۆلی ئاوارەکان بەرەو ئێران و تورکیا ڕۆیشتن . ئەم خەڵکە نەتەنها تۆشی شاخە میواننەویستەکان و بیاوانە قاتوقڕەکان بوون، بەڵکوو لە ناو کەمپەکانی ئاوارەکاندا گیران خواردەوە و خۆراك، دەواو دەرمان و سووتەمەنی کەمیان هەیە . لەمە زیاتر حکوومەتی ئەمریکا نەیویستووە حکوومەتی عێراق ناچار بکات بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە باشتر کردنی باروودۆخی دڵتەزێنی کوردەکان جێبەجێ بکات.
کەمینە ئەتنیکییەکانی دیکەش دوا بەدوای شەڕی کەنداوی فارس تا ئێستا هەر ئێش و ئازار دەکێشن. پتر لە ١٢ هەزار ئاشووری و کەلدانی مەسیحی و کەمینەکانی دیکە کە لە کاتی شەڕ و پاش شەڕ لە عێراق هەڵهاتوون ، هێشتا هەر ئاوارەن و لە وڵاتانی دراوسێی عێراق سەرگەردانن لە بەر ئەوەی ناوێرن بگەڕێنەوە بۆ عێراق .
سەرەڕای ڕاگەیاندنی سەرکەوتنی شەڕ لە لایەن حکوومەتی بوش، قەیرانی کەنداو بە نیسبەت ئەم قوربانیە لە بیرکراوانە هێشتا هەر بەردەوامە . ئەوانە کە دوابەدوای شەڕی کەنداو تا ئێستا ئێش و ئازار دەکێشن دەبێ لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە سەرنجی تەواویان پێ بدرێ و نابێت حکوومەتی ئێستای ئەمریکا لەمە زیاتر پشتگوێیان بخات . لە یەکەمین ساڵیادی کۆتایی پێهاتنی شەڕی کەنداوی فارس لە کاتێکدا کە دەبێ ئەم یادە بەرز ڕابگرین با قوربانییە نەخوازراوەکانی شەڕ لە بیر نەکەین .

## سەدام حوسەین، کورد و ژینۆساید

## ١٧ی ئاداری ١٩٩٢ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "دۆل"[١] :

جەنابی سەرۆك ئەم هەفتەیە چوارەمین ساڵیادی یەکێ لە دزێوترین رووداوەکانی سەدەی بیستەمە . لە ١٧ــ١٨ی ئاداری ١٩٨٨ هێزە چەکدارەکانی سەدام حوسەین هەزاران ژن، منداڵ و پیرەمێردیان لە شارۆچکەی هەڵەبجە کوشت . ئەم کۆمەڵکوژییە بە چەکی کیمیایی ئەنجامدرا، هەمان چەکی کیمیایی کە ئەمرۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بە شوێنیدا دەگرێت لە عێراقدا .

لەو کاتە قێزەونەی ١٩٨٨ تا ئێستا سەدام و هێزەکانی گاردی کۆماری بە چەکی کیمیایی بەردەوام هێرشیان کردووەتە سەر کوردەکان لە باکووری عێراق و خەڵکیان بە کۆمەڵ لەسێدارە داوە و بە هەموو شێوازێکی وێنانەکراو ئەشکەنجەیانی داوە .

ئەم کردووەوە دڕندەیە زۆر جار لە تەلەفزیۆنەکانی جیهاندا بڵاو بووەتەوە بەڵام ئێمە بە خێرایی لە بیری دەکەین. هەر ئەم مانگە بەرنامەی تەلەفزیۆنی "٦٠ خولەك " کە نزیکەی ٦٠ میلیۆن ئەمریکایی سەیری دەکات ، دوایین کردەوە بێبەزەیانەکانی هێزەکانی سەدام حوسەینی دژ بە خەڵکی کورد نیشاندا. وادیارە سەربازە عێراقییەکان کردەوە کۆمەڵکوژییەکانی خۆیان بە کامێرا تۆمار دەکەن تا خەڵات بکرێن . ئەم وێنە کامێراییانە لە گەڵ هەزاران لاپەڕە بەڵگەنامەی دیکە دەستی بە سەردا گیراوە ، ئەم وێنانە ترسناك و دڵتەزێن بوون .

هێشتا لە واشنگتۆن هیچ باسێك نییە بۆ ئەوەی ئەم کردەوە بەردەوامانە بە ژینۆساید بناسرێن، تەنانەت ئێستاش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە رۆژئاواییەکان سەرنجی خۆیان چڕ کردووەتەوە لە سەر تەکنۆلۆژیا و کارخانەکانی بەرهەمهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکانی سەدام نە

---

[١] Mr. DOLE

ئەو خەڵکە کە بوونەتە قوربانی(و لەوانەیە دیسان لە داهاتوویەکی نزیکدا ببنەوە قوربانی ) چەکە کۆمەڵکوژەکانی سەدام .

لە هەفتەی رابردوودا راپۆرتە هەواڵییەکان هەڵویستی لەخۆبایانە و بێ باکانەی جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراقیان بلاو کردەوە کە بە نەتەوە یەکگرتووەکانی وتووە سەدام حوسەین دیاری دەکات پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دۆزینەوەی چەکی کۆمەڵکوژ، دەتوانن سەردانی کوێ بکەن و سەردانی کوێ نەکەن .

ئێستا کۆمەڵێك گوشار لە لایەن بریتانیا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە بۆ ئەنجامدانی هەندێ کردەوەی سەربازی .

## کوردەکان هاوپەیمانی سرووشتی ئێمەن دژی سەدام
## ١٧ی ئاداری ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" دیکۆنسینی[١]" :

جەنابی سەرۆك زۆر پێشتر لەوەی کە کردەوە بێ بەزەیانەکانی سەدام بە شێوازێکی بەرفراوان ریسوا بکرێ ، رژێمە دەڕندەکەی سەدام شاڵاوێکی بۆ قەڵاچۆکردنی کوردەکانی دانیشتوی باکووری عێراق ئەنجامدا . گوندەکان خاپوور کران، هەزاران کەس کوژران و دەیان هەزار کەس ناچار بوون لە زێدی خۆیان ئاوارە ببن .

ئەمڕۆ چوارەمین ساڵیادی کردەوەیەکی دڕندانەیە کە جیهانی هەژاند و تاکتیکی تیرۆری هۆڤانەی سەدامی ئاشکرا کرد کە هەمووومان بە باشی ئاگادارینی. چوار ساڵ پێش دیکتاتۆری عێراق دژی گوندنشینە کوردەکان چەکی کیمیایی بە کار هێنا و هەزاران ژن، پیاو و منداڵی کوشت .

جەنابی سەرۆك وێنە زیندووەکانی ئەم کۆمەڵکوژییە هەموو کەسێك دەهەژێنێت ، بەتایبەت ئەوانەی کە وێنەی قوربانییەکانیانی سەر شەقامەکان و نێو ماڵەکانیان بینیوە . تەرمی بنەماڵەکان وشك بووە و کەوتۆتە سەریەك و سەرەڕای ئەم بەڵگەنامە حاشا لێنەکراوانە رژێمی عێراق تا ئێستا دانی بەکردەوە دزێوەکانی خۆیدا نەناوە . تەنانەت ئێستاش رژێمی سەدام لە رێگای توندتر کردنی گەمارۆ ئابوورییەکان و گوشاری سەربازی درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ لە ناو بردنی کوردەکان .

خواستی سەدام بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بۆ قەڵاچۆ کردنی هاوولاتیانی خۆی نیشان دەدات سەدام بۆ راگرتنی دەسەڵاتی دزێوی خۆی لە ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەکی زاڵمانە دەست ناپارێزێت . کوردەکانی باکووری عێراق دەیانەوێت مانگی داهاتوو هەڵبژاردنێك بەڕێوە ببەن و

---

[١] Mr. DECONCINI

ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لەم هەوڵە بکات بـۆ چەسـپاندنی دیمۆکراسـی لـە ولاّتێك کە لە مێژە ئازادییەکانی لێ زەوت کراوە .
٤ ساڵ پێش جیهان بێ دەنگ بوو و لە راستیدا لە کاتی هێرشە کیمیایەکاندا بەردەوام پـشتیوانی لە سەدام دەکرد. جەنابی سەرۆك ئێمە ئێستا دەزانین کوردەکان هاوپەیمانی سرووشـتی ئێمـەن دژی سەدام و شایانی ئەوەن پشتیوانی سیاسی و ئەخلاقی ئێمەیان هەبێت و یارمەتی مرۆڤدۆسـتانەیان بکەین . ئەم ساڵیادە دزێوە دەبێ ببێ بە خاڵی پشتیوانی ئەمریکا بـۆ زینـدوو راگرتنـی هیـوای کوردەکـان لـە عێـراق و خـەبات بـۆ ئـازادی و دیموکراسـی . ئیـدی قـەد نابێـت کوردەکـان یـا هەرکەسێکی دیکە ببێ بە قوربانی کردەوە درندانەکانی سەدام.

## چوارەمین ساڵیادی کیمیاباران کردنی کوردەکان

## ١٨ی ئاداری ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "جۆرج":

جەنابی سەرۆك رۆژی دووشەمە ، ١٦ی مانگی ئادار چوارەمین ساڵیادی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە بوو بە فەرمانی سەدام کە پتر لە ٥ هەزار ژن، پیاو و منداڵ لەم هێرشە دا کوژران. ئەمڕۆ سەدام تەنانەت لە هەرەسهێنانە سەربازییەکەی بە دەستی ئێمە رزگاری بووە و ئێستاش هەر لە سەر دەسەڵاتە . سەدام درێژە بە شەڕی ژینۆسایدی دەدات دژی هەر گرووپێك کە لە بەرامبەری رابوەستێت وەك شیعەکان کە لە باشووری عێراق گیریان خواردووە و بە تایبەت هەموو کوردەکان لە باکووری عێراق .

بەڕاستی هیچ وشەیەك نییە کە مرۆڤ بتوانێت مۆتەکەی ترۆری بەردەوامی سەدام و ئێش و ئازاری ژن و پیاو و منداڵە بێ گوناحەکانی پێ وەسف بکات کە بە دەستی دەوڵەتێك ئەنجام دەدرێت کە ئەم خەڵکەی ترساندووەو تۆقاندووە و تووشی بێ هیوایی کردووە .

بۆ وەسف کردنی ئەم رووداوانە بە تایبەت سپاسی ئێوە و هەموو ئەندامانی ئەم لیژنەیە دەکەم بە بۆنەی دەرکردنی راپۆرتێك لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ بۆ کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران لە ژێر ناوی " کوردستان لەسەردەمی سەدامدا " . کاتێ کە ئەم راپۆرتە دەرچوو، ٦٠٠ هەزار کورد ئاوارەی سنووری تورکیا و عێراق ببوون و لە گەڵ مەرگی بە کۆمەڵ بە هۆی سەرماو سۆڵە، نەخۆشییە پەتاکان و برسێتی رووبەڕوو بوون. پاش دەستپێکردنێکی درەنگ ، حکوومەتی بوش سەرئەنجام دەست بەکار بوو و لە "شالاوی دابینکردنی حەسانەوە"دا پێشی لەوە گرت ئەم نەهامەتییە ببێ بەکارەسات .

بەیارمەتی ئەم هەولانە خەڵکی کورد لە کارەسات رزگاریان بوو بەڵام هێشتا لە گەڵ مەترسیەکی کوشندە بەرەوڕوون . بۆ چەند مانگ سەدام گەمارۆی خستە سەر ناوچە کوردنشینەکان بۆ ئەوەی

خەڵکەکەی خۆی بە برسێتی بکوژێت لەبەر ئەوەی سەدام لەوە دەترسێت کە ئەگەر ئەم دەنگانە کپ نەکات کوردەکان بەسەریدا زاڵ دەبن .

ئێستا خۆراك ، سووتەمەنی و دەواو دەرمان له ناوچە زۆر کەمە. نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەرکی یارمەتیدانی مرۆڤدۆستانەی لە سەر شانە هەتا ئەو شوێنەی کە من ئاگادارم وەکوو پێویست وڵامی پێداویستییەکانی نەداوەتەوە . لە هەمان کاتدا هێزەکانی سوپای عێراق دەستیان کردووە بە گوشار خستنە سەر ناوچە کوردنشینەکان . روونە کە سەدام دەیەوێت لە هەموو ئامرازێك بۆ لە ناوبردنی کوردەکان کەڵك وەربگرێت . پرسیار ئەوەیە کە ئایا سەدام دەتوانێت خۆی دوور بگرێت؟

وڵاتە یەکگرتووەکان ناتوانێت پشت لەم سەرکوتە زاڵمانە ، نامرۆیی و وێنانەکراوە بکات. ئێمە دەتوانین کارێکی جیاواز بکەین بۆ میلیۆنەها مرۆڤ لە پیاو، ژن ، منداڵ، دایك و باوك و باپیر و داپیر و نەوەی نوێ و بیانپارێزین . ئێمە دەتوانین خۆراك، سووتەمەنی و دەواو دەرمان بگەیەنینە دەستی کوردەکان، تەنانەت ئێمە و وڵاتانی دیکە دەبێ یارمەتی تورکیا بدەین بۆ رووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ئەم بوومەلەرزەیە . ئێمە دەبێ و توانای ئەوەمان هەیە کە وەڵامی سەدام بدەینەوە ئەگەر شەرت مەرجەکانی ئاگربەست رەچاو نەکات

## گەلاڵە یاسای "بەهاری شاخ" بۆ پاراستنی کوردەکان

## ٢٦ی ئاداری ١٩٩٢ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك، ئەمڕۆ دەمەوێت بڕیارنامەیەك بخەمەڕوو کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا گرنگە. ئەم بڕیارنامەیە داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات کاتی مانەوەی هێزەکانی چادێر و ئاشتیپارێز لە کوردستان لە باکووری عێراق درێژ بکاتەوە .

هەرچەند کە من پشتیوانی سەرەکی ئەم گەلاڵەیاسایە بوومە بەڵام ئەم کەسانەش پشتیوانیان لێ کردووە : بەڕێز گیلمەن، نوێنەری ئەیالەتی نیویۆرك، ئەندامی پایە بەرزی کۆمیسیۆنی ئۆرووپا و رۆژهەڵاتی نزیکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوە، بەڕێز سۆلارز، نوێنەری ئەیالەتی نیویۆرك کە سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئاسیا و کاروباری زەریای هێمنە لە کۆمیتەی کاروباری دەرەوە .

ئەم گەلاڵە یاسایە هەروەها داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکات کاتی مانەوەی هێزە فرەڕەگەزەکان لە بنکەکانی ئەو وڵاتە درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی بە هێزی هەوایی بتوانن هەرێمی دژە فڕینی کوردستان بپارێزن. هەروەها داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کراوە کاتی مانەوەی هێزەکانمان لە ناوچە درێژ بکاتەوە بۆ یارمەتیدانی پرۆسەی پاراستنی کوردەکان، لە بەر ئەوەی کە ئەگەر ئەم کاتە درێژ نەکرێتەوە سەدام و سوپای عێراق هێرش دەکەنەوە سەر کوردستان ، کوردەکان لەناو دەبەن و سەدان هەزار کەس دەکەن بە قوربانی و دیسان کێشەمان بۆ ساز دەبێت (کێشەی ئاوارەکان) و هەزاران کەسی دیکە دەمرن .

تکا لە هاوکارانم لە لە کۆنگرێس دەکەم دەنگ بدەن بەم بڕیارنامەیە کە هەفتەی داهاتوو یا ئەم هەفتەیە لە کۆمیسیۆنی ئۆرووپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران ئاوتوێ دەکرێت و پەیوست بن بە ئێمە بۆ پاراستنی ناوچە و گەلی کورد کە

یەکێ لە کۆنترین گەلانی جیهانە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سامرییەکانی کەونار.
کوردەکان مەزنترین گرووپی ئەتنیکین لە جیهان کە دەوڵەتیان نییە .
تکا لە هاوکارانم دەکەم یارمەتی ئێمە و کوردەکان بدەن و ڕێگا خۆش بکەن بۆ ئەوەی لە ڕێگای چاودێری کردنی ناوچە بە هێزی ئاسمانی ، کوردەکان لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بپارێزرێن.

## پەرەسەندنی ئاڵۆزییەکان لە عێراق

## ٣١ی ئاداری ١٩٩٢ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" پێڵ ":

جەنابی سەرۆك  من ئەمرۆ بە توندی نیگەران بووم لە راپۆرتی رۆژنامەکان سەبارەت بەوەی کە عێراق سەر لە نوێ هێرشی کردووەتە سەر کوردەکان . راپۆرتەکان نیشان دەدەن دەوڵەتی عێراق ناوچە کوردنشینەکانی دەوروبەری هەولێری بۆمباران کردووە کە بووەتە هۆی ئاوارە بوونی ٤٠ هەزار کەس.  راپۆرتەکان هەروەها دەڵێن دەوڵەتی عێراق گاردی کۆماری ناردۆتە ناوچە و کۆپتەر بە سەر ناوچەکانی ژێر دەستی کوردەکان دەفڕێنێت ، لەوانە هەرێمی دژە فڕینی ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان. بەرپرسانی نەتەوە یەکگرتووەکان رایانگەیاندووە ئەم کردەوە دوابیانەی عێراق پێشێل کردنی بڕیارنامەکانی ئاگربەستی نەتەوە یەکگرتووەکانە .

ئەم کردەوانە ، هۆشدارییە  بۆ ئێمە  کە سەدام درێژە بە هێرشەکانی بۆ سەر کورددکان دەدات . لە ماوەی ساڵی رابردوودا  ناوچەی کوردنشینی باکووری عێراق بووە بە ئامانجی گەمارۆی توندی ئابووری حکوومەتی عێراق. لەگەڵ ئەمەشدا ، کوردەکان کۆنترۆڵی زۆربەی خاکی کوردستانی عێراقیان گرتووەتە دەست و دەیانەوێت لە کۆتایی ئەم مانگە هەڵبژاردن بکەن بۆ پێکهێنانی ئیدارەیەکی یەکگرتووی کوردی.

بێ گومان ئەم هێرشە دواییانەی دەوڵەتی عێراق ، بۆ ئەوەیە کە هەڵبژاردنی کوردەکان هەڵبوەشێتەوە ، بە هەر حاڵ کێشەی لەوە ئاڵۆزتر ئەوەیە کە ئەم هێرشانە نموونەی سەرکووت و ئازار و ئەزیەتی کوردەکانە لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە . لە سەرەتای ئەم مانگە من سەرۆکایەتی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیرانم کرد بۆ تاوتوێ کردنی کۆمەڵکوژییەکانی عێراق بە دەستی رژێمی سەدام . کۆمیتە تاوتوێی بەڵگەنامەکانی پەیوەندیدار بە کوژرانی بێ فەرق و جیاوازی خەڵکی سڤیلی کوردی کرد ، لەوانە بەڵگەنامە فەرمییەکانی عێراق و شایەتیدانی پسپۆڕان . بەڵگەنامەکان نیشان دەدەن کە ژمارەی گشتی ئەو کوردانەی کە

کوژراون یان بێ سەر و شوێن کراون ۲۰۰هەزار تا ۳۰۰ هەزار کەسە کە دەکاتە ٥٪ ی سەرجەم دانیشتوانی کوردستانی عێراق . بە بیروبۆچوونی من ئەم زانیارییانە نیشان دەدات کردەوەکانی عێراق دژی کوردەکان لە حوکمی سیاسەتی فەرمی ژینۆسایدە.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارە لە بەرامبەر یارمەتیدان بە پاراستنی کوردەکان . لە کاتی شەڕی کەنداو سەرۆك کۆماری ئەمریکا تکای لە خەڵکی عێراق کرد کۆنترۆڵی هەموو شتێك بگرنە دەست و سەدام لە سەر دەسەڵات لاببەن ، ئەم داواکارییە راپەڕینی راستەوخۆی کوردەکانی لە ساڵی رابردوو لێکەوتەوە . کۆمەڵگای نێونەتەوەیش بەرپرسیارە لە بەرامبەر کوردەکان لە بەر ئەوەی داوای لە هەزاران ئاوارەی کورد کرد کە بگەڕێنەوە بۆ هەرێمی پارێزراو.

ئێستا کە بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان و سنوورەکانی هەرێمی پارێزراو دەستدرێژی کراوەتە سەر ، کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ ئەوە بسەلمێنێت کە قسەکانی بێ واتا نین . ئێمە دەبێ لە رێگای "شاڵاوی دابینکردنی حەسانەوە" جەخت لە سەر بەرپرسیاریەتی خۆمان بکەینەوە بۆ پاراستنی کوردەکان و کوردەکان نەخەینە بەردەم کردەوە دڕندانەکانی سوپای عێراق . ئەمە نەتەنها بە قازانجی ئێمەیە بەڵکوو لە پێناو بەرپرسیارێتی ئەخلاقی ئێمەشدایە .

## بڕیارنامەی ١٠٨ سەبارەت بە کورد لە باکووری عێراق
## ٩ی نیسانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی پیران

- به لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە دەوڵەتی عێراق بە شێوەیەکی دڕندانە ڕاپەڕینی کوردەکانی لە شوبات و ئاداری ١٩٩١ سەرکوت کردووە و سەدان هەزار کوردی ئاوارەی تورکیا کردووە
ــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لەم شەپۆلە ئاوارەییە کتوپڕ و بەرفراوانە بەرەو تورکیا، لە ئەنجامی کەمی خێوەت، خۆراك ، دەواو دەرمان و ئاوی خاوێن ئاوارەکان لە گەڵ مەترسی مەرگ ڕووبەڕوو بوونەتەوە
ــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە باشترین ڕێگاچارە بۆ ئەم قەیرانە مرۆڤییە ئەوەیە کە کوردەکان هان بدرێن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان لە باکووری عێراق لە ڕێگای درووست کردنی هەرێمێکی هێمن لە باکووری عێراق کە هێرش نەکرێتە سەری
ــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لە وەڵامی پێداویستیە یەکجار زۆرەکانی کوردەکان ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرپەرشتی "شالاَوی دابینکردنی ئاپاسایش"ی کردووە کە تێیدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکانی دیکە یارمەتیدانی کوردەکان هەم لە ناو تورکیا و هەم ناوچەی پارێزراو لە باکووری عێراقیان گرتووەتە ئەستۆ .
ــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لە حوزەیرانی ١٩٩١ کۆمیسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران هێشتا لە باکووری عێراق چالاکییەکانی درێژە پێدەدات ، لەوانە پتر لە هەزاران ڕێکخراوی ناحکوومی و سەدان گاردی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان سەرقاڵی چالاکی فریاگوزارین
ــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کۆمیسۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران ئێستا سەرقاڵی وتووێژە لەگەڵ سندووقی منداڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوەکانی دیکەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان لە باکووری عێراق

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە یادداشتنامەی لەیەك تێگەیشتنی نێوان عێراق و نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مانەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە حوزەیرانی ۱۹۹۲ کۆتایی پێدێت

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کەمی خۆراك لە هەرێمی پارێزراو لە ئەنجامی گەمارۆی دەوڵەتی عێراق وای کردووە کە هەوڵە فریاگوزارییە نێونەتەوەییەکان زۆر پێویست بێت بۆ پێشگیری لە قاتوقڕی لە نێوان دانیشتووە کوردەکان

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە بڕیاری دڵخۆشکەرانەی دەوڵەتی تورکیا بۆ ڕێگەپێدان بەدامەزراندنی بنکەی سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری تورکیا زۆر پێویستە بۆ سەرکەوتنی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش ، سەرەڕای ئەوەی کە لەوانەیە عێراق تۆڵەی ئەم کارە لە تۆرکیا بسێنێتەوە

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش هێشتا پێویستە بەردەوام بێت بۆ وڵامدانەوەی هێرشەکانی عێراق بۆ سەر کوردەکان لە هەرێمی پارێزراو لە باکووری عێراق

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە ڕێکەوتننامەی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و تورکیا بۆ ڕێگەپێدانی دامەزراندنی بنکە سەربازیەکانی لە باشووری تورکیا لە ۲۰ی ژۆئەنی ۱۹۹۲ کۆتایی پێدێت

ـ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە ئەگەر ئەم ڕێکەوتننامەیە درێژ نەکرێتەوە و شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش کۆتایی پێبێت ، ئەگەری ئەوە زۆرە کە هێزەکانی عێراق هێرش بکەنە سەر هەرێمی پارێزراو و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵك بکوژرین و لەوانەیە شەپۆلێکی دیکەی ئاوارەبوون بەرەو تورکیا درووست بێت.

کەوابوو کۆنگرێس بڕیاری دا کە:

۱ـ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ هەوڵ بدات بۆ درێژکردنەوەی ڕێکەوتننامەی حوزەیرانی ۱۹۹۲ کە ڕێگا دەدات بنکە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری تورکیا دابمەزرێت بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش.

٢ــ دەوڵەتی تورکیا دەبێ وەڵامی ئەرێنی بداتەوە بە داواکاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ درێژکردنەوەی ئەم رێکەوتننامەیە. رەزامەندی تورکیا شەرتە بۆ بەردەوام بوونی شالاوی دابینکردنی ئاسایش .

٣ــ مانەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە باکووری عێراق دەبێ درێژ بکرێتەوە

٤ــ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ یەکەمین هەوڵیان ئەوەبێ کە دەوڵەتی عێراق گەمارۆ ئابوورییەکان لە سەر باکووری عێراق لاببات .

## هەڵبژاردن له کوردستان: یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراتیك له مێژووی عێراق

## ٧ی گوڵانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "جان کێری":

جەنابی سەرۆك مانگی مایس مانگی بەهار ، مانگی هیوا و مانگی سەرلەنوێ له دایك بوونه بۆ باکووری عێراق ، مانگی هیوا به لەدایکبوونی دیموکراسییه. له ١٧ی مایس خەڵکی کوردی باکووری عێراق هەڵبژاردنەکانی پارلمانی هەرێمی کوردستان بەڕێوه دەبەن . ئەم هەڵبژاردنه یەکەمین هەڵبژاردنی دیۆکراتیك دەبێ له مێژووی عێراقدا .

بەداخەوه ئەم هەڵبژاردنه تەنها هەنگاوێکی بچووکه بەرەو پێش له بەر ئەوەی که کوردەکانی باکووری عێراق هێشتا له گەڵ مەترسی جیدی دیکتاتۆری دڕندەی عێراق ، سەدام حوسەین ڕووبەڕوون . هێزه چەکدارەکانی سەدام درێژه به گەمارۆ ئابوورییەکانییان له سەر ناوچه کوردنشینەکانی عێراق دەدەن و هێرشەکانیان بۆ سەر گونده کوردنشینەکان درێژه پێدەدەن. تەنها لەوانەیه بوونی هێزی ئاسمانی ولاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا، فەرانسا و دامەزرانی هەرێمێکی پارێزراو بتوانێ ڕێگر بێت له سیاسەتی کۆمەڵکوژی تەواوی کوردەکانی باکووری عێراق به دەستی سەدام حوسەین .

سەرەڕای ئەم بارودۆخه ترسناکه کوردەکانی عێراق کۆڵیان نەداوه و هەوڵ دەدەن یەکەمین هەڵبژاردنی پارلمانی کوردستان ئەنجام بدەن . دەوڵەتی عێراق ئیدارەی مەدەنی خۆی به تەواوی له باکووری عێراق کێشاوەتەوه و کوردەکان هەوڵ دەدەن دەوڵەتێکی ڕەوا و هەڵبژاردوو پێکبێنن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئیدارەی و کاروبارەکانی دیکەی دەوڵەتی .

جەنابی سەرۆك هەڵبژاردنەکانی کوردستانی عێراق ڕووداوێکی گرنگه و شایانی ئەوەیه له لایەن ولاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوه به فەرمی بناسرێت و پشتیوانی

لێبكرێت . كوردەكانی عێراق لەمێژە مافەكانیان پێشێل دەكرێ و ئامانجە رەواكانیان زەوت دەكرێ . ئێمە دەبێ ستایشی بوێری و ئیرادەیان بكەین بۆ هەنگاو هەڵگرتن بەرەو دیموكراسی و شێلگیربوونیان بۆ راوەستان دژی سەدام حوسەین .

## هەڵبژاردنی پارلمانی کوردستان: خاڵی وەرچەرخان بۆ گەلی کورد
## ۱۳ی گوڵانی ۱۹۹۲- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "سپیکتێر" [1]:

جەنابی سەرۆك دەمەوێت سەرنجی ئەنجوومەنی پیران بەرەولای رووداوێك رابکێشم کە لە کۆتایی ئەم مانگە لە عێراق دەقەومێت . لە ۱۷ی مانگی مایس یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراتیك لە مێژووی عێراق بەڕێوە دەچێت . سەرەڕای ئەو راستیە کە سەدام حوسەین هێشتا لە بەغداد لە سەر دەسەڵاتە ، کوردەکانی باکووری عێراق دەیانەوێت هەڵبژاردنی پارلمانی کوردستان بەڕێوە ببەن . گەلێك رووداوی نێونەتەوەیی دەقەومێ کە مرۆڤ بە سانایی پشتگوێیان دەخات بەڵام ئەم هەڵبژاردنە سەرنج و پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بەرەو لای خۆی راکێشاوە .

جەنابی سەرۆك نزیکەی ۲۰۰ هەزار پیاو، ژن و منداڵی کورد بە دەستی سەدام کوژراون، تەنانەت پاش هەرەسهێنانی سەربازی عێراق لە شاڵاوی گەردەلوولی بیابان، سەربازانی عێراق درێژە بە هێرشەکانیان دەدەن بۆ سەر گوندە کوردنشینەکان و تەنها بوونی هێزی سەربازی بەریتانیا، فەرانسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە کوردەکانی پاراستووە .

سەرەڕای ئەم بارودۆخە ناخۆشە و گەمارۆی ئابووری سەر کوردستان، کوردەکان هەرێمێکی ئارامیان درووست کردووە و دەیانەوێت هەڵبژاردنێکی دیموکراتیك بەڕێوە ببەن .

جەنابی سەرۆك ئەم هەڵبژاردنە خاڵی وەرچەرخانە بۆ گەلی کورد . هیوادارم هەڵبژاردنێکی دیموکراتیك داهاتوویەکی روونتر بۆ کورد وەدی بێنێت کە پتر لە ۷۰ساڵە مافە بنەڕەتییەکانی لێ زەوت کراوە . هیوادارم دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رەوتی مافی چارەی خۆنووسین بۆ کوردکان هەموار بکات کە مافی بنەڕەتی مرۆڤە.

---

[1] Mr. SPECTER

دەوڵەتی سەدام مافی دەسەڵاتداری و بەڕێوبردنی لە کوردەکان زەوت کردووە و هەر ئێستاش گەمارۆی ئابووری خستووەتە سەر باکووری عێراق بۆ ئەوەی بە برسێتی بە چۆکیاندا بهێنێ .
جەنابی سەرۆك من دەرك بەوە دەکەم کە سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت عێراق ، ئاڵۆزە و نیگەرانی ناوچەیی ، ناکۆکی سنووری و هەڕەشەی راستەقینەی بناژۆخوازانی ئیسلامی لە ئارادایە . بە هەر حاڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەمیشە پشتیوانی لە مافی چارەی خۆنووسین کردووە و لە بەرامبەر پێشێل کردنی مافی مرۆڤ راوەستاوە . لە عێراق باروودۆخەکە روونە. کوردەکانی باکووری عێراق دەبێ لە هێرشە کۆمەڵکوژییەکانی سەدام بپارێزرێن و یارمەتی بدرێن بۆ بەڕێوەبردنی یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراتیك لە ولاتی عێراقدا .

## بە فەرمی ناسینی مافی کوردەکان و هەڵبژاردنەکانی داهاتوو
## ١٤ی گوڵانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك دەمەوێت سەرنجی ئەندامانی کۆنگرێس بەرەولای بارودۆخی نالەباری ناوچە کوردنشینەکانی باکووری عێراق رابکێشم . نزیکەی نیو ملیۆن ئاوارە لە لوتکەی سنووری عێراق و تورکیا گیریان خواردووە و ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان لە گەڵ مەترسی مەرگ بەرەورِوو دەبنەوە و تەنها ئەتەوە یەکگرتووەکان و هێزی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە ناهێڵێت سوپای عێراق هێرشیان بکاتە سەر و لە ئاسایش و ئەمنییەتدا ژیان بە سەر بەرن .
بە هەرحاڵ کاتەکە بەرەو کۆتایی دەچێت . مانگی داهاتوو چەتری پارێزگاری ئەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر ئەم ناوچەیە کۆتایی پێدێت و ئەگەر هێزەکانمان ناوچەکە بە حێ بهێڵن بە دڵنیاییەوە کوردەکان لە لایەن سەدامەوە ژینۆساید دەکرێن. سەدام هیچ باکێکی نییە لە دەربڕینی نەفەرەتی خۆی لە کوردەکان کە یەکێ لە نموونەکانی کیمیاران کردنی هەڵەبجە و کۆمەڵکوژی بەردەوامی ژن و منداڵی بێ گوناحە . لەگەڵ ئەمەشدا ئێستا هەلی ئەوەمان بۆ رەخساوە سەرنجی دەوڵەتی بوش بەرەولای رووداوێکی مێژوویی رابکێشین.
١٧ی ئەم مانگە کوردەکان هەنگاوێکی مێژوویی هەڵدەگرن کە ئەویش هەڵبژاردنی پارلمان و سەرۆکایەتی کوردستانە کە دەربڕی خواستی ئەوانە بۆ بەشداری کردن لە دیموکراسیدا. کوردەکان لەم رێگایە دەیانەوێت نیشان بدەن ئامەزرۆی ئازادین و دەیانەوێت هەمان ماف و ئاسایشیان هەبێت کە جیهانی دیموکراتیك هەیەتی .
ئێستا لیژنەیەکی کۆنگرێس ، پسپۆڕانی کاروباری دەرەوە و چالاکی مافی مرۆڤ چوونەتە تورکیا بۆ ئەوەی سەردانی ناوچە کوردنشینەکانی عێراق بکەن و چاودێری بە سەر هەڵبژاردنەکاندا بکەن.

ئەم لیژنەیە کە لە لایەن پارێزگاری ئەیالەتی "نقادا" و سەرنووسەری رۆژنامەی" لاسڤێگاس[1]" ، بەرێز "سان مایك ئۆکالاهان[2]"وە سەرپەرەشتی دەکرێت ، راپۆرتێکمان سەبارەت بە باروودۆخی دژواری ئەم خەڵکە و پێویستی پاراستنی ئاسایشیان پێشکەش دەکات.

بۆ ئەوەی هەموو هاوکاران ئاگاداری رووداوە مێژووییەکانی ناوچە بن و پشتیوانی بکەن لە کۆتایی پێهاتنی سەرکووت و توندوتیژی دژی کوردەکان ، داوا دەکەم وتاری خاتوون" لیزلی ویویر[3] " بخوێننەوە لە ژێرناوی "کوردەکانی عێراق خۆیان ئامادە دەکەن بۆ یەکەمین هەڵبژاردنی ئازاد " کە لە ١٣ی مایسی ١٩٩٢ لە رۆژنامەی "نیۆیۆرك تایمز" دا بڵاو بووەتەوە.

---

[1] Las Vegas
[2] Sun Mike O'Callahan
Leslie Weaver [3]

## هەڵبژاردنی دیموکراتیك له کوردستان: رووداوێکی گرنگ بۆ دانیشتوانی کوردستان و هەموو کۆمەڵگای نێونەتەوەیی

## ١٤ی گوڵانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەرێز " لڤین "نوێنەری ئەیالەتی "کالیفۆرنیا" :

جەنابی سەرۆك ، ١٧ی ئەم مانگە کەمینەی کورد له باکووری عێراق هەڵبژاردن دەکات بۆ دیاریکردنی ئەندامانی پارلمان. ئەمە رووداوێکی گرنگە بۆ دانیشتوانی کوردستان و هەموو کۆمەڵگای نێونەتەوەیی .کوردەکانی عێراق له ئەنجامی سیاسەتی سەرنەکەوتووی دەوڵەتی بوش له بەرامبەر عێراق، چەوسێنراونەتەوە . ٢٠٠ هەزار کورد بە دەستی هێزە چەکدارەکانی سەدام کوژراون و سەدان هەزاری دیکه ئاوارە کراون و له بارودۆخێکی نالەبار له باکووری عێراق دەژین و خۆراك و خێوەتیان وەکوو پێویست نییه . له سەروبەندی ئەم نەهامەتییەدا رژیمی سەدام درێژە بە هێرشەکانی دەدات بۆ سەر گوندەکانی کوردستانی عێراق .

سەرەرای ئەم بارودۆخە دژوارە خەڵکی کورد بۆ ژیانێکی باشتر بێ هیوا نەبووە و دەیەوێت هەڵبژاردنێکی دیموکراتیك بەرێوە ببات بۆ پێکهێنانی ئیدارەیەکی دیموکراتیك کە هێمای ئاوات و هیواکانیە . زێدەباری ئەمە هەڵبژاردنە ئازاد و دادپەروەرانەکانی کوردستان دەبێت بە نموونەی دیموکراسی له عێراق و ناوچەی کەنداوی فارس .

جەنابی سەرۆك گەلی کورد نەهامەتی زۆری بە دەستی سەدام حوسەین و کۆمەڵگای نیونەتەوەیی بینیوە بە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای نیونەتەوەیی وەکوو پێویست یارمەتیانی نەکردووە . له ١٧ی مایس کوردەکان هەنگاو هەڵدەگرن بۆ یارمەتیدانی خۆیان . دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نیونەتەوەیی دەبێ سەرنج بدات بە هەڵبژاردنەکانی کوردستان و وڵاتانی دراوسێی کوردستان هان بدات رەوتێکی دیموکراتیکی هاوشێوە بگرنەبەر .

## هەڵبژاردنەکانی پارلمان لە کوردستان: کوردەکان هەنگاو هەڵدەگرن بۆ یارمەتیدانی خۆیان

### ١٧ی گوڵانی ١٩٩٢ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "لڤین":

جەنابی سەرۆك ئەمرۆ لە باکوری عێراق، خەڵکی کورد بۆ یەکەمین جار هەڵبژاردن دەکەن بۆ دیاری کردنی ئەندامانی پارلمان . کوردەکانی عێراق سەرەڕای ئەوەی لە بارودۆخێکی دژواردان بەڵام دەروەسبەونی خۆیان نیشان دەدەن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی پرشکۆ کە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بێ وێنە بێت ، هەربۆیە خەڵکی کورد شایستەی ستایشی قوڵ و رێز و لە هەموو گرنگتر پشتیوانی ئێمەن .

بە هەرحاڵ حکوومەتی ئەمریکا بە جۆرێکی دیکە چاو لە کوردەکان دەکات . لە روانگەی دەوڵەتی بوش ــ "بەیکێر"ەوە کوردەکانی عێراق یەکێ لە روونترین نموونەکانی سیاسەتی سەرنەکەوتوو و بەلارێداچووی ئەمریکان بە نیسبەت سەدام حوسەین. حکوومەتی بەش لە باتی ئەوەی لەم هەلە کەڵك وەربگرێت بۆ هاندانی دیمۆکراسی لە ناوچە(کە ناوەندی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ و ئازادییە سیاسییەکانە) هەوڵ دەدات هەڵبژاردنەکانی کوردستان کەم بایەخ بکات .

بەڕێز "ئا ـ م رۆزینتاڵ "[1]، کار و چالاکیەکانی حکوومەتی ئەمریکای لە وتارێکدا خستووەتە روو کە رۆژی هەینی لە رۆژنامەی "نیۆیۆرك تایمز" بلاّو بووەتەوە. ئیدارەی بوش دەبێ لە خۆی شەرم بکات ، ئیدارەی بوش بە هەوڵدان بۆ شاردنەوەی سەرنەکەوتنی سیاسەتی پێشووی خۆی بە نیسبەت عێراق، نەهامەتی و ئاوارەیی کوردەکان خراپتر دەکات.

---

[1] A.M. Rosenthal

ئەمڕۆ نزیكەی ملیۆنێك كورد بۆ دیاری كردنی ئەندامانی پارلمان هەڵبژاردن دەكەن . پێشتر قەد هەڵبژاردنێكی وا نەكراوە بۆ ئەم خەڵكە كە لە كاتی شەڕی مان و نەماندا بە دەستی دوژمنەكەیان دەچەوسانەوە . كوردەكان گەلێكی موسڵمانی غەیرە عەرەبن كە لە نێوان عێراق ، توركیا ، ئێران ، سووریا و هەندێ لە كۆمارەكانی باشووری یەكێتی سۆفیەتی پێشوو بڵاو بوونەتەوە. پێشتر و ئێستاش دەوڵەتانی رۆژئاوا و نیمچە رۆژهەڵات و دەوڵەتانی دیكە لە پێناو بەرژەوەندییەكانی خۆیان كوردیان وەك داردەست بەكار هێناوە.

لە كاتی شەڕی كەنداو، سەرۆك بوش داوای لە خەڵكی عێراق كرد دژی سەدام راپەڕین بكەن ، كوردەكانیش متمانەیان بە ئەمریكا كرد و دژی سەدامێك راپەڕین كە لە هەمووساڵەكانی دەسەڵاتیدا ،كوردەكانی دەكوشت. بەڵام پاش ئەوەی كە سەدام هەرەسی هێنا ، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا رێگری نەكرد لە كەڵكوەرگرتنی سەدام لە كۆپتەر و تۆپ و ئەوچەكانە كە سەدام بۆ لەناوبردنی بە كۆمەڵی كوردەكان پێویستی پێ بوو . سەدام سەرنەكەوت و وێنەی ئەو كوردانەی كە لە رێگا شاخاوییەكاندا دەمردن جیهانی هەژاند . تەنانەت ئەگەر بۆ دەمێكیش بێت ئێستا كوردەكان بەشێك لە ناوچەكانی عێراقیان بەدەستەوەیە و بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی( نە سەربەخۆیی) هەوڵ دەدەن. بە گوێرەی سەرچاوەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، بە سەدام وتراوە ئەگەر هێرش بكاتەوە سەر كوردەكان، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەڵامی دەداتەوە بەڵام باوەڕ ناكەم سەدام لەم هەڕەشەیە ترسابێت .

هەندێ لە سەرچاوەكان دەڵێن سەدام ژمارەی هێزەكانی دووقات كردووە بۆئەوەی هێرش بكەنە سەر كوردەكان. هەروەها كە هەندێ لەو پسپۆڕە ئەمریكاییانە (كە سەدامیان گەورە كردووە) هەمیشە وەبیرمان دەهێننەوە، كوردەكان خەڵكێكی یەكنەگرتوو و ناتەبا و توندوتیژن، لە راستیشدا تەبایی و یەكگرتوویی و ئارامبوون بۆ گەلێك وەك كورد كە بە درێژایی سەدەكان تووشی كۆمەڵكوژی بووە، زەحمەتە .

بە هەر حاڵ کوردەکان لە سەروبەندی ئەم شەڕە بەردەوامەی ئێستا کە ڕۆژ بە ڕۆژ مەترسیدارتر و بەرفراوانتر دەبێت، هەڵبژاردن بەڕێوە دەبەن . کوردەکان دەڵێن گەمارۆی سەدام بەواتای ئەوەیە کە ئەوان تەنها ٢٥٪ی خۆراك و پێداویستەکانی عێراقیان بەردەکەوێت . کوردەکان وابیر دەکەنەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیەوێت ئەم هەڵبژاردنە بەڕێوەبچێت و داوایان لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردووە کۆمەڵێك چاودێر بنێرێتە کوردستان هەروا کە بۆ هەڵبژاردنەکانی نیکاراگوا، بەنگلادیش، ئالبانیا، نامیبیا، شیلی[٢] و ولاتانی دیکە ناردوویەتی .

---

[٢] Nicaragua, Bangladesh, Albania, Namibia, Chile

## لە کاتی هەڵبژاردندا کوردەکان بپارێزن

## ٢١ی گوڵانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك ، ئەم هەفتەیە بۆ یەکەمجار لە مێژووی گەلی کورد هەڵبژاردنێکی ئازاد لە کوردستان بەڕێوە چوو . ئەم هەڵبژاردنە ئەو راستییەی سەلماند کوردەکان دەتوانن ئیدارەیەکی چڕوپڕ لە چوارچێوەی ناوچەیەکی خاوەن ئۆتۆنۆمی (نە سەربەخۆیی) بەڕێوە ببەن کە تێیدا کوردەکان لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی دیکتاتۆری دڕندەی عێراق واتا سەدام حوسەین بپارێزرین.

ئەمڕۆ لە کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی کۆنگرێس بڕیارنامەیەك ئامادە کراوە کە تێیدا داوا لە ئەمریکا کراوە چاودێری ئاسمانی لە سەر هێڵی ٣٦ لە باکووری عێراق لە رێگای شالاوە ئاشتیپارێزەکانی خۆی بۆ پاراستنی کوردەکان درێژە پێبدات و داوا لە دەوڵەتی تورکیا کراوە وەك رابردوو رێگە بدات فڕۆکەکانی ئەمریکا لە خاکی تورکیاوە چالاکی بکەن .

خەڵکی کورد ئەهامەتی زۆری بەدەستی ئەم رژێمە بینیوە . سەدام سەربازانی خۆی لە پاڵ هێڵی ٣٦ مۆڵ داوە و چاوەڕوانە ئەتەوە یەکگرتووەکان ناوچەکە بە جێ بهێڵێت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چاودێری ئاسمانی خۆی رابوەستێنێت.

جەنابی سەرۆك تکا لە هەموو هاوکارانم دەکەم ئەگەر ئەم گەلاڵە یاسایە هەفتەی داهاتوو یان پاش ئەم هەفتەیە لە کۆنگرێس خرایەڕوو ، پشتیوانی لێ بکەن . ئەم گەلاڵە یاسایە داوا لە ئەمریکا دەکات درێژە بە پاراستنی کوردەکان بدات لە بەرامبەر دیکتاتۆری دڕندەی بەغداد.

هیوادارم گەلی کورد کە ٤ هەزار ساڵ مێژووی هەیە لە ژێر چەتری پاراستنی ئەتەوە یەکگرتووەکاندا هەر بە کامەرانی بژی .

## هەستی كۆنگرێس بە نیسبەت كوردەكانی عێراق
## ٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەرێز "هامیلتۆن":

جەنابی سەرۆك من پشتیوانی لە بڕیارنامەی ٢٩٩ی كۆنگرێس دەكەم كە باسی مەسەلەكانی پەیوەندیدار بە كۆمەڵگای كورد دەكات لە باكووری عێراق. ئەم بڕیارنامەیە لە ٢٠ی مایس لە كۆمیتەی كاروباری دەرەوەی كۆنگرێس تاوتوێ كراوە و پەسەند كراوە.

جەنابی سەرۆك ئەم بڕیارنامەیە ٤ خاڵ لەخۆ دەگرێت : یەكەم داوا دەكات ماوەی مانەوەی بنكەی هێزەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە باشووری توركیا لەپێناو ئامانجەكانی شالاوی دابینكردنی ئاسایش پاش حوزەیرانی ١٩٩٢ درێژ بكرێتەوە . دووەم داوا دەكات ماوەی چالاكی نەتەوە یەكگرتووەكان لە باكووری عێراق درێژ بكرێتەوە . سێیەم جەخت دەكاتەوە لە سەر بەردەوامبوونی یارمەتیە مرۆڤدۆستانەكان بۆ كوردەكانی عێراق و چوارەم داوا لە دەوڵەتی ئەمریكا دەكات هەنگاو هەڵبگرێت بۆ هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری دەوڵەتی عێراق لە سەر باكووری عێراق.

لە ١٧ی مایسی ١٩٩٢ كوردەكانی عێراق هەڵبژاردنێكی سەركەوتوویان لە باكووری عێراق بەڕێوەبرد. ئەمە رەوتێكە بەرەو دیمۆكراسی كە ئێمە دەمانەوێت لە شوێنەكانی دیكەی عێراق و سەراسەری رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیش هەبێ . بەڕێوەچوونی ئەم هەڵبژاردنە بەبێ بوونی هێزەكانی شالاوی دابینكردنی ئاسایش لە باشووری رۆژهەڵاتی توركیا نەدەلوا .بە باوەڕی من ئێستا كاتێكی زۆر گونجاوە بۆ ئەوەی شالاوی دابینكردنی ئاسایش درێژەی پێبدرێت و كار بۆ ئاڵوگۆڕی ئاشتیخوازانە و دیمۆكراتیك لە شوێنەكانی دیكەی عێراق بكرێت.

سپاسی هاوكارانی بەڕێز" بیلبرەی" و بەڕێز"سۆلارز" دەكەم بۆ سەرپەرشتیان لەم بارەیە و داواكارم بڕیارنامەی ٢٩٩ پەسەند بكرێت.

بەڕێز "برامفیلد" :

جەنابی سەرۆك من پشتیوانی دەکەم لەم بڕیارنامە بەجێیە بۆ بەردەوام بوونی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش و پێکهاتنی هەرێمی پارێزراو لە باکووری عێراق و بەردەوامبوونی چالاکی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو شوێنە . هەروەها سپاسی پشتیواتی ئەندامانی کۆنگرێس، بەڕێزان "بیلبرەی"، "سۆلارز"، "فاسکاڵ" (سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی کۆنگرێس) و کۆنگریسمەن "هامیلتۆن" و " گیلمان" دەکەم لە کۆمیسیۆنی ئۆرووپا و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست.

رژێمی سەدام حوسەین بەوپەڕی دڕندەییەوە رەفتاری لە گەڵ کوردەکان کردووە . هەر رۆژ کۆمەڵێك بەڵگەنامەی نوێ دەدۆزرێتەوە سەبارەت بە هەوڵە سیستماتیکەکانی ئەم رژێمە بۆ کوشتوبڕین و ئەشکەنجە کردنی خەڵکی بێ گوناهی کورد کە بە ناو هاوولاتی عێراقن . دەوڵەتی ئەمریکا جگە لە پاراستنی هەرێمی پارێزراو ، ئێستا یارمەتی کوردەکانیش دەکات لە ڕێگای خستنەڕووی بەڵگەنامە نهێنییەکاتی ئیستیخباراتی عێراق کە پێوەری رەفتارە دڵڕەقانەکانی سەدام نیشان دەدات و بەم زووانە جیهان ئاگاداری ئەم پێشێلکارییە ترسناکەی مافی کوردەکان دەبێتەوە .

ئێمە ناتوانین سەرکووتی دڕندانەی ڕاپەڕینی سەرەتای ١٩٩١ی کوردەکان لە بیر بکەین . بە بیروبۆچوونی من سەدام ئامادەیە و دەیەوێت و دەتوانێت شاڵاوێکی دیکەی سەربازی دژی کوردەکان ئەنجام بدات ئەگەر کۆمەڵگای نێونەتەوەیی نەیانپارێزێت . ئێمە دەبێ هەرچی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش بەردەوام بێت و هەرێمی پارێزراو هەر بمێنێت .

خەڵکی کورد بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە لەم رۆژانەی دواییدا نیشانی دا کە لە بەرامبەر رەوتی دیمۆکراسی خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ و دەیەوێت ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتری هەبێت . ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان دەنگیان دا و ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان و رێبەری بزووتنەوەی کوردیان هەڵبژارد . سەرەڕای هەڕەشەکانی دەوڵەتی عێراق، کوردەکان ئازایانە بەرەو داهاتوویەکی دیموکراتیك هەنگاو هەڵدەگرن . هەتا کاتێك رژێمی

سەدام حوسەین لە عێراق دەسەڵاتدار بێت خەڵکی کورد لەگەڵ مەترسی سـەرکووتی زۆرتـر بـەرە ورووە دەبێ . داوا لە هاوکارانم دەکەم دەنگیان بخەنە پـاڵ دەنگـی مـن بـۆ پـشتیوانی کـردن لـەم بڕیارنامەیە.

بەڕێز " گیلمان" :

جەنابی سەرۆك من پشتیوانی دەکەم لە بڕیارنامەی ٢٩٩ کە هەستی کـۆنگرێس دەردەبڕێـت بـە نیسبەت کوردەکانی باکووری عێراق . هەروەها سۆپاسی بەڕێز بیلبرەی نوێنەری ئەیالەتی نڤـادا ، بەڕێز سۆلارز نوێنەری ئەیالـەتی نیۆیـۆرك و بـەڕێز هـامیلتۆن ، نوێنـەری ئەیالـەتی ئینـدیانا و سەرۆکی هێژای کۆمیسیۆنی کاروباری دەرەوەی ئۆرووپا و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ئەندامی هێژای کۆمیتەی کەمینە ، بـەڕێز "برامفیلـد"، نوێنـەری ئەیالـەتی "میـشیگان" دەکـەم بـە بۆنـەی یارمەتییە زۆر بەرچاوەکەیان لەم پەیوەندییەدا.

بارودۆخی کوردەکان هەندێ سەرنجی پێدراوە بەڵام بە بۆچوونی من هێشتا هەر کەمە.

جەنابی سەرۆك روونە کە شالاّوی دابینکردنی ئاسایش پێویستە بەردەوام بێت بۆ ئەوەی پـێش لـە هێرشەکانی دەوڵەتی سەدام بۆ سەر کوردەکانی باکووری عێـراق بگیردرێـت . مـن لـە سـەر ئـەو باوەڕەم دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵ بدات رێکەوتننامەی ئەمریکا و تورکیا کە لـە ژوئەنی ١٩٩٢ کۆتایی پێدێت درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی بنکە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری تورکیا کار بکەن بۆ ئامانجەکانی شالاّوی دابینکردنی ئاسایش .

جەنابی سەرۆك نەتەوە یەکگرتووەکان و هەموو کۆمەڵگای نێونەتەویی دەبێ گوشار بخەنـە سـە ر دەوڵەتی چەپەڵی سەدام تا گەمارۆ ئابوورییەکانی سەر باکووری عێراق هەڵگرێت .

بەڕێز "سۆلارز":

جەنابی سەرۆك سپاسی سەرۆکی هێژای کۆمیسیۆنی ئۆرووپا و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دەکـەم بـە بۆنەی خستنەڕووی ئەم بڕیارنامەیە، هەروەها سپاسی دۆستی زۆر بەڕێزم "بیلـبرەی" دەکـەم کـە یارمەتی داوە بە دارشتنی ئەم بڕیارنامەیـە . هـەروەها سپاسـی بـەڕێزان"برامفیلـد"، نوێنـەری

ئەیالەتی "میشیگان" ، ئەندامی ناتاسایی کۆنگرێس، خاتوون "ماییرز" [1] ، نوێنەری ئەیالەتی "کانزاس "، بەڕێز" بیرۆتێر"" [2] ، نوێنەری ئەیالەتی "نیبراسکا"، بەڕێز" "پۆرتێر"" نوێنەری ئەیالەتی "ئیلۆنوێز" ، بەڕێز "گیلمان"، نوێنەری ئەیالەتی " نیویۆرك" و کۆمەڵێك لە دۆستانی دیکە دەکەم کە پشتیوانیان لەم بڕیارە کردووە .

جەنابی سەرۆك ئەم بڕیارنامەیە گرینگییەکی بەرچاوی هەیە و بە بیروبۆچوونی من دو راستی زۆر گرنگ لە بەشێك لە جیهان لە خۆ دەگرێت: یەکەم ئەوە کە سەدان هەزار کورد ئێستا لە باکووری عێراق دەژین کە ئاسایش و ئەمانەت ژیانیان دەکەوێتە مەترسی ئەگەر شالاوی داینکردنی ئاسایش لە مانگی ژۆئەن کۆتایی پێبێت .

چەند مانگ پێش من لە عێراق بووم و هەلی ئەوەم بۆ رەخسا بە چاوی خۆم ئەو ئەهامەتیە گەورانە ببینم کە سەدام لە دەیەی ۱۹۸۰ بە سەرخەڵکی کورددا هێناویە . هەزاران گوند کە چەند سەدە لەمەوبەر دروستکراون خاپور کراون . چەکی کیمیایی ئەتەنها لە هەڵەبجە (کە چەند هەزار کەسی تێدا کوژرا) بەڵکوو لە گەلێ لە گوندەکانی دیکە کەڵکی لێوەرگیراوە . هیچ گومان لەوەدا نییە ئەگەر شالاوی داینکردنی ئاسایش کۆتایی پێبێت و نەتەوە یەکگرتووەکان لە ناوچە بکشێتەوە و هێزە هاوپەیمانەکان چالاکی نەکەن لە ناوچە، سەدام جارێکی دیکە دژی کوردەکان دەست بە جموجۆڵ دەکات و ئەگەر شتێکی وا رووبدات جارێکی دیکە دەیان هەزار و لەوانەیە سەدان هەزار کەس ئاوارە بن و ژمارەیەکی زۆر گیانی خۆیان لە دەست بدەن .

کەوابوو ئامانجی ئەم بڕیارنامەیە گرنگیەکی مرۆڤایەتی یەکجار زۆری هەیە بەڵام راستیەکی گرنگی دیکەش لە خۆ دەگرێت، ئەویش ئەوەیە کە چارەسەر کردنی هەرکێشەیەك لەکەنداوی فارس پێویستی بە هاوکاری بەردەوامی تورکیا هەیە . ئەگەر تورکیا نەبوایا، سەپاندنی گەمارۆی کاریگەر لە سەر عێراق پاش داگیر کرانی کوێت نەدەلوا، لە بەر ئەوەی کە تورکیا بۆری نەوتی

---

[1] Mrs. MEYERS
[2] Mr. BEREUTER

عێراقی پچڕاند كه له خاكی ئەو وڵاتەوە دەربـاز دەبـوو . هـەروەها توركیـا بەتـەواوی هاوكـاری ئێمەی كرد له كاتی شەڕ و تیمكانی ئەوەی بۆ ئێمە رەخساند كه لـه كـاتی شـاڵاوی دابینكردنـی ئاسایش له خاكی توركیاوە هێرش بكەینە سەر عێراق. ئەگەر توركیا خـاكی خـۆی نـەدابایا بـە ئێمە ، بەڕێوەچوونی شاڵاوی دابینكردنی ئاسـایش نـەدەلوا . كـەوابوو رەزامەنـدی توركیـا زۆر گرنگە ، هەر بۆیە ئەم بڕیارنامە نەتەنها داوای له ئەمریكا كردووە هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی توركیا بۆ درێژە پێدانی شاڵاوی دابینكردنی ئاسایش، بەڵكوو راستەوخۆش داوای لـە دۆستە توركەكانمان كردووە كه رازی بن بە بەردەوام بوونی ئەم شاڵاوە . هیوادارم توركیا درێژە بـە هاوكارییەكانی بدات لەم پەیوەندییەدا و له سەر ئەو بڕوایەم ئەگەر ئێمە بتوانین پێكەوە كاربكەین ، دەتوانین تیمكانی ئەوە بڕەخسێنین كه كوردەكان له سالّی داهاتوودا ئاسایشان هەبێ. كوردەكـان له مێژووی ئەشكەنجەو چەوساندنەوەی جیهاندا له هەموو كەسێك زۆرتر قوربانیان داوە .

بەڕێز" برامفیلد ":

جەنابی سەرۆك بێ سەرەوبەرەیی بەردەوامی باكووری عێراق و بارووDۆخی یەكجار مەترسیداری كوردەكانی عێـراق هـەموومانی ترسـاندووە . سـەدام نیـازی خـۆی دەربڕیـوە بـۆ تەمیـەكردنی كوردەكان له بەر ئەوەی كه وەفادار نەبوونە بە رژێمە دلڕەقەكەی و تـەنها شـتێك كـە رێگـرە لـە بەردەم سەدام بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، هەوڵە فریاگوزارییە نێونەتەوەییەكانـە كـە لـە چوارچێـوەی شاڵاوی دابینكردنی ئاسایشدا بەڕێوە دەچێت. بەڵام هەروا كه هاوكارانم ئاماژەیان پێكرد ، ماوەی ئەم شاڵاوە بەرەو كۆتایی دەچێت. هێزە ئاشتیپارێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان كه وەك قەڵغان له بەرامبەر سەدام راوەسـتاون لەوانەیـە بـەم زووانـە لـە ناوچـە بكـشێنەوە . ئەگـەر كۆمـەڵگای نێونەتەوەیی لەم ساتە وەختەدا كوردەكان بەتەنیا بهێڵێتەوە بـە بیروبۆچـوونی مـن دەتـوانین بـە دروستی پێشبینی ئەوە بكەین كه چییان بە سەر دێت ، دەسـەڵاتی تـرۆر چـاوەڕوانیانە و دەبێتـە مۆتەكەیەك بۆیان .

بڕیارنامــەی ۲۹۹ی کـۆنگرێس هــەوڵ دەدات پــێش لــەم ڕووداوە بگرێــت و هەســتی کـۆنگرێس دەردەبڕێت سەبارەت بەوەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبـێ کـاتی شـاڵاوی دابینکردنـی ئاسایش درێژ بکاتەوە و لەگـەڵ دەوڵـەتی تورکیـا کـار بکـات بـۆ ئـەوەی هەوڵـە فریاگوزارییـە نێونەتەوەییەکان لە باکووری عێراق بەردەوام بێت . شایانی ئاماژە پێکردنە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێت هەروا بە سادەیی سرووشتی دزێوی ڕژێمی عێراق و بێ بەرگەیی خـەڵکی کـورد لە بیر بکات . هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە ئەم بڕیارنامە لە کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی کۆنگرێس بە تەواوی پێداچوونەوە کراوە بۆ ئەوەی زیان نەگەیەنێت بە یەکپارچەیی خاکی وڵاتـانی ناوچە . هەروەها لەگەڵ سیاسـەتی وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا هاوتەریبــە و نیگەرانییــە ڕەواکانی دەوڵەتی تورکیای بــە نیــسبەت بزووتنــەوەی جیــاییخوازی کــورد ڕەچــاو کــردووە. ئــەم گۆڕانکارییە زمانی بڕیارنامەکەی بە هێزتر کردووە و ئیمکانی ئەوەی بردووەتە سەر کە دەوڵـەتی تورکیا وەڵامی ئەرێنی پێبداتەوە .

جەنابی سەرۆك ئەم بڕیارنامە گرنگە بە بێ هەوڵی بەڕێز" بیلبرەی" لە ئەیالەتی "نڤادا" ئامـادە نەدەبوو . سپاسی سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئۆرووپـا و ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت ، بـەڕێز هـامیلتۆن و سەرۆکی کۆمیـسیۆنی مـافی مرۆڤ و ڕێکخراوە نێونەتەوەیەکان ، بەڕێز یارتۆن دەکەم کە بـە پەلـە ئەم بڕیارنامەیەی خستە ڕوو . هەروەها دەبێت ئاماژە بە یارمەتی بەرچاوی بەڕێز " گیلمـان" ، نوێنەری ئەیالەتی"نیۆیۆرك" و بەڕێز "برامفیلد"، نوێنەری ئەیالەتی" میـشیگان " بکـەم بـۆ ئامـادە کردنـی ئـەم بڕیارنامەیــە. بڕیارنامــەی ۲۹۹ پێویــستی بــە هــەوڵی هــەر دوو حیــزب ( کۆماریخواز و دیمۆکرات) هەیە .

بەڕێز "بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك دەمەوێت سپاسی سەرۆك "هامیلتۆن" ، سەرۆك "سۆلارز "، سەرۆك" فاسکال" و کۆنگریسمەن " گیلمان" بکەم کە لەم هەوڵەدا یارمـەتی ئێمـەیان دا کـە ئامـانجی پاراسـتنی کوردەکانە بۆ ئەوەی سەرەنجام ئەم پەیامە بە حکوومەتی عێراق بگەیەنین کـە دەوڵـەتی ئـەمریکا

دەیەوێت بەڵێنەکانی خۆی بە نیسبەت کوردەکان جێبەجێ بکات . ساڵی پار میلیۆنێك کورد کە زۆرتر ژن و منداڵ بوون و تەنها برسێتی و سەرما و سۆڵەیان دەناسی ، ئاوارەی سنووری عێراق و تورکیا بوون بۆ ئەوەی خۆیان لەو ژینۆسایدە رزگار بکەن کە سەدام بە نیاز بوو بە سەریان بهێنێت . ساڵی پار ئێمە ئەم گەلە کەونار و بەشەرەفەمان هاندا تا لە رووخاندنی سەدامدا یارمەتیمان بدەن و کاتێك کە رووداوەکان وەك پێویست نەچووە پێش ، دەوڵەتی ئێمە کوردەکانی لە بەرامبەر گورگەکانی سوپای عێراق بە تەنیا هێشتەوە و تەنها لە رێگای دەستێوەردانی نەتەوە یەکگرتووەکان و شالاوی دابینکردنی ئاسایش بوو کە ئێمە توانیمان پێش لە کۆمەڵکوژی کوردەکان بە دەستی سوپای سەدام بگرین .

بەڵام جارێکی دیکەش کات بەرەو کۆتایی دەچێت . بەم زووانە کات کۆتایی پێدێت و ئەم خەڵکە جارێکی دیکە تەنیا دەمێننەوە و هێچ کەس نییە بیانپارێزێت و لەگەڵ سوپای تەیارتری عێراق بەرەورِوو دەبنەوە . برِیارنامەی ۲۹۹ی کۆنگرێس هەنگاوی ئەرێنی هەڵگرتووە ( کە حکوومەتی ئەمریکا چەند مانگە خۆی لێدەبوێرێت) بۆ پاراستنی ئەو کەسانەی کە لە کاتی تەنگانەدا یارمەتی ئێمەیان دا و داوا لە رێکخراوی نێونەتەوەیی پەیوەندیدار واتا نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات دەوری ئاشتیپارێزی خۆی لە ناوچە درێژە پێبدات .

ئێمە داوای یارمەتی مادی ناکەین ، داوای ناردنی سەرباز بۆ ناوچە ناکەین ، بەڵکوو داوا لە رێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەین جارێکی دیکە سەرپەرەشتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بکات بۆ درێژەپێدانی پاراستنی کوردەکان کە زۆر زۆر پێویستە.

من لەم هەلە کەڵك وەردەگرم و پیرۆزبایی لە کوردەکان دەکەم کە دوو هەفتە پێش هەلیان قۆزتەوە و ئاوات و ئارەزووە دیمۆکراتەکانی خۆیان دەربری و هەڵبژاردنێکی ئازادیان بەرێوەبرد بە بێ ساختەکاری و توندوتیژی . دەمەوێت ئاماژە بە کۆمەڵێ وتاری پارێزگاری پێشووی" نڤادا" ، بەرێز "مایك ئۆکالاهان" بکەم کە پاش چاودێری کردنی ئەم هەڵبژاردنە نووسیویەتی. ئەم نووسراوانە نەتەنها خوێندنەوەیەکی راست لە سەر توندوتیژی و نەهامەتی لە جیهانی

دەوروبەرمان دەخەنە روو بەڵکوو هیواکانیشمان پێ نیشان دەدەن . لەم نووسراوانە و راپۆرتەکانی دیکەدا روون دەبێتەوە کە خەڵکی کورد چاویان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە و ستایشی دەکەن .

با ئیمە بەڵێنەکانمان بەجێ بهێنین و داوا لە حکوومەتی ئەمریکا بکەین سەرەنجام هەڵوێست بگرێت بۆ پشتیوانی کردن لە کوردەکان . ئەم گەلە بەشەرەفە پێشتر سەلماندوویەتی کە تامەزرۆی دیمۆکراسییە و خوازیاری ئاشتی درێژخایەنە لە ناوچەدا. با داوا لە دەوڵەتی ئەمریکا بکەین بەڵێنەکانی خۆی لە بەرامبەر ئەم گەلە جێبەجێ بکات. با دڵنیابین لەوەی کە ئەوەی کە بە سەر کوردەکاندا هاتووە ، بە سەر خەڵکی ئەمریکادا نەهاتووە.

کوردەکان پێویستیان بە هەرێمێکی دیموکراتیك و بەئازادی هەڵبژێردراو هەیە واتا هەرێمێکی خودموختار لە چوارچێوەی عێراقدا . ئێمە دەبێ پشتیوانی خۆمانیان پێ نیشان بدەین . سپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە پشتیوانی خۆیان لە خەڵکی کورد دەربڕیوە .

بەڕێز "پۆرتێر" :

جەنابی سەرۆك کۆمیتەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس کە من یەکێ لە سەرۆکەکانی بوومە لە ماوەی ١٠ساڵی مێژووی خۆیدا هەمیشە سەرەنجی بە کوردەکان داوە و نیگەرانیان بووە . ئەم هۆگرییە چ پێش لە شاڵاوی گەردەلوولی بیابان وچ پاش ئەوە هەر هەبووە.

چەند ساڵ پێش ئێمە" دانیل میتران"، خانمی یەکەمی فەرانسامان بانگهێشت کرد بۆ واشنگتۆن بۆ بیستنی نیگەرانییەکانی سەبارەت بە خەڵکی کورد و رەفتاری خراپی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان تێیدا دەژی . هەڵاواردن و چەوساندنەوەی کورد لە هەموو ئەم وڵاتانەدا هەیە بەڵام لە عێراق زۆرترە لە بەر ئەوەی کە سەدام بە چەکی کیمیایی هێرشی کردووەتە سەریان و هەزاران کەسی لێ کوشتوون و لە سەراسەری ئەم قۆناخەدا لەگەڵ هەڵاواردن و چەوساندنەوەی یەکجار دژواری دەوڵەتی عێراق بەرەڕوو بوونە .

هەڵبژاردن لە باكووری عێراق بەڕێوە چوو. ئێمە ستایشی بوێری و ئازایەتی كوردەكان دەكەین بۆ هەڵگرتنی ئەم هەنگاوە بەڵام پشتیوانی ئێمە لەم خەڵكە دەبێ بەردەوام بێ و دەبێ بیانپارێزین و ئەم بڕیارنامەیەش ئێمە بەرەو ئاراستەیەكی راست دەبات . تكا دەكەم كۆنگرێس پەسەندی بكات.

جەنابی سەرۆك مێژوو غەدری زۆری لە كورد كردووە . بە درێژایی چەند سەدەیە كە كوردەكان لە ناو دۆزەخێكی ئەتنیكیدا دەژین و بە سەر ٤ دەوڵەتدا دابەشكراون و ئەم دەوڵەتانە نەیانهێشتووە كوردەكان خواستی سیاسی خۆیان دەربڕن . لە كاتی ناسەقامگیری سیاسی و سەربازی ، كوردەكان بە دەستی رێبەرایەتی ئەم دەوڵەتانە(كە لەوە دەترسان كوردەكان راپەڕین بكەن و خوازیاری ئۆتۆنۆمی یا سەربەخۆیی بن ) بە شێوازێكی دڕندانە سەركووت كراون. دوایین لاپەڕەی بە سەرهاتی خەمباری كورد شەڕی كەنداو بوو . دوابەدوای هەرەسهێنانی سەدام حوسەین بە دەستی سوپای وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا سەدام هێزەكانی خۆی نارد بۆ باكووری عێراق تا راپەڕینی كورد تێكبشكێنن .

بە یارمەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و نەتەوە یەكگرتووەكان، دەستدرێژی سەدام بۆ سەر كوردەكان كۆنترۆڵ كرا و لە رێگای شاڵاوی دابینكردنی ئاسایش ، یارمەتی كوردەكان درا . لەمە زیاتر هەرێمێكی پارێزراو لە باكووری عێراق لە هێڵی ٣٦ درووست كرا بۆ دابینكردنی ئاسایشی كوردەكان . ئەم هەرێمە لە لایەن چاودێرانی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە دەپارێزرێ . لەمە زیاتر دەوڵەتی توركیا رەزامەندی خۆیی دەربڕیوە بۆ ئەوەی هێزەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە بنكەكانی باشووری توركیا كەڵك وەر بگرن بۆ یارمەتیدانی كوردەكان . بەداخەوە رێككەوتننامەی نێوان وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و توركیا لەم بارەیەوە و رێككەوتننامەی نێوان توركیا و نەتەوە یەكگرتووەكان لە باشووری عێراق لە مانگی ژۆئەنی ١٩٩٢ كۆتایی پێ دێت . بڕیارنامەی ٢٩٩ داوا لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكات ئەم رێككەوتننامەیە لە

گەڵ توركیا درێژ بكاتەوە و هەروەها داوا لە نەتەوە یەكگرتووەكان دەكات درێژە بە چالاكییەكانی خۆی بدات لە باكووری عێراق .
جەنابی سەرۆك نابێ كوردەكان لە بیر بكرێن . ئەگەر وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و نەتەوە یەكگرتووەكان پشت لە كورد بكەن ، دەستی سەدام بۆ پێشێل كردنی مافی كوردەكان ئاوەڵا دەبێت كە هەموو دەزانین دەتوانێ پێشێلی بكات. تكا لە ئەندامانی كۆنگرێس دەكەم پشتیوانی لە بڕیارنامەی ٢٩٩ بكەن كە بۆ پشتیوانی لە مافی كوردەكان ئامادە كراوە .
بەڕێز "فاسكاڵ" :
جەنابی سەرۆك منیش پشتیوانی لە بڕیارنامەی ٢٩٩ دەكەم كە پەیوەندی بە كوردەكانی باكووری عێراقەوە هەیە . خۆشحاڵم كە یەكێ لە پشتیوانە سەرەكییەكانی ئەم بڕیارنامەیە بووم و سپاسی ئامادەكاری ئەم بڕیارنامەیە، نوێنەری هێژای ئەیالەتی نڤادا، بەڕێز بیلبرەی دەكەم بۆ هەوڵەكانی بۆ سارێژكردنی ئێش و ئازارەكانی كوردەكان. هەروەها سپاسی سەرۆكی هێژای كۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ و رێكخراوە نێونەتەوەییەكان، بەڕێز "یارتۆن" و سەرۆكی كۆمیسیۆنی ئۆرووپاو رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەڕێز "هامیلتۆن" دەكەم بۆ ئەو هەوڵانەی كە دایان بۆ ئەوەی ئەم بڕیارنامەیە ئەمڕۆ لە كۆنگرێس بخرێتە روو .
جەنابی سەرۆك ئەم دوو رێككەوتننامەیە دەبێ درێژ بكرێنەوە . ژیانی هەزاران كورد كە بە دەستی رژێمی دڕندەی سەدامی دیكتاتۆر نەهامەتی زۆریان بینیوە ، گرێدراوە بە بەردەوام بوونی چالاكیەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان لە باكووری عێراق( بۆ پاراستنی كوردەكان )و مانەوەی هێزە هاوپەیمانەكان لە بنكەكانی توركیا . ئێمە نابێ رێگە بەوە بدەین سەدام جارێكی دیكە سەرەڕۆیی خۆی بە سەر ئەم خەڵكە بێ پاراستنەدا بسەپێنێت ، بڕیارنامەی ٢٩٩ بۆ ئەم مەبەستە ئامادە كراوە .
جەنابی سەرۆك كوردەكانی عێراق مانگی پێشوو هەنگاوێكی گرنگیان هەڵگرت بۆ خستنەرووی ئامانجە دیموكراتیكەكانیان واتا ئەوكاتە كە لە بارودۆخێكی دژواردا هەڵبژاردنێكی ئازاد و

دیموکراتیان بەڕێوە برد . ئێمە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ڕێزگرتن لـە مـافی مـرۆڤ و چاکسازی دیمۆکراتیکمان کردووە بە بەردی بناخەی سیاسـەتی دەرەوەی دەوڵەتەکـەمان ، نـاتوانین ئەوکەسانە بە تەنیا بهێڵینەوە کە بۆ مافەکانیان خەبات دەکەن و لە مەترسییەکی گەورەدان. ئێمە دەبێ پشتیوانی لە کوردەکان بکەین و بیانپارێزین . تکا لە هاوکارانم دەکەم بە تێکڕای دەنگ ئەم بڕیارنامەیە پەسەند بکەن.

بەڕێز "یارتۆن" :

جەنابی سەرۆك ، بڕیاربڕیارنامەی ٢٩٩ هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت بە نیسبەت ئەوەی کە دەبـێ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ماوەی شالاّوی دابینکردنی ئاسایش لە باکووری عێراق و مانەوەی هێـزە هاوپەیمانەکان لە بنکەی باشووری تورکیا درێژ بکاتەوە .

شالاّوی دابینکردنی ئاسایش کـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان ئـەنجامی دەدات ، ئاسـایش، خـۆراك و سەرپەنا بۆ هەزاران کوردی ئاوارە دابین دەکات کە ئێستا لە باکووری عێـراق و تورکیـا دەژیـن . کاتێك کە هێزەکانی عێراق بە شێوازێکی دڕندانە ڕاپەڕینی کوردەکانیـان سـەرکووت کـرد ئـەم ئاوارانە ناچار کران لە شوبات و مایسی ١٩٩١ زێدی خۆیان بە جێ بهێڵن.

شالاّوی دابینکردنی ئاسایش هەتا ڕادەیەك سەرکەوتوو بووە لە پاراستنی کوردەکان لە بەرامبـەر هێرشەکانی عێراقدا. تورکیا ڕێگەی داوە بەوە کە هێزەکـانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە خـاکی تورکیا بنکە دابمەزرێنن و بـە هێـزی ئاسمـانی کوردەکـان بپـارێزن و کۆمیـسیۆنی بـالاّی نەتـەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران بەڕێوەبردنی کەمپەکان بگرێتە دەست .

بە هەر حاڵ ڕێککەوتننامەی بوونی بنکە سەربازییەکانی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە تورکیا و ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە گەڵ عێراق بۆ بەڕێوەبردنی کەمپی ئاوارەکـان لە مانگی حوزەیران کۆتایی پێدێت . ئێستا دەوڵەتی تورکیا سەرقاڵی تاوتوێ کردنی ئەوەیـە کـە ئایا ئەم ڕێککەوتننامەیە لەگەڵ وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا پـاش مـانگی حـوزەیران درێـژ بکاتەوە یا نا . کۆمیسۆنی بـالاّی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـۆ کاروبـاری پەنابـەران بـەم زووانـە

بەرپرسیارییەتیەكانی خۆی سەبارەت بە بەڕێوەبردنی كەمپەكان دەخاتە ئەستۆی UNICEF كە ئەویش دەبێ رێككەوتننامەیەكی نوێ لە گەڵ دەوڵەتی عێراق واژۆ بكات بۆ بەردەوام بوونی مانەوەی نەتەوە یەكگرتووەكان لە هەرێمی پارێزراو . ئەم بڕیارنامەیە داوا لە هەموو لایەنەكان دەكات چالاكییەكانیان درێژە پێ بدەن و داوا لە حكوومەتی عێراق دەكات كۆتایی بە گەمارۆ ئابوورییەكانی لە سەر باكوور بێنێت. دەوڵەتی عێراق بەرپرسیارە لەبەرامبەر چەوساندنەوەی بەرفراوانی هەزاران سڤیلی كورد .

جەنابی سەرۆك هاوكات لەگەڵ ئەوە كە بەردەوامبوونی شالاوی دابینكردنی ئاسایش یەكجار پێویستە بەڵام روونە هەتا كاتێ كە سەدام لە سەر دەسەڵات بێت ، كوردەكان لە دەستی هێرشەكانی دەوڵەتی عێراق ئاسایشیان نابێت . ئەم بڕیارنامەیە لەگەڵ سیاسەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەگونجێت و ئیدارەی ئەمریكا ئێمەی ئاگادار كردووەتەوە كە هیچ كێشەیەكی لەگەڵ ئەم بڕیارنامەیە نییە. داوا لە هاوكارانم دەكەم دەنگ بدەن بەم بڕیارنامەیە .

***

## بڕیارنامەی ٢٩٩ی كۆنگرێس

- بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە دەوڵەتی عێراق بە شێوەیەكی دڕندانە راپەڕینی كوردەكانی لە شوبات و مایسی ١٩٩١ سەركووت كردووە و سەدان هەزار كوردی ئاوارەی توركیا كردووە
- بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە ئەم شەپۆلە ئاوارەییە كتووپڕ و بەرفراوانە بەرەو توركیا ئاوارەكانی لەگەڵ مەترسی مەرگ رووبەڕوو كردووەتەوە لە ئەنجامی كەمی خێوەت، خۆراك ، دەواو دەرمان و ئاوی خاوێن
- بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە كە باشترین رێگاچارە بۆ ئەم قەیرانە مرۆڤییە ، هاندانی كوردەكانە بۆ گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان لە باكووری عێراق لە رێگای درووست كردنی هەرێمێكی هێمن لە باكووری عێراق كە لە بەرامبەر هەموو چەشنە هێرشێك بپارێزرێت

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لـە وەڵامـی پێداویـستیە یـەکجار زۆرەکـانی کوردەکـان ، وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرپەرشتی "شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش"ی کردووە کە تێیـدا وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکانی دیکـە یارمەتیـدانی کوردەکانیـان هـەم لـە نـاو تورکیا و هەم لە " ناوچەی پارێزراو" لە باکووری عێراق گرتووەتە ئەستۆ .

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە لە حوزەیرانی ۱۹۹۱وە کۆمیسیۆنی باڵای نەتـەوە یـەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران هێشتا لە بـاکووری عێـراق چـالاکییەکانی درێـژە پێـدەدات ، لەوانـە بـە هەزاران ڕێکخراوی ناحکوومی و سەدان گاردی سەر بە نەتەوە یـەکگرتووەکان سـەرقاڵی چـالاکی فریاگوزارین

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کۆمیسۆنی باڵای نەتەوە یـەکگرتووەکان بـۆ کاروبـاری پەنابـەران ئێستا سەرقاڵی وتووێژە لەگەڵ سندووقی منداڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوەکانی دیکەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان لە باکووری عێراق

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە" یادداشـتنامەی لەیـەك تێگەیـشتنی" نێـوان عێـراق و نەتـەوە یەکگرتووەکان بۆ مانەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە حوزەیرانی ۱۹۹۲ کۆتایی پێ دێت

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە کەمی خۆراك لە هـەرێمی پـارێزراو (کـە لـە ئـەنجامی گـەمارۆی ئابووری دەوڵەتی عێراق دروست بووە) وای کردووە کە هەوڵە فریاگوزارییـە نێونەتەوەییـەکان زۆر پێویست بێت بۆ پێشگیری لە قاتوقڕی لە نێوان دانیشتووە کوردەکان

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە بڕیارە دڵخۆشکەرەکەی دەوڵەتی تورکیا بۆ ڕێگەپێدان بە مانەوەی بنکەی سەربازییەکانی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە باشـووری تورکیـا زۆر پێویـستە بـۆ سەرکەوتنی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش ، سەرەڕای ئەوەی کە لەوانەیە عێراق تۆڵەی ئـەم کـارە لە تۆرکیا بسێنێتەوە

ـــ بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە هێشتا پێویستە شاڵاوی دابینکردنی ئاسـایش بـۆ وەڵامدانـەوەی هێرشەکانی عێراق بۆ سەر کوردەکان لە هەرێمی پارێزراو لە باکووری عێراق بەردەوام بێت

ـ به لەبەرچاو گرتنی ئەوه که ڕێکەوتننامەی نێوان وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و تورکیا بۆ مانەوەی بنکه سەربازییەکانی ئەمریکا له باشووری تورکیا له ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٩٢ کۆتایی پێدێت

ـ به لەبەرچاو گرتنی ئەوه که ئەگەر ئەم ڕێکەوتننامەیه درێژ نەکرێتەوه و شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش کۆتایی پێبێت ، ئەگەری ئەوه زۆره که هێزەکانی عێراق هێرش بکەنه سەر هەرێمی پارێزراو و له ئەنجامدا ژمارەیەکی بەرچاو له خەڵك بکوژن و لەوانەیه شەپۆلێکی دیکەی ئاوارەبوون بەرەو تورکیا درووست بێت .

کەوابوو کۆنگرێس بڕیاری دا که:

١ـ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ هەوڵ بدات بۆ درێژکردنەوەی ڕێکەوتننامەی حوزەیرانی ١٩٩٢ که ڕێگا بەوه دەدات بنکه سەربازییەکانی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له باشووری تورکیا دابمەزرێت بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش .

٢ـ دەوڵەتی تورکیا دەبێ وڵامی ئەرێنی بداتەوه به داواکاری وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ درێژکردنەوەی ئەم ڕێکەوتننامەیە. ڕەزامەندی تورکیا شەرته بۆ بەردەوام بوونی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش .

٣ـ مانەوەی نەتەوه یەکگرتووەکان له باکووری عێراق دەبێ درێژ بکرێتەوه

٤ـ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەبێ یەکەمین هەوڵیان ئەوەبێ قەناعەت به دەوڵەتی عێراق بهێنن گەمارۆ ئابوورییەکان له سەر باکووری عێراق هەڵگرێت .

٥- بۆ باشترکردنی بارودۆخی کوردەکانی عێراق، وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژه بدات به پشتیوانی کردن له یەکپارچەیی و سەروەری سەرجەم وڵاتان و مافی سەرجەم خەڵکی ناوچه به فەرمی بناسێت.

## چەتری پاراستنی کوردەکان درێژ بکەنەوە

## ٣ی حوزەیرانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران

بەرێز " پێڵ ":

جەنابی سەرۆك ئەم چەند هەفتەی داهاتووە ، قۆناخێکی زۆر گرنگ دەبیت لە مێژووی گەلی کورد . دوابەدوای هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییانەی پارلمانی کوردستانی عێراق ، کوردەکان لەگەڵ رێگایەکی ئەستەم رووبەڕوو دەبنەوە لەبەر ئەوەی هەوڵ دەدەن دەستکەوتە دیمۆکراتیکەکانی خۆیان پتەو بکەن و بە هەر حاڵ ئەم ئەرکەی ئەوان قورستر دەبێت لەبەر ئەو راستییە کە شالاوی دابینکردنی ئاسایش (کە هێزە هاوپەیمانەکان بۆ پاراستنی کورد لە هێڵی ٣٦ لە باکووری عێراق ئەنجامیان داوە) لە کۆتایی ئەم مانگە کۆتایی پێدێت .

شالاوی دابینکردنی ئاسایش رزگاریدەری کوردە . بێ پاراستنی نێونەتەوەیی کوردەکان جارێکی دیکە لەگەڵ سەرکوتی رژێمی سەدام رووبەڕوو دەبنەوە و ئەزموونەکانی پێشوو نیشانی داوین مانای ئەمە چییە، بە مانای سەرکوت و ئەشکەنجەی هێزە ئەمنییەکانی سەدام حوسەینە، مانای ئەوەیە ژنانی کورد لە گەڵ دەستدرێژی بەرپرسانی هێزە ئەمنیەکان رووبەڕوو دەبنەوە، مانای ئەوەیە جارێکی دیکە بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکرێتەوە سەر، مانای ئەوەیە جوان و پیری کورد ، سیاسی و ناسیاسی ، جارێکی دیکە بێ سەروشوێن دەکرێنەوە . ئەم کردەوە قێزەون و دزێوانە هەموو راستن و زیادەرۆیی تێدا نییە .

ئەم کردەوانە هەرچەندە بۆ مرۆڤ باوەڕپێنەکراون بەلام راستن لە بەر ئەوەی کە هێزەکانی عێراق چەوساندنەوە و ئازار و ئەزیەتدانی کوردەکانیان لە سەر شریتی ڤیدیۆ ، کاغەز و شریتی تەجیل تۆمار کردووە . هەر ئەم مانگی رابردووە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران لە هەوڵێکدا بەشداری کردووە بۆ گوازتنەوەی هەندێ لەم بەلگەنامانە بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە پێکهاتبوو لە چەند تەن بەلگەی کاغەز و شریتی تەجیل و شریتی ڤیدیۆ .

لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی لەسەر هەندێ لەم بەڵگەنامانە کە ئێستا لە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە دەپارێزرێن ، کردەوە ترسناکە بەزمان نەهاتووەکانی هێزەکانی عێراق دژی کوردەکان نیشان دەدات کە بە شالآوی ئەنفال ناسراوە . لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلتر لەسەر ئەم بەڵگەنامانە لە داهاتوودا دەتوانێت بنەمایەك درووست بکات بۆ دادگایی کردنی سەدام حوسەین و هێزەکانی بەتاوانی ژینۆساید و تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی. ئێمە دەبێ درێژە بە پاراستنی ئاسمانی کوردەکان بدەین ، نەتەنها بۆ ئەوەی نەهێڵین تووشی سەرکوتێکی هۆڤانەی دیکە ببنەوە بەڵکوو بۆ ئەوە کە یارمەتیشیان بدەین دەستکەوتەکانی ئەزموونە دیمۆکراتیکەکەیان ببینن .

مانگی رابردوو ٥ میلیۆن کوردی عێراق بە شێوازێکی نموونەیی دەنگیان دا بۆ هەڵبژاردنی رێبەرایەتیەکی یەکگرتوو . هەرچەندە کە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە درزێکی لە نێوان دوو حیزبە سیاسیە سەرەکییەکەی کوردستانی عێراق درووست کرد بەڵام ئەزموونێکی دیموکراتیکی ئاناسایی بوو لە بەرامبەر دیکتاتۆری و سەرەرۆیی کە یارمەتی بە بانگەشەی ئۆتۆنۆمی کوردەکانی عێراق دەدات .

لە مانگی نیسان، من و ٦ کەس لە هاوکارانم لە ئەنجوومەنی پیران نامەیەکمان بۆ سەرۆك بوش نووسی کە تێیدا داوامان کرد ئەمریکا درێژە بە پاراستنی کوردەکان و شیعەکانی عێراق بدات. ئەمە دەقی ئەم نامەیە و وەڵامی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، بەڕێز سکۆکرافت ـە:

ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا

کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە

واشنگتۆن دی دسی ،٢٤ی نیسانی ١٩٩٢

کۆشکی سپی

بەڕێز جەنابی سەرۆك کۆمار :

ئێمە دەمانەوێت نیگەرانی قووڵی خۆمان دەرببڕین بە نیسبەت بارووددۆخی عێراق به تایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ ئاسایشی کوردەکان له باکوور و موسڵمانه شیعەکان له باشووری عێراق .

ئەم دواییانه کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران ، کۆبوونەوەیەکی بەڕێوەبرد بۆ تاوتوێکردنی بەڵگەنامەکانی پەیوەندیدار بە کۆمەڵکوژی رژێمی سەدام حوسەین له عێراق کە تێیدا بەڵگەنامەکان و راپۆرتەکانی پەیوەندیدار بە کۆمەڵکوژی خەڵکی سڤیلی کوردی عێراق ، بە تایبەت لەم چەند ساڵی رابردووە تاوتوێ کرا. لەم کۆبوونەوەیەدا بەڵگەنامە فەرمییەکانی عێراق و شایەتی پسپۆڕان و ئاکامی لێکۆڵینەوەی خودی کۆمیتە لەم ناوچەیە خرایە روو . ئەم بەڵگەنامانە نیشان دەدەن بە گشتی ۲۰۰ هەزار تا ۳۰۰ هەزار کوردی عێراقی کوژراون و بێ سەروشوێن کراون کە دەکاتە لە سەدا ٥ی دانیشتوانی کوردستانی عێراق . ئەم زانیارییانە نیشان دەدات رەفتاری عێراق دژی کوردەکان لە حووکمی سیاسەتی فەرمی ژینۆسایدە .

کوردەکان بە شێوازێکی کارامە هەرێمێکی ئازادیان پێکهێناوە کە زۆربەی ناوچە کوردنشینەکانی باکووری عێراق لەخۆ دەگرێت . بە هەر حاڵ تەنها هەڕەشەی هێزە هاوپەیمانەکانە کە ئەم هەرێمە ئازادکراوەی لە بەرامبەر هێرشی دەوڵەتی عێراق پاراستووە و هەروا کە دەزانین ئەگەر ئەم هێرشە روو بدات کوردەکان لەگەڵ مەترسی کومەڵکوژی رووبەڕوو دەبنەوە .

کەوابوو ئێمە بە توندی پشتیوانی دەکەین له درێژکردنەوەی پاراستنی ئاسمانی ئەم هەرێمە لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکان لە چوارچێوەی "شالاوی دابینکردنی ئاسایش" کە بڕیارە لە کۆتایی مانگی حوزەیران کۆتایی پێبێت . هەروەها هیوادارین ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوا لە دەوڵەتی تورکیا (کە رەزامەندی ئەم دەوڵەتە، شتێکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ سەرکەوتنی شالاوی دابینکردنی ئاسایش ) بکات کە پشتیوانی لە درێژەپێدانی پاراستنی ئاسمانی ئەم هەرێمە بکات .

هەروەها هیواداریین ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵ بدات بۆ باشتر کردنی بارودۆخی شیعەکانی عێراق . هەرچەند کە بارودۆخی کوردەکان زۆر گرنگترە بەلای ئێمەوە ، بەلام دەبێ تۆزێکیش سەرنج بدرێت بە چارە نووسی ١٣میلیۆن موسڵمانی شیعە کە دژی دەسەلاتی سەدام حوسەینن . ساڵی پار دوابەدوای راپەرینی باشووری عێراق ، گەلێ لە خەباتکارانی شیعە، لایەنگرە سڤیلەکانیان و ئەوانەی کە لە سوپای عێراق هەڵهاتبوون بۆ ناوچە زەلکاوییەکانی نێوان دوو رووباری دیجلە و فورات لە باشووری رۆژهەلات دوورخراونەوە و لەوێ لە گەڵ توڵەسەندنەوەی توندی هێزەکانی عێراق رووبەڕوو بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان گیانیان لە دەست دا و تووشی کێشە و تەنگوچەڵەمەی زۆر بوون . کەوابوو ئێمە داوا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەین هەوڵ بدات بۆ ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە باشووری عێراقیش چالاکی بکات و شیعەکانیش بخرینە ژێر چەتری پاراستنی هێزە نێونەتەوەییەکان .

سپاستان دەکەین ، ئەگەر ئەم داواکاریانە جێبەجێ بکەن.

لەگەڵ ریزماندا

"کلایبۆرنی پێل"[1] ، " هاریس وفۆرد"[2]، "جەیمز م جیفۆردز"[3]، "جۆزێف بایدن"[4]، "ئالبێرت گۆر"[5] ،" پاوڵ سیمۆن"[6]، "دانییل پاتریک مۆینیهان"[7] .

***

---

[1] Claiborne Pell
[2] Harris Wofford
[3] James M. Jeffords
[4], Joseph R. Biden
[5] Albert Gore
[6] Paul Simon
[7] Daniel Patrick Moynihan.

وەلامی دەفتەری سەرۆك كۆمار

كۆشكی سپی

واشنگتۆن ، ٢٦ی گوڵانی ١٩٩٢

بۆ بەڕێز "كلايبۆرنێ پێڵ "، سەرۆكی كۆميتەی پەيوەندييەكانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پيرانی ئەمريكا

واشنگتۆن دی سی

بەڕێز جەنابی سەرۆكی كۆميتە

سەرۆك كۆمار و من به تەواوی شەريكی نيگەرانيەكانی ئێوەين بە نيسبەت بارووەۆخی ئێستای عێراق كە ئێوە لە نامەكەی بەرواری ١٤ی نيسانی ١٩٩٢دا ئاماژەتان پێكردووە. هەروا كە ئێمە چەندجار بە گشتی وتوومانە ، سياسەتی ولاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكا بە نيسبەت عێراق ئەوەيە كە گەمارۆی نێونەتەوەيی بخرێتە سەر ئەم دەوڵەتە هەتا كاتێك كە رێبەرايەتی عێراق بگۆڕدرێت و دەوڵەتێكی نوێ بێتە سەر دەسەلات كە لەگەڵ دراوسێكانی عێراق و خەڵكی خۆی بە ئاشتی بژی. ئێمە بە تەواوی پشتيوانی لە بڕيارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسايشی نەتەوە يەكگرتووەكان دەكەين كە داوای لە عێراق كردووە سەركووتی هاووڵاتيانی عێراق رابوەستێنێت .
هەروەها كە ئێوە ئاماژەتان پێكردووە ، دابينكردنی ئاسايشی ئاسمانی لە لايەن هێزە هاوپەيمانەكان زۆر يەكلاييكەرەوەيە بۆ پێشگرتن لە هێرشی عێراق بۆ سەر ناوچەكانی ژێر كۆنترۆڵی كوردەكان لە باكووری عێراق . ئێمە شانازی بەو دەورە دەكەين كە هێزە هاوپەيمانەكان بۆ سارێژ كردنی ئێش و ئازارەكانی خەڵكی باكووری عێراق گێراويانە.
دڵنياتان دەكەمەوە كە ئێمە و هاوپەيمانەكانمان لە" شالاوی دابينكردنی ئاسايش" پێشتر لەگەڵ رێبەرايەتی توركيا بۆ درێژەپێدانی ئەم شالاوە دانوستانمان كردووە . شتێكی سرووشتييە كە نيگەرانی ئێمە بە نيسبەت ئێش و ئازارەكانی خەڵكی عێراق ، دانيشتووانی شيعەی باشووری

عێراقیش لەخۆ دەگرێت . ئێمە لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان دیالۆگمان کردووە بۆ ئەوەی چالاکییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لەو هەرێمە بۆ ماوەیەکی دیکە درێژەی هەبێ و هەرواش دەبێت .

لەگەڵ رێزمان

"برێنت سکۆکرافت" [٨]

راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی

***

جەنابی سەرۆك ماوەی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش وەك شمشێری "دامۆکلیس[٩]" بە سەر کوردەکاندا راوەستاوە. هێزە هاوپەیمانەکانی دژبەری عێراق ، دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە نەهێڵن غەزەبی سەدام حوسەین جارێکی دیکە بە سەر کوردەکاندا ببارێت . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك هێزی سەرەکی هێزە هاوپەیمانەکان دەبێ سەرپەرەشتی ئەوە بگرێتە ئەستۆ کە ماوەی پاراستنی کوردەکان درێژ بکرێتەوە. داوا دەکەم لەم پەیوەندییەدا وتاری رۆنامەی واشنگتۆن پۆست لە ژێر ناوی " کوردەکان : دیمۆکراسیەتی نوێ " بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم کە لە ١ی حوزەیرانی ١٩٩٢ بلاو بۆتەوە .

---

[٨] BRENT SCOWCROFT

[٩] شمشێری دامۆکلوس(دێموکلوس) (Sword of Democles ) ئەفسانەیەکی یونانییە و لە ئەدەبیاتی سیاسیدا مەبەست هەر جۆرە مەترسی و کارەساتێکە کە لەسەروبەندی قەوماندا بێت و هەر ئانوساتێك لەوانەیە روو بدات . وەرگێڕ

## حەواندنەوەی کوردەکان لە باکووری عێراق

## ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" رەید"[١] :

جەنابی سەرۆك دوێنێ ئەنجوومەنی پیران رەزامەندی دەربڕی لەگەڵ بڕیارنامەی ٢٩٩ی کۆنگرێس کە لەلایەن نوێنەری کۆنگرێس ، "جەیمز بیلبرەی "یەوە خرابووە روو . ئەم بڕیارنامەیە داوا لە تورکیا دەکات رێکەوتننامەی خۆی لەگەڵ ئەمریکا پاش حوزەیرانی ١٩٩٢ درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی بنکە سەربازییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری تورکیا وبنکەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق بهێننەوە . هەروەها بڕیارنامەکە دەڵێت: "ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ زۆر گرنگی بدەن بەوەی قەناعەت بە عێراق بهێنن گەمارۆ ئابوورییەکانی سەر باکووری عێراق لاببات و هەروەها دەڵێت ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی هەموو ولاتانی ناوچە بکات" .

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کوردەکانی هاندا راپەڕین بکەن و پاشان لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی سەدام بە تەنیا هێشتنییەوە و میلیۆنەها کورد ــ زۆرتر ژن و منداڵ ــ ناچار بوون لە ترسی هەڕەشەکانی سوپای عێراق لە زێدی خۆیان ئاوارە بن. ئەم ئاوارانە ئێش و ئازاری زۆریان بینی، برسێتی زۆریان کێشا .

سەدام کوردەکانی کیمیاباران کردووە و هەموو گوندەکانی خاپوور کردووە . ئەگەر ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان لە ناوچە بچنە دەرەوە دەبێ چاوەڕوانی کۆمەڵکوژی تەواوی کوردەکان بین .

---

Mr. REID[١]

له رێگای نەتەوە یەکگرتووەکان و "شالاوی دابینکردنی ئاسایش"ەوە ، ئێمە توانیومانە پێش لە هێرشی گورگەکانی سەدام بگرین بەلام کات کۆتایی پێدێت ، بەم زووانە کات کۆتایی پێدێت و دەبێ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەست بەکار بێت . ئەمە داواکاری مادی نییە یان داواکاری بۆ دەستێوەردانی سەربازی نییە ، بەڵکوو داواکاری بۆ رێبەرایەتی کردنە .

ئەم دواییانە کوردەکان ئاوات و ئارەزووی خۆیان بۆ دیمۆکراسی لە رێگای بەرێوەبردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و سالم و بە دوور لە توندوتیژی دەربڕی. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بەڵێنەکانی خۆی بە نیسبەت ئەم خەڵکە ئازادیخوازە جێبەجێ بکات ، هەربۆیە پەسەند کردنی بڕیارنامەی ۲۹۹ی دوێنێ زۆر گرنگە .

من ستایشی هەوڵەکانی بەرێز "بیلبرەی" دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی بەڵێنەکانی دەوڵەتی ئەمریکا و ناردنی پەیامێك بۆ خەڵکی هەژاری کورد . ئەمە کەمترین کارێکە کە ئێمە دەتوانین بۆ کوردەکان بیکەین .

## درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی شالاوی دابینکردنی ئاسایش لە لایەن تورکیاوە

## ٨ی تەموزی ١٩٩٢- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز" شۆگ[١]" :

جەنابی سەرۆك دەمەوێت لەم هەلە کەڵك وەربگرم بۆ ئەوەی سپاسی دەوڵەتی تورکیا بە گشتی بکەم بۆ درێژکردنەوەی ماوەی شالاوی دابینکردنی ئاسایش بۆ ٦ مانگی دیکە . هەروەها کە ئێوە دەزانن " شالاوی دابینکردنی ئاسایش" بەرنامەیەکی نێونەتەوەییە کە دوابەدوای بەئەنجام گەیشتنی "شالاوی سەربازیی گەردەلوولی بیابان" بۆ پاراستن و یارمەتیدانی کوردەکانی عێراق دارێژراوە. هەروەها کە دەوڵەتی ئێمە داوای کردبوو، لە ٢٦ی حوزەیران بە ٢٢٨ دەنگی بەڵێ لە بەرامبەر ١٣٦ دەنگی نەخەیر ، پارلمانی تورکیا ئەم رێککەوتننامەیەی درێژ کردەوە.

جەنابی سەرۆك بەفەرمانی ئێوە من بە سەرپەرشتی لیژنەیەکی دوو حیزبی ، ساڵی پار پاش کۆتایی پێهاتنی شالاوی سەربازیی گەردەلوولی بیابان (بۆ یارمەتیدانی کوردەکان) سەردانی ناوچەم کرد. بارودۆخی کوردەکان لە کاتی سەردانی ئێمە شڵەژاو بوو و بە تەواوی دیار بوو کە هیچ هەوڵێك بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە بێ هاوکاری دەوڵەتی تورکیا سەرکەوتوو نابێت . ئەم پشتیوانییە هاتە دی و شالاوی دابینکردنی ئاسایش بە سەرکەوتوویی توانی کوردەکان بپارێزێ و یارمەتیان بدات . پارلمانی تورکیا بە درێژکردنەوەی ئەم رێککەوتننامەیە بۆ ٦ مانگی دیکە ، جارێکیتر نیگەرانی مرۆڤدۆستانەی خەڵکی تورکیای بە نیسبەت کوردەکانی باکووری عێراق نیشان دا .

---

Mr. MCHUGH[1]

## پيرۆزبايى له توركيا بۆ درێژكردنەوەى كاتى شالآوى دابينكردنى ئاسايش

## ٩ى تەموزى ١٩٩٢ - ئەنجوومەنى نوێنەران

بەرێز "بيلبرەى" :

جەنابى سەرۆك لەم دەرفەتە كەڵك وەردەگرم و پيرۆزبايى له خەڵكى توركيا دەكەم به تايبەت له پارلّمانەكەيان (به رێبەرايەتى سەرۆك وەزيران ، سوليمان دميرێل ) بۆ دەنگدانە بوێرانەكەى بۆ درێژكردنەوەى شالآوى دابينكردنى ئاسايش . به ٢٢٨ دەنگى ئەرێنى له بەرامبەر ١٣٦ دەنگى نەرێنى ، هێزە هاوپەيمانەكان رێگايان پێدرا شالآوى ئاسمانى خۆيان درێژە پێبدەن بۆ پاراستنى ئاسايش و ئەمنييەتى ئەو سەدان هەزار كوردە ئاوارەيە كه له باكوورى عێراق ماونەتەوە . ئەم دەنگدانە نيشانى دا كه توركيا دەيەوێت ببێت به شەريكى وڵاتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا و پەيوەست بێت بەو هێزانە كه لەگەڵ ئێمە ديموكراسى و سەقامگيرى دەبەنە ناوچە . ئاگادار بوون له بارودۆخى كوردەكان و هەوڵەكانيان بۆ چارەسەر كردنى گيروگرفتەكانى كوردەكان ، توركياى كردووە به رێبەرى رۆژهەڵاتى نێوەڕاستێكى ديموكرات و ئاشتيخواز .

جارێكى ديكە سپاسى خۆم و سەرجەم ئەندامانى كۆنگرێس- كه دەنگيان خستۆتە پاڵ دەنگى من بۆ پشتيوانى كردن له خەڵكى كورد- پێشكەشى خەڵكى توركيا دەكەم. من گەشبينم به نيسبەت هاوكارى بەردەوامى دوو وڵاتى ئەمريكا و توركيا و يارمەتيدانى توركيا به ئێمە بۆ دۆزينەوەى رێگاچارەيەكى ئاشتيخوازانه وديمۆكراتيك بۆ داهاتووى كورد .

## درێژکردنەوەی ڕێککەوتننامەی شالاَوی دابینکردنی ئاسایش هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە کوردەکان

### ۹ی تەموزی ۱۹۹۲ - ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " گیلمان" ، نوێنەری ئەیالەتی" نیوێۆرك" :
جەنابی سەرۆك دوا بەدوای شەڕی کەنداو ، جیهان ڕووبەڕووی قەیرانی ئاوارەکان بووەوە واتا کاتێك کە کوردەکانی عێراق لە ترسی ئەوەی چارەنووسیان بەدەستی دیکتاتۆرێکی هەرسهێناو قوربانی بکرێت بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا هەڵهاتن . لە وەڵامدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نیونەتەوەیی هەرێمیکی پارێزراویان لە باکووری عێراق پێکهێنا و کوردەکانیان هاندا بگەڕێنەوە زێدی خۆیان . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هاوکاری کۆمەڵگای نیونەتەوەیی ، دەستی بە هەوڵی حەواندنەوەی کوردەکان کرد کە بە "شالاَوی دابینکردنی ئاسایش" ناسراوە. بۆ ئاسانکاری بۆ ئەم شالاَوە دەوڵەتی تورکیا ڕەزامەندی خۆی لە گەڵ مانەوەی هێزە سەربازییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشووری ئەو وڵاتە دەربڕی . ئەم بڕیارە بڕیارێکی قارەمانانەیە لە بەر ئەوەی لەوانەیە عێراق تۆڵە لە تورکیا بسێنێتەوە. ئەم ڕێککەوتننامەیە لە حوزەیرانی ۱۹۹۲وە بۆ ٦ مانگی دیکە درێژ کراوەتەوە و بە هۆی ئەوەی کە سیستمی حکوومەتی تورکیا دیموکراسی پارلمانییە، درێژکردنەوەی ئەم ڕێککەوتننامەیە دەبێ لە لایەن پارلمانەوە بکرێت .
جەنابی سەرۆك گەلێ لە ئێمەی ئەندامی کۆنگرێس خۆشحاڵین کە دۆستانی ئێمە لە پارلمانی تورکیا، ئەم مانگە شێلگیرانە دەنگیان دا بە درێژکردنەوەی ڕێککەوتننامەی دابینکردنی ئاسایش .ئەم دەنگدانە کە دوایین نموونەی هاوکاری تورکیایە لەگەڵ ڕۆژئاوا ، سەقامگیری ناوچە هان دەدات و هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە دەیان هەزار کەس .

درێژکردنەوەی پشتیوانی تورکیا لە شالآوی دابینکردنی ئاسایش ، گرنگی دەوری تورکیا لە ناوچە بەرجەستە دەکات . هاوکاریی تورکیا شتێکی یەکلاییکەرەوە بوو بۆ سەرکەوتنی هێزە هاوپەیمانە نێونەتەوەییەکان لە کاتی قەیرانی کەنداو و دەورێکی زۆر گرینگیش دەبینێ لە درووست کردنی داهاتوویەکی دیموکراتیك . تورکیا نموونەیەکی باشە، نەتەنها بۆ کۆمارە تازە سەربەخۆبووەکانی یەکێتی سۆفیەتی پێشوو ، بەڵکوو هەروەها بۆ جیهانی عەرەب . تورکیا لە رێگای هاوکاری و دانووستانی ئابووری زۆرتر لە بەرامبەر بیرۆکەی ئاشتی دەروەست بووە و ئەم دواییانەش میوانداری لە رێبەرانی ۱۱ وڵات کردووە ( لەوانە رێبەرانی ٦ کۆماری پێشووی سۆڤیەت و ئەرمەنستان و ئازەربایجان کە لە سەر کێشەی نەگوونی قەرەباغ ناکۆکن) بۆ واژۆ کردنی پەیمانی هاوکاری ئابووری دەریای رەش .

جەنابی سەرۆك بڕیاری تورکیا بۆ درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی شالآوی دابینکردنی ئاسایش، هیوایەکی نوێ دەبەخشێ بە کوردەکان . هەڵوێستی شێلگیرانەی تورکیا وەبیرهێنەری ئەوەیە کە رۆژئاوا دەتوانێ لە سەر تورکیا حیساب بکات و تورکیا دەتوانێت رۆژ لە دوای رۆژ دەورێکی گرینگتر ببینێت لە کاروباری ناوچە و جیهاندا .

## بە هاوکاری ئێمە کوردەکان دەتوانن یارمەتی خۆیان بدەن

## ٢٨ی مایسی 1993 - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " پێڵ ":

جەنابی سەرۆك خەلکی کورد لە باکووری عێراق کە لە ٢ ساڵ پێشەوە لە تەوقی(کەلـەوە) دەسەلاتی سەدام رزگاریان بووە ، پێشکەوتنێکی بەرچاویان بە خۆوە بینیوە لە بەڕێوەبردنی ژیانی ئاسایی خۆیان . وادیارە کە بە هەرحاڵ دەوڵەتی بەغداد لە بەرامبەر ئەم سەرکەوتنەی کوردەکان هەروا بێ دەنگ نابێت و راپۆرتەکان نیشان دەدەن لەوانەیە کوردەکان جارێکی دیکە لە گەڵ داگیرکاری عێراق رووبەڕوو ببنەوە .

لە نیسانی ١٩٩١ کۆمەڵگای نیونەتەوەیی دەستی بەکار کرد بۆ سارێژ کردنی ئێش و ئازارە زۆر گەورەکانی کوردەکان کە پاش راپەڕینێکی سەرنەکەوتوو دژی رژێمی بەعسی سەدام لە عێراق هەڵهاتبوون . لە ئەنجامی ئازاری ویژدانی ئێمە بە گشتی(لەبەر ئەوەی لەمێژە کوردەکانمان لە بەرامبەر بەرنامەی ژینۆسایدی سەدام بەتەنیا هێشتووەتەوە) هێزە هاوپەیمانەکان سەرنجام بەرپرسیاری خۆیان بە نیسبەت پاراستنی کوردەکان بەجێ گەیاند. سەرەتا لە رێگای شالاوی دابین کردنی ئاسایش و هەوڵی هێزە هاوپەیمانەکان بۆ پاراستنی هەرێمی دژەفڕین لە باکووری عێراق ، کوردەکان هەتا رادەیەك پارێزران و هەلی ئەوەیان بۆ رەخسا بەرەو خۆبەڕێوەبردن بچنە پێش.

ئەم دواییانە جیرالدین برۆکس[1] لە وتارێکدا لە ژێر ناوی" رێگایەکی بێ عەیب، لانیکەم بۆ کوردەکان کە هەرێمی دژەفڕین دەیانپارێزێت " کە لە رۆژنامەی "والستریت ژۆرناڵ[2] "بە شێوازی کرۆنیك (بە ریزی کات) بلاو بووەتەوە هەوڵی کوردەکانی خستووەتە روو کە بە بۆچوونی ئەو ئەم هەوڵە هەم مەترسیدارە و هەم سوودمەندە . لە بەشێك لەم وتارەدا هاتووە نموونەی کوردەکان

---

[1] Geraldine Brooks

[2] Wall Street Journal

لەوانەیە بە سوود بێت بۆ سیاسەتی "بۆسنیا" [٣]. ئێستا کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان هەوڵ دەدەن ستراتیژیی درووست کردنی هەرێمی پارێزراو لە "بۆسنیا" پەیڕەو بکەن ، دەتوانن بۆ ئەم مەبەستە لە ئەزموونی هەرێمە پارێزراوەکەی باکووری عێراق کەلك وەرگرن. داوا لە هاوکارانم دەکەم ئەم بەشەی وتارەکە بە وردی بخوێننەوە .

لە هەمان کاتدا من نامەوێت بڵێم کە کێشەی کورد چارەسەر بووە . هەروەها کە راپۆرتە هەواڵیەکانی ئەم هەفتەیە نیشان دەدەن کوردەکان هێشتا لە گەڵ مەترسی تۆڵە سەندنەوەی سوپای عێراق بەرەوروون . سوپای عێراق بە شێوازێکی هەڕەشەکەرانە لە جموجۆڵدایە و ئەگەری هێرشکردنە سەر کوردەکان و بیانییەکان رووی لە زیاد بوونە ، نگەرانیەکانی کوردەکان زۆرتر بووە و گەلێ لە رێکخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییەکان بە یەکەوە لە عێراق کێشاویانەتەوە .

ئەم بارووەدۆخە بە تایبەت کێشە خوڵقێنەرە، لە بەر ئەو راستییە کە کوردەکان لە ژێر باری گرانی دوو جۆرە گەمارۆدان : گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر عێراق بە گشتی و گەمارۆی دەوڵەتی عێراق لە سەر ناوچە کوردنشینەکان . ئەگەر هێرشێك روویدات رەنگە شاری سلیمانی و دەوروبەری ببێ بە ئامانج . سلێمانی هەرچەند لە دەستی کوردەکاندایە بەڵام لە باشووری هێڵی ٣٦ دایە و هەرێمی دژەفڕین لە لای باشوورە کۆمەڵێك گیرو گرفتی هەیە. ژمارەی دانیشتوانی سلیمانی ٨٠٠هەزار کەسە و هەرچەشنە هێرشێك لەوانەیە ببێتە هۆی هەڵگیرسانی ئاوارەییەك وەك ئاوارەییەکەی ١٩٨٧ و ١٩٩١ . هێرشی عێراق و ئاوارە بوونی خەڵکە دوا بە دوای هێرشەکە دبێ بە کارەسات .

بەهۆی ئەوەی بارووەدۆخی "بۆسنیا" زۆربەی سەرنجی ئێمەی لە سیاسەتی ناوخۆیی وڵات بەرەولای خۆی راکێشاوە ، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویستی بە قەیرانێکی نێونەتەوەیی دیکە نییە . ئێمە دەبێ بە زووترین کات دەست بەکار بین بۆ پێشگرتن لەم رووداوە . بۆ ئەم مەبەستە دەبێ:

---

[٣] Bosnia

یەکەم ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە شالاَوی دابینکردنی ئاسایش وەك پێشتر رابگەیەنن بە هیچ شێوازێك ناهێڵین دەوڵەتی عێراق هێرش بکاتە سەر ناوچە کوردنشینەکان ، لەوانە هەرێمی دژەفڕینی هێڵی ٣٦. ئەم هەفتەیە ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەنگاوی گرینگی هەڵگرت و لەم پەوەندییەدا وەزیری دەرەوە ، "ویلیام کریستۆفێر[٤] "وتی ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێلگیری تەواو جێبەجێ دەکات . من ستایشی وەزیری دەرەوە و بەرپرسانی دیکەی وەزارەتی دەرەوە دەکەم کە ئەم هۆشدارییە گرینگەیان دا بە سەدام و نیشانیان دا ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەلاَمی هێرشی عێراق بۆ سەر قەڵەمەڕەوی کەمینەی کورد دەداتەوە، تەنانەت لە باشووری هێڵی ٣٦ .

دووەم ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ گوشار بخاتە سەر کۆمەڵگای نیونەتەوەیی کە ئەرکی خۆی بە نیسبەت پاراستن و یارمەتیدانی کوردەکان جێبەجێ بکات. بڕیارنامەی ٦٨٨ی ٥ی نیسانی ١٩٩١ی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتیوانی ناڕاستەوخۆی کۆمەڵگای نیونەتەوەیی هەموار کرد بۆ پاراستنی کەمینەکانی عێراق . ئەنجوومەنی ئاسایش دەبێ پەیڕەوی لە ئامانجی ئەم بڕیارنامەیە بکات و لەوانەیە بتوانێت بڕیارنامەیەکی نوێ پەسەند بکات کە بە ئاشکرا پاراستنی ناوچە کوردنشینەکانی باشووری هەرێمی دژەفڕین دابین بکات . ئەنجوومەنی ئاسایش هەروەها دەبێ بەشێك لە گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر ناوچە کوردنشینەکانی باکووری عێراق هەڵبگرێت و بەڵێنی متمانەپێکراو لە رێبەرە کوردەکان بسێنێت کە لە گەڵ بەغداد بازرگانی نەکەن.

سێهەم جیهان دەبێ پشتیوانی لە ئامانجی کوردەکان بکات بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی. کوردەکان دەیانەوێت خۆیان یارمەتی خۆیان بدەن و خۆیان خۆیان بپارێزن، بۆ نموونە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی کوردەکان نەوتی زۆری هەیە بەلاَم پێویستیان بە تۆزێ یارمەتی نێونەتەوەیی هەیە بۆ ئەوەی بتوانن کەڵکی لێوەربگرن . کوردەکان بە یارمەتی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەتوانن

---

William Christopher[٤]

پێداویستیەکانی پالأوتنی ئەم نەوتە دابمەزرێنن و خۆیان بە خێو بکەن . لە مە زیاتر کوردەکان هەنگاوی گەورەیان هەڵگرتووە بۆ پێکهێنانی سۆپا و پۆلیسێکی یەکشکڵ . بە مەرجێك کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی تۆزێ یارمەتی مادی زۆرتری کوردەکان بدات ، کوردەکان دەتوانن ئەرکی پاراستنی خۆیان بگرنە ئەستۆ .

هیچکام لەم هەنگاوانە پێویست بە جێبەجێ کردنی ئەرکی نوێ لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا هاوپەیانان ناکات ، لە راستیدا بە پێچەوانەیە . ئەم هەنگاوانە دارێژراون بۆ ئەوەی یارمەتی کوردەکان بدرێت لە سەر پێی خۆی رابوەستن و ئامادە بن شوێنێکی گرینگ لە دەوڵەتی فیدراڵی پاش سەدام بگرنە دەست .

ئێمە ئێستا دەتوانین لە رێگای ئەم هەنگاوە پربایەخانە پێشگیری بکەین لە ئاکامەکانی هێرشێکی دیکەی رژیمی عێراق و قەیرانێکی دیکەی ئاوارەکان.

## یارمەتیدانی کوردەکان

## ۳۰ی حوزەیرانی ۱۹۹۳- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك هەر ئێستا کە ئێمە قسەدەکەین ، کورد و کوردستان دەچەوسێنرێنەوە و ئێمە بەرپرسیارین یارمەتی کوردەکان بدەین . ئێمە یارمەتی مرۆڤدۆستانەی کوردەکان دەدەین بەلاّم گەمارۆکانی سەدام حوسەین ، کوردەکانی خنکاندووە و بێ دەنگ کردووە . ئێمە ١٥ ملیۆن دۆلارمان تەرخان کرد بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بەلاّم بورۆکراسی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستی بە سەر ئەم پارەیەدا گرتووە . سەدام پارەی ٢٥ دیناری نیاوەتە لاوە کە تەنها پارەیەك بوو کە زۆر لە دەستی کوردەکاندا بوو . کوردەکان تەنانەت ناتوانن بەرهەمی جووتیارەکانی خۆیشیان بکڕن تا خەڵکەکەیانی پێ تێر بکەن و ئەگەر ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە زووترین کات دەست بەکار نەبێت ، کوردستان تووشی قاتووقڕی دەبێت و ئەوکاتە پارەی زیاتر ( لە و ١٥ میلیۆن دۆلارەی کە تەرخانمان کردووە ) پێویست دەکات بۆ گەیاندنی یارمەتی هەوایی بە کوردەکان .

من داوا لە حکوومەت و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەکەم دەست بەکار بێت بۆ یارمەتیدانی کوردەکان . گەمارۆی ئابووری سەر باکووری عێراق و کوردستان لابەن و یارمەتی کوردەکان بدەن ئیدارەیەکی سەربەخۆ و خۆبەڕێوەبەر لەو ناوچەیە پێکبهێنن ، ئەگەر نا کوردەکان ئەم زستانەش برسی دەبن .

## بۆمبارانەکانی عێراق ، کوردەکان دەخاتە ناو مەترسی

۳۰ی تەموزی ۱۹۹۳ - ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" پێڵ " :

جەنابی سەرۆك، عێراق جارێکی دیکە بووە بە مەکۆی هەواڵەکان . دوێنێ فڕۆکە جەنگییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە مووشەك داویانە لە بنکە دژە هەواییەکانی عێراق پاش ئەوەی لە لایەن راداری عێراق دۆزراونەتەوە . پێشتر پیلانێکی عێراق بۆ کوشتنی سەرۆك بوش لە کوێت لە لایەن دەزگای هەواڵگری ئەمریکاوە پووچەڵ کرایەوە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بە ئەنجامدانی هێرشێکی مووشەکی بۆ سەر ناوەندی فەرماندەیی ئیستخباراتی عێراق وەڵامی ئەوانی دایەوە. بەڵام هێشتا سەدام هەر لە سەر دەسەڵاتە و بەداخەوە کوردەکانی عێراق لەوانەیە ئەم جارەش بین بە قوربانی.

لە مایسی ۱۹۹۱ دوابەدوای جەنگی دووەمی کەنداوی فارس ، کوردەکان( کە رژیمی سەدام ژیانی لێیان تاڵ کردبوو ) دژی سەدام راپەڕینیان کرد تا وڵاتی باوباپیران و کەوناری خۆیان رزگار بکەن. لە مانگی نیسان هێرشێکی عێراق، کوردەکانی ئاوارەی ناوچەی سنوورییەکانی تورکیا کرد . هەزاران کورد بە تایبەت ژن و منداڵ و پیرەمێرد و پیرەژن بەهۆی برسێتی و سەرماو سۆڵە گیانیان لە دەستدا و هەر وەك سالانی پێشوو ، ئێش و ئازاری کوردەکان سەرنجی خەڵکی جیهانی بەرەولای خۆی راکێشا. ئەم جارە بە رێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، شالاوی دابینکردنی ئاسایش لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە کوردەکانی پاراست و یارمەتی دان تا ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێبکەنەوە و بووە هۆی پاراستنی مافی مرۆڤ و گەشەی دیموکراسی لە کوردستانی عێراق ، لەوانە بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنێك کە ئازادترین و راستەقینەترین هەڵبژاردن لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست (جگە لە ئیسرائیل)بوو .

بەڵام ئەم رۆژانە رۆژی ئەهامەتی كوردەكانە . ئێستا سەرەڕای پاراستنی هەوایی ناوچە لە لایەن هاوپەیمانانەوە پتر لە ۱۰۰ هەزار سەربازی عێراق لە باشووری هەرێمی دژەفڕین مۆڵیان داوە . لە ئەمووزی ۱۹۹۱ەوە واتا كاتێك كە دووەمین گرووپی سەربازە هاوپەیمانەكان لە ناوچە پاشەكشەیان كرد ، ئێستا كارمەندانی رێكخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییەكان تەنها گرووپی بیانین كە لە ناوچەدا ماونەتەوە.

هێرشی عێراق بۆ سەر ئەم گرووپانە، رێكخراوی پزیشكانی بێ سنووری هاندا تا پزیشكەكانی خۆی لە ناوچە بباتە دەرەوە بۆ ئەوەی سیاسەتی شێلگیربوونی عێراق لە سەر رەدوونانی چاودێرە سەربەخۆ بیانییەكان شەرمەزار بكات. ئەمڕۆ هێزەكانی سەدام لە باشووری هێڵی ۳٦ی باكووردان و لەوانەیە هێرش بكەنە سەر كوردەكان بۆ ئەوەی تۆڵەی راپەڕینەكەیان لێبسێننەوە، بەڵگەكان نیشان دەدات هێزەكانی سەدام دەیانەوێت و دەتوانن ئەم هێرشە ئەنجام بدەن .

هێرشی ئەمریكا بە موشەكی Tomahawk [1] بۆ سەر بەغدا كە بە فرمانی سەرۆك كلینتۆن بەڕێوە چوو پەیامێكی نارد بۆ سەدام . ئەمجارەش دەبێ پەیامێك بنێرین بۆ سەدام (بە شێوازێك لە لێی تێبگات ) و پێی بڵێین بەرپرسیارێتی ئێمە بە نیسبەت ئامانجە دیموكراتیكەكانی كوردەكان ، جیدییە و تەنها كاردانەوەیەكی خەمخۆرانە نییە لە بەرامبەر وێنەی تەلەفزیۆنەكان و پاڵەوانبازی پاش شەڕ .

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان لە مانگی ئەیلوول كۆ بێتەوە، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ بۆ ئەوە هەوڵ بدات نەتەوە یەكگرتووەكان بڕیارنامەیەك دەربكات و تێیدا جەخت لە سەر پاراستنی كوردەكانی عێراق و كەمینەكانی دیكە بكاتەوە . وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هێزە هاوپەیمانەكان دەبێ ماوەی پاراستنی هەوایی ناوچەی دژە فڕین

---

[1] تەوەرزێن

درێژ بكەنەوە و يارمەتى مادى بدەنە كوردەكان بۆ ئەوەى كوردەكان بتوانن خۆيان و فەرمانبەرانى رێكخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەييەكان بپارێزن.
ئێمە هەروەها دەبێ بە شوێنى رێگايەكدا بگەڕێين بۆ ئـەوەى ئـابوورى كوردسـتانى عێـراق پـێش بكەوێت . ئێستا كوردستانى عێراق (وەك ولاتى عێراق بە گـشتى) لـە ژێـر گـەمارۆى ئـابوورى نەتەوە يەكگرتووەكاندايە. هەڵگرتنى هەنديك لە گەمارۆ ئابوورييەكان لە سەر كوردستانى عێراق دەبێتە هۆى دەستپێڕاگەيشتنى كوردەكان بە بازارى جيهانى و رێگايەكـە بـۆ بـێ كاريگـەربوونى گەمارۆكانى سەدام، و ئابوورى كوردستان هەتا رادەيەك لە بەرامبەر خراپكارى سەدام دەپارێزێت.
جەنابى سـەرۆك كۆميتـەى پەيوەندييـەكانى دەرەوەى ئەنجوومـەنى پـيران ئـەم دواييانـە ياسـاى حيسابى ماددى ساڵى ١٩٩٤ و ١٩٩٥ى پەسەند كرد. من پێشنيارم كرد بەشێك لەم ياسايە كـە پەيوەندى بە سياسەتى ولاتە يەكگرتووەكانى ئەمريكاوە هەيـە بـە نيـسبەت كوردەكـانى عێـراق هەموار بكرێت. بە بيروبۆچوونى من ئەم پێشنيارە شێوازى هەڵسووكەوتى درێژخايەن و كاريگەرى ئێمە لەگەڵ كوردستانى عێراق بەرجەستە دەكات .
ئەمە دەقى ياسا هەموار كراوەكەيە :

## بەشى ٧٠٩ : سياسەتى ولاتە يەكگرتووەكانى ئـەمريكا بـە نيـسبەت كوردسـتانى عێراق

بە لەبەرچاو گرتنى ئەوەكە :
١ ــ كۆمەڵگاى نيونەتـەوەيى بـە گـوێرەى بڕيارنامـەى ٦٨٨ى ئەنجوومـەنى ئاسايـشى نەتـەوە يەكگرتووەكان و شالاوى دابينكردنى ئاسايش ، پشتيوانى دەكات لە پاراستنى كوردەكانى عێراق و كەمينە ئايينى و ئەتنيكييەكانى ديكەى عێراق
٢ ــ سەرەڕاى پاراستنى كۆمەڵگاى نێونەتەوەيى، هەندێك لە ناوچەكانى كوردسـتانى عێـراق لـە گەڵ مەترسى داگيركارى عێراق بەرەوڕوون

٣ــ سەرەڕای هەڕەشەی داگیرکاری عێراق ، کوردەکان و گرووپە ئایینی و ئەتنیکیەکانی دیکەی عێراق هەنگاویان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان بەڕێوە بەرن لەوانە:

ــــ بەڕێوە بردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە بۆ پێکهێنانی پارڵمان که پشتیوانی دەکات له یەکپارچەیی خاکی عێراق و بەدەسەڵات گەیشتنی حکوومەتێکی یەکگرتوو و دیموکرات.

ــــ پلاندارشتن بۆ بەڕێوەبردنی خزمەتگوزاری گشتی.

ــــ دووبارە چاککردنەوە و سەر لەنوێ بنیادنانەوەی ژێرخانی کوردستانی عێراق

ــــ پێکهێنانی پۆلیس و هێزی ئاسایشی یەکشکڵ .

٤ــ سەرەڕای یارمەتییە مرۆڤدۆستانە نێونەتەوەییە بەرچاوەکان و سەرەڕای ئەو راستیە کە گەمارۆی ئابووری عێراق له لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پێداویستییە مرۆڤدۆستانەکان له خۆ ناگرێت ، دانیشتوانی کوردستانی عێراق بە هۆی گەمارۆی ناوخۆیی دەوڵەتی عێراق هێشتا لە گەڵ گیروگرفت بەرەورِوون

٥ــ کوردەکان و کەمینە ئایینی و ئەتنیکییەکانی دیکەی عێراق توانیویانە بگەنە ئامانجی ئۆتۆنۆمی خۆیان و بەدەر له چوارچێوەی یارمەتی نێونەتەوەیی کاریان کردووە

کەوابوو کۆنگرێس بڕیاری دا کە :

١ــ هەنگاو هەڵبگرێت بۆ هاندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی کە:

ئاــ جەخت بکاتەوە له سەر پاراستنی هەموو کوردەکانی عێراق و کەمینەکانی دیکەی عێراق بە گوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایش

ب ــــ هەندێ لە گەمارۆ ئابوورییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر ئەو ناوچانە هەڵبگرێت کە لە لایەن رێبەرایەتی بە دیمۆکراسی هەڵبژێردراوی کوردستانی عێراقەوە بەڕێوە دەچێت بەو شەرت و مەرجەی کە :

ــــ دانیشتوانی ئەم هەرێمە بازرگانی نەکەن لەگەڵ رژێمی عێراق

ــــ ئەو گەمارۆیانە کە هەڵدەگیرێت لە رووی مادییەوە یارمەتی بە رژێمی عێراق نەدات

٢ــ درێژه به پشتیوانی خۆی دەدات له هاتنه سەرکاری حکومەتێکی یەکگرتوو و دیموکراتیك له عێراق

٣ــ هەنگاو هەڵدەگرێت بۆ دارشتنی پرۆگرامێکی چەند لایەنه بۆ یارمەتیدانی خەڵکی کوردستانی عێراق و پشتیوانی له ئامانجی ئۆتۆنۆمی ئەوان دەکات له رێگای :

ــ دابین کردنی یارمەتی ماددی و تەکنیکی بۆ ئیدارەی به دیمۆکراسی هەڵبژێردراوی کوردستانی عێراق بۆ ئەوەی سەرچاوه سروشتییەکانی ژێر زەوی وەك نەوت بەرهەم بهێنێت

ــ پشتیوانی کردن له مافی رەوای خۆپاراستن و دابین کردنی پێداویستییه ئاسایشیەکانی خەڵکی کوردستانی عێراق

٤ــ هەڵگرتنی هەنگاو بۆ چڕتر کردنی دانووستان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا( که پشتیوانی و هاوکارییەکەی یەکلاییکەرەوەیه بۆ پاراستنی خەڵکی کودستانی عێراق) بۆ مسۆگەر کردنی ئەوەی که سەقامگیری تورکیا و هەموو ناوچه له رێگای رێوشوێنەکانی ئەم بەشه دەستەبەر دەبێت .

## تراژیدیای بەردەوامی کوردستانی عێراق

## ١٢ی نیسانی ١٩٩٤- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەرێز" بیلبرەی" :

جەنابی سەرۆك راستییەکەی ئەوەیە ئێش و ئازاری خەڵکی عێراق ئەنجامی راستەوخۆی دڕندایەتی سەدامی دیکتاتۆرە . هەروەها کێشەیەکی دیکەشمان لە کوردستان هەیە. گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر عێراق ، کوردستانی عێراقیش دەگرێتەوە . ئێمە ئێستا خەڵکی کوردستانی عێراق لە باکووری هێڵی ٣٦ دەپارێزین و بە بیروبۆچوونی من شەرمە بۆ ئێمە ئەم گەمارۆوانە لە سەر خەڵکی ئەم ناوچەیە هەڵنەگرین کە بە دڵنیاییەوە لەگەڵ شیعەکانی باشووری عێراق زۆرترین ئێش و ئازاریان بە دەستی سەرکوتی ئەم رژێمە دڕندەیە کێشاوە .

جەنابی سەرۆك لە دەساڵی رابردوودا سەدام حوسەین بە شێوازێکی بەرفراوان هاووڵاتیانی کوردی عێراقی کیمیاباران کردووە . کوردەکان تەنها داوای مافی خۆبەڕێوەبردن دەکەن و بە دڵنیاییەوە نایانەوێت لە عێراق جیا ببنەوە ، کوردەکان داوای یارمەتی لە ئێمە دەکەن ، داوا دەکەن گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەریان هەڵبگیردرێت بۆ ئەوەی بتوانن لەم کاتە قەیرانییەدا خۆیان بەخێو بکەن .

جەنابی سەرۆك سوپاسی بەرێز " بۆنیۆر " [1] دەکەم کە ئەمەی هێنایەوە بیری سەرۆکی ئەنجوومەن و هیوادارم لە کۆبوونەوەی دووقۆڵی داهاتوودا ، ئەم بەرێزە باسی بارودۆخی دژواری کوردەکانیش بکات کە زۆر پێویستیان بە یارمەتی ئێمە هەیە.

بەرێز " بۆنیۆر":

---

Mr. BONIOR [1]

جەنابی سەرۆك سپاسی هاوکارم بەڕێز "بیلبرەی" دەکەم بۆ یارمەتییەکەی و دڵنیای دەکەمەوە کە من ئەم مەسەلەیە بەتەواوی دەخەمە بەرباس . ئێمە دەبێ یارمەتی ئەو کەسانە بدەین کە بە هۆی نەبوونی دەواودەرمان و پێداویستیە رۆژانەکانی دیکە لە تەنگانەدان . ئێمە دەبێ لە رێگای رێکخراوە مرۆڤدۆست و خێرخوازەکانەوە یارمەتیان بدەین بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان بژێنن و لە کاتی خۆیدا جێگای سیاسی خۆیان بەتەواوی لە بەرامبەر سەدام حوسەین بدۆزنەوە .

## یادکردنەوەی هەڵەبجە

### ١٤ی ئاداری ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " پێڵ ":

جەنابی سەرۆك کۆتایی ئەم هەفتەیە ساڵیادی یەکێ لە تاریکترین کاتەکانی مێژووی مرۆڤایەتییە . ٨ساڵ پێش لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ هێزەکانی سەدام حوسەین ( کە لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە لە دوورگەی فاو گەمارۆ درابوون و هێزە کوردەکانیش لە باکووری عێراق پێشڕەویان کردبوو) بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردە سەر شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە و لەئەنجامدا ٥تا٦ هەزار کورد کوژران کە زۆربەیان خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بوون .

لەم ٨ ساڵەی پاش هێرشی کیمایی عێراق ، هەڵەبجە گرنگترین سەمبوولی بارودۆخی نالەباری خەڵکی کورد بووە کە وێنای دڕندەیی دەوڵەتی عێراقە لە بەرامبەر کوردەکان. وێنە لەبیرنەکراوەکانی قوربانیانی ئەم هێرشە( پیاوێك کە لەگەڵ کوڕەساواکەی وشك ببوو و کچە منداڵێك کە سەرپۆشی بەسەرەوە بوو و دەمووچاوی بە تەواوی شێوابوو) هەتا هەتایە لە بیری خەڵکی کورددا دەمێنێتەوە . هەروا کە زۆربەی خەڵکی بۆسنیا قەت پاکتاوی رەگەزی شاری "سربیرنیکا" [١] لە بیرناکەن، کوردەکانیش هێرشی کیمیایی هەڵەبجە قەت لە بیر ناکەن .

بە دڵنیاییەوە هەروەها کە هەموومان دەزانین ، هەڵەبجە تەنها نموونەی کیمیابارانکردنی کوردەکان نەبوو و کۆتایی بە سەرکوتی کوردەکان لە لایەن عێراقەوە نەهێنا . هەرچەند کە کیمبارانی هەڵەبجە ناخۆشترین رووداو بوو ، بەڵام تەنها یەکێ لە زنجیرە کردەوە دلڕەقەکانی عێراق بووە دژ بەکورد . لە ناوەراستی دەیەی ١٩٨٠ تا کۆتایی ئەم دەیە ، هێزەکانی عێراق بە شێوازی سیستماتیك گوندە کوردنشینەکانیان رووخاند و گوندنشینەکانیان بە زۆر لە کەمپە زۆرە ملییەکاندا نیشتەجێ کرد و دەیان هەزار کوردیان گرت و بێ سەروشوێن کرد و سەدان گوند و

---

[١] Srebrenica

شاری کوردنشینیان خاپوور کرد . ئەم کردەوانە لە شاڵاوی ناسراو بە ئەنفال لە ١٩٨٨ گەیشتە لوتکەی خۆی . بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان نزیکەی ١٥٠ هەزار کورد لەم ماوەیەدا بێ سەروشوێن کراون و لەناو براون . بە گشتی ئەم کردەوانەی عێراق دژی کوردەکان لە حوکم و قەبارەی ژینۆسایددایە .

من و سەرۆکی هێژای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، سناتۆر هێلمز زۆر هەولمان داوە سەرنجی ئەنجوومەنی پیران بەرەو لای ئازار و نەهامەتییەکانی کوردەکان رابکێشین کە یەکێ لەوانە خستنەڕووی یەکەم گەڵاڵە یاسای گەمارۆدانی عێراق لە ١٩٨٨ بوو بە هۆی کەڵك وەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان .

پاش ئەوەی کۆمەڵێك بەڵگەو نیشانەی بایەخدار کەوتە دەستی ئێمە سەبارەت بە رەفتاری درندانەی عێراق دژی کوردەکان کە زۆربەیان بەدەستی خودی کاربەدەستانی عێراق نووسراون ، کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە ( بەتایبەت لە رێگای هەوڵە بێ وچانەکانی بەڕێز" پیتر گالبریس[٢]"کە ئەو کاتە ئەندامی ئەم کۆمیتەیە بوو و ئێستا بالوێزی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لە کرواتیا[٣]) هەولی دا پتر لە ١٨ تەن بەڵگەنامەی ئیستخباراتی عێراق بخاتە دەستی خۆی کە کوردەکان لە کاتی راپەڕینی ١٩٩١ دەستیان بەسەردا گرتبوو . ئەم بەڵگەنامانە دەتوانێ رەفتاری تاوانبارانەی عێراق بە تەواوی ئاشکرا بکات . رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ کە رێکخراوێکی سەربەخۆیە ، دەستی داوەتە کارێکی شاز بۆ تاوتوێ و شیکردنەوەی ئەم بەڵگەنامانە کە پەیوەندییان بە ژینۆسایدی کوردەوە هەیە بە دەستی دەوڵەتی عێراق .

ئەمە بەسەرهاتێکە کە دەبێ بگێڕدرێتەوە . هەروەها کە لەوانەیە هەندێ لە هاوکارانم بزانن ، مەسەلەی ژینۆساید گرینگیەکی یەکجار زۆری لای من هەیە. پاش شەڕی دووەمی جیهانی ،

---

Peter Galbraith [٢]
Croatia[٣]

باوکی من بەڕێز "هێربێرت کلایبۆرنی پێڵ "[٤] دەورێکی بەرچاوی بینی لە وەی کە ژینۆساید وەك تاوانێکی شەڕ سەیر بکرێت . باوکم هەرچەند تەنگ و چەڵەمەی زۆری بینی بەڵام سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا و منیش لە سووربوون و بەرپرسیاربوونی ئەو لە بەرامبەر پرەنسیپەکان گەلیّ شت فێر بووم. جیهان دەبیّ دژی ژینۆساید رابوەستێنیّ لە هەر شوێنێك و هەر کاتێك کە روو بدات .

هەڵەبجە نابێت لە بیر بکرێت و عێراق دەبیّ بەرپرسیار بیّ لە بەرامبەر کردەوە دڵڕەقەکانی دژ بە کورد ، ئێمە نابیّ بهێڵین ئەم هەلە بە سادەیی لە دەستمان بچێت .

بریا بمتوانیبا بڵێم بە خۆشییەوە چیرۆکی تراژیدیای کوردەکانی عێراق کۆتایی پێهاتووە و بووە بە وانەیەك بۆ رێبەرایەتی عێراق ، بەڵام بەداخەوە ناتوانم . هەرچەند کە کوردەکانی عێراق ئێستا کۆنترۆڵی بەشێکی بەرچاو لە خاکی کوردستانیان بەدەستەوەیە ( لە ئاکامی شەڕی کەنداوی فارس) بەڵام رەفتاری خراپی سەدام لەگەڵ کوردەکان بەردەوامە . هێزەکانی عێراق گەمارۆیەکی توندوتۆڵیان خستووەتە سەر پارێزگاکانی ژێر کۆنترۆڵی کوردەکان . لەمە زیاتر لە ئاکامی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر عێراق ، کوردەکان لە ژێر باری گران و تاقەت پڕووکێنی دوو گەمارۆی ئابووریدان .

کوردەکان لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیش (بەتایبەت ئێران و تورکیا ) لەگەڵ پێشێلکاریی جیدی مافی مرۆڤ و سەرکوتی لە رادەبەدەر بەرەوڕوون و ئەمە نیشان دەدات بارودۆخی ناڵەباری کورد هیچ سنوورێکی نییە . بارودۆخەکە ئەوەندە ناڵەبارە کە لە ماوەی ١٨ مانگی رابردوودا ، کوردەکانی عێراق ( کە سەرەتا یەك هەڵوێست و هاودەنگ بوون بۆ ئۆتۆنۆمی و دژایەتی کردنی سەدام ) دەستیان کردووە بە شەڕ لە ناو خۆیاندا .

ئەم بارودۆخە بۆ من راست و دادپەروەرانە نییە و لەوە ناچێت وەڵامێکی باش بێت لە لایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە بە میراتی ترسناکی هەڵەبجە . بە باوەڕی من دەبیّ هەوڵێکی یەکجار

[٤] Herbert Claiborne Pell

زۆرتر بدرێت بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵە رێگایێک بۆ یارمەتیدانی کوردەکانی عێراق بۆ ئەوەی بیرەوەرییە پڕ ئێش و ئازارەکانی رابردوویان لە بیر بەنەوە ، بۆ ئەوەی هێدی هێدی لە گرێدراوبوون بە یارمەتیەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی رزگاریان بێت و لەگەڵ دووژمنی هاوبەشمان واتا سەدام حوسەین بەربەرەکانی بکەن . تەنها ئەو کاتە کوردستانی عێراق دەتوانێت ببێت بە بنەما و بەردی بناخەی عێراقێکی ئازاد و دیمۆکراتیك .

لانیکەم کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و بە تایبەت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئەرکی خۆی بە نیسبەت پاراستنی کوردەکان جێبەجێ بکات . لە ژێر چەتری شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش ، هێزە هاوپەیمانەکان، لەوانە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا و فەرانسا درێژە بە پاراستنی هەوایی هەرێمی دژەفڕین و پاراستنی کوردەکانی عێراق دەدەن و ئاسانکاری دەکەن بۆ گەیاندنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان. بە هەرحاڵ ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ئەم دواییانەی تورکیا کۆمەڵێك گومانی درووست کردووە لە بەرامبەر بەردەوامبوونی ئەم شاڵاوە لەدرێژخاندا و بارودۆخی ئابووری کوردستانی عێراق بە گشتی بەرەو خراپی دەچێت . ئەم بارووودۆخەی ئێستا نە بە قازانجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەواو دەبێت و نە بەقازانجی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و نە یارمەتی بە سارێژ کردنەوەی مێژووی خەمباری چەوساندنەوەی کورد دەدات . کاری ئێمە لە عێراق ( چ دژی سەدام و چە پشتیوانی کردن لە کوردەکان) هێشتا تەواو نەبووە .

بەڕێز "هێلمز" :

جەنابی سەرۆك منیش لە گەڵ بیروبۆچوونەکانی دۆستی بەڕێز و ئەندامی هێژا و بە توانای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران ، بەڕێز " پێڵ " دام و سپاسی دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی کارەساتی کۆمەڵکوژی خەڵکی سڤیلی کورد لە شارۆچکەی هەڵەبجە لە ٨ ساڵ پێش لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ .

فڕۆکە جیتەکانی عێراق بێ هۆشداری پێشوو بەچەکی کیمیایی شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجەیان لە باکووری عێراق بۆمباران کرد. ئەم هێرشە ترسناکە کە تەنانەت بە گوێرەی

ستانداردەکانی عێراقیش کردەوەیەکی هۆڤانەیە ، هەزاران ژن، پیاو ومنداڵی بێ پاراستنی کوشت. کۆمەڵکوژی هەڵەبجە سەرنجی جیهانی بەرەولای شالاوی ژینۆسایدی سەدام دژی کوردەکانی باکووری عێراق راکێشا . بە هەرحاڵ ئەم سەرنجدانە نەیتوانی پێش لە کۆمەڵکوژی سیستماتیکی سەدان هەزار خەڵی سڤیلی کورد بە دەستی دەوڵەتی عێراق بگرێت .

جەنابی سەرۆك سپاسی بەڕێز" پێڵ " دەکەم لەبەر ئەوەی هەمیشە یەکێ لەو کەسانەیە کە دەیەوێت باسی بارووذۆخی خراپی کوردەکان بکات . من لە گەڵ بەڕێز " پێڵ " لە ساڵی ١٩٨٨ کارم کرد بۆ گەمارۆدانی عێراق بە هۆی رەفتارە چەوسێنەرەکەی . ئەگەر کۆمەڵە کەسانێکی دیکە وەك سناتۆر " پێڵ " لە سەراسەری جیهان و بەتایبەت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەبانا کە داوای پاراستنی کوردەکانیان بکردبایا ، لەوانەیە ژمارەیەکی زۆرتر لە کوردەکان ئیستا زیندوو ببان .

بە هەرحاڵ بەشی کۆتایی ئەم تراژیدییە هێشتا جێبەجێ نەکراوە . سەدام حوسەین دەستی لە رەفتارە دڵڕەقەکانی دژی هاووڵاتیانی کوردی عێراق هەڵنەگرتووە و هەرچەند کە ناتوانێ لە ناویان ببات بەڵام هەرچی لە دەستی دێت دەیکات بۆ ئەوەی لە سەرەتایی ترین مافەکان بێ بەشیان بکات.

جەنابی سەرۆك، لە ئەنجامی هەوڵەکانی سناتۆر " پێڵ " ، بارودۆخی کوردەکان سەرنجی جیهانی بەرەولای خۆی راکێشاوە . کوردەکان نابێ قەد لە بیر بکرێن .

خاتوون "فێنیێستین" ° :

جەنابی سەرۆك ، ٨ساڵ پێش لە هەفتەیەکی وەك ئەم هەفتەیەدا لە هەفتەکانی کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق ، سەدام حوسەین هێزە چەکدارەکانی خۆی نارد بۆ ئەوەی راپەڕینی کوردەکانی باکووری عێراق تێکبشکێنن .

---

Mrs. FEINSTEIN °

لەم هێرشەدا کە لە شارۆچکەی هەڵەبجە چڕ بووەوە ، هێزەکانی سەدام بە چەکی کیمیایی هەڵەبجەیان بۆمباران کرد و پتر لە٥ هەزار کورد بە شێوازێکی دڕندانە گیانیان لە دەست دا کە ژمارەیەکی زۆریان منداڵ بوون .
هەروەها لێکۆڵینەوەکانی کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق نیشانی داوە هەڵەبجە تەنها یەکێ لە دڕندەترین بەشەکانی شاڵاوی ژینۆسایدی سەدام دژبە کوردەکانی باکووری عێراق بووە نە هەمووی .
لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ هەتا کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق ، دەوڵەتی عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر گوند و شارە کوردنشینەکان، سەدان هەزار کوردی لە کەمپە زۆرە ملێیەکاندا نیشتەجێ کرد و دەیان هەزار کوردی دیکەی بێ سەروشوێن کرد. نزیکەی ١٥٠ هەزار کورد لە شاڵاوی ناسراو بە ئەنفالدا گیانیان لە دەست دا کە تەنها دەکرێت وەك شاڵاوی ژینۆسایدی کوردەکانی عێراق لە لایەن سەدام حوسەینەوە ناوزەد بکرێت .
بەداخەوە ئەمە تەنها کردەوەی دڕندانەی سەدام نەبوو دژ بە خەڵکی خۆی . کۆمەڵکوژی دەوڵەتی عێراق لە شاڵاوی "ئەنفال" بواری بۆ دوایین ژینۆسایدی سەدام خۆش کرد ، ئەمجارە دژی "عەرەبە مارشەکانی" باشووری عێراق . لە ساڵانی پاش شەڕی کەنداو کاتێك کە شیعە ڕاپەڕیوەکانی عێراق پەنایان بۆ کۆمەڵگا دووردەستەکانی "عەرەبە مارشەکان" برد، سوپای سەدام هێرشی کردە سەر ئەم کۆمەڵگایە . لەم ٣ ساڵەی دواییدا هەزاران کەس لە عەرەبە مارشەکان بێ سەروشوێن کراون و هەموو گوندەکانیان خاپوور کراوە و سوتێنراوە . ژینۆسایدی ئەمجارە لەگەڵ دەستدرێژی بۆ سەر ژینگە ئەنجام دراوە لە بەر ئەوەی ئەندازیارە عێراقیەکان ژینگەی بە پیت و بەرەکەت و هەزاران کێڵگەی عەرەبە مارشەکانیان وشك کردووە بۆ ئەوەی گوندنشینەکان لەوێ دەربکەن و ڕێگای لەمێژینەی بژێوی "عەرەبە مارشەکان" لە ناو بەرن.
کوردەکانیش هەروا بە دەستی سەدام دەچەوسێنەوە . کوردەکان لە کۆتایی شەڕی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١ بە یارمەتی دەستێوەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان توانیان لە دەستی

شەپۆلێكی نوێی كۆمەڵكوژی سەدام رزگاریان بێ . ئەمڕۆ هەرچەند كە كوردەكانی عێراق بە شێوازی ئۆتۆنۆمی پارێزگاكانی باكووری عێراق بەڕێوە دەبەن ( لە ژێر سایەی هەوڵی هاوبەشی هێزەكانی ئەمریكا، بەریتانیا و فەرانسا كە شالاوی دابینكردنی ئاسایش بەڕێوە دەبەن بۆ پاراستنی كوردەكان) بەلام هێشتا لە گەڵ گەمارۆی ناوخۆیی هێزەكانی سەدام و هەروەها گەمارۆی نەتەوە یەكگرتووەكان لە سەر عێراق و هێرشە كاتییەكانی عێراق بۆ سەر شارە كوردنشینەكان بەرەوڕوون .

هیچكام لە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران بە قەد ئەندامی هێژا و پایەبەرزی كۆمیتەی پەیوەندییەكانی دەرەوە ، بەڕێز سناتۆر " پێڵ " هەوڵیان نەداوە بۆ خستنەڕووی باروودۆخی كوردەكان . لە ئاكامی هەوڵەكانی سناتۆر " پێڵ " و هەوڵەكانی سەرۆكی هێژای كۆمیتەی پەیوەندییەكانی دەرەوە سناتۆر "هێلمز" پتر لە ١٨ تەن بەڵگەنامەی دەوڵەت و ئیستخباراتی عێراق لە پەیوەندی لەگەڵ شالاوی ژینۆسایدی كوردەكان بۆ شیكردنەوە و توێژینەوە گوازراوەتەوە بۆ ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا. ئەم بەڵگەنامانە لە كاتی راپەڕینی ١٩٩١ لە لایەن كوردەكانەوە دەستیان بە سەردا گیراوە. ئەنجامی ئەم توێژینەوانە مێژووی رەفتارە دلڕەقەكانی عێراق دژ بە كوردەكان دەردەخات ، لەوانە بەكارهێنانی ترسناكی چەكی كیمیایی.

لەم ساڵیادە تراژیدیكەدا ، سپاسی سناتۆر " پێڵ " و سناتۆر" هێلمز" دەكەم بۆ رێبەرایەتییەكەیان لەم پەیوەندییەدا . هیوادارم ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا درێژە بە دەوری ریبەرایەتی خۆی بدات بۆ دابین كردنی ژیانێكی باشتر بۆ كوردەكانی عێراق ، چ پێش و چ پاش لە سەر دەسەلات لابرانی سەدام .

## ساڵیادی کۆمەڵکوژی کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی عێراق

## ٢٦ی ئاداری ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز " گیلمان" :

جەنابی سەرۆك داوا دەکەم هاوکارانم دەنگ بدەن بە بڕیارنامەی ٣٧٩ کە دەربڕی هەستی کۆنگریسی ئەمریکایە بە نیسبەت هەشتەمین ساڵوەگەڕی کۆمەڵکوژی پترلە ٥ هەزار کورد لە ئاکامی هێرشی کیمیایی دەوڵەتی عیراق . ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە :

### بڕیارنامەی ٣٧٩ی کۆنگریس ئەمریکا

ــ بە هۆی ئەوەی پتر لە ٤میلیۆن کورد لە عێراق دەژین کە دەکاتە ٢٠٪ی دانیشتووانی عێراق

ــ بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق درێژە بە کردەوە توندوتیژەکانی خۆی دەدات دژی کوردەکانی عێراق

ــ بە هۆی ئەوەی لە ٧ی ئاداری ١٩٨٨ دەوڵەتی عێراق چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی سڤیلی کوردی عێراق لە شارۆچکەی سنووری هەڵەبجە بەکار هێناوە و لە ئەنجامدا پتر لە ٥هەزار خەڵکی بێ گوناح کوژراون .

ــ بە هۆی ئەوەی ئەم کردەوە نامرۆڤی و دڕندەیەی دەوڵەتی عێراق بووەتە هۆی نارەزایەتی و تووڕەیی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی

ــ بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق درێژە دەدات بە کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی بێ پاراستنی کورد ، هەروەها کە لە ساڵی ١٩٨٨ ئەنجامی داوە

ــ بە هۆی ئەوەی پتر لە ١٨٢ هەزار کوردی عێراق لە سەروبەندی شاڵاوی ئەنفال لە ١٩٨٨دا کوژراون

## کورد و کوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

ـ بە هۆی ئەوەی ئەگەر کۆمەڵگای نیونەتەوەیی وەڵامی داگیرکرانی کوێتی له ۱۹۹۰ بە دەستی عێـراق نـەدابایاوە و کۆمـەڵێك ڕێگـای نـەگرتبایا بـەر بـۆ لـە نـاو بردنـی ئـەمباری چـەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق

ـ بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق پتر لە ۲۰میلیۆن مینی لە سەراسـەری ناوچـە کوردنـشینەکان چاندووە کە کەند و کۆسپ درووست دەکات لە سەر ڕێگای نیشتەجێ کردنەوەی خەڵکی ئاوارە

ـ بـە هـۆی ئـەوەی بڕیارنامـەی ٦٨٨ی ١ی نیـسانی ١٩٩١ی ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نەتـەوە یەکگرتووەکان داوای لە عێراق کردووە سـەرکوتی هاووڵاتیـانی خـۆی ڕابوەسـتێنێت و داوای لـە کۆمەڵگای نیونەتەوەیی کردووە پڕۆگرامێکی حەواندنەوە بۆ خەڵکی سڤیلی عێـراق ، بەتایبـەت کوردەکان دابڕێژی

ـ بە هۆی ئەوەی لە بەهاری ١٩٩١وە ، ئەمریکا، بەریتانیا و فەرانسا هەر ڕۆژ هەرێمی دژەفڕین لە هێڵی ٣٦ لە باکووری عێراق بە هێزی ئاسمانی دەپارێزن.

بە هۆی ئەوەی جگە لە چەتری پاراستنی ئاسمانی هێزە هاوپەیمانـەکان ، نەتـەوە یـەگرتووەکانیش شالاوی حەواندنەوە و ئاسایشی لە عێراق ، بەتایبەت لە ناوچە کوردنشینەکان جێبەجێ کردووە

ـ بەهۆی ئەوەی لە ساڵی ١٩٩١ەوە ، وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا نزیکـەی ١/٢ بیلیـۆن دۆلاری تەرخان کردووە بۆ پاراستن و یارمەتیدانی کوردەکـانی عێـراق لـە شـالاوی دابینکردنـی ئاسایشدا

ـ بە هۆی ئەوەی کوردەکانی عێراق قەت ئاشتییەکی ڕاستەقینە بە چاو نابینن هەتا کاتێك کـە داپەروەری لە بەرامبەر تاوانبارانی عێراق جێبەجێ نەکرێت

کەوابوو کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری دا حکوومەتی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ :

١ــ هەشتەمین ساڵوەگەڕی کوژرانی ٥ هـەزار کـوردی عێـراق لـه هێرشـی کیمیـایی ١٩٨٨ بـه دەستی دەوڵەتی عێراق له هەڵەبجه بەرز رابگرێت له رێگای یادکردنەوەی ئەو ژن و منداڵ و پیـاوه بێ گوناحانەی که گیانیان لەم رووداوەدا له دەست داوه .
٢ــ جەخت له سەر ئەرکی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکاتـەوه بـۆ پاراسـتن و یارمەتیـدانی خەڵکی کورد له عێراق و ئەوه مسۆگەر بکات که تراژیدیای هەڵەبجه قەت دووپات نابێتەوه .
٣ــ پشتیوانی بکات له هەوڵەکان بۆ پێکهێنانی ئالترنـاتیڤێکی دیموکراتیـك بـۆ رژێـمی ئێـستای عێراق که مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکان له چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵدا به فەرمی بناسێت
٤ــ درێژه به هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکانی جەنگ بۆ دادگـایی کردنی رێبەرانی عێراق که تاوانی دژبه مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگیان ئەنجامداوه .

* * * * * *

بەڕێز " گیلمان" :
جەنابی سەرۆك من به توندی پشتیوانی دەکەم له بڕیارنامــەی ٣٧٩ی کـۆنگرێس کـه لـه ١٧ی ئاداری ١٩٩٦ له لایەن هاوکاری هێژامان ، بـەڕێز "پـۆرتێر"، نوێنــەری ئەیالـەتی "ئیلۆنـوێز" ئامادە کراوه که دەربڕی هەستی کۆنگرێسه به نیسبەت هەشتەمین ساڵیادی کۆمەڵکوژی ٥ هەزار کوردی عێراق له ئاکامی هێرشی کیمیایی دەوڵەتی عێراق.
وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا باش ئاگاداری کردەوه دڕندەکانی رژێـمی سـەدام حوسـەینه دژ بـه کەمینەکانی عێراق ، به تایبەت کوردەکان که ئێستا له باکووری عێراق له شاڵاوی دابینکردنـی ئاسایـشدا دەپـارێزرێن . پـشتیوانی وڵاتــه یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـەم شـاڵاوه شـتێکی یەکلاییکەرەوەیه لەبەر ئەوەی ئەمریکا له پاراستنی هەرێمی دژەفڕین له باکووری عێراق له هێڵی ٣٦ بەشداره و هەروەها بەهۆی یارمەتی ١/٢بیلیۆن دۆلاری ئـەمریکا بـۆ یارمــەتی و پاراسـتنی

کوردەکان لە باکووری عێراق کە ئێمە دەتوانین لەم ڕێگاشەوە وەڵامی دەستدرێژییەکانی سەدام بدەینەوە .

بڕیارنامەی ٣٧٩ی کۆنگرێس ڕووداوەکانی ١٧ی ئاداری ١٩٨٨ وەبیر دەهێنێتەوە و داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکات یادی ئەو خەڵکە بێ گوناحە بەرز رابگرێت کە لەم هێرشە تراژیدیکەدا گیانیان لە دەست داوە و جارێکی دیکە جەخت لە سەر ئەرکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکاتەوە بۆ پاراستن و یارمەتیدانی کەمینەی کورد لە عێراق و مسۆگەر کردنی ئەوە کە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە جارێکی دیکە دووپات نابێتەوە و پشتیوانی لەو هەوڵانە بکات بۆ پێکهێنانی ئاڵترناتیڤێکی دیموکراتیك بۆ رژێمی ئێستای عێراق کە لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵ دا دان بە مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکاندا بنێت و درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانباری جەنگ بۆ دادگایی کردنی ڕێبەرانی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی.

بەڕێز "مۆران" :

جەنابی سەرۆك ، ئەندامانی گرووپی کەمینەی کۆنگرێس ستایشی ئەم بڕیارنامەیە دەکەن کە لە لایەن بەڕێز "پۆرتێر" و بەڕێز " گیلمان"-ەوە خراوەتە ڕوو . پێویستە ئێمە تووڕەیی و ناڕەزایەتی خۆمان دەربڕین بە نیسبەت کۆمەڵکوژی ٥ هەزار کورد بە چەکی کیمیایی . لە پێشەڕۆژدا ئێمە دەبێ لە لایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی درێژە بە چاودێری کردن و گوشار خستنە سەر عێراق بدەین.

ئەم بڕیارنامەیە جەخت لە سەر بەرپرسیار بوونی ئێمە دەکات بەنیسبەت پاراستن و یارمەتیدانی کوردەکانی عێراق و پشتیوانی دەکات لە هەوڵەکان بۆ پێکهێنانی ئاڵترناتیڤێکی دیموکراتیك بۆ رژێمی ئێستای عێراق کە لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵی دیمۆکراتیك دان بە مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکاندا بنێت و داوا لە دەوڵەتی ئەمریکا دەکات درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانبارانی جەنگ بۆ دادگایی کردنی ڕێبەرانی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی ، بەتایبەت سەدام حوسەین . کەوابوو ئەمە بڕیارنامەیەکی باشە و داواکارم پەسەند بکرێت .

بەڕێز " گیلمان" :

سپاسی نوێنەری هێژای ئەیالەتی"ئیلونیوز " و هاوسەرۆكی كۆمیتەی مافی مرۆڤ ، بەڕێز "پۆرتێر" دەكەم كە رێبەری خەباتی ئێمە بوونە بۆ مافی مرۆڤ و كێشەی كوردیان بە ماوەی چەند ساڵ هێناوەتە بیری ئێمە .

بەڕێز "پۆرتێر" :

جەنابی سەرۆك سپاسی هاوسەرۆكی هێژای كۆمیتەی مافی مرۆڤ ، بەڕێز " گیلمان" دەكەم كە كاتی خۆی دا بە من و زۆر سپاسی دەكەم بە هۆی رێبەرایەتییە شازەكەی لە خەبات بۆ مافی كەمینەكان لە سەراسەری جیهان . بەڕێز " گیلمان" شێلگیر بووە لە سەر پشتیوانی كردن لە گەلی كورد كە مەزنترین گرووپی ئەتنیكی جیهانە كە ٢٥میلیۆنە و دەوڵەتی خۆی نییە و لە نێوان توركیا، ئێران، عێراق و سووریادا دابەش بووە . بەڕێز " گیلمان" بەتەواوی سەركەوتوو بووە لە رێبەرایەتیەكەی بۆ راكێشانی سەرنجی ئێمە بەرەولای بارودۆخی كوردەكان و خەبات بۆ مافە بنەڕەتیەكانی خۆیان لەم چەند ولاتەدا .

جەنابی سەرۆك ٨ساڵ پێش لە ١٧ی ئاداری ١٩٨٨ رژێمی سەدام حوسەین بە چەكی كیمیایی هێرشی كردە سەر شارۆچكەی كوردنشینی هەڵەبجە و لە ئەنجامدا پتر لە ٥ هەزار خەڵكی سڤیلی كورد ، لەوانە ژن و منداڵ كوژران. دوابەدوای هێرشەكە دەوڵەتی عێراق لە رێگای درێژەپێدانی سەركوتی كوردەكان ، سرووشتی نامرۆڤانەی خۆی نیشاندا .

لە ساڵی ١٩٨٨ پتر لە ٥ هەزار كوردی عێراق لە ئاكامی هێرشی كیمیایی دەوڵەتی عێراق كوژران و تەنها پاش داگیركرانی كوێت لە لایەن عێراق لە ١٩٩٠ بوو كە كۆمەڵگای نیونەتەوەیی هەنگاوی بۆ لە ناوبردنی ئەمباری چەكە كۆمەڵكوژەكانی عێراق هەڵگرت. ئەمڕۆ ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و كۆمەڵگای نیونەتەوەیی پشتیوانی لە هەوڵی پاراستنی كوردەكانی عێراق دەكەن . ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەوری سەرەكی بینیوە لە مسۆگەر كردنی

دەستپێڕاگەیشتنی کوردەکانی عێراق بە یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان و پاراستنیان لە بەرامبەر هێرشەکانی دەوڵەتی عێراق .

بە هەر حاڵ بارودۆخی کوردەکانی عێراق هەروا لەو پەڕی خراپی دایە . سەدام حوسەین درێژە بە کردەوە تیرۆریسیەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان دەدات لە ڕێگای خراپکاری و گەمارۆی ئابووری. لەمە زیاتر چاندنی ٢٠ ملیۆن مین لە سەراسەری ناوچە کوردنشینەکان لە لایەن دەوڵەتی عێراق ، کەند وکۆسپی دروست کردووە لە سەر ڕێگای هەوڵە مرۆڤدۆستانەکان . ئەمڕۆ نزیکەی ١٠٠هەزار سەربازی عێراقی لە لێواری ناوچە کوردنشینەکان مۆڵیان داوە و هەڕەشە لەم ناوچانە دەکەن .

جەنابی سەرۆک دەوڵەتی عێراق هاووڵاتیانی خۆی لە سەرەتاییترین مافەکان و ژیان لە ژێر سەروەری یاسا بێ بەش کردووە . نەتەوە یەکگرتووەکان دوابەدوای داگیرکرانی کوێت لە ١٩٩٠، گەمارۆی خستۆتە سەر عێراق . سەدام حوسەینیش درێژە بە سەر پێچیی کردن لە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات. لە ئاکامدا ڕەوشی ئابووری ڕۆژ بەرۆژ خراپتر دەبێت ، بەڵام باری ئەم ڕەوشە ئابووریە لە سەر شانی سەدام حوسەین نییە، بە پێچەوانەوە باری گرانی دیکتاتۆری و سیاسەتە سەرکوتکەرەکانی لە سەرشانی هاووڵاتیانی بێ گوناحی عێراقە کە لە مافی گۆڕینی دەوڵەت و مافی ئازادی ڕادەربڕین و پێکهێنانی کۆڕ و کۆمەڵەکان بێ بەش کراون . تەنها لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کوردەکان لە باکووری عێراق (کە لەلایەن هێزە نێونەتەوەییەکانەوە دەپارێزرێت) ڕێز لە مافی مرۆڤ دەگیرێت.

جەنابی سەرۆک، عێراق دەبێ هەر وەکوو ڕابردوو لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی گۆشەگیر بکرێت هەتا کاتێك کە ڕێز لە مافی هەموو مرۆڤێك بۆ ژیان ، عیبادەت و قسە کردن بە زمانی زگماکی بگرێت. ئێمە قەد نابێ ئەو کوردانەی عێراق لە بیر کەین کە لە ئاکامی کردەوە دڕندە و سەرکوتکەرانەکانی دیکتاتۆری سەدام گیانی خۆیان لە دەست داوە . جەنابی سەرۆك بەرپرسیارێتی زیندوو ڕاگرتنی یادی ئەوان بۆ هەتا هەتایە لە ئەستۆی ئێمەیە . ڕووداوەکانی

رابردوو بەروونی دەری خستووە سەدام حوسەین سبەینێ دیسان هێرش دەکاتەوە سەر کوردەکان ، ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەیانپارێزێت . لە ساڵی ۱۹۹۱ەوە "شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش" یارمەتی مرۆڤدۆستانەی بۆ کوردەکان دابین کردووە و پاراستوونی . من لە سەر ئەو بڕوایەم بێ یارمەتی ئەخلاقی و ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بێ هیچ گومانێک ژمارەیەکی زۆرتر لە پیاو و ژن و منداڵی بێ گوناح ژیانی خۆیان لە دەست دەدەن . وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژە بە پشتیوانی کردن لە کەسانێك وەك کوردەکانی عێراق بدات کە مافە بنەڕەتییەکانی خۆیان تەسلیمی دیکتاتۆرێکی مرۆڤکوژ و سەرکوتکەر وەك سەدام نەکردووە .

جەنابی سەرۆك ، ئەمڕۆ بە پەسەند کردنی ئەم بڕیارنامەیە کۆنگرێس ڕەچە شکێنی دەکات لە بەرز ڕاگرتنی یادی هێرشی ۱۷ی ئاداری ۱۹۸۸ بۆ سەر کوردەکان و جەخت دەکاتەوە لە سەر پشتیوانی بە هێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خەڵکی کوردی عێراق . تکا دەکەم دەنگبدەن بەم بڕیارنامەیە.

جەنابی سەرۆك ڕێگەم پێدەن لەم پەیوەندییەدا ئاماژە بە خاڵێکی دیکە بکەم . ئەم دواییانە هاوپەیمانی ئێمە واتا تورکیا سەرۆك وەزیرانێکی نوێی بە ناوی "مەسعود ییلماز" هەڵبژاردووە . "یلماز" داوای دیالۆگی لەگەڵ یۆنان کردووە. ئەم دیالۆگە دەتوانێ گەلێ لە ناکۆکییەکانی نێوان تورکیا و یۆنان چارەسەر بکات و پەیوەندییەکانی ئەم دوو وڵاتە بباتە قۆناخێکی دیکە و لە ئەنجامدا گرژییەکانی ئەم هەرێمە جۆگرافییە کەم بێتەوە . سەرۆك وەزیران یلماز ڕایگەیاندووە دەیەوێت دەروازەیەکی گەورەتر بۆ وتووێژ لەگەڵ ئەرمەنستان بکاتەوە، ئەگەر نیشانەیەکی روون ببینێت لە پیشکەوتنی وتووێژی ئاشتی لە نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان بۆ کۆتایی پێهاتنی شەڕی ٥ ساڵەی نێوان ئەم دوو وڵاتە لە سەر هەرێمی "ئەگرۆنی قەرەباخ ".

"مەسعود یلماز" هەروەها بە نیسبەت سەرکوتی کوردەکان لە باشووری تورکیا بە دەستی دەوڵەتی تورکیا ڕایگەیاندووە بەرنامەیەکی بە دەستەوەیە بۆ بەخشینی ئازادییە کولتوورییەکان بە

کوردەکان وەك پەروەردە بەزمانی کوردی کە گرووپە کوردە میانەڕەوەکان لە مێژە هەوڵی بۆ دەدەن ." یلماز" هەرووەها وتوویەتی ڕەوشی نائاسایی هێندی هێندی لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵات هەڵدەگرێت و کۆمەڵێك هەنگاو هەڵدەگرێت بۆ باشتر کردنی ڕەوشی ئابووری ئەم ناوچەیە کە بە هۆی گرژی درێژخایەنی نێوان کوردەکان و تورکیا لاواز بووە . مەسعود یلماز هەروەها رایگەیاندووە:

"پاش دیتنی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنانەی رابردوو و لە دەستدانی ١٥هەزار کەس بە بیروبۆچوونی من دەبێ بگەینە ئەو قەناعەتە کە ئەم کێشەیە تەنها لەرێگای ئاشتیخوازانە چارەسەر دەکرێت نە لە ڕێگای سەربازی."

جەنابی سەرۆك ئەم دەنگ و باسانە لە رادەبەدەر باشن . ئەمە هەمان ئەو هەڵوێستەیە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێمە لە کۆنگرێس لە مێژە هەوڵمان بۆ داوە بە نیسبەت بارووودۆخی کوردەکان لە تورکیا . ئەگەر دەوڵەتی تورکیا ئەم سیاسەتە پەیڕەو بکات و خەڵکی تورکیا پشتیوانی لە سەرۆك وەزیرانی نوێ بکەن ، بە باوەڕی من ژیانی هەزاران هەزار خەڵکی بێ گوناح( هەم کوردەکان و هەم تورکەکان ) دەپارێزێت . سپاسی سەرۆك وەزیران مەسعود یلماز دەکەم بۆ ئەم دەستپێشخەرییە . دەزانم جێبەجێ کردنی ئەم بەڵێنانە ، بوێرییەکی سیاسی زۆری دەوێت . ئێمە بەڵێن دەدەین کار بکەین لەگەڵ تورکیا بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی لە گەڵ یۆنان و ئەرمەنستان و کێشەی کورد لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا کە بووەتە هۆی کوژران و ئاوارەبوونی ئەم هەمووە خەڵکە و هەموو ولاتی تورکیای تووشی ئەم بەلا و نەهامەتییە درێژخایەنە کردووە .

بەرێز" ئێسمیت" نوێنەری ئەیالەتی" نیوجێرسی" :

جەنابی سەرۆك منیش سپاسی بەرێز "پۆرتێر" دەکەم بۆ ئەم بڕیارنامە باشە و ڕێبەرایەتیەکەی لەم پەیوەندییەدا .

بەرێز "پۆرتێر" ساڵەهای ساڵە شێلگیرانە هەوڵ دەدات بۆ خستنە ڕووی بارووودۆخی دژواری کوردەکان کە ئێش و ئازاری زۆریان چەشتووە و سپاسی دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی ساڵڕۆژی

كوژرانی ٥ههزار كورد به چهكی كیمیایی . من قهت وینهی ئهو دایكه كورده له بیر ناكهم كه منداڵه ساواكهی تووند له ئامێز گرتبوو و دهمی منداڵهكه ههروا كراوه مابووهوه و له ئهنجامی كیمیابیهكه دا ههردوویان به شێوازێكی ترسناك كوژرا بوون . ئهم دایك و منداڵه تهنها یهكێ له قوربانیانی سهدام حوسهین بوون ، یهك له ههزاران. ههروهها دهمهوێت وهبیرتان بهێنمهوه كه رژێمی سهدام حوسهین درێژه دهدات به كوشتن ، ئهشكهنجهو زیندانی كردنی نایاسایی كوردهكان له عێراق و خهڵكی دیكهی نهیاری رژێم له شوێنهكانی دیكهی عێراق . كارمهندانی رێكخراوه فریاگوزارییه نێونهتهوهییهكانیش كه یارمهتی كوردهكان دهدهن ، بوونهته قوربانی كوشتن و بێ سهروشوێن كردنی دهوڵهتی عێراق .

جهنابی سهرۆك له سهرهتای دهیهی ۱۹۹۰ من یهكێ له ئهندامانی ئهو لێژنهیه بووم كه سهردانی كهمپی ئاوارهكانم كرد له سهر سنووری توركیاو عێراق و قسهم لهگهڵ گهلێ لهو كوردانه كرد كه له سهركوتی سهدام ههڵهاتبوون. ئهم سهردانه درووست دوابهدوای شهڕی كهنداوی فارس و گهرماوگهرمی سهركوتی كهمینهی كورد له لایهن گاردی كۆماری عێراقهوه بوو . بۆ من زۆر سهرنجڕاكێش بوو ببینم چۆن سوپای ئێمه شاڵاوی دابینكردنی ئاسایش ئهنجام دهدات . هێزهكانی ئێمه هاتنه ناوچه ، به رێكخستن كران و توانیان پێداویستی لۆجیستیكی خوراك و دهواو دهرمان دابین بكهن و ههزاران كورد له ههوڵه مرۆڤدۆستانهكانی سوپای ئهمریكا له شاڵاوی دابینكردنی ئاسایش كهڵكیان وهرگرت . پاش چهند مانگ ، بارووددۆخهكه سهقامگیر بوو و رێگا بۆ ئهوه ههموار كرا رێكخراوه ناحكوومییهكان پێداویستیهكانی كوردهكان دابین بكهن .

جهنابی سهرۆك ههروهها كه هاوكار و دۆستی هێژام بهرێز "پۆرتێر" ئاماژهی پێ كرد ، كوردهكانی توركیا ئێش و ئازاری زۆریان بینیوه. سهر له بهیانی ئهمڕۆ من و بهرێز "مۆران" و بهرێز " گیلمان" و بهرێز" هیده "و ئهندامانی دیكهی كۆمیتهی كۆمیسیۆنهكانی پهیوهندیدار بهم ناوچانه بیستمان ئهمریكا دهیهوێت كۆپتهری "كوبرا" بفرۆشێت به توركیا . من وهك سهرۆكی كۆمیسۆنی مافی مرۆڤی نێونهتهوهیی له سهر ئهو باوهڕهم فرۆشتنی كۆپتهری كوبرا به

تورکیا مەترسیدارە لە بەر ئەوەی سوپای رژێمی تورکیا پێشتر لە شالآوی پاکتاو کردنی ئـەتنیکیی کوردەکان لەم کۆپتەرانە کەڵکی وەرگرتووە و لەوانەیە جارێکی دیکـە لاپەڕەیـەکی خـەمناك لـە ئێش و ئازارەکانی ئەم خەڵکە بکرێتەوە .

ئەو کۆمەڵکوژییە ٥هەزار کەسییە کە لەم بڕیارنامەیەدا ئاماژەی پێکراوە تەنها یەکێ لە ئاڵقـە گەورە و زۆر دڵتەزێنەکانی زنجیرە تراژیدیاکانی کەمینەی کوردە ، کەوابوو ئەمـە بڕیارنامەیـەکی گرنگە ، تکا دەکەم پەسەند بکرێت.

## ئاسایشی كەمینەی كورد
## ٥ ی ئەیلوولی ١٩٩٦- ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "پۆرتێر" :

جەنابی سەرۆك ، گەلی كورد گەلێكی كۆن و كەوناره كه ٣٠ میلیۆن كەسه و له ئێران، عێراق، توركیا و سوریا دەژی و له هەموو ئەم وڵاتانەدا دەچەوسێتەوە .

هیچكام لەم وڵاتانه نایانەوێت خەڵكی كورد یەك بگرن و بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دەبینن كوردەكان پارچه پارچه بن و له ناوخۆیاندا شەڕ بكەن . ئەم دەوڵەتانه هەركاتێك بۆیان كراوه چەكیان داوه به لایەنه جۆراوجۆرەكان و له ڕێگای پڕوپاگەندا و ئامرازەكانی دیكه كەڵكیان لێوەرگرتوون بۆ ئەوەی بیانخەنه ژێر ركێفی خۆیان. ئەمڕۆ سەرنجی میدیاكان له سەر مووشەكی cruise چڕ بووەتەوە بەڵام خەڵكی بێ گوناحی كورد دەكوژرێ و بارودۆخی كوردستانی عێراق یەكجار مەترسیداره .

جەنابی سەرۆك ئەم بارودۆخه ئاڵۆزترو خراپتر بووه لەبەر ئەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا نەیتوانیوه حیزب و لایەنه كوردەكان له یەكدی نزیك بكاتەوە و ڕێگا بەوه نەدات له لایەن دەوڵەتەكانەوە بەكاربهێنرین و ئەم دەوڵەتانه وەك مرۆڤ رێز له مافی كوردەكان بگرن .

جەنابی سەرۆك كاتێ كه من مانگی تەمووز لەگەڵ نوێنەرانی وەزارەتی دەرەوە دانیشتم، بینیم هیچ خەبەریان لەوه نییه كه ئێران سنووری عێراقی بەزاندووە و هێرشی كردووەته سەر بنكەكانی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران (PDKI) له باكووری عێراق . پاش هێرشەكەی ئێران، دەوڵەتی ئەمریكا هیچ هەڵوێستێكی نەگرتووە و ئەم هێرشەی شەرمەزار نەكردووە . بەڵام بێ گومان دەوڵەتی عێراق وەك دەستدرێژی بۆ سەر خاكی وڵاتەكەی سەیری ئەم هێرشەی ئێرانی كردووە و بەرەو باكووری عێراق كەوتۆتە جموجۆڵ . دەوڵەتی عێراق به سوپایەكی گەورەوە هاتووەته باكوور بەڵام ئەو ڕاستییه كه دەوڵەتی عێراق له ماوەی ٥ ساڵی رابردوو تا كاتی

ده‌ستپێکردنی شالاوی دابینکردنی ئاسایش جووڵه‌یه‌کی وای نه‌کردووه به روونی نیشان ده‌دات هۆکاری ئه‌م جموجۆڵه‌ی ده‌وڵه‌تی عێراق ، هێرشی ئێران بۆ سه‌ر باکووری عێراق بووه .

ئێمه هیچ کارێکمان نه‌کرد بۆ پێشگرتن له‌م رووداوه ، هیچ کارێکمان نه‌کرد بۆ چاره‌سه‌ر کردنی ناکۆکی نێوان یه‌کێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) و پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK) و به بیروبۆچوونی من ئه‌مه سه‌ره‌تای کۆمه‌ڵه کێشه‌یه‌که که ئێستا ئێمه له ناوچه رووبه‌رووی بوینه‌ته‌وه. ئه‌مرۆ گارده‌کانی کۆماری عێراق (که ژماره‌یه‌کی زۆریان جلوبه‌رگی کوردیان له به‌ر کردووه ) له شاری کۆیه‌ن، له شاری سلیمانین ، ماڵ به ماڵی کورده‌کان ده‌گه‌ڕێن و چه‌پاوی ده‌که‌ن و خه‌ڵکی بێ گوناح ده‌کوژن و ده‌برن ، به‌ڵام ئێمه هیچ کارێکیان بۆ ناکه‌ین .

له سنووری باکووری کوردستانی عێراق ، ده‌وڵه‌تی تورکیا له‌م بارووده‌خه که‌لکی وه‌رگرتووه و ٣تا ٦ مایل له خاکی عێراقی داگیر کردووه و ٣٥ هه‌زار سه‌ربازی تورك و جاشی تێکردووه و گوندنشینه‌کانی له ناوچه‌که ده‌رکردووه و ئه‌و گوندنشینانه‌ی کوشتووه که ناوچه‌که‌یان به جێ نه‌هێشتووه. ده‌وڵه‌تی تورکیا ناوچه‌یه‌کی بێ دانیشتووی له پاڵ سنووری تورکیا درووست کردووه له ناو خاکی عێراق دا.

جه‌نابی سه‌رۆك ، ئه‌م بارووده‌خه بارووده‌خێکی مه‌ترسیدار و جیدییه که ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا زۆر به‌رپرسیاره له به‌رامبه‌ری و ته‌نها بۆمبارانکردنی باشووری عێراق به مووشه‌کی cruiseو وتنی ئه‌مه که ئێمه ده‌ستدرێژی عێراق راده‌وه‌ستێنین ، به‌س نییه . ئه‌م ده‌ستدرێژییه ئێستاش هه‌ر به‌رده‌وامه و به‌ره‌و هه‌موو لایه‌ك درێژه‌ی هه‌یه. ئه‌و خه‌ڵکه که له ناوه‌ڕاستی ئه‌م هێرشه گیریان خواردووه، خه‌ڵکێکی بێ گوناهن که به درێژایی مێژوو له لایه‌ن ده‌وڵه‌ته‌کانیانه‌وه به‌کار هێنراون و به توندترین شێوه سه‌رکوت کراون. ئێستا کاتی ئه‌وه هاتووه سه‌رۆك کۆماری ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا هه‌ڵبسێت به داکۆکی کردن له مافی ئه‌م گه‌له که ئێستا پتر له هه‌رکاتێکی دیکه پێویستی به یارمه‌تی ئێمه هه‌یه .

## كهی ئێمه رێبهرایهتی ئیمپریالیزم رادهوهستێنین: هێزهكانی سهدام هێشتا له ههولێرن
## ٥ ی ئهیلوولی ١٩٩٦ - ئهنجوومهنی نوێنهران

بهڕێز "دۆرنان"[١]:

جهنابی سهرۆك منیش له گهڵ بیروبۆچوونهكانی بهڕێز " پێڵ " دام. بارودۆخی باكووری عێراق زۆر خراپه . ئایا رۆژێك دێت خهڵكی كورد ئاسایش و ئارامی به چاوی خۆی ببینێت .
گهلی كورد یهكێ له گروپه ئهتنیكیه چارهرهشهكانه كه له نێوان ٤ ولاتدا دابهش كراوه و جۆگرافیاكهی له ماوهی چهند سهدهی رابردوودا ، گهلێ جار گۆڕاوه . تهنها نهتهوهیهك كه به بیروبۆچوونی من وهك نهتهوهی كورد به ٤ بهش دابهش كراوه ، نهتهوهی ئهرمهنه كه ئێستا كهمتر له یهك له چواری ولاتی راستهقینهی خۆی به دهستهوهیه و یهكهمین نهتهوهیه كه سالی ٣٠٠ی زایینی واتا سهدهی چوارهم بووهته مهسیحی . ئێستا ئهم گهلی كورده له نێو خۆیدا پارچه پارچه بووه و دهستی كردووه به شهڕی براكوژی .
پاش دهستپێكردنی شالاوی دابینكردنی ئاسایش ئێمه ههلی ئهوهمان بۆ رهخسا لهگهڵ لیژنهیهكی دیپلۆماتیك له لایهن سهرۆك جۆرج بوشهوه سهردانی باكووری عێراق بكهین، "جیمز بهیكێر" ی وهزیری دهرهوهش سهردانی ناوچهی كرد . كاتێ كه من بۆ ماوهی ٣تا٤ رۆژ بۆ نهشتهرگهری له نهخۆشخانه بووم (ئهمه یهكهم جار بوو له ژیانمدا نهخۆشخانهم دهبینی) سهرۆك بوش له ٣ی نیسانی ١٩٩١ كه رۆژی له دایك بوونم بوو تهلهفوونی بۆ كردم و وتی پێم :" باب[٢] " له نهخۆشخانه وهره دهرهوه ، پێویستمان پێته . منیش وتم دهتوانین باسی بازرگانی بكهین ؟ ئهویش وتی چی؟ دهتهوێت له نهخۆشخان دهربارهی بازرگانی قسه بكهی . منیش وتم" جهنابی سهرۆك كۆمار هێڵێك بكێشه له ناو شاخهكاندا ، ههروا كه له نێوان لمهكاندا كێشاوته . ئهویش وتی :

---

Mr. DORNAN[١]
"Bob[٢]

"باب" هەندێ هێز لە واشنگتۆن هەن کە دەیانەوێت عێراق ببێت بە لانیکەم سێ دەوڵەت .
منیش وتم : ئەگەر سەیری تەلەفزیۆن بکەی(هەروا کە من لەم دوو ڕۆژەی دواییدا زۆر سەیرم
کردووە) وێنەی ئاوارە کوردەکان مێشکت دەشێوێنێت . وێنەی ئەو ژنە کوردانە دەبینێت کە دێنە
ناو کەمپەکانی سەر سنووری تورکیا و عێراق لەکاتێکدا منداڵیان بە کۆڵەوەیە کە پێشتر لە
سەرماو سۆڵەدا مردوون" . بە خۆشحاڵییەوە هەر ڕۆژ گەرما ٤ پلە بەرزتر دەبوو و سەرۆك بوش
وتی:" باشە با بزانین چۆن دەبێ ". پاشان میدیاکان هێرشێکی هۆڤانەیان کردە سەر سەرۆك بوش
. ئەمە ٤ ڕۆژ پاش کۆتایی پێهاتنی شەڕی زەمینی لە عێراق لە ٢٧ی کتنوونی یەکەم بوو . ٠
هەفتە پاش ئەوەش ئەوان هەر سەیری ئەو وێنانەیان دەکرد. لە ماوەی چەند ڕۆژدا سەرۆك [illegible]
ئەو هێڵەی لە شاخەکانی باکووری عێراق کێشا و شاڵاوی دابینکردنی ئاسایشی بەڕێخست
بەڵام باوەڕ کردنی ئەوە زەحمەتە کە ئەم مانگی ئادارە ، ٦ساڵ تێپەڕ دەبێت و کوردەکان [illegible]
دەچەوسێنرێنەوە. هەروەها کە بەڕێز "پۆرتێر" باسی کرد سەربازانی عێراق لە باکووری وڵاتن و
لە دەرگای ماڵەکان دەدەن و خەڵك دەدەنە بەر دەستڕێژی گوللە . هێزەکانی عێراق لە چەند ڕۆژی
ڕابردووەوە دەستیان کردووە بە تۆپبارانی هۆڤانەی هەولێر (کە پایتەختی خەڵکی کوردە لە
هەرێمی باکوور) .
بۆ بەڕێز کلینتۆن لەماوەی خولی یەکەمی سەرۆك کۆماری خۆی ئەم ناوچەیەی بە تەواوی
پشتگوێ خستووە . ئێمە بەرژەوەندی ئیستراتیژیکمان هەیە لەم ناوچەیە، بە هۆی ئەوەی کە
دیکتاتۆرێك وەك سەدام دەتوانێ نرخی نەوت لە سەراسەری جیهان بشێوێنێت . سەدام خێراتر لە
هەر کەسێکی دیکە بەرەو بەدەستهێنانی تەکنۆلۆژیایی ناوکی ، بیۆلۆژیکی و کیمیایی دەچێتە
پێش ، ڕاستیەکەی ئەوەیە ئێمە قەت نەمانتوانیوە یەك دانە موشەکی **scud** لە عێراق
بدۆزینەوە . جەنابی سەرۆك لەم پەیوەندییەدا چەند پرسیارێکم هەیە.

١- ئێمە بۆ تا ئێستا لە باکوور هێرشمان نەکردووەتە سەر سوپای عێراق کە بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی پێشێل کردووە و خەڵکی کوشتووە. ئەم هێزانە لە باکوور دەستلێنەدراون . ئێمە تەنها هێرش دەکەینە سەر ئامانجەکانی باشووری عێراق .

٢- ئایا هۆکارەکەی ئەوەیە ئەم ئامانجانە نەرمترن ؟ لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێ هێزی ئاسمانی زۆرترمان هەیە لە باشوور یان هۆکارەکەی ئەوەیە تورکیا لەم پەیوەندییەدا هاوکاریان ناکات. ئێستا دەوڵەتێکی بناژۆخواز لە تورکیا دەسەڵاتدارە، خاتوونی سەرۆك کۆماری درەوشاوە(مەبەستی تانسۆ چیللەرە- وەرگێڕ) هەرەسی هێناوە ، هەر بۆیە من وای بۆ دەچم تورکیا ناهێڵێت ئێمە لە بنکەی" ئینجرلیك[٤] " کەڵك وەربگرین کە بنکەی هێزەکانی شالاوی دابینکردنی ئاسایشە. ئەو رۆژە کە جەنگی زەمینی لە"ئینجرلیك" دەستی پێکرد واتا ٢٤ی شوبات من لەوێ بووم ، بە یارمەتی ئەفسەرێکی ئازای هێزی ئاسمانی کە ناوی نابەم من توانیم بە فڕۆکەیەکی KC ١٣٥ بچمە ناوچەی "دیازتەك" لە سەر سنووری عێراق و تورکیا .

٣- ئایا کۆمەڵێ هۆکاری ژئۆپلۆتیکی لە پشتی ئەمەیە ؟ گومانم هەیە .

ئەگەر کردەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەڵامێك بوو بە هێرشی عێراق بۆ سەر یەکێ لە دوو حیزبە سەرەکییەکانی کوردستانی عێراق ، بۆ هەرێمی دژەفڕین بەرەو باشوور بەرفراوانتر نەکرایەوە ؟

٤- شارە کوردنشینەکانی سلێمانی و کەرکووك هەردوویان لە دەرەوەی هەرێمی دژەفڕینن. ئایا ئەم شارانە نابنە ئامانجی هێرشی سەدام لە داهاتوودا ئەگەر سەدام بڕیارێکی وابدات .

٥- ئەگەر دەوڵەتی عێراق سەربازانی خۆی رەوانەی ناوچە کردبایا( لانیکەم بە ماوەی ٣هەفتە) ئایا حکومەتی کلینتۆن هۆشداری دەدا بە عێراق کە وڵاتە یەکگرتووەکانی

---

[٤] Incirlik

ئەمریکا وەڵامی سەربازی دەداتەوە ئەگەر هێرش بکاتە سەر کوردەکان. ئێمە دەمانتوانی پارچەی تۆپەکان لە سەر زەوی ببینین. ئەم هەستە لە ناو ئەورووپادا هەیە کە دەوڵەتی عێراق نەیویستووە هێرشی راستەقینە بکات و ئەمە تەنها نیشاندانی هێز بووە . مرۆڤ دەیتوانی رێگای هاتووچۆی سەربازان بۆ هێرش بۆ سەر هەولێر ببینێت، کەوابوو بۆ هیچ هۆشدارییەك لێرەوە نەدرا بە سەدام . کوا کۆمەڵگای نێونەتەوەیی تا بە سەدام بڵێت ئەگەر کارێکی وا بکەیت ئەمە ئەنجامەکەی دەبێت، یا گومانی ئەوە هەیە کە لە رووی سیاسیەوە بە قازانجمانە کە رێگە بە جموجۆڵی سەدام بدەین و پاشان دژەکردەوەیەکی بچووکی خێرا نیشان بدەین.

٦- بۆ دەوڵەتی ئەمریکا وەڵامی نەدایەوە کاتێك کە ئێران ئەم دواییانە هێرشی کردە سەر یەکێ لە دوو حیزبە سەرەکییەکانی کوردستانی عێراق کە دەوڵەتی عێراق پشتیوانی لێدەکات و بۆتە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق بریار بدات تۆڵە لەو حیزبە کوردە بسێنێتەوە کە ئێران پشتگیری دەکات . بۆ ئێمە وەڵامان نەدایەوە کاتێك کە شەڕەکە لەم دواییانە دەستی پێکرد . تەنانەت لە چاپەمەنییەکانیشدا وەڵامان نەدایەوە، ئەوان سەرقاڵی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی حیزبی دیموکراتی (ئەمریکا) بوون .

٧- بۆ وەڵامی سەربازی ئێمە ئەوەندە لاوازە و هیچ هەڕەشەیەك نییە لە سەر هێزەکانی عێراق لە باکوور.

٨- ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەڵامەکەی بەرفراوان دەکات ئەگەر عێراق هێرش بکاتە سەر سلیمانی و کەرکوك و هێزەکانی لە ناوچە بێننەوە؟ هێزەکانی عێراق هێشتا لە هەولێرن . بە گوێرەی هەندێ لە راپۆرتەکان دەیانەوێت لە هەولێر بکشێنەوە ، بەڵام نە هەموویان . هێزەکانی عێراق هێشتا لە پایتەختی کوردستانی عێراقن . هەولێر ئەو شوێنەیە کە دوو دانە کۆپتەر لە ئاڤریلی ١٩٩٤ بە هەڵە خرانە خوارەوە بە دەستی دوو فڕۆکەوانی فرۆکەی F ١٥ . یەکێ لەم فڕۆکەوانانە لە هێزی ئاسمانی چووەتە

دەرەوە و ئەوی دیکەش دەیەوێت بچێتە دەرەوە . ئێمە دوودانە کۆپتەری ئەتەوە یەوکگرتووەکانمان خستە خوارەوە کە هەرکامیان ١٣ کەسیان تێدا بوو و زۆربەیان ئەمریکایی بوون . ئەمە تراژیدی بوو ، ئەوان بەرەو کوێ دەچنە پێش؟ بەرەو هەولێر کە لە دەرەوەی هەرێمی دژەفڕینە . کەوابوو ئێستا سەدام کۆنترۆڵی تەواوی بە دەستەوەیە ئەگەر بڕیاری گرتنی سلێمانی و کەرکووك بدات.

٩- چی هەوڵێك دەدرێت بۆ کۆکردنەوەی پشتیوانی هێزەهاوپەیمانەکان و دەوڵەتانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست بۆ کاری زۆرتر . ئەمە کارێکە کە سەرۆك کۆماری پێشوو ، جۆرج بوش سەرکەوتنێکی درەوشاوەی تێیدا بە دەست هێنا. بوش ٢٨ دەوڵەتی لە هێزە هاوپەیمانەکان لە دەوری یەك کۆ کردەوە. بوش تەنانەت ڕکوردی گۆرباچۆڤی شکاند. پێکهێنانی ئەم هاوپەیمانییە شاکارێکی سەرسووڕهێنەری دیپلۆماسی بوو بۆ جۆرج بوش و" جیمز بەیکێر"ی وەزیری دەرەوە. بەلام ئێستا کێ لەگەڵمانە ؟ هەروا کە ئامارەم پێکرد نە فەرانسا نە تورکیا لەگەڵ ئێمە نیین ، تەنها ولاتی دایك و هەمیشە ئامادەمان بەریتانیای مەزن لە گەڵمانە .

## وەڵامی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە دەستدرێژییەكانی دەوڵەتی عێراق بۆ سەر باكووری وڵات

### ٥ی ئەیلوولی ١٩٩٦- ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "داشلی":

جەنابی سەرۆك ، رۆژی شەمبە من بە كورتی باسی بیروبۆچوونەكانی خۆمم كرد سەبارەت بە بڕیاری سەرۆك كلینتۆن بۆ وەڵامدانەوە بە هێرشە هانندەراو ، پاساو هەڵنەگر و دڕندانەكەی دەوڵەتی عێراق بۆ سەر خەڵكی سڤیلی هەولێر كە شارێكە لە باكووری عێراق . ئەو كاتە من وتم بەنیازم بڕیارنامەیەك لە ئەنجوومەنی پیران بخەمەڕوو بۆ شەرمەزار كردنی ڕەفتاری سەدام حوسەین و پشتیوان كردنی ئەنجوومەنی پیران لە كردەوەكانی سەرۆك كۆماری ئەمریكا . دەبێ بڵێم قەت وێنای ئەوەم نەدەكرد ئامادەكردنی بڕیارنامەیەكی ئەوەندە سادە ( بۆ پشتیوانی كردن لە كردەوەكانی ئەم هەفتەیەی سەرۆك كۆمار ) ئەوەندە كات بگرێت و ئەوەندە زەحمەت بێت .
چەند رۆژە ئێمە هەوڵ دەدەین مەسەلەكانی پەیوەندیدار بە زمانی بڕیارنامەكە چارەسەر بكەین بەڵام هەوڵەكانمان بە كۆمەڵێك هۆكار بێ ناكام بوو ، زۆرتر بە هۆی ئەوەی گەلێ لە هاوكارانمان سەر بە لایەنی دیكە (مەبەستی كۆماریخوازەكانە- وەرگێڕ) نایانەوێت ستایشی سەرۆك كۆمار بكەن یان رێگایەك بدۆزنەوە بۆ ستایش كردن لە كردەوەكانی سەرۆك كۆمار . لە راستیدا ئێمە بۆ ماوەی چەند كاتژمێر مشتومڕی ئەوەمان دەكرد كە ئایا وشەی" سەرۆك كۆمار " لەم بڕیارنامەكە بە كاربێنین یا نا؟ گەلێ لە هاوكارانمان سەر بە لایەنی بەرامبەر پێداگرییان دەكرد كە نابێت وشەی " سەرۆك كۆمار " بەكار بهێنین و سەرەنجام لەسەر داوای گەلێ لە هاوكارانم لە حیزبی كۆماری ، وشەی "سەرۆك كۆمار"مان لە بڕیارنامەكە سڕییەوە.
لە راستیدا تەنها شتێك كە لەم بڕیارنامەیەدا ئاماژە بە سەرۆك كۆمار دەكات دەستەواژەی "فەرماندەی گشتی"یە و دەبێ بڵێم ئەمە بۆ گەلێ لە ئێمە لە جێی خۆیدایە بەڵام ناخۆشبوونی

بارووددۆخەکە بووەتە هۆی لایەنگری ئێمە (له راستیدا لایەنگرییەکی زۆر) لەم تاوتوێکردنانە. لـە هەمان کاتدا رێگەم پێ بدەن سپاسی رێبەرایەتی زۆرینە( مەبەست دیمۆکراتەکانە ـ وەرگێر) بکـەم بۆ درێژەپێدانی هاوکارییـەکانیان بـۆ چارەسـەر کردنـی کێشـە گرنگـەکان و چـاککردنی زمـانی بڕیارنامـەکە کە ئێستا له ئەنجوومەنی پیران دەخرێتە روو . کار و هاوکاری رێبەرایـەتی زۆرینـە و هەروەها هەندێ له هاوکارانم له لایەنی بەرامبەر ئێمەی گەیاندە ئەم قۆناخـە . هـەروەها رێگـەم پێبدەن سپاسی سناتۆری هێژای ئەیالەتی "جۆرجیا "و ئەندامی پایەبەرزی "کۆمیتـەی خزمەتـە سەربازییەکان" ، بەڕێز "نۆن" و سناتۆری هێژای ئەیالەتی "میشیگان "، بـەڕێز "کارێـل لڤـین" بکەم . هەروەها سپاسی سناتۆر " پێڵ" و سناتۆر "جۆزێف بایدن "دەکەم کە یارمەتیان دام بـۆ ئامادەکردنی ئەم بڕیارنامەیە . هەروەها سپاسی سناتۆر "جان مەککین[1]"، سـناتۆر "وارنێـر[2] "و چەند کەسی دیکە دەکەم کە یارمەتیان دام بۆ گەیشتن بەم قۆناخە .

رێگەم پێبدەن بە تەواوی روونی بکەمەوە کە سەرەڕای ئەو مشتومڕانەی کە سـەبارەت بـە کـەڵك وەرگرتن یا کەڵك وەرنەگرتن له وشەی "سەرۆك کۆمار" کرا ، ئەم بڕیارنامەیە زۆر بە روونی و بە توندی و له ناخی دڵەوە پشتیوانی له هەنگاوەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لـە ٧٢ کاتـژمێری رابردوودا دەکات.

شەمبەی رابردوو سەرەڕای هۆشدارییە روونەکانی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و کۆمـەڵگای نێونەتەوەیی ، هێزەکانی عێراق هێرشیان کردە سەر دانیشتوانی کوردی سڤیلی بە بـێ پاراسـتنی هەولێر و دەور وبەری . بە گوێرەی راپۆرتەکان هێزەکانی عێراق مـاڵ بـە مـاڵ گـەڕاون و هەنـدێ کەسیان کوشتووە ، بەداخەوە ئەم راپۆرتانە راستن. زێدەباری ئەم دەستدرێژییە روونە بۆ سەر ژیانی مرۆڤ ، داگیرکاری سەدام هەروەها هەڕەشەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لەم ناوچە هەستیارەی جیهان دا .

---

[1] McCain
[2] Senator Warner

ئهگهری شهڕی ناوخۆیی زۆر بهرز بووهتهوه و سهقامگیری ناوچه تووشی مهترسی بووه، کهوابوو مهترسی ناکۆکییهکی بهرفراوانتر له ناوچه زۆرتر بووه . هێرشی سهدام به تهواوی دژی بڕیارنامهی ٦٨٨ ی ئهنجوومهنی ئاسایشی نهتهوه یهکگرتووهکانه که له ساڵی ١٩٩١ و دوابهدوای شهڕی کهنداوی فارس پهسهند کراوه. ئهو کاته ئهنجوومهنی ئاسایشی نهتهوه یهکگرتووهکان ئهو دهسهڵاتهی بهخشی به وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا، بهریتانیا و فهرانسا که له رێگای دامهزراندنی ههرێمی دژهفڕین له بهشێکی گهورهی باکوور و باشووری عێراق، خهڵکی کورد له بهرامبهر پێشێل کردنی مافی مرۆڤ له لایهن رژێمی عێراق بپارێزن. هێرشی سهدام بۆ ههولێر پێشێل کردنی یهکجار زۆری رێوشوێن و یاسا نێونهتهوهییهکانه ، کهوابوو بڕیارهکانی سهرۆك کۆماری ئهمریکا بۆ هێرش کردنه سهر ٤ ئامانجی سهرهکی له عێراق به ٤٤ مووشهکی "کروز" و بهرفراوانتر کردنی ههرێمی دژه فڕین ههتا دهوروبهری شاری بهغداد له لایهنی باکوورهوه مهسهلهیهکی پاساو ههڵگره .

بهداخهوه دهستدرێژی بۆ سهر ههولێر تهنها یهکێ له دوایین ئاڵقهکانی زنجیره کردهوه دڵڕهقهکانی سهدامه له کات و پاش و پێش جهنگی کهنداوی فارس .

جهنابی سهرۆك ئامهوێت به ریز ئاماژه به ههموو کردهوه توونده و سهرکوتکهرانهکانی سهدام و گرووپهکهی بکهم که له کاتی گهیشتن به دهسهڵات له عێراق تا ئێستا ئهنجامیان داوه ، پێویست به وتن ناکات لیستی ئهم کردهوانه گهلێ دوور و درێژه. سهرۆك کلینتۆن سهرکهوتوانه له لێدوانهکهی رۆژی سێ شهممه رایگهیاند :

"ئامانجهکانی سهدام لهوانهیه گۆڕانی بهسهردا بێت بهڵام مێتۆدهکانی ههمان مێتۆدی توندوتیژی و دهستدرێژیه بۆ سهر کورد و کهمینه ئهتنیکییهکان و دراوسێکانی عێراق". له سهر بنهمای ئهم هۆکارانهیه که من و هاوکارانم پشتیوانی له بڕیاری سهرۆك کلینتۆن دهکهین بۆ دهست بهکار بوون دژی سهدام . ههروهها له سهر ئهو باوهڕهم که خهڵکی ئهمریکاش ههمان ههستیان ههیه .

کردەوەکانی سەرۆك کۆمار دوو ئامانج دەپێکێ : یەکەم بە سەدام نیشان دەدات بۆ کردەوە دەستدرێژییەکەی ئەم دواییەی دەبێ بەهایەکی گران بدات. ئەم هێرشە گەورەترین هێرشە بۆ سەر خاکی عێراق لە ماوەی ٥ ساڵی رابردووی پاش شەڕی کەنداوی فارس.و بەم شێوەیە سەرۆك کلینتۆن بە شێوازێکی لەجێخۆدا وەبیری سەدامی هێنایەوە کە پێشێل کردنی یاسا و رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان بێ سزا نامێنێت. دووەم لە رێگای لە ناوبردنی سیستمی بەرگری ئاسمانی لە ناوەڕاستی عێراق و بەرفراوانترکردنی هەرێمی دژەفڕین بەرەو باکووری بەغداد ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مەترسی سەدامی لە سەر نەیارانی رژێمی عێراق لە ناوخۆی وڵات و وڵاتانی دۆستی عێراق کەم کردووەتەوە. بڕیاری سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەستی سەدامی خوێنڕێژی بەستەوە و توانایی ئەم رژێمە سەرکوتکەرەی کەم کردەوە بۆ تێکدانی بارودۆخی ناوەندی رۆژهەڵاتی ناوەراست کە زۆر یەکلاییکەرەوەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .

وەڵامی ئەمریکا بەم دەستدرێژییەی سەدام گونجاو، وەکوو پێویست و بە تەواوی سەرکەوتوو بوو. لێرە هەروەها دەمەوێت پشتیوانی توندی خۆم دەربڕم لە هێزە سەربازیە ژن و پیاوەکانمان کە پێیان ناوەتە رێگایەکی مەترسیدار بۆ پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێمە . راپۆرتە سەرەتاییەکان نیشان دەدات ئەم هێرشە دواییە بۆ سەر عێراق هیچ کوژراو برینداریکی لە هێزەکانی ئەمریکا لێنەکەوتۆتەوە .

شایانی ئاماژە پێکردنە سەرەڕای کۆتایی پێهاتنی شەڕی سارد ، هێزە سەربازییەکانی ئێمە هەروەها دەوری سەرکی لە سەراسەری جیهان دەگێڕن بۆ پاراستن و بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ئێمە . ئەم گرووپە لێهاتووە ژن و پیاوە سەربازییەی ئەمریکا دوابەدوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و سەرەتای قۆناخی شەڕی سارد بەردەوام چالاکیان کردووە و قەد خەڵکی ئەمریکا یا دۆستانی ئێمەیان لە دەرەوەی ئەمریکا بێ هیوا نەکردووە .

ئەم بڕیارنامەیەی بەردەستمان نموونەیەکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ هەمووومان ، لە بەر ئەوەی دەبێ دۆستان و دوژمنانمان بزانن ئێمە یەك دەنگ و یەك هەڵویستین کاتێ کە مەسەلەکە دێتە سەر سیاسەتی سزادان و تێکشکاندنی سەدام حوسەین. هەروەها کە ئێمە ئەزموونێکی پڕش ئێش و ژانمان لە رابردوودا بینیوە ، ناکۆکی ناوخۆیی لە سەر مەسایلی گرنگی ئاسایشی نەتەوەیی تەنها بە قازانجی ئەوکەسانە دەبێت کە هەوڵ دەدەن بڕیارەکانی ئێمە تووشی هەرەسهێنان بکەن . بۆ ئێمە زۆر زۆر گرنگە کە لە کاتێکدا کە هێزە سەربازییەکانی ئێمە لە ڕێگایەکی مەترسیداردان ، یەکگرتوویی نەتەوەیی خۆمان نیشان بدەین .

تەنانەت لەم قۆناخە سیاسیە یەکجار هەستیارەدا، سیاسەت بۆ هەموو ئەمریکاییەك هێشتا لە لێواری دەریاکان کۆتایی پێدێت . سەرۆك کلینتۆن لەگەڵ کۆمەڵێك ڕێگا بەرەوڕوو بووەتەوە لە کاتی بڕیاردان بۆ چۆنیەتی وەڵامدانەوە بە دەستدرێژییەکەی سەدام.

ئەم بڕیارنامەیە پشتگیری توندی ئەنجوومەنی پیران لە بڕیاری گونجاوی سەرۆك کۆمار دەردەبڕێت . مەبەستی سەرۆك کۆمار لاوازکردنی هێزی بەرگری ئاسمانی عێراقە هاوکات لەگەڵ بەرتەسك کردنەوەی هەرێمی چالاکی هێزی ئاسمانی عێراق . ئەم کردەوانە بە روونی نیشان دەدات وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەیە بەهایەکی گران بە سەر سەدامدا بسەپێنێت بە هۆی دەستدرێژییەکەی .

هەروەها کە ژەنەراڵ "کالین پاوڵ" [٣] ئاماژەی پێکردووە ، سەرۆك کلینتۆن باشترین کاری کردووە . ئێمە داوا لە هەموو دۆستان و هاوپەیمانەکانمان لە دەرەوەی ئەمریکا دەکەین لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بن بۆ جێبەجێ بوونی تەواوی بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە پاش کۆتایی پێهاتنی شەڕی کەنداوی فارس پەسەند کراون.

کردەوەکانی سەدام نیشان دەدات سەدام هێشتا مەترسییەکی جیدییە بۆ خەڵکەکەی ، بۆ دراوسێکانی و بۆ ئاسایشی ئەم ناوچە هەستیارە بەگشتی . ئەگەر جیهان ئێستا بە شوێنی

---

[٣] Gen. Colin Powell

ڕێگایەکی دیکەدا بێت و ڕێگە بدات کردەوەکانی سەدام بێ وەڵام بمێنێتەوە ، ڕێگا بۆ ئەوە خۆش دەکەین هێرشی توندتر و مەترسیدارتر لەلایەن سەدامەوە لە داهاتوودا رووبدات . نابێت هیچ گومانێك لە مێشکی سەدامدا بمێنێتەوە کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر رەفتارگەلێکی قبوڵنەکراوی وەها یەکدەنگ و یەك هەڵویستە.

سەرەنجام با هەڵویستی ئەم حکومەتە و ئەم کۆنگرێسە بە روونترین و ئاشکراترین شێوە بە سەدام رابگەیەنین. هەرچەند لەوانەیە ئێمە سەر بە حیزبگەلێکی سیاسی جۆراوجۆر بین و لە سەر هەندێ مەسەلە بیروڕای جیاوازمان هەبێت بەڵام لە سەر مەسەلەی سەدام یەك هەڵویست و یەکدەنگین. دەستدرێژی عێراق نابێت بێ وەڵام بمێنێتەوە ، نە لە ئێستا و نە لە داهاتوودا . ئێمە دەمانەوێت عێراق یاسا و رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان بێ شەرت و مەرج جێبەجێ بکات .

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە من لەگەڵ رێبەرایەتی هێزای زۆرینە(مەبەستی کۆماریخوازەکانە- وەرگێڕ) کارم کردووە بۆ ئامادە کردنی رەشنووسی بڕیارنامەیەك بۆ شەرمەزار کردنی رەفتاری سەدام و نیشاندانی پشتیوانی توندی خۆمان لە دەوڵەتی ئەمریکا بە شێوەیەك کە هیچ گومانێك لە مێشکی کەس (بەتایبەت سەدام حوسەین)دا نەمێنێت کە خەڵکی ئەمریکا لەمبارەیە یەك هەڵویست و یەکگرتووە . پەسەند کردنی ئەم بڕیارنامەیە بۆ ئەوەیە هاوبیری و هاوبڕیار بوونی خۆمان لە سەر کێشە گەوهەری و یەکلاییکەرەوەکان بە دۆستان و دوژمنانمان نیشان بدەین. داوا دەکەم و هیوادارم ئەم ئێوارەیە پشتیوانی خۆمان لەم بڕیارنامەیە بە تێکڕا نیشان بدەین.

بەڕێز "لۆت"[٤]:

جەنابی سەرۆك بە کورتی دەڵێم بڕیارنامەی ٢٨٨ی ئەنجوومەنی پیران نیشان دەدات وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەرژەوەندی گەوهەرییان هەیە لە دەستەبەر کردنی سەقامگیری ناوچەی کەنداوی فارس . هەروەها نیشان دەدات کە سەدام حوسەین لە ٣١ی ئابی

---

Mr. LOTT [٤]

١٩٩٦ سەرەڕاى هۆشدارى ولاّتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا هێرشێكى هاننەدراو، پاساوهەڵنەگر و دڕندانەى كردووەتە سەر خەڵكى سڤيل لە دەوروبەر و نێو هەولێر لە باكوورى عێراق.
ولاّتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا وەلاّمى دەستدرێژييەكەى سەدامى لە ٣ى ئەيلوولى ١٩٩٦ داوەتەوە لە ڕێگاى لە ناوبردنى هەندێك لە دامەزراوەكانى بەرگرى ئاسمانى عێراق و بەرفراوانكردنى هەرێمى دژەفڕين بەرەو باشوور . ئەنجوومەنى پيران ستايشى كردەوە سەربازييەكانى هێزى ئاسمانى ولاّتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا دەكات بە فەرماندەيى فەرماندەى گشتى(مەبەستى سەرۆك كۆمارە- وەرگێڕ) بۆ جێبەجێ كردنى ئەم ئەركە سەربازييە بەم شێوازە زۆر پرۆفيشناڵ و كاريگەرە .
هەندێك كەس دەيانەوێت بڕيارنامەكە باسى شتى زۆرتر بكات . هەندێكى ديكەش- كە هەندێك پرسياريان هەيە سەبارەت بە سياسەت و بەرنامەكانى داهاتوو- پێيان خۆش نەبوو لەم قۆناخە دا هيچ بڵێين بەلاّم بە بيروبۆچوونى من باشتر ئەوەيە لەم پەيوەندييەدا بڕيارێكى بێ لايەنانە بدەين و سپاس و ستايشى ژن و پياوە سەربازەكانمان بكەين بۆ ئەنجامدانى ئەم هێرشە، ئەوان كارێكى سەرسوڕهێنەريان لە هەوا و دەرياوە ئەنجام داوە ، هەر وەك نموونەكانى ديكە . هەركاتێك باسى هێزەكانى ئەمريكا دێتە پێش ئێمە دەبێ لە دەورى يەك كۆببينەوە و لايەنگريى حيزبى وەلابنێين و ئێستا كاتى ئەوەيە. ئێمە لە ڕۆژى سێ شەممەوە كاردەكەين بۆ ئەوەى بڕيارنامەيەك ئامادە بكەين بۆ شەرمەزار كردنى كردەوەكانى سەدام حوسەين و ستايش كردنى سەربازەكانمان . هيچ گومانێك لە مێشكى هيچ سناتۆرێك دا نييە كە ئێمەى خەڵكى ئەمريكا ١٠٠٪ پشتيوانى لە سەربازەكانمان دەكەين كە بەشداريان لەم كردەوە سەربازييەدا كردووە . ولاّتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا ڕێبەرايەتى هاوپەيمانى نێونەتەوەيى كرد بۆ بەرپەرچدانەوەى دەستدرێژى سەدام بۆ سەر كوێت لە ١٩٩١ . لەو كاتەوە كە سەرۆك كلينتۆن هاتە سەركار سياسەتێكى بە نيسبەت عێراق بۆ ميرات ماوەتەوە كە بريتييە لە لاواز كردنى سەدام ، بە هێزكردنى هاوپەيمانى نێونەتەوەيى،

توندتر کردنی گەمارۆ نێونەتەوەییەکانی سەر رژێمی عێراق و بە هێز کردنی یەکگرتوویی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق .
ئێستا کۆمەڵێك نیگەرانی هەیە بە نیسبەت هەندێ هەنگاو بۆ کەمکردنەوەی گەمارۆکانی سەر عێراق بەڵام من هەلی ئەوەم بۆ رەخسا تا بە شێوازی تاکەکەسی سەبارەت بە گەمارۆکان لە سەرۆك کۆمار پرسیار بکەم و ئەویش دڵنیای کردمەوە کە گەمارۆکان هەڵناگیردرێت و داهاتی فرۆشی نەوتی عێراق بەم شێوازەی ئێستا ناچێتە پێش . ئێمە هەروەها نیگەران بووین بە نیسبەت هاوپەیمانییە نێونەتەوەیەکەمان بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی خۆمان لە هەرێمی دژەفرینی نوێ لە باشووری عێراق . کەوابوو دەبێت لەم پەیوەندییەدا کاریکرێت بەڵام دڵنیام هەم کۆنگرێس و هەم حکوومەتی ئەمریکا سەرنج دەدەن بەم کێشەیە.
خەڵکی ئەمریکا و ئەنجوومەنی پیران بە تێکڕا هێرشە دڕندانەکانی سەدام بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان لە باکووری عێراق شەرمەزار دەکەن . لە کاتێکدا کە ئەم بارودۆخە ئاڵۆزە( لە روانگەی بەرژەوەندییەکانی ئێران و تورکیا و حیزب و گرووپە جۆراوجۆرەکان لە ناو خودی کوردەکاندا) بەڵام بارودۆخێکە کە ناتوانین بە نیسبەتی خەمسارد بین . ڕێبەرانی سەرجەم وڵاتانی ناوچە لە سەر ئەو هەڵوێستەن دەبێ عێراق بکەوێتە ژێر چاودێری و هەنگاوگەلێکی زۆر جیدی و بەهێز دژی ئەم وڵاتە هەڵبگیردرێت لە بەر ئەوەی کردەوەیەکی وەها دڕندانەی ئەنجام داوە و هەڕەشەی سەربازی لە دراوسێکانی کردووە و لە راستیدا وڵاتێکی دراوسێ خۆی داگیر کردووە.
هەروەها دەمەوێت بڵێم نیگەرانم بە نیسبەت راوێژ نەکردنی حکوومەتی ئەمریکا لەگەڵ کۆنگرێس سەبارەت بە ئەم کردەوانە و ئەم نیگەرانیەشم لە گەڵ ڕێبەرایەتی پارتی دیموکراتیك باس کردووە.
یاسای دەسەڵاتەکانی شەڕ زۆر روونە بە نیسبەت راوێژکردن و هەروەها راپۆرت دان لە بارەی ئەم کردەوەیە . ئەم ڕێوشوێنە بەنیسبەت ئەم کردەوەی سەرۆك کۆمار جێبەجێ نەکراوە و باوەڕیش ناکەم تا ئێستا لە لایەن هیچکام لە پارتەکانی بەشدار لە کۆنگرێس جێبەجێ کرابێت ، ئەمە قەبوولکراو نییە . لەوانەیە کۆمەڵێك هۆکار هەبێت بۆ ئەم مەسەلەیە ، بەڵام من نیگەرانییەکانی

خۆم بۆ حکوومەتی ئەمریکا و NSC(مەبەستی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییە- وەرگێڕ) باس کردووە و لە سەر ئەو باوەڕەم ئێمە دەبێ راوێژی زۆرتر بکەین لە داهاتوودا . ئێمە نابێت هێزی سەربازی بەکار بهێنین ئەگەر لەگەڵ کۆنگرێس راوێژ نەکرا ، ئێمە دەبێ پێداگری بکەین لە سەر ئەمە . پەسەند کردنی بڕیارنامەکەی ئەم ئێوارەیە، هەنگاوێکی باشە . گەلێ لە هاوکارانمان پێیان خۆش بوو ئەم بڕیارنامە شتی زۆرتر لە خۆ بگری، پێموایە ئەمە لە جێی خۆیدایە . بە شێوازێکی بێ لایەنانە کار لە سەر ئەم بڕیارنامەیە کراوە. بە بیروبۆچوونی من ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لەم پێناوەدا هەنگاو هەڵبگرین . ئەم بڕیارنامەیەش بۆ ئەم مەبەستەیە، کەوابوو سپاسی هاوکاری هەموو لایەك دەکەم .

خاتوون "میکۆڵسکی" :

جەنابی سەرۆك من پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە دەکەم.ئەم بڕیارنامەیە پشتیوانی ئەنجوومەنی پیران دەردەبڕێت لە سەربازەکانمان و سەرۆك کۆمارەکەمان لە بەر ئەوەی وەڵامی دڕندەیی سەدام حوسەینیان داوەتەوە .

سەرۆك کۆمار کارێکی باشی کرد وەڵامی دەستدرێژی سەدام حوسەینی دایەوە. کردەوەکانی سەدام حوسەین هەڕەشەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها ئاسایشی خەڵکی عێراق. سەدام دەبێت بەهای کردەوە دڕندە و نائەخلاقییەکانی بداتەوە .

وەڵامی ئەمریکا خێرا ، تایبەت و سنووردار بوو. پاش ئەوە کە عێراق شاری هەولێری لە هەرێمی پارێزراوی کوردستان داگیر کرد سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە خێرایی و بە شێوازێکی ئیستراتیژێك وەڵامی دایەوە. ئامانجی ئێمە روون و بەرتەسکە : ناچار کردنی سەدام حوسەین بە تەحەممول کردنی بەهای دڕندایەتییەکەی و زیادکردنی ئاسایشی فڕۆکەکانمان کە هەرێمی دژەفڕین لە عێراق دەپارێزن لە رێگای لەناوبردنی سیستمی پاراستنی ئاسمانی عێراق . بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە تەنها هەندێ شوێنی تایبەتی سەربازی کراوە بە ئامانج . ئێمە پێشتر بەهایەکی زۆرمان داوە بۆ کۆنترۆڵ

كردنی سەدام حوسەین لە شالاّوی گەردەلوولی بیاباندا . ئەگەر ئێمە كردەوەكانی ئەم دواییەی سەدام پشتگوێ بخەین ، سەدام دڕتر دەبێت و كردەوەی گوستاخانەی زۆرتر ئەنجام دەدات كە هەڕەشەیە بۆ سەر بەرژەوەندییكانی ئێمە لە بەشی نەوت و هەروەها ژیانی خەڵكی عێراق .
جەنابی سەرۆك سپاس و پێزانینی خۆم پێشكەشی سەربازەكانمان دەكەم كە جارێكی دیكە ئەركی خۆیان بۆ پاراستنی كەسانێك ئەنجام دا كە بێ پاراستنن. ژنان و پیاوانی هێزی سەربازی ئێمە ئەركی خۆیان بە لێزانیین و ئازایەتییەكی زۆرەوە جێبەجێ كرد . داوای لەشساخی و گەڕانەوەی خێرایان دەكەم بۆ ولاّت .

بەڕێز "جان كێری" :
جەنابی سەرۆك ، كۆتایی هەفتەی رابردوو سەدام حوسەین ویستی بڕیار و وەلاّمی كۆمەڵگای نیونەتەوەیی تاقی بكاتەوە . نزیكەی ٣٠ هەزار سەربازی عێراق بە رێبەرایەتی گاردە كۆمارییە تایبەتەكان هێرشیان كرد و شاری كوردنشینی هەولێریان لە باكووری عێراق داگیر كرد كە لە دەستی كوردەكاندا بوو . سەدام سەرەڕای هۆشداری پێشووی ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئەندامانی دیكەی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئەم كردەوەیەی ئەنجام دا بۆ ئەوەی بەرپرسیاریەتی بە كۆمەڵی ئێمە بۆ پاراستنی كوردەكان بباتە ژێر پرسیار كە ئەنجامی شەڕی كەنداوی فارس بوو.
هیچكام لە ئێمە نازانین بۆ سەدام بڕیاری دا ئێستا تاقیمان بكاتەوە بەلاّم مێژووی ئەم ٦ ساڵەی دوایی ئەوەی نیشان داوە سەدام حوسەین دیپلۆماسی نازانێ و تەنها سەری لە دەسەلاّت دەبێتەوە . ئەگەر سەدام دەسەلاّتی خۆی بە شێوازێك نیشان بدات كە هەڕەشە بێت بۆ بەرژەندییەكانی ئێمە یان رێوشوێنە نێونەتەوەییە قبوڵكراوەكان پێشێل بكات ئێمە دەبێت ئامادەبین وەلاّمی بدەینەوە ، تەنانەت ئەگەر پێویست بكات لە رێگای سەربازییەوە .
وەلاّمی سەرۆك كلینتۆن بەم كردەوە دواییەی سەدام وەلاّمێكی لێبڕاوانە و لە جێ خۆیدا بوو و بە تەواوی حیسابی ئەوە كرا بوو كە بە قازانجی ئیستراتیژیكی سەدام تەواو نەبێت . لە رێگای

به‌رفراوانتر کردنی هه‌رێمی دژه‌فڕینی باشوور بۆ هێڵی ۳۳ ، ئێمه پێش له توانایی سه‌دام ده‌گرین بۆ ئه‌وه‌ی که‌ڵك له دوو بنکه‌ی ئاسمانی سه‌ره‌کی خۆی بگرێت و کۆنترۆڵی هه‌رێمی ئاسمانی عێراق له سنووری کوێت تا باشووری به‌غدادی به‌ده‌سته‌وه نه‌مێنێت . ئه‌م وه‌ڵامه به شێوازێکی به‌رچاو له توانایی سه‌دام که‌م ده‌کاته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی هێرش بکاته سه‌ر دراوسێکانی عێراق و بیره نه‌وته‌کانی که‌نداوی فارس . ئێمه له ڕێگای هێرشکردنه سه‌ر سیستمی به‌رگری ئاسمانی عێراق و کۆنترۆڵ کردنی ئه‌م سیستمه توانایی خۆمان بۆ پاراستنی هه‌رێمی دژه‌فڕین زیاد کرد و هه‌ڕه‌شه‌کانی عێراق له سه‌ر فڕۆکه‌کانمان و هه‌روه‌ها فڕۆکه‌کانی به‌ریتانیا و فه‌رانسامان که‌م کرده‌وه .

سه‌دام حوسه‌ین هه‌وڵی داوه پاساو بۆ ده‌ستدرێژییه‌که‌ی بهێنێته‌وه و وتوویه‌تی هێزه‌کانی به داوای پارتی دیمۆکراتی کوردستان (PDK) که یه‌کێ له حیزبه‌کانی باکووری عێراقه چوونه‌ته ناو هه‌ولێر. ده‌رك کردن به‌وه زه‌حمه‌ته که بۆ حیزبێکی کوردی بیه‌وێت ببێت به هاوپه‌یمانی سه‌دام گه‌ گه‌لێك ساڵان هێزه‌کانی ئه‌وی سه‌رکوت کردووه ، ئه‌شکه‌نجه کردووه و مافی مرۆڤی خه‌ڵکی کوردی پێشێل کردووه . به هه‌ر حاڵ ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر PDK یش داوای ده‌ستێوه‌ردانی ده‌وڵه‌تی عێراقی کردبێ ، ئه‌م داواکارییه نابێته پاساو بۆ که‌ڵك وه‌رگرتن له هێزی سه‌ربازی دژی خه‌ڵکی سڤیلی کورد له هه‌ولێر . کۆمه‌ڵگای نیونه‌ته‌وه‌یی دوابه‌دوای نیسانی ۱۹۹۱ واتا کاتێك که ئه‌نجوومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه یه‌ککرتووه‌کان بڕیارنامه‌ی ٦٨٨ی په‌سه‌ند کرد ، ئه‌وه‌ی روون کرده‌وه که سه‌رکووتی کورده‌کان و خه‌ڵکی سڤیلی عێراق ته‌حه‌مول ناکات . هێرشی عێراق بۆ سه‌ر هه‌ولێر و مه‌ترسی به‌رده‌وامی هێزه‌کانی عێراق بۆ ئه‌وه‌ی هێرش بکه‌نه سه‌ر شوێنه‌کانی دیکه ، سووکایه‌تی کردنه به ڕۆح و ناوه‌رۆکی بڕیارنامه‌ی ٦٨٨.

چه‌ند مانگێکه وڵاته یه‌ککرتووه‌کانی ئه‌مریکا له هه‌وڵێکی دیپلۆماتیکدایه بۆ ئه‌وه‌ی ناوبژیوانی بکات له نێوان دوو گرووپی کوردی که له‌گه‌ڵ یه‌ك به‌شه‌ڕ هاتوون واتا پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK) به‌رێبه‌رایه‌تی مه‌سعوود بارزانی و یه‌کێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) به‌رێبه‌رایه‌تی جه‌لال تاڵه‌بانی . سه‌دان خه‌ڵکی سڤیلی بێ گوناحی کورد کوژراون و له‌وانه‌یه سه‌دان

کەسی دیکە بکوژرێن ئەگەر دەسەڵاتی سەدام بە سەر هەولێردا بمێنێت و هێزەکانی عێراق هەڕەشەی ئەوە بکەن کە هێرش دەبەنە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی PUK .
بەرژەوەندی ئەخلاقی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەوەدایە نەهێڵێت کەڵکی خراپ لە کوردەکان وەربگیردرێت . بەرژەوەندی ئیستراتژیکی ئێمە ئەوەیە نەهێڵین سەدام توانایی ئەوەی هەبێت هێرش بکاتە سەر کوێت و ولاتانی،دیکەی ناوچە یان هەڕشە لە سەرچاوەکانی نەوتی جیهان بکات . هەروەها بەرژەوەندی ئیستراتژیکی ئێمە لەوەدایە پشتیوانی لە ئۆپۆزسیۆنی عێراق بکەین بە شێوەیەك کە بەرەنگاری دەستڕۆیشتوویی رۆژ لە دوای رۆژی ئێران ببنەوە و رێ بگرین لە توانایی ئێران بۆ کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخی عێراق پاش سەدام .
هەر بۆیە ئێمە لایەنی هیچکام لە گرووپە کوردەکانمان نەگرتووە و نابێ بیشیگرین .
وەڵامی سەربازی بە عێراق بە ئەنقەست بۆ پێکانی دوو ئامانج داڕێژرابوو :
یەکەم سەپاندنی بەهایەکی گران بە سەر سەدامدا بۆ دەستدرێژییەکەی بۆ سەر خەڵکی سڤیلی کورد لە هەولێر و دووەم لاواز کردنی توانایی سەدام بۆ ئەوەی نەتوانێت هێرش بکاتە سەر هیچ ولاتێکی دیکەی ناوچە . لە ماوەی ٦ ساڵی رابردوودا ، سەدام چەند جار هەوڵی داوە رادەی بەرپرسیاربوونی کۆمەڵگای نیونەتەوەیی بە نیسبەت ئاشتی و سەقامگیری ناوچە تاقی بکاتەوە و هەموو جارێکیش لەگەڵ وەڵامی توندی سەربازی کۆمەڵگای نیونەتەوەیی رووبەڕوو بووەتەوە .
هێرشی عێراق بۆ کوێت لە ئابی ١٩٩٠ بووە هۆی هەرەسهێنانی هێزەکانی عێراق بە دەستی هێزە هاوپەیمانەکان بە رێبەرایەتی ئەمریکا . سەرکوتی راپەڕینی کوردەکان لە باکووری عێراق دوابەدوای شەڕی کەنداوی فارس بووە هۆی دامەزرانی هەرێمی دژەفڕین لە لایەن کۆمەڵگای نیونەتەوەییەوە. هەڕەشەکانی عێراق بۆ سەر فڕۆکەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە هۆی هێرشی موشەکی بۆ سەر سیستمی بەرگری هەوایی باشووری عێراق. ٦ مانگ دواتر سەرۆك کلینتۆن بە هێزەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا فەرمانی دا هێرش بکەنە سەر یەکێ لە دامەزراوە ئیستیخباراتییەکانی عێراق کاتێك کە پەیان بە پلانێکی عێراق برد بۆ کوشتنی

سەرۆك کۆماری پێشوویی ئەمریکا، جۆرج بوش . لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی هێزی سەربازییان نارد بۆ ناوچە، لە بەر ئەوەی سەربازانی عێراق دەستیان بە جموجۆڵ کرد بەرەو کوێت .

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشتر لە کاتی سەرۆك کۆماری سەرۆك بوش و سەرۆك کلینتۆن ڕێبەرایەتی ئەم هەوڵانەی کردووە بۆ کۆنترۆڵ کردنی سەدام. بە هۆی ئەوەی ئێستا هەندێك لە هاوپەیمانەکانمان لە ناوچە لە ژێر گوشاردان ، ئێمە دەست بەکار نابین . بەرژەوەندییەکانی ئێمە و بەرژەوەندی درێژخایەنی ئاشتی و سەقامگیری ناوچە پێویست بەوە دەکات ئێمە وەڵامی ئەم تاقیکردنە دواییەی سەدام بدەینەوە .

هێرشی عێراق بۆ سەر هەولێر ناکام و لێکەوتەوی جیدی بە دواوە بووە بۆ خەڵکی عێراق ، بووەتە هۆی کوژرانی خەڵکی بێ گوناح ، تیمکانی چارەسەر کردنی ناکۆکییەکان و گەیشتن بە ڕێکەوتنێکی سیاسی لە نێوان حیزبە کوردەکانی کەم کردووەتەوە ، سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانی ناچار کردووە ڕێوشوێنەکانی بڕیارنامەی ٩٨٦ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵبواسرێت کە ڕێگای دەدا بە فرۆشتنی نەوتی عێراق بۆ کڕینی خۆراك و دەواو دەرمان بۆ خەڵکی عێراق . هەولێر یەکێ لە ناوەندە سەرەکییەکانی دابەشکردنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکانە . پێویست بە وتن ناکات فڕۆکەکانی ئێمە ناتوانن لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی عێراق بفڕن .

سەرۆك کلینتۆن ڕوونی کردووەتەوە کە ئێمە سەدام حوسەین لە ڕووی کردەوەکانییەوە هەڵدەسەنگێنین نە قسەکانی . سەدام وتوویەتی عێراق ڕێز لە بەرفراوانکردنی هەرێمی دژەفڕین ناگرێت و دوێنێ ڕاداری عێراق پێشی لە فڕۆکەیەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرتووە و ناچاری کردووە دابنیشێت . واتای ئەمە چییە ؟، ڕوون نییە . ڕوونە کە وەڵامی لۆژیکی سەدام دەبێ ئەوە بێ هیچ کارێك نەکات ئەم قەیرانە قووڵتر بێتەوە. من دەزانم هەمووومان هیواداریین کە سەدام بە گوێرەی لۆژیك بجوڵێتەوە .

بەڕێز "وارنێر" :

جەنابی سەرۆك منیش ئەمڕۆ پەیوەست دەبم بە ڕێبەرایەتی زۆرینە بۆ پشتیوانی کردن لە جێبەجێ کردنی ئەرکی هێزی سەربازی ئێمە کە هێرشە ئاسمانییەکانی ئەم دواییانەیان دژی سەدام و سوپای عێراق داڕێژا و جێبەجێ کرد. لە کاتی قەیرانە نێونەتەوەییەکاندا زۆر گرنگە کە سەربازەکانمان لە بەرەی شەڕ ـــ ئەوانە کە لەگەڵ هەڕەشەیەکی زۆر بەرەوڕوون ـــ بزانن لە لایەن کۆنگرێس و خەڵکی ئەمریکاوە پشتیوانی دەکرێن . من کە خۆم پێشتر وەك سکرتێری ئیدارەی دەریاوانی مەدەنی و پاشان لە سۆپا دا خزمەتم کردووە، ئاگاداری پێویستبوونی یەکجار زۆری ئەم پشتیوانییەم لە سەربازەکانمان و بنەماڵەکانیان .

لەوکاتەوە کە هێزەکانی سەدام کوێتیان لە ئابی ۱۹۹۰ داگیر کرد ، من بەردەوام پشتیوانیم لەوە کردووە کە سوپای ئەمریکا کەڵك لە هێزی سەربازی وەربگرێت (ئەگەر پێویست بکات) بۆ ڕێگرتن لە دەستدرێژی عێراق لە سەراسەری ناوچە . روونە کە لە پێناو بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندی ئابووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە راستیدا کۆمەڵگای نێونەتەوەیدایە کە دەوڵەت و سوپای عێراق هەڕەشە نەکات لە سەقامگیری ناوچەیەك کە ۷۰٪ ی سەرچاوەکانی نەوتی جیهانی تێدایە . هەر بۆیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ڕێبەرایەتی سەرۆك بوش توانی گرنکترین هاوپەیمانی سەربازی پاش شەڕی دووەمی جیهانی درووست بکات بۆ دەرکردنی داگیرکەرانی عێراق لە کوێت و زیندووکردنەوەی یەکپارچەیی کوێت و سەپاندنی گەمارۆ و ڕێوشوێنی تووند بە سەر توانایی سەربازی سەدام و رەفتارە دەستدرێژیکەرەکانی و زیندوو کردنەوەی ئامرازەکانی سەقامگیری ئەم ناوچە پڕ کێشەیە .

من خۆشبەختانە لەگەڵ سناتۆر "دۆل" کارم کرد بۆ ئامادەکردنی رەشنووسی گەلاڵە یاسایەك و سەرەنجام بۆ پەسەند کردنی بڕیارنامەیەك بۆ ڕێگە پێدان بە سەرۆك بۆش بۆ ئەوەی لە هێزی سەربازی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی کەنداو کەڵك وەربگرێت . ئەمڕۆ وێنا کردنی ئەوە زەحمەتە کە لە ساڵی ۱۹۹۱ کە ۵۰۰ هەزار سەربازی ئەمریکا لە کەنداو ئامادەبوون ،

ئەنجوومەنی پیران تەنها بە ٥ دەنگ پشتیوانی خۆی لەم بڕیارنامەیە دەربڕی . خۆشبەختانە پاش شالاوی گەردەلوولی بیابان، کۆنگرێس و خەڵکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە خێرایی پشتیوانیان لە سەربازەکانمان کرد و ئەرکەکانمان وەها کە لە بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتبوو ، جێبەجێ کرا .

ئەمڕۆ قەیرانی عێراق بە هۆی شەڕی ناوخۆیی تراژیدیکی نیوان حیزبە کوردەکان گرنگ نییە ، بەڵکوو بە هۆی ڕاگرتنی ئاسایشی ناوچە گرنگە کە سەربازانی ئێمە لە ساڵی ١٩٩١ شەڕیان بۆ کرد و کوژران . ئێستا پاش ٦ساڵ لە شەڕی کەنداو ، کۆمەڵگای نیونەتەوەیی هێشتا شەڕ دەکات بۆ ئەوەی سەدام ئەو ڕێککەوتنننامانە جێبەجێ بکات کە خۆی و دەوڵەتەکەی دوابەدوای کۆتایی پێهاتنی جەنگ ئیمزایان کردووە . بەلام ئەمڕۆ سەدام هەروەك پێشوو لە سەر ڕێگای پشکنەرەکانی چەکی نەتەوە یەکگرتووەکان کەندوکۆسپ درووست دەکات و حیساب بۆ چارەنووسی ئەو کوێتیانە ناکات کە لە کاتی جەنگەوە بێ سەروشوێنن و سەرپێچی لە گەڕاندنەوەی ئەو سەروەت و سامانە دەکات کە لە کاتی داگیرکرانی کوێت دەستی بە سەردا گرتووە و درێژە بە سەرکوتکردنی هاوولاتیانی عێراق دەدات . ئەم کردەوانە قابلی تەحەموول نییە .

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرمایەگوزارییەکی بەرچاوی کردووە (قوربانیدان و کوژران و بریندار بوونی سەربازەکانمان و زەرەرمەند بوونی بنەماڵەکانیان) بۆ کۆنترۆڵ کردنی دەستدرێژییەکانی سەدام . لە کاتی شالاوی گەردەلوولی بیاباندا، نزیکەی ١٥٠ سەربازی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کوژران و پتر لە ٤٦٠ کەس بریندار بوون ، لەمەزیاتر بڕێکی زۆر لە پارەی باجەکانی ئەمریکا بۆ کۆنترۆڵکردنی سەدام حوسەین لە بەشی سەربازیدا خەرج کراوە ( لانیکەم نیو بیلیۆن دۆلار بۆ هەر ساڵێك لە ١٩٩١ەوە) و ئێستاش خەرج دەکرێت . ئەم سەرمایەگوزارییە دەبێ بپارێزرێت بۆ ئەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەلامی ئەم دەستدرێژییە دواییەی سەدام بداتەوە .

سپاسی ڕێبەرایەتی زۆرینە ، سناتۆر" تارمۆند[٥] "و سناتۆر "مەککین" دەکەم بۆ ڕێبەرایەتیان بۆ ئامادەکردنی ئەم بڕیارنامەیە .

بەڕێز" کرایگ[٦]" :

جەنابی سەرۆك ، هێرشی سەدام بۆ سەر باکووری عێراق هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆی دیکەیە بۆ سەر بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئاسایش و سەقامگیری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست . مووشەکە کروزەکانی ئەمریکا داویانە لە گەلێ لە دامەزراوە سەربازییەکانی عێراق ، بەو ئامانجە کە پێش لە توندوتیژی زیاتری عێراق دژی کوردەکان بگرن و سیستمی پاراستنی ئاسمانی عێراق لەناو بردن کە هەڕەشەیە بۆ هێزی ئاسمانی ئێمە . من لە سەرۆك کۆمار وەك فەرماندەی گشتی و بڕیارەکەی بۆ هێرشکردنە سەر دامەزراوە سەربازییەکانی سەدام حوسەین بە ئامانجی دابینکردنی پاراستنی زۆرتری هێزەکانمان و بەرفراوانتر کردنی هەرێمی دژەفڕین پشتیوانی دەکەم.

من ١٠٠٪ پشتگیری لە ژن و پیاوە ئازاکانی هێزی سەربازی خۆمان دەکەم . کەوابوو پشتیوانی لەو بڕیارنامەیە دەکەم کە پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ دەنگی بۆ دەدەین کە کردەوەکانی سەدام حوسەین شەرمەزار دەکات و پشتیوانی لە سەربازەکانمان و هەوڵەکانی سەرۆك کۆمار بۆ کۆنترۆڵ کردنی کردەوەکانی عێراق دەکات. هەتا ئەو شوێنە کە من دەزانم پاش ئەوەی کە ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکان دامەزراوە سەربازییەکانی عێراقیان ئاشکرا کرد، هۆشداری ڕوون بە سەدام درا کە نابێت کەڵك لە هێزی سەربازی وەربگرێت بەڵام سەدام ئەم هۆشدارییەی پشتگوێ خست .

جەنابی سەرۆك کردەوەکانی سەدام حوسەین و وەڵامی ئێمە لە گەڵ یەکدا نایەنەوە . ئێستا کۆمەڵێك هەوڵ لە ئارادایە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو گەمارۆانە لە سەر عێراق کە دوابە دوای شەڕی

---

[٥] Thurmond

[٦] Mr. CRAIG

کەنداو دانراون . کەوابوو لە کاتێکدا کە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دەبێ هەمیشە دوایین ئامرازی سیاسەتی دەرەوە بێت بەڵام کردەوە دڵڕەق و سەرکوتکەرانەکانی سەدام دەبێ تەنها یەك وەڵامی پێبدرێتەوە، ئەویش وەڵامی سەربازییە . لە کاتێکدا کە ئێمە دەتوانین دەرك بەم رووداوانەی دوایی بکەین بەڵام داهاتووی ئەم باروودۆخە بووە بە نیگەرانی بۆ هەموومان . بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە، لەمە زیاتر ناکۆکییە جۆراوجۆرەکانی نێوان وڵاتانی دراوسێی عێراق و یەکنەگرتوویی خەڵکی کورد توانایی ئێمەی بۆ سەقامگیر کردنی بارووبۆخەکە لاوازتر کردووە . زۆر زۆر پێویستە و لە پێناو بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێمەدایە کە دەوڵەتی ئەمریکا لە گەڵ هاوپەیمانەکانمان ، بەتایبەت ئەوانەی ناوچە کاربکات کە رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم رووداوانە بدۆزنەوە .

سەرەنجام لە کاتێکدا کە شەڕی سارد کۆتایی پێهاتووە، روونە کە ئێمە لە جیهانێکی ناسەقامگیردا دەژین کە تاقیگەیە بۆ بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی ئێمە. ئێمە دەبێ لە رووی ماددیەوە بە تەواوی هێزی سەربازی خۆمان پۆشتە بکەین بۆ ئەوەی هەروا بەهێز بن . کاتێك کە ئێمە داوا لە ژنان و پیاوانی ئەمریکا دەکەین ژیانی خۆیان لەپێناو وڵاتەکەیان بەخت بکەن، دەبێ باشترین پێداویستی و پەروەردەیان بۆ دابین بکەین .

جەنابی سەرۆك هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئێمە کۆمەڵێك بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەییمان لەم ناوچە ناسەقامگیر و لەرزۆکەی جیهاندا هەیە. دوژمنایەتی زیاتری هێزەکانی سەدام حوسەین دژ بە هێزەکانی ئێمە یان دەستدرێژی بۆ سەر شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش یا گەمارۆکانی دیکەی کۆمەڵگای نیونەتەوەیی بۆ سەر عێراق دەبێ لەگەڵ وڵامی خێرا و لێبڕاوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رووبەڕوو بێتەوە.

بەڕێز "جۆزێف بایدن[٧]":

جەنابی سەرۆك دوو ڕۆژ پێش سەرۆك کۆماری ئەمریکا فەرمانی دا وەڵامی سەربازی بدرێتەوە بە دەستدرێژی عێراق بۆ سەر کەمینەی کوردی خۆی . پرسیارێك کە ڕووبەڕووی ئێمە بۆتەوە ئەوەیە کە ئایا ئەنجوومەنی پیران پشتیوانی دەکات لەو هەنگاوانە کە سەرۆك کۆمارەکەمان هەڵیگرتوون . هەندێ کەس کۆمەڵێك نیگەرانی دەردەبڕن کە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەم پرسیارەیە . ئەوان کۆمەڵێك خاڵ دەخەنە ڕوو کە دەتوانێ ببێ بە تەوەری مشتوومڕێکی ڕەوا بەڵام با ئەم مشتوومڕە بهێڵینەوە بۆ ڕۆژێکی دیکە . ئێمە مشتوومڕ ناکەین لە سەر مێژووی دیپلۆماسی ئەمریکا بە نیسبەت عێراق ، مشتوومڕ ناکەین لە سەر داهاتووی سیاسەتی ئاسایشی ئەمریکا لە کەنداوی فارس ، ئێمە تەنها پرسیارێکی سادەمان ڕووبەڕوو بۆتەوە، ئەویش ئەوەیە ئایا ئێمە پشتیوانی لە کردەوەکانی فەرماندەی گشتی دەکەین یا نا . ئایا پشتیوانی لەو سەربازانە دەکەین کە فەرمانەکەی سەرۆك کۆمار جێبەجێ دەکەن و ئایا ئێمە کردەوە سەرکوتکەرەکانی سەدام شەرمەزار دەکەین . ئەمانە کۆمەڵێ پرسیاری گرانن.

ئێمە نابێت لە سەر مەسایلی لاوەکی مشتوومڕ بکەین . من دەمەوێت پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەم لە بەر ئەوەی لە سەر ئەو بڕوایەم وەڵامەکەی سەرۆك کۆمار هەم پێویست بوو و هەم گونجاو بوو. سەدام حوسەین بە جاران نیشانی داوە تەنها لە زمانی زۆر تیدەگات . پێشتر هۆشداری ڕوون لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دراوە بە سەدام واتا کاتێك کە شەواهیدەکان نیشانی دەدا دەوڵەتی عێراق دەیەوێت خۆی بۆ ئەم هێرش تەیار بکات . سەدام ئەم هۆشدارییانەی پشتگوێ خست و چووە ناو ناوچەیەك کە پێشتر ناوەندی دەستدرێژییەکانی عێراق بووە .

کردەوەکانی سەدام پێشێلکاری شەرت و مەرجەکانی مافی مرۆڤی جیهانی و بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە داوا لە سەدام دەکات کۆتایی بە سەرکووتی کوردەکان بهێنێت . ئەگەر ئەم هێرشە بێ وەڵام بمابایەوە ، بارووددۆخی سەدام لە ناوخۆی عێراق بە

---

[٧] Mr. BIDEN

هێزتر دەبوو و هانی دەدا هێرش بکاتە سەر شوێنەکانی دیکە . خۆشبەختانە ئەم هێرشە بێ وەڵام نەمایەوە .

بڕیارەکەی سەرۆك کلینتۆن پەیامێکی بەهێز بوو دەربارەی ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چاوپۆشی لە کردەوە گوستاخانەکانی سوپای عێراق ناکات و سەدام دەبێ بەهای دەستدرێژییەکانی بدات . ئەم بڕیارە لە خزمەتی پاراستنی بەرژەوەندییە یەلاییکەرەوەکانی کەنداوی فارس بوو لە رێگای کۆکردنەوەی هاوپەیمانە سەرەکییەکانی ئەمریکا بۆ دابینکردنی سەقامگیری ناوچە لە رێگای بەرفراوانتر کردنی هەرێمی دژەفڕینی باشوور. سەرۆك کۆمار توانایی سەدامی بەرتەسك کردەوە بۆ شەڕاشۆیی و ئاژاوەگێڕی زۆرتر . بە بۆچوونی من نیگەرانبوون بە نیسبەت ئەم بەرژەوەندییانە لە نیگەرانبوونی گەلێ لە هاوکارەکانمان بە نیسبەت شەڕی ناوخۆیی حیزبە کوردەکان گرنگترە.

حیماسەی کوردەکان چیرۆکی دوور و درێژی خەبات ، چەوسانەوە و سەرکوتە . ئەم بارودۆخە بە هۆی دەستێوەردانی هێزە ناوچەییەکان واتا ئێران ، عێراق ، سوریا و تورکیا ئاڵۆزتر بووە . کێشەی کورد بە ئاسانی چارەسەر نابێت. بە هەرحاڵ ئێمە نابێت رێگا بەوە بدەین بارودۆخی ئاڵۆزی کوردستان ئێمە لە ئامانجە گەورەکانمان لابدات . بڕیاری سەرۆك کۆمار بۆ ئەوە نییە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەوێتە ناو ئاژاوەی کورد بەڵکوو بۆ ئەوەیە کۆنترۆڵی دیکتاتۆرێکی مەترسیدار بکات کە هەڕەشە لە ئاسایش و سەقامگیری ناوچە دەکات ، بۆ پاراستنی سەقامگیری ناوچەیە کە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا یەکلاییکەرەوەیە ، بە کورتی بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە .

تکا لە هاوکارانم دەکەم دەنگی خۆیان بخەنە پاڵ دەنگی من بۆ پشتیوانی کردن لە بەربەرەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەگەڵ دیکتاتۆری دڵڕەقی عێراق .

بەڕێز "جان مەککین" :

سپاسی ڕێبەرایەتی زۆرینە و ڕێبەرایەتی دیمۆکرات دەکەم بۆ ئەم سازشە زۆر دژوارە کە لە سەر ئەم بڕیارنامەیە کردیان لەم کاتە ناسکەدا (بە هۆی نزیکبوونەوە بە کاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا).

بە بیروبۆچوونی من ئەم بڕیارنامەیە ئاماجی خۆیی دەپێکێ کە دەربڕینی سپاس و پێزانینی ئێمەیە لە ژنان و پیاوانی ئازا کە لە سوپادا خزمەت دەکەن . روونە ئەم ژن و پیاوانە لە ژێر فەرمانی فەرماندەی گشتی (واتا سەرۆك کۆمار ـــ وەرگێڕ) خزمەت دەکەن و لەم بڕیارنامەیەدا بە شێوازێکی گونجاو ئاماژەی پێکراوە .

بە بیروبۆچوونی من (کە پێموایە بیروبۆچوونی گەلێ لە هاوکارانیشم هەروا بێ) پێویستبوونی ئەنجامدانی کۆمەڵێك کردەوەی سەربازی دژ بە سەدام شتێکی روونە بەڵام ئەمە کە ئایا ئەم کردەوەیە وەڵامێکی گونجاو بوو بۆ هەڕەشەکەی سەدام ، روون نابێتەوە هەتا کاتێك کە ئێمە بە تەواوی دەرك بە ئیستراتیژی گشتی حکومەتی ئەمریکا نەکەین بۆ زیادکردنی سەقامگیری ناوچە و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو هەڕەشانەی کە دەکرێتە سەر بەرژەوەندییە ئاسایشیەکانی ئێمە لە ناوچە. دەوڵەتی ئەمریکا دەبێت روونی بکاتەوە کە مووشەکە کروزەکانی ئێمە دەیانەوێت چ ئامانجگەلێك بپێکن . ئایا دەیانەوێت سوپای عێراق ناچار بکەن بە تەواوی لە شاری کوردنشینی هەولێر لە باکووری عێراق بکشێتەوە و هەموو دەستدرێژییەکانی بۆ سەر کوردەکان رابوەستێنێت؟ ئایا دەیانەوێت توانایی سەدام کەم بکەنەوە بۆ سەرلەنوێ دەستدرێژی کردنە سەر دراوسێکانی لە لای باشووری عێراق ؟ ئایا دەیانەوێت دژایەتی کردن لە گەڵ سەدام لە ناو سوپای عێراق هان بدەن ؟ ئایا سنووردارکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنە بە هۆی دژایەتی کردنی هاوپەیمانەکانمان بوو لە ناوچە یان بە هۆی کۆمەڵێك حیسابات و تێبینی دیکە بووە کە دەوڵەتی ئەمریکا تا ئێستا ئاشکرای نەکردووە ؟

لەوانەیە سەدام زۆرتر ئەمریكا تاقی بكاتەوە لە ڕێگای درێژەپێدانی دوژمنایەتییەكانی لە باكووری عێراق و ئەنجامدانی شاڵاوی نوێ دژی بە كەمینەی شیعە لە باشوور و درووست كردنی كێشەی نوێ بۆ هەرێمی دژەفڕین و هاویشتنی مووشەك بۆ فڕۆكە شەڕكەرەكانی ئەمریكا و هێزە هاوپەیمانەكان یان سەر لە نوێ هەڕشە كردن لە یەكپارچەیی خاكی هاوپەیمانانی ئەمریكا لە ناوچە.

لەم بارووددۆخەدا ئایا دەوڵەتی ئەمریكا ئامادەیە كردەوەی سەربازی گەورەتر و گرینگتر ئەنجام بدات ؟

ئایا ئەمریكا "شاڵاوی گەردەلوولی بیابان" زیندوو دەكاتەوە ؟ كە بە دڵنیاییەوە ئەگەر خۆمان لە بەرامبەر بەرفراوان كردنی وەڵامی سەربازی بە بەرپرسیار بزانین دەبێ زیندووی بكەینەوە. بێ كەڵك وەرگرتن لە بنكە سەربازییەكانمان لە توركیا و عەرەبستانی سعوودی ، جموجۆڵە سەربازییەكانمان بە توندی بەرتەسك دەبێتەوە . لە هەمووی گرینگتر حكوومەتی ئەمریكا دەیەوێت چ بارووددۆخێكی ژئۆپلۆتیكی بە سەر ناوچەی كەنداوی فارسدا زاڵ بكات؟.

هەتا كاتێك كە وەڵامی ئەم پرسیارە بنەڕەتییانە نەدرێتەوە ، نە من و نە هیچكام لە ئەندامانی كۆنگرێس و نە جەماوەری خەڵك نەتەنها ناتوانن ڕێژەی كاریگەری ئەم هێرشانە هەڵبسەنگێنن بەڵكوو ناتوانن توانایی دەوڵەتی ئەمریكا هەڵبسەنگێنین بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە یەكلاییكەرەوەكانی ئاسایشی ئێمە لە ناوچە ، بەرژەوەندییەك كە ئەم وڵاتە تا ئێستا بەردیلێكی زۆری بۆ پاراستنی داوە.

جەنابی سەرك ، ڕێگەم پێبدەن ئەوە دووپات بكەمەوە كە هیچكام لەم پرسیارە وڵامنەدراوانە كاری نەكردووەتە سەر من (و نابێت كاریش بكاتە سەر هیچكام لە ئەندامانی كۆنگرێس) بۆ ئەوەی پشتیوانی نەكەن لە هێزی سەربازی ئێمە كە بڕیاری سەرۆك كۆماریان جێبەجێ كردووە و نابێت ببێتە هۆی ئەوەی ئێمە لە سەرۆك كۆمار ڕێز نەگرین یان لە خودا نەپاڕێینەوە بۆ سەركەوتنی سیاسەتەكەی . ئێستا كاتی ئەوەیە بە یەك دەنگ پشتیوانی لە سەرۆك كۆمار

بکەین، هەروەها کە لە سەر ئەو بڕوایەم پاش ماوەیەکی دیکە به پەسەند کردنی ئەم بڕیارنامەیە هەروا دەکەین. ئێستا کاتی ئەوەیە شرۆڤەی رەخنەکان بکەین، بـا بەرداشـتەکان و هەڵێنجانـدنی ئەنجامەکان بێنیّ بۆ رۆژێکی دیکە ، ئەو رۆژە بـە هـەرحاڵ زۆر دوور نییـە . داوا لـە هاوکـارانم دەکەم پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن .

***

بڕیارنامەی ٢٨٨ی ئەنجوومەنی پیران

ـ بە هۆی ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەرژەوەندی یەکلاییکـەرەوەیان هەیە لە پاراستنی سەقامگیری ناوچەی کەنداوی فارس

ـ بە هۆی ئەوەی لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦ سەدام حوسەین سەرەڕای هۆشدارییە پێـشووەکانی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، هێرشێکی هانەدراو، پاساو هەڵنەگر و درندەی کردووەتە سەر خەڵکی سڤیل لە ناو و دەوروبەری هەولێر لە باکووری عێراق و خۆی کردووە بە هاوپەیمانی یەکێ لە حیزبە کوردەکان بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر حیزبێکی دیکەی کورد و لە ئەنجامدا بۆتە هـۆی کـوژرانی سەدان خەڵکی بێ گوناح

ـ بە هۆی ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ٣ی ئـەیلوولی ١٩٩٦ وەڵامـی دەسـتدرێژی سەدامی داوەتەوە لە رێگای لە ناوبردنی هەندێ لـە سیـستمەکانی پاراسـتنی ئاسمـانی عێـراق و رایگەیاندووە کە هەرێمی دژەفڕینی باشووری عێراق بەرفراوانتر دەکات

کەوابوو ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا :

ستایشی کردەوە سەربازییەکەی هێزەکـانی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە ژێـر رێنـوێنی فەرماندەی گشتی دەکات بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە سـەربازییە بـە شـێوازێکی زۆر پرۆفیـشناڵ ، لێزانانە و کاریگەر .

***

بڕیارنامەکە بە ٩٦ دەنگی ئەرێنی لە بەرامبەر ١ دەنگی نەرێنی پەسند کرا .

## ئێمە پشتمان له كوردە راپەڕيوەكان كرد

٦ى ئەيلوولى ١٩٩٦ ــ ئەنجوومەنى پيران

بەڕێز "گۆرتۆن"[١] :

جەنابى سەرۆك ، پاشنيوەڕۆى دوێنێ من تەنها كەسێك بووم كە دەنگى نەرێنيم دا بە بڕيارنامەى٢٨٨ سەبارەت بە دەستێوەردانى سەربازى ئەم هەفتەيەى سەرۆك كۆمار لە عێراق .
بە هۆى ئەوەى پاشنيوەڕۆى دوێنێ ، كاتى ئەوە نەبوو هۆكارى ئەم مەسەلەيە شرۆڤە بكەم دەمەوێت ئێستا باسى بكەم . ئێستا مشتومڕى باو (لەوانەيە زۆرتر لە لايەن سەرۆك كۆمارى ئێستاى وڵاتە يەكگرتووەكانى ئەمريكاوە ) ئەوەيە كە جۆرج بوش زۆر بە هەڵەدا چوو كە شەڕى كەنداوى دژى سەدام تەواو نەكرد و هێزەكانى سەدامى بەتەواوى تێكنەشكاند و دەوڵەتێكى لە جێگاى دەوڵەتى سەدام حوسەين لە عێراق دانەنا. بە هۆى ئەوەى لە كاتى خۆيدا رەخنەيەكى وام نەبووە ، ئێستا پەيوەست نابم بەم رەخنانە و بە بيروبۆچوونى من ئەم رەخنانە لە بنەڕەتدا هيچ پەيوەندييەكى بە چالاكييەكانى ئەم هەفتەيە نييە .
كاتێك سەرۆك كلينتۆن دەسەڵاتى گرتە دەست باروودۆخێكى بە ميرات بۆمايەوە كە نەدەكرا هەر بەو شێوەيە بچێتە پێش . بە هەر حاڵ لەو كاتەوە كە سەرۆك كلينتۆن دەسەڵاتى گرتووەتە دەست سياسەتەكانى سەرۆك كۆمار بووەتە هۆى لاواز بوونى ( ئەگەر نەڵێين لەيەك هەڵوەشانەوەى تەواو) ئەو هاوپەيمانييە كە لە كاتى شەڕى كەنداو دژى عێراق درووست بوو. بە تايبەتتر خەمساردى دەوڵەتەكەى كلينتۆن بە نيسبەت ئەو بارە گرانەى كە لە سەر شانى هاوپەيمانەكەمان واتا توركيايە و ئەو گيروگرفت و كێشە تايبەتانەى كە توركيا لە گەڵيدا رووبەڕووييە كە بووەتە هۆى ئەوەى ئێمە بكەوينە ناو باروودۆخێك كە نەتوانين كەڵك لە بنكەكانمان لەو وڵاتە وەربگرين بۆ

---

[١] Mr. GORTON

وەڵامدانەوەی عێراق . لە راستیدا هاوپەیمانییەکە ئەوەندە لە یەك هەڵوەشاوەتەوە کە رێگەمان پێ نەدرا کەڵك لە هیچکام لە بنکەکانی هاوپەیمانەکانمان (جگە لە بەریتانیا) وەربگرین بۆ وەڵامدانەوەی عێراق .

سەرەتای هاوینی ئەمساڵ ئێمە مەسەلەی دەرباز کردنی سنوور و هێرشی ئێران بۆ سەر باکووری عێراقمان بە تەواوی پشتگوێ خست کە بە مەبەستی پشتیوانی کردن لە یەکێ لە حیزبە کوردەکان ئەنجامدرا. هەروەها لە سەرەتای هاوین بە تەواوی خەمسارد بووین بە نیسبەت ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کە دەوڵەتی عێراق بۆ لێژنەی پشکنینی چەکە قەدەخەکراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان (چ چەکی کیمیایی و چ چەکی ناوکی) درووستی کرد . لە گەڵ ئەمەشدا ئەمریکا لە سەرەتای ئەم هەفتەیە بە شێوازێکی سەربازی وەڵامی شەڕی نێوان کوردەکانی پشتگیریکراو لەلایەن عێراق و کوردەکانی پشتگیریکراو لە لایەن ئێرانی دایەوە و ئێمەش بە شێوازێکی زۆر نەگونجاو وەڵامی سەرۆك کۆماری ئەمریکامان دایەوە .

بە بۆچوونی من لە کاتی هێرشی ئەم دواییانەی عێراق بۆ پشتیوانی کردن لە یەکێ لە حیزبە کوردەکانی لایەنگری خۆی ، ئێمە لە بنەڕەتدا دوو رێگامان لە بەردەمدا بوو :

یەکەم ، دەمانتوانی بێ دەنگ بین و هیچ کارێك نەکەین کە ئەمەش هیچ سوودێکی بۆ شەڕی نێوان حیزبە کوردەکانی پشتگیریکراو لەلایەن عێراق و حیزبە کوردەکانی پشتگیریکراو لە لایەن ئێرانەوە نەبوو . رێگای دووەم ئەوە بوو کە وەڵامی سەربازی بە هێرشەکەی عێراق بدەینەوە بۆ ئەوەی نیشان بدەین ئەم هێرشە نابێ بێ بەردیل بێت. لەم بارووددۆخەدا بە هەرحاڵ تەنها وەڵامی گونجاوی سەربازی ئێمە دەبوایا ئەوە ببایا کە بەردیلێکی زۆر گەورەتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا بە سەر دەوڵەتی عێراقدا بسەپێنین ، بەردیلێك کە گەورەتر ببایا لەو دەستکەوتەی کە سەدام لە هێرشکردنە سەر باکووری وڵاتی خۆی بە دوایەوە بوو بەڵام ئێمە وامان نەکرد .

ئێمە بە شێوەیەك وەڵامی شەڕی نێوان حیزبە کوردەکانمان دایەوە کە هیچ سودێکی نەگەیاند بە قوربانیانی ئەم هێرشەی عێراق . لە راستیدا ئێمە بە روونی ئەوەمان نیشان دا کە هەوڵمان نەدا

بۆ تاوەژۆ کردنی ئەو کارەی کە سەدام لە باکووری وڵاتی خۆی کردی . کەوابوو ئەنجامە سەرەکییەکەی بوو بە چی؟ بوو بەوە کە عێراق کۆنترۆڵی بەشێکی زۆری خاکی کوردستانی عێراقی بە دەست هێنایەوە و کوردە راپەڕیوەکانی بە کۆمەڵ کوشت کە زۆربەیان بە ناو لە ژێر پاراستنی ئێمە دابوون ، بەڵام ئێمە پشتمان تێ کردن. ئەم کارەی ئێمە وای نیشان دا کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شێرێکی کاغەزییە یەڵام سەدام چ بەردیلێکی دا جەنابی سەرۆك کۆمار ؟ هیچ تەنها چەند راداری عێراق لە ناو چوون . ئێمە لە لایەن هەموو هاوپەیمانەکانمانەوە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست تەریك خراوین ، هیچکام لە هاوپەیمانەکانمان نەیویست لە رووی سیاسییەوە پشتیوانی لە وەڵامە سەربازییەکەی ئێمە بکات . فەرانسا وەڵامی نەرێنی دایەوە بە بەرفراوانتر کردنی ئەم دواییانەی هەرێمی دژە فڕین لە لایەن ئێمەوە.

ئێستا سەرۆك کۆماری ئێمە دەڵێت وەڵامی سەربازی کۆتایی پێهاتووە و رادەگەیەنێت سەرکەوتوو بووە .

جەنابی سەرۆك با ئێمەش چەند سەرکەوتنێکی هاوشێوە بەدەست بهێنین و رابگەیەنین هەرێمی دژەفڕینمان لە ریاز(ی پایتەختی عەرەبستانی سعوودی) درووست کردووە. باشترین لێکچوونێك کە من دەتوانم بۆ ئەم کردەوەیەی سەرۆك کۆمار بیدۆزمەوە ئەوەیە کە شارەداری ناحیەیەکی کۆلۆمبیا خەڵك هۆشیار بکاتەوە بە نیسبەت شەڕی سەرەتایی لەگەڵ قاچاخچیانی مادە سڕکەرەکان لە هەندێك لە شوێنەکانی شاردا و هۆشداری توند بدات دژی توندوتیژی لە پەیوەندی ئەم شەڕە لەگەڵ قاچاخچیانی مادە سڕکەرەکان و پاش ئەوە کە سەرۆکی شارەوانی لەگەڵ توندوتیژییەکی زۆر و ژمارەیەك کوژراو رووبەڕوو بووەوە ، ١٠٠ دۆلار غەرامەی بکوژەکان بکات و رابگەیەنێت شەڕی مادەسڕکەرەکان کۆتایی پێهاتووە و ئاسایش لە شەقامەکانی واشنگتۆن دی سی جێگیرە . وەڵامەکەی ئێمەش بە دەوڵەتی عێراق شتێکی لەم چەشنەیە .

جەنابی سەرۆك ، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەرەسی پێهێنراوە و سووکایەتی پێکراوە. ئێمە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستمان ناسەقامگیرتر کردوووە و تامەزرۆیی سەدامان پتر هانداوە بۆ دەستدرێژی زۆرتر .

هیچ ڕاوێژێك لەگەڵ هیچکام لە ئەندامانی کۆنگرێس نەکراوە لە پەیوەندی لە گەڵ ئەم وەلاّمەی سەرۆك کۆمار و هیچ یادداشتنامەیەکمان تەسلیم نەکراوە . جەنابی سەرۆك من لە سەر ئەو باوەڕەم لە بارووەدۆخێکی وەهادا دەرکردنی بڕیارنامەی پشتگیری پێویست نییە ، تەنانەت ئەگەر بڕیارنامەیەك وەك بڕیارنامەکەی پاشنیوەڕۆی دوێنێ بێت کە ئەوەندە سارد و بە پارێز و لاوازییەوە ئامادەکرا بوو . من لە سەر ئەو باوەڕەم لە ماوەیەکی کورتدا زۆربەی هاوکارانم پەشیمان دەبنەوە لە دەنگدان بەم بڕیارنامەیە و ئارەزوو دەکەن بریا وەك من دەنگیان نەدابایا پێی.

ئەم بڕیارنامەیە لە جێی خۆیدا نەبوو و وەلاّمێکی نەگونجاو بوو بە کردەوەیەکی نەگونجاو لە لایەن سەرۆك کۆماری ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە .

## كردەوەی سەربازی ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دژ بە عێراق
## ١١ی ئەیلوولی ١٩٩٦ - ئەنجوومەنی پیران

بەرێز "جان مەككین" :

جەنابی سەرۆك ، سەر لەبەیانی ئەمرۆ ئاگادار بووینەوە كە عێراق مووشەكێكی زەوی بۆ ئاسمانی هاوێشتووە بۆ فرۆكەیەكی ١٦ ـ Fی ئەمریكا كە هەرێمی دژەفڕینـی لـە ناوچـەی كوردنـشینی پارێزراو لە باكووری عێـراق دەپاراست. ئـەم تـەنگ و چـەڵمە درووسـت كردنـە بـۆ ئاسایـشی فرۆكەكانی ئەمریكا و جەولە ئەمنییەكانی ئەمریكا لە ناوچـەی كەنـداوی فـارس نیـشان دەدات سەدام هیچ حیسابێك بۆ هۆشدارییەكانی ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ناكات لەبەر ئەوەی ئێمە پێشتر هۆشداریمان دابوو بە سەدام كە نابێت ئەو سیستمی پاراستنی هەواییە چاك بكاتەوە كە لـە هێرشی ئەم دواییانەی مووشەكی كروزی ئێمە بۆ باشووری عێراق لە كار كەوتبوون .

ئێستا پێویستی كردەوەی سەربازی زۆرتری ولاّتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دژ بـە عێـراق روونـتر بووەتەوە. سەدام حوسەین بەم كردەوە دواییانەی خۆی نیشانی دا كردەوە سـەربازییەكەی هەفتـەی رابردووی ئەمریكا لە جێی خۆیدا نەبووە و دەبێ وەلاّمێكی سەربازی گەورەتر بە سەدام بدرێتـەوە . لەمە زیاتر دەستدرێژییە كێشەخوڵقێنەرەكەی سەدام بۆ ئەمریكا و سەركەوتن بۆ سـەر لـەنوێ كۆنترۆڵ كردنەوەی باكووری عێراق (كە لە رێگای هێـزی سـەربازی و یارمـەتی هێـزە هاوپەیمانـە نوێكەی توانی لە رۆژی دووشەمبە ناوچەكە داگیر بكاتەوە ) گرینگی یەكجار زۆری ئەوە ئاشـكرا دەكات كە دەبێ بەریانەكانی ئیدارەی كلینتۆن بەربەست بكرێت بە هۆی ئەوەی ئیدارەی كلینتۆن ئامانجەكان و رێگاچـارە سیاسـییەكانی خـۆی شـەفاف پێناسـە نـەكردووە و لـە بانگەشـەكانی سەركەوتنی خۆی زیادەرۆیی كردووە .

هێرشەكانی هەفتەی رابردووی ئێمە لە وەلاّمی داگیر كرانی شاری كوردنشینی هـەولێر لـە لایـەن دەوڵەتی عێراق (بە یارمەتی یەكێ لە حیزبە كوردەكان ) ئەنجامـدرا بـەلاّم بـە هێرشـكردنە سـەر

چەند ئامانجێـك لـە باشـووری عێـراق ، دەوڵـەتی ئـەمریکا وەڵامێکـی گونجـاوی نەدایـەوە بـە دەستدرێژییەکەی عێراق بەڵکوو وەڵامێکی بچووك بوو کە بە گوێرەی سزای ئەو سووچە نەبوو کە سـەدام ئـەنجامی دابـوو . هـەروەها کـە یـەکێ لـە کاربەدەسـتانی فـەرمی دەوڵـەتی ئـەمریکا رایگەیاندووە : " ئێمە دەزانین کارێکی باشمان کردووە کە نەمانهێشتووە سەدام بیر لە هێرشکردنە سەر باشووری عێراق بکاتەوە و تێمـان گەیانـدووە کـە ئەگـەر خەڵکەکـەی بـچەوسێنێتەوە یـان هەڕەشە لە ناوچە بکات ، ئێمە بە راستی وەڵامی دەدەینەوە ".

روونە کە ئەم لێدوانە ئەو سێ بەریانە زەرەرمەندە لە خۆ دەگرێـت کـە ئاماژەمـان پێکـرد. ئـەو ئامانجەی ئێمە کە لەم لێدوانەدا ئاماژەی پێکراوە (سەبارەت بە رێگرتن لـە سـەرکوتی خـەڵکی عێراق بە دەستی سەدام) بە خێرایی لەلایـەن کاربەدەسـتێکی فـەرمی حکوومـەتی ئـەمریکوە ا خراوەتە ژێر پێ کە وتوویەتی:" ئێمە خۆمان ناخەینە ناو شەڕی ناوخۆی باکووری عێراق". ئەمـە لە کاتێکدایە کە کاربەدەستانی حکوومەت سەرەتا دەیانگوت هێرشەکانی ئێمە بۆ سەر باشـووری عێراق ، کار دەکاتە سەر کردەوەکانی عێراق لـە بـاکوور بـەڵام ئێـستا جـەخت لـە سـەر ئـەوە دەکەنەوە کە مەبەستی ئەم هێرشانە تەنها ئەوە بووە کە بەرژەوەندی ئیستراتیژیکی ئێمە بپارێزێت لە پەیوەندی لە گەڵ بەرتەسك کردنـەوەی توانـایی سـەدام بـۆ هەڕەشـە کـردن لـە دراوسـێکانی باشووری عێراق .

ئێستا روون دەبێتەوە کە هەرەسهێنانی هاوپەیمانی ئەمریکا (کە لەوەدا ئاشکرا دەبێت کە تورکیا و عەرەبستانی سعوودی رێگەیان بەوە نەداوە کە فڕۆکەکانی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە بنکەکانی خۆیان لەم وڵاتانـە هێـرش بکەنـە سـەر عێـراق ) کاریگەرییـەکی زۆری بـووە لەسـەر هەڵبژاردنی ئامانجەکان لە لایەن ئێمەوە و رێـژەی ئـەو هێـزەی کـە ئـەمریکا بـەکاری هێنـاوە ، هەروەها کە کاربەدەستانی حکوومەت دانیان پێدا ناوە .

گرینگترین مەسەلە ئەوەیە کە بانگەشەکانی سەرۆك کۆمار سەبارەت بەوەی کە هێرشەکانی ئێمـە بە سەرکەوتوویی ئامانجی خۆیان پێکاوە ، دوابەدوای رووداوەکـانی ئـەم هەفتەیـە چـووەتە ژێـر

پرسیار . بەچی دڵنیابیەکەوە ئێمە دەتوانین ئەوە مسۆگەر بکەین کە سەدام هاتۆتە سەر ئەو قەناعەتە کە خەڵکەکەی خۆی نەچەوسێنێتەوە و ملکەچی بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت و شەرت و مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی پاش شەڕی کەنداوی فارس جێبەجێ بکات . ئێمە چۆن دەتوانین لەوە دڵنیا بین کە توانایی عێراق کۆنترۆڵ کراوە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانمان لە ڕووی ئیستراتیژیکییەوە پاش هێرشی ٤٤ موشەکی "کروز"ی ئەمریکا بۆ سەر سیستمی پاراستنی عێراق لە باشوور ، ئێستا لە بارودۆخێکی باشتردان .

لە کاتی ئەم هێرشانە تا ئێستا کوردە هاوپەیمانەکانی سەدام سەرکەوتنی تەواویان لە باکووری عێراق بە دەست هێناوە و سەدام کۆنترۆڵی ئەو ناوچەیەی گرتووەتە دەست کە بە ماوەی چەند ساڵ لە دەستیدا نەبوو. ئاوارە کوردەکان دیسان شەپۆل شەپۆل بەرەو سنوورەکان کەوتوونەتە ڕێ . سەدام لەو پەڕی سووکایەتی کردن بە هۆشدارییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، دەستی کردووە بە چاککردنەوەی ئەو ڕادارانە کە ئێمە هەفتەی ڕابردوو هێرشمان کردە سەریان .

سەدام لانیکەم بۆ ماوەیەك توانیویەتی هاوپەیمانی "شالاوی گەردەلوولی بیابان" لە یەك بترازێنێت و بە پێشێل کردنی ڕێککەوتننامەی ئاگربەست و بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان ، موشەکی هاویشتووە بۆ فڕۆکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ئەرکیان پاراستنی هەرێمی دژەفڕینە کە کۆمەڵگای نیونەتەوەیی درووستی کردووە. ڕوونە کە ئێمە دەبێ وەلامی سەربازی بدەینەوە بە هەوڵی عێراق بۆ لێدانی فڕۆکەکانی ئەمریکا . من گومانم لەوەدا هەیە کە سەرۆك کۆمار فەرمانی هیچ چەشنە وەڵامدانەوەیەك دەر بکات .

کردەوەکانی سەدام تەنها کێشە بۆ ئەمریکا ناخولقێنێت ، بەڵکوو کێشەخوڵقێنەرە بۆ هاوپەیمانی نێونەتەوەیی کە بەرپرسیارە لە بەرامبەر پاراستنی هەرێمی دژەفڕین. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم ڕاستییە ، من چاوەڕوانی هاوکاری زۆرتر لە هاوپەیمانەکانمان دەکەم لە بەراورد لە گەڵ هاوکارییەکەی هەفتەی ڕابردوو .

## بڕیارنامەی پشتیوانی لە شاڵاوی سەربازی لە عێراق

## ۱۳ی ئەیلوولی ۱۹۹٦ ـــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " گۆرتۆن[۱] " :

جەنابی سەرۆك ، هەفتەی پێشوو من تەنها ئەندامی ئەنجوومەنی پیران بووم کە دژی بڕیارنامەی ۲۸۸ (بۆ پشتیوانی کردن لە شاڵاوە سەربازییەکەی ئێمە لە عێراق لە هەفتەی پێشوو) دەنگم دا.
جەنابی سەرۆك من دژی ئەم بڕیارنامەیە دەنگم دا بە هۆی ئەوەی پێموابوو وەڵامی ئێمە لە نێوان دوو ڕێگاچارەی گونجاودا گیر دەکات و لە ئاکامدا وەڵامەکان بە تەواوی بێ کاریگەر دەبێت . من هەفتەی رابردوو وا هەستم دەکرد (و ئەمڕۆش هەر ئەو هەستەم هەیە ) کە ئێمە هیچ بەرژەوەندییەکمان نییە کە خۆمان بخەینە نێو شەڕی ناوخۆیی نێوان دوو حیزبە کوردەکە کە یەکێکیان لە لایەن ئێران و ئەوی دیکە لە لایەن عێراقەوە پشتگیری دەکرێت. لە لایەکی دیکەوە بەهۆی ئەوەی کە ئێمە کوردەکانمان (کە بە هەرحاڵ ڕەفتارێکی ناشارستانیان دژ بە یەك هەیە) تا ئێستا پاراستووە دەتوانین بە شێوازی سەربازیش وەڵام بدەینەوە .
بە هەرحاڵ بێ هیچ ناوێزایەك ، بیرمەندە ئاکادیمیکەکان ، توێژەرانی سەربازی و شارەزایانی بواری ئاسایشی نەتەوەیی لە سەر ئەو بڕوایەن کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێت هێزی سەربازی خۆی بە کاربێنێت بۆ وەڵامدانەوەی کێشەی ناوخۆیی وڵاتێکی دیکە ، واتای ئەمە چییە ؟ واتای ئەوەیە کە کاتێك کە ئێمە کەڵك لە هێزی سەربازی وەردەگرین دەبێ بە تەواوی دڵنیابین لەوەی کە ئەو زەبرە کە لە دەستدرێژیکەر یان دوژمن دەیوەشێنین زۆرتر و گەورەتر بێ لە دەستکەوتەکانی ئەو دوژمنە یان دەستکەوتەکانی دەستدرێژییەکەی. ئەگەر ئێمە ئەم فەلسەفەیە

---

Mr. GORTON [۱]

رەچاو نەكەین بەدڵنیاییەوە لە ئاكامەكانی كەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی پەشیمان دەبینەوە و ئەڵبەتە خەسار لە پرستیژی نەتەوەیشمان دەكەوێت .

جەنابی سەرۆك من لە سەر ئەو بڕوایەم كە ئەوەی كە ئێمە هەفتەی پێشوو كردمان ، ٥ سێنت خەساری لە سەدام دا و یەك دۆلار قازانجی بۆ سەدام و هێزەكانی هەبوو . ئێمە هەفتەی پێشوو بە ٤٤ موشەكی كروز هێرشمان كردە سەر عێراق لە وەڵامی دەستدرێژییەكەی بۆ سەر هەرێمی پارێزراوی كوردستان لە باكووری عێراق. هەروەها كە باسم كرد ئەم هێرشە لە میانەی شەڕی ناوخۆیی نێوان دوو حیزبی كوردی روویدا كە یەكیان لە لایەن ئێران و ئەوی تریان لە لایەن عێراقەوە پشتگیری دەكرێت .

وەڵامەكەی ئێمە وەڵامێكی تەواو نەبوو ، ئێمە هێرشمان كردە سەر باشووری عێراق لە كاتێكدا كە شەڕ و كردەوە دڕندانەكان لە باكووردا رووی دەدا . ئەنجامەكەی (بەوتەی حكوومەتی ئەمریكا) سەركەوتنی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بوو ، هەروەها كە یەكێ لە كاربەدەستە فەرمییەكانی دەوڵەتی ئەمریكا وتوویەتی: " ئێمە لە راستیدا سەداممان تێكشكاند" . ئێستا پاش كەمتر لە هەفتەیەك راستیەكان بە شێوازێكی دیكە دەركەوتوون .

سەدام حوسەین كۆنترۆڵی باكووری عێراقی بە دەست هێناوەتەوە . پاش چەند ساڵ سەركوتی خەڵكی عێراق ( هەروەها كە خودی سەدامیش بە توندی سەركووت كرا) و كوشتنی هەزاران كەس ، سەدام درێژە بە تەقە كردن لە فڕۆكەكانی ئەمریكا لە باشووری عێراق دەدات. حكوومەتی ئەمریكا لە سەروبەندی پێداچوونە بە سەر سیاسەتەكەی خۆیدایە .

بەڵام لە راستیدا ئەمە كەموكورتییەكە لە سیاسەتی دەوڵەتی ئەمریكادا لەبەر ئەوەی لە باتی ئەوەی كە بە شێوازێك وەڵامی دەستدرێژییە سەربازییەكەی عێراق بدەینەوە كە زەرەرەكانی لە قازانجەكانی پتر بێت ، وەڵامەكەی ئێمە بە پێچەوانە بوو . ئەنجامی وەڵامەكەی ئێمە كەمتر بوو لەوەی كە دەبوایا ببایا . ئێستا دڵنیابووینەتەوە كە ئەگەر بمانەوێت بە جۆرێك وەڵامی سەدام بدەینەوە كە زەرەری هێرشەكەی زۆرتربێت لە قازانجەكانی ، دەبێت سەرمایەگوزاری زۆرتر بكەین

و مەترسی زۆرتر قبووڵ بکەین لە چاو ئەو سەرمایەگوزاری و مەترسیەی کە هەفتەی پێشوو کردمان .

ئەوەندە بەسە چرکەساتێك بیر بکەینەوە دەستکەوتی وەڵامە سەربازییەکەی هەفتەی پێشووی ئێمە چی بوو. ئایا رەفتاری سەدام لە گەڵ خەڵکەکەی باشتر بووە؟ ئایا سەدام ناچار کراوە ملکەچی پەیاننامەی ئاگربەستی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت ؟ ئایا رەفتاری عێراق کۆنترۆڵ کراوە ؟ ئایا بارودۆخی ئەمریکا ئێستا باشترە لەچاو پێش لە کردەوە سەربازییەکە؟ ئایا ئێمە لە لایەن هاوپەیانان و هاوپەیانی دژە عێراق ، پشتیوانی چڕوپڕمان لێدەکرێت؟. وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە روونە کە (نا)یە.

ئەو هاوپەیانیە کە سەرۆك بوش بە شێوازیکی لێزانینانە لە کاتی شەڕی کەنداو درووستی کرد ئێستا لاواز بووە ( ئەگەر نەڵێین لەیەك هەڵوەشاوەتەوە) . سەدام بە گوستاخییەوە هۆشدارییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان پشتگوێ دەخات و بە خێرایی هەوڵ دەدات ئەو سیستمی پاراستنی ئاسمانییە چاك بکاتەوە کە ئێمە هەفتەی پێشوو لە کارمان خستووە ، ئەمە لە کاتێکدا کە ئێمە پێمان راگەیاندبوو کە نابێت چاکی بکاتەوە . لە ماوەی ٢یا٣ رۆژی رابردوودا ، سەدام موشەکی هاویشتووە بۆ فڕۆکەکانی ئەمریکا کە هەرێمی دژەفڕین دەپارێزن .

دۆستی بەرێزم سناتۆری ئەیالەتی" ئاریزۆنا"، بەرێز "جان مەککین" شەوی رابردوو وتی " بڕیاری پەیوەندیدار بە چەندایەتی وەڵامەکەی ئێمە ئەڵبەتە بە دەستی سەرۆك کۆمارە " بەڵام بێ سەرەوبەرەیی هەر بەردەوامە . پێرێ وەزیری بەرگری ئەمریکا وتی وەڵامەکەی ئێمە وەڵامێکی تەواو نەبووە و دوێنێ وتی ئەم وەڵامە هەڵدەسەنگێندرێت ، لەوانەیە ئەمرۆ رابگەیەنن وڵامەکەمان بە تەواوی هەڵنەسەنگاندووە .

بەهەرحاڵ جەنابی سەرۆك بە بۆچوونی من زۆر گرنگە کە یەکەم ، سەرۆك کۆمار راوێژ بکات لەگەڵ هاوپەیانەکانمان لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست ( کە تا ئێستا نەکراوە) و دووەم ، سەرۆك کۆمار

بە گوێرەی یاسای دەسەڵاتەكانی شەڕ و بەراوێژ لە گەڵ كۆنگرێس بچێتە پێش . سەرۆك كۆمار باوەڕی بە یاسای دەسەڵاتەكانی شەڕ وەك یاسایەكی بنەڕەتی هەبێت یا نەبێت ، زۆر زۆر باشە كە لەگەڵ نوێنەرانی خەڵكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا راوێژ بكات پێش ئەوەی دەست بدات بە ئەنجامدانی كردەوەگەلێكی وەها ، نە ئەوەی كە پاش ئەنجامدانی كارەكە هەوڵ بدات بۆ رازی كردنی كۆنگرێس .

جەنابی سەرۆك بە بەراورد لە گەڵ هەفتەی رابردوو، ئێمە ئێستا لە بارووددۆخێكی خراپتر داین، ئێستا لە گەڵ قەیرانێكی جیدی بەرەورووین . ئێمە ئێستا هیچ بنكەیەكمان نییە لە نێو وڵاتانی هاوپەیمان بۆ ئەوەی لەم بنكانەوە هێرش بكەینە سەر عێراق . ئەگەر نامانەوێت هەموو ئەو شتانە لە دەست بدەین كە بە بەهایەكی گران لە شەڕی كەنداودا بە دەستمان هێناوە سەرۆك كۆمار دەبێ سەرەنجی زۆرتر بدات بە كێشەكە لە چاو ئەو سەرەنجەی كە تا ئێستا داویەتی و هاوپەیمانییەكی بەرفراوانتر دروست بكات.

## بارووودۆخی عێراق

## ١٣ی ئەیلوولی ١٩٩٦ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز " كرایگ ":

جەنابی سەرۆك من بۆ بردنە سەرەوەی زانیارییەكانی خۆم سەبارەت بە عێراق پشت بە دەنگوباسی تەلەفزیۆنەكان دەبەستم. پێویست بە وتن ناكات كە تۆزێك بێ هیوا بوومە لەوەی كە سەرۆك كۆمار هیچ هەوڵێكی نەداوە بۆ راوێژ كردن لەگەڵ كۆنگرێس سەبارەت بەم بارووودۆخە زۆر ناڵۆزە . بەڵام بەهەرحاڵ من راپۆرتەكەی تەلەفزیۆنی CNN بە جێبەجێكردنی ئەركی سەرۆك كۆمار بە نیسبەت یاسای دەسەڵاتی شەڕ نازانم.

یاسای دەسەڵاتەكانی شەڕ دەڵێت " سەرۆك كۆمار دەبێت بە مومكینترین شێوە لە گەڵ كۆنگرێس راوێژ بكات پێش ئەوەی سەرباز رەوانەی شوێنی شەڕ بكات و پاش ئەوەش كە سەربازی رەوانەی شوێنی شەڕ كرد دەبێت بەردەوام لە گەڵ كۆنگرێس راوێژ بكات " . جەنابی سەرۆك ئەم رێوشوێنە ئەو كاتانەش لەخۆ دەگرێت كە بارووودۆخەكە بەرەو شەڕ دەچێت واتا ئەم بەرپرسیارێتییە بۆ رووداوەكانی ٣١ی ئاب وەڕاست دەگەڕێت . كۆنگرێس ئەم جارە لە بەرامبەر سەرۆك كۆمار پاشەكشەی كرد بە هۆی ئەوەی سەرۆك كۆمار دەبوایا پێش لە ئەنجامدانی كار راوێژی لەگەڵ ئەندامانی كۆنگرێس بكردبایا بەڵام ئەمجارە كۆنگرێس لە پاڵ سەرۆك كۆمار راوەستا بۆ ئەوەی بە تەواوی پشتیوانی لە سەربازەكانمان و بڕیاری سەرۆك كۆمار وەك فەرماندەی گشتی بكات .

بە هەر حاڵ ئێستا بارودۆخەكە بە تەواوی جیاوازە . كۆنگرێس لێرەیە و ئێمەش چاوەڕوانین . جەنابی سەرۆك با بە روونی ئەوە بڵێم كە پشتیوانی كردن لە سەربازەكانمان هەر لە جێی خۆیدایە بەڵام سەرۆك كۆمار ئیدی ناتوانێت پشتیوانی كۆنگرێس بە دەست بهێنێت ئەگەر لەپێشدا ئاگادارمان نەكاتەوە .

جەنابی سەرۆك ، سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەست بەکار بوو بۆ بەرەنگاری کردن لەگەڵ هێرشی سەدام بۆ سەر کوردەکان و بە خێرایی سەرکەوتنی خۆی ڕاگەیاند . بەڵام سیاسەتی سەرۆك کۆمار تا ئەمڕۆ سەرکەوتوو نەبووە . لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەك دوای ڕاگەیاندنی ئەم سەرکەوتنە ، سەدام تەقە لە فڕۆکەکانمان لە هەرێمی دژەفڕین لە باکووری عێراق دەکات و پێگەیەکی بەهێزی لە ناوچە کوردنشینەکانی نێو هەرێمی پارێزراوی پێشوو بە دەست هێناوە و هێزی سەربازی و پێداویستی ڕەوانەی کەنداوی فارس کراوە . ئەگەر بەم زووانە سیاسەتێکی شەفاف و بەهێز پێناسە نەکرێت سیاسەتی سەرۆك کۆمار لە کەنداو بە دڵنیاییەوە ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە . ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەرك و ئامانج و ستراتیژییەکانمان بۆ خەڵکی ئەمریکا و کۆنگرێس ڕوون بکەینەوە، کاتی ئەوەیە کە سەرۆك کۆمار ئەرکەکانی خۆی بە گوێرەی یاسای دەسەڵاتەکانی شەڕ جێبەجێ بکات .

من هەفتەی ڕابردوو لە کاتی باسکردنی بارودۆخی عێراق ، نیگەرانی خۆم بە نیسبەت سەرنەکەوتنی سەرۆك کۆمار بۆ ڕاگرتنی هاوپەیمانێتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ هاوپەیمانانی شەڕی کەنداو دەربڕی. بە بێ بوونی هاوپەیمانی ، ئێمە لەگەڵ مەترسی لەدەستدانی بەرژەوەندی ستراتیژیك ڕووبەڕوو دەبینەوە و پێگەی بەرگریکارانەی ئێمە لە کەنداوی فارس لاوازتر دەبێت . سەدام حوسەین لە ڕێگای هەوڵدان بۆ خستنی درز لە نێو هاوپەیمانی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی شەڕی کەنداوی فارس شێلگیربوونی ئێمە لە کەنداوی فارس تاقی دەکاتەوە. ئەگەر ئێمە ئەرك و سیاسەتی خۆمان بە ڕوونی پێناسە نەکەین ، هەروا دەکەوینە ناو بارودۆخێك کە لە ناوچە گۆشەگیرمان دەکات و ڕێگاکانی چارەسەر کردنی بارودۆخەکە کەم دەکاتەوە .

سەدام کەسێك نییە کە یاری پێبکرێت ، سەدام جگە لە دەستدرێژی سەربازی سەری لە هیچ نابێتەوە و ئێمە دەبێ ئاگادار بین بە نیسبەت ئەوەی کە سەدام سەرنەکەوتن و شەرمەندە بوونی

ئەمریکا بە هەر بەهایەك بە سەرکەوتنی خۆی دەزانێت . ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە بە هۆی ئەوەی لەوانەیە ئەم بەهایە هەڕەشە بۆ سەر ژیانی ئەمریکاییەکانیش لە خۆبگرێت.

جەنابی سەرۆك ، راپۆرتەکەی تەلەفزیۆنی CNN زانیاری باش و نوێ دەخاتە بەردەستمان ، بەلام پەیامێکی دووربینانە، ئاراستەدار و روون بە نیسبەت ئەو سیاسەتەی کە دەوڵەتی کلینتۆن دەیەوێت بیگرێتە بەر پێشکەش ناکات . کەوابوو هیوادارم و ئامانجیشم ئەوەیە کە سەرۆك کۆمار هان بدەین ئەرکی خۆی بە نیسبەت کۆنگرێس بە گوێرەی یاسای دەسەلاتەکانی شەڕ بۆ خەڵکی ئەمریکا و سەربازەکانمان جێبەجێ بکات .

## بەكارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق
## ١٧ی ئەیلوولی ١٩٩٦ ــ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" سپیكتێر ":

جەنابی سەرۆك من ئێستا لەو كۆبوونەوەیە دێمەوە كە سەبارەت بە عێراق گیرا و سەرۆك كلینتۆن، وەزیری دەرەوە، وەزیری بەرگری ، فەرماندەی گشتی سوپا و ئەندامانی كۆنگرێس و ئەنجوومەنی پیران( سەر بە هەردوو حیزبی كۆماریخواز و دیموكرات) تێیدا بەشدار بوون. دەمەوێت شرۆڤەی مەسەلەیەك بكەم كە بە تایبەت لەگەڵ سەرۆك كۆمار باسم كردووە ، ئەویش ئەوەیە كە ئەم مەسەلەیە لە كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بخاتە روو كە ئایا ئێمە دەبێ لە ناوچەی كەنداو كەڵك لە هێزی سەربازی وەربگرین دژی عێراق.

بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی ، لە كاتی قەیراندا سەرۆك كۆمار وەك فەرماندەی گشتی دەسەڵاتی ئەوەی هەیە كردەوەی دەستبەجێ ئەنجام بدات . هەروەها بە هەمان شێوە كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش دەسەڵاتی ئەوەی هەیە شەڕ رابگەیەنێت و كەڵك لە هێزی سەربازی وەربگرێت هەروەها كە لە شەڕی ١٩٩١ی كەنداوی فارسدا كرا كە شەڕێكی راستەقینە بوو و سەرۆك كۆمار لە كانوونی دووەمی ١٩٩١ لە كۆنگرێس ئامادە بوو و كۆنگرێس مشتوومڕی لە سەر ئەم مەسەلەیە كرد و سەرەنجام بە ٥٢ دەنگی ئەرێنی لە بەرامبەر ٤٧ دەنگی نەرێنی رێگەی دا بە سەرۆك كۆمار كەڵك لە هێزی سەربازی وەربگرێت .

من بە تەواوی لە سەر ئەو باوەڕەم كە مەسەلەی كەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی دژی عێراق مەسەلەیەكە كە ئەمڕۆ دەبێ كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بڕیاری لە سەر بدات نە ئەوە كە سەرۆك كۆمار بەشێوازی یەكلایەنانە بڕیاری لە سەر بدات، ئەمە لە كاتێكدا كەئەم مەسەلەیە مەسەلەیەكی زۆر كتوپڕ نییە و كاتی ئەوەمان هەیە بە گوێرەی رەوتی یاسایی خۆمان مشتوومڕی لە سەر بكەین. كاتێ كە دوو هەفتە پێش یەكەم هێرشی مووشەكی كرایە سەر عێراق

له ٣ی ئەیلوول، سەرۆك كۆمار له پێشەوە راوێژی لە گەڵ كۆنگرێس نەكرد كە بە بیروبۆچوونی من بە گوێرەی یاسای دەسەڵاتەكانی شەڕ پێویست بوو راوێژی بكردبایا ، ئەمە وەك ئاوێكی پشت بەنداوێك وایە .

له كۆبوونەوەی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ ئەندامانی كۆنگرێس باسی ئەوەیان كرد كە راوێژی زۆرتر پێویستە . پێموابێ دانیشتنەكەی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ یەكەمجار بوو كە گرووپێ لە ئەندامانی كۆنگرێس و ئەنجوومەنی پیران لە لایەن دەوڵەت ، سەرۆك كۆمار ، وەزیری دەرەوە و وەزیری بەرگرییەوە ئاگادار كرانەوە . لەم كۆبوونەوەیەدا كە گەلێ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران و كۆنگرێس سەربە هەردوو حیزب تێیدا بەشدار بوون ، كۆمەڵێك پرسیار لە لایەن ئەندامانی سەر بە هەر دوو حیزب خرایە روو سەبارەت بەوە كە سیاسەتی ئێستای ئێمە چییە و ئایا ئێمە سیاسەتێكی یەكپارچەمان هەیە و دەمانەوێت ئێستا چی لە عێراق بكەین و سیاسەتی ئێمە دەبێ چۆن بێت .

له كۆبوونەوەكەی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ پرسیار كرا كە ئایا ئەو كارە لە جێی خۆیدا بووە كە حكومەتی ئەمریكا هەرێمی دژەفڕینی لە باشووری عێراق بەرفراوانتر كردووە لە كاتێكدا كە سەدام هێرشی كردبووە سەر كوردەكان لە باكووری عێراق و باسی ئەوە كرا كە كردەوەكانی ئەم دواییانەی ئێمە دژی سەدام نەبووەتە هۆی لاواز بوونی سەدام بەڵكوو سەدام بە هێزتر بووە، بە تایبەت پاش ئەوەی كە هەندێ لە كوردەكان بانگهێشتی سەدامیان كرد بێتە نێو باكووری عێراق . هەروەها باسی ئەوە كرا كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبێ چی بكات لە كاتێكدا كە بەرژەوەندییە یەكلاییكەرەوەكانی ئەمریكا لەگەڵ ئامانجە مرۆڤدۆستانەكانمان یەكی نەگرتەوە و لە كاتێكدا كە هێزی سەربازی ئەمریكا لەوانەیە بخرێتە ناو رێگایەكی مەترسیدار لە شوێنێك كە مەسەلەی بەرژەوەندییە یەكلاییكەرەوەكانی ئەمریكا لە ئارادایە. لەوانەیە بیروڕای جیاواز هەبێت كاتێك كە كێشەكە دێتە سەر مەسەلە مرۆڤدۆستانەكان .

جەنابی سەرۆك هەموو ئەم پرسیارانە دێتەوە سەر ئەو مەسەلەیە كە خەڵكی ئەمریكا ئەمڕۆ نازانن دەوڵەتی ئەمریكا دەیەوێت لە كەنداوی فارس چی بكات ، دژی سەدام چی بكات، و راوێژ لە گەڵ كۆنگرێسدا نەكرا پێش لەوەی هێرشی مووشەكی بكرێتە سەر باشووری عێراق و زانیاری تەواومان پێ نەدرا لەم پەیوەندییەدا. مەسەلەی كەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی (لە كاتی نزیكبوونە لە شەڕ) دەبێ لە لایەن كۆنگرێسی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاوە بڕیاری لە سەر بدرێت و دەسەڵاتی سەرۆك كۆمار وەك فەرماندەی گشتی بۆ ئەنجامدانی كردەوە لە كاتی كتووپڕدا لە جێی خۆیەتی. ئێمە كاتی ئەوەمان هەیە لە كۆنگرێس مشتوومڕ بكەین سەبارەت بەوە كە دەبێ سیاسەتمان چۆن بێت و چی بكەین و چۆن بچینە پێش .

هەربۆیە من لە كۆبوونەوەكەی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ داوام لە سەرۆك كۆمار كرد داواكاری خۆی پێشكەشی كۆنگرێس بكات بۆ ئەوەی كۆنگرێس بە گوێرەی رێوشوێنە یاساییەكان بڕیاری لە سەر بدات و رەزامەندی لە سەر بەكارهێنانی هێزی سەربازی لە لایەن دەوڵەتی ئەمریكا دەربڕێ.

## مافی چارەی خۆنووسین بۆ کورد

## ١ی مایسی ١٩٩٧، ئەنجوومەنی نوێنەران

بەریز فیلنێر[1]، نوێنەری ئەیالەتی کالیفۆرنیا:

جەنابی سەرۆك ، دەمەوێت سەرنجی هاوکارانم بەرەو لای بارودۆخی دژواری کوردەکان رابکێشم.

کورد گەلێکی کۆن و کەونارە کە لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست لە سەرزەمینێك بە ناوی کوردستان دەژی و گەلێکی سەربەرزە کە نفوسی نزیکەی ٣٠ میلیۆن کەسە و ئەمرۆ گەورەترین نەتەوەیە لە جیهاندا کە لە مافی چارەی خۆنووسین بێبەشە.

کوردەکان هەزاران ساڵە لە سەرزەمینی ئیستای خۆیان نیشتەجێن .پادشا کوردە "گوتییەکان" پتر لە ٤هەزار سال لەمەو پیش بە سەر ئێران و میزۆپۆتامیادا فەرمانڕەواییان کردووە. "شۆرشی نئۆلۆتیك[2]" ٧هەزار ساڵ پیش لە زایینی مەسیح سەرەتا لە کوردستان رووی داوە واتا ٣٥٠٠ساڵ پێش لەوەی شۆڕشی نئۆلۆتیك لە ئەوروپا روو بدات.

هەندی لە سەرەتاییترین شارو گوند و ئەو شوێنانە کە مرۆڤ لە مێژوودا تییێدا نیشتەجێ بووە لە کوردستان دۆزراونەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا کورد یەکێ لە گەورەترین نەتەوەکانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستە کە لە دەسەلاّتداری بە سەر هەموو خاکەکەی خۆی بێبەشە. کوردستان

[1] Mr. FILNER

[2] نئولۆتیك (چاخی بەردینی نوێ) بەو چاخە دەڵێن کە مرۆڤ دەستی بە کشتوکاڵ و خۆماڵی کردنی هەندێ لە گیانلەبەران و پیکهێنانی گوند کرد و توانی بەسەر دەوروبەری خۆیدا زاڵ بێت. (وەرگێڕ )

کۆلۆنییەکی(موستەعمەرە) نێونەتەوەییە کە دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا بەسەریدا دەسەلاتداری دەکەن.

گەلی کورد بەدەستی ئەم چوار رژێمە دەچەوسێنرێتەوە. نیوەی خاکی کوردستان و دوو لە سێی دانیشتوانی کوردستان لە کوردستانی بن دەستی تورکیان. ئەم داگیرکارییە لە سالی ١٩٢٣ لە لایەن پەیماننامەی" لۆزان"ەوە رەوایەتی پێبەخشرا کەحاشای لەو بەڵێنە کرد کە پەیماننامەی "سێڤر" لە سەرەتای ١٩٢٠بە کورد و ئەرمەنییەکانی دابوو. پەیماننامەی"سێڤر" بڕیاری دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردی لە سەرزەمینی کوردستان دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی دابوو. پەیماننامەی "لۆزان" رەوایەتی بەخشی بە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان بە دەستی تورکیا (کە پێشتر لەوە روییدابوو) و رێگای بۆ هەڵمەتی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەڵکوژی کوردەکان لە سالانی دواتر خۆش کرد.

دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکەکانی تورکیا بەرپرسیاری زەنجیرەی دوورو درێژی پاکتاوی رەگەزین. مێژوونوس "جەیمز تاشجیان[3]" هەڵیسەنگاندووە کە پتر لە دوو میلیون و سەد و بیست هەزار یونانی، نەستوری، مارونی، سەریانی، بولگاری ، ئیزەدی، جاکۆبیت و ئەرمەنی لە سەد سالی نیوان ١٨٢٢ و ١٩٢٢ بە دەستی تورکەکان بە کۆمەڵ کوژراون. "جەیمز تاشجیان" جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم ئامارە ئەو ٥٠٠هەزار کوردە لە خۆ ناگرێت کەلە هەمان فەترەدا کوژراون، دوور خراونەتەوە یا دەربەدەر کراون. لە نیوان ١٩٢٥ و ١٩٣٨یەك میلیۆن کوردی دیکە قڕ کران ، ئەمە لە کاتیکدایە کە سەرجەم دانیشتووانی ئەرمەنی ژێر دەسەلاتی تورکەکان واتا پتر لە یەك میلیۆن و ١٢٠ هەزار کەس پێشتر قەلاچۆ کرابوون.

ئەمڕۆش کۆماندۆ تایبەتەکانی تورکیا لە راستیدا بۆ بڕینی سەری گریلا کوردەکان و کەسانی دیکە خەلات کۆ دەکەنەوە ، واتا هەر ئەو کارە کە بە سەر قوربانییە ئەرمەنییەکانیاندا هێنا،

---

[3] James Tashjian

هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەیانەوێت هەمان ئەو چارەنووسە کە بە سەر ئەرمەنییەکانیاندا هێنا بە سەر کورد و ئامانجە نەتەوەیەکانیدا بهێنن.

"تیمی کردەوە تایبەتەکانی تورکیا" روومەتی خۆیان بە رەنگی سەوز و سپی بۆیاخ دەکەن. پیداویستییەکانی ئەم تیمە تایبەتە و ٨٠٪ی پێداویستییەکانی سوپای تورکیا لە لایەن ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا( زۆربەی بە مەسرەفی خەڵکی باجدەرەی ئەمریکا ) دابین دەکرێت.

ئەمڕۆ تەنانەت ئەندامە کوردەکانی پارلمانی تورکیا لە بەندیخانەدان کە نموونەی سەرەکییان "لەیلا زانا"یە کە وەرگری خەلاّتی ئازادی ساخارۆڤە. "ئاندرێ ساخارۆڤ[4]" لە سالی ١٩٨٩داکۆکی لە کوردەکان کرد و رایگەیاند :

" خەباتی تراژدیکی گەلی کورد کە ئەوەندەی خایاندووە، لە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان سەرچاوە دەگریت، کەوابوو خەباتێکی رەوایە"

رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، رێکخراوی چاودێری هلیسینکی،رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و گەلێ گروپی مافی مرۆڤی دیکە لەم سالأنەی دواییدا سەرنجی زۆریان داوە بە پیشیل کردنی مافی کوردەکان لە لایەن تورکیاوە. ئەم رێکخراوانە ئاماژە بەوە دەکەن کە لە سالی ١٩٨٤ـەوە پتر لە ٢٠ هەزار کەس کوژراون، پتر لە ٣ هەزار گوند کاول کراون و دانیشتووانی کوردی تورکیا لەگەڵ ئەشکەنجە، کوشتن و برین، دەربەدەر کردن و گرتن و زیندانی کردن رووبەڕوو بوونەتەوە.

سەرکوتی کوردەکان بە دەستی رژیمی سەدام حوسەین لە عێراق شتێکە کە بیروڕای گشتی زۆرتر ئاگاداریەتی. پتر لە ٢٠٠ هەزار کورد دوابەدوای شەڕی ئێران و عێراق کوژران و لە سی سالی رابردوودا پتر لە ٤ هەزار گوندی کوردنشین بە دەستی هێزەکانی عێراق کاول کراون. سێ تەن بەڵگەنامە و بەڵگەی دیکە دەربارەی شالاوی "ئەنفال" دوابەدوای شەڕی ئێران و عێراق لە دەستی ولاّتە یەکگرتووەکاندایە. من داوا لە وەزارەتی دەرەوە دەکەم ئەم بەڵگەنامانە ئازاد بکات

---

[4] Andrei Sakharov

بۆ ئەوەی لایەنە پەیوەندیدارەکان توێژینەوەی گشتی له سەر بکەن. بە باوەڕی من ئەم بەڵگەنامانە ئەو تاوانانە پشتڕاست دەکەنەوە کە رژێمی عێراق دژی مرۆڤایەتی لە کوردستان ئەنجامی داوە.

باش دەبێت ئەگەر ئێمە مەسەلەی یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بە دەوڵەتانی دیکە بە ریزگرتن لە مافی مرۆڤ ببەستینەوە و دژی ئەیار کردنی ئەو دەوڵەتانە بە پێداویستی سەربازی رابوەستین کە ئەم پێداویستیانە بۆ سەرکوتی خەڵکەیان بەکار دێنن. وڵاتە یەکگرتووەکان قەد نابێت رێگا بەوە بدات جارێکی دیکە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان یا هەرکەسێکی دیکە بەکار ببردرێت، هەروەها کە لە ئاداری ١٩٨٨ شاری کەوناری کوردنشینی هەڵەبجە بەم چەکانە کیمیاباران کرا و پتر لە ٥ هەزار خەلکی سڤیلی کورد کە زۆربەیان ژن و منداڵ بون، کوژران.

جەنابی سەرۆك ئیستا کاتی ئەوەیە سیاسەتی لەمێژینەی خۆمان بگۆڕین و بوونی کوردستان و ماف و ئازادی دانیشتوانەکەی بە فەرمی قبووڵ بکەین کە هەموو مرۆڤێك بێ ناوێزە دەبێ هەیبێت. ئێمە دەبێت لە دەستڕۆیشتوویی خۆمان کەڵك وەربگرین بۆ ئەوەی یارمەتی بدەین بەچارەسەر بوونی کێشەی ناوخۆیی کوردەکان و پشتیوانی لە یەکگرتوویان بکەین بۆ ئەوەی کوردەکان بگەن بە مافی چارەی خۆنووسین. ئێمە دەبێ کۆتایی بەوە بێنین کە لە روانگەی قازانج و بەرژەوەندی کومپانیا نەوتییەکان و خزمەت کردن بە مانۆڕی زلهێزەکان سەیری نەتەوەکان بکەین .ئێمە دەبێ هەناردنە دەرەوەی چەکە کیمیایەکان قەدەخە بکەین.هەم عێراق و هەم تورکیا چەکی کۆمەڵکوژیان دژی کوردەکان بە کار هێناوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان داویەتی پێیان. ئێمە بەردەوام چەکی هێشوویی دەفرۆشین بە تورکیا و تورکیاش بەردەوام ئەم چەکانە بۆ بومبارانکردنی گوند و ناوچە کوردنشینەکان بەکار دێنێ.

ئێرانیش بەردەوام کوردەکان لە وڵاتەکەی سەرکووت دەکات. باوکی شا کە لایەنگری فاشیستەکان (مەبەستی فاشیستەکانی ئاڵمانیای هیتلەرییە- وەرگێڕ) بوو و لە ساڵی ١٩٤١ لە لایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە سەر دەسەڵات لابرا، سیاسەتی یەکجێنشین کردنی عەشیرەتە

رەوەندەکانی گرتە بەر کە بووە هۆی لەناوچوونی گەلێ لە عەشیرەتە کوردەکان و غەیرە کوردەکان. رژێمی خومەینی دەستبەجێ پاش گەیشتن بە دەسەلات لەئێران لە ۱۹۷۹ کوردەکانی سەرکووت کرد، و رێبەرانی حیزبە کوردە سەرەکییە نەیارەکانی دەسەلاتی رژێمی ئێران یەك لە دوای یەك بە دەستی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی لە ئەورووپا کوژران.

سەرکوتی کوردەکان بە دەستی رژێمی ئێران کەمتر لە ئەمریکا سەرنجی پێدراوە و نیگەرانی بە نیسبەت پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لە لایەن ئەو رژێمەوە پشتگوێ خراوە. ئێمە دەبێ کۆتایی بەوە بێنین کە وەك هەڕەشەیەك بۆ سەقامگیری وڵاتان سەیری ئازادی کوردەکان بکەین و دەبێ پێشوازی لە ئازادیان بکەین.

مایکیل وان واڵت وان پراگ[5] ،راوێژکاری دالایی لاما[6]، رێبەری تەبەت[7] دەڵێت:

"هەڵوەشانەوەی کتوپڕ لە بۆسەی هەموو ئەو وڵاتانەدایە کە خەڵکی خۆیان لە مافی چارەی خۆنووسین بێبەش کردووە. ئێمە نابێت پرسپێکتیڤێکی درێژخایەن کە پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی هەموو گەلان زامن دەکات بکەین بە قوربانی بەرژەوەندی کورتخایەنی ئابووری و سیاسی. بەفەرمی ناسینی جیهانیی مافی چارەی خۆنووسین، خاڵی وەرچەرخان و لە راستیدا هۆکاری پێکهاتنی جیهانێکی ئاشتیخواز و سەقامگیری راستەقینەیە".

بە وتەی دادوەر "ویلیام داگلاس"کە نزیکەی ۵۰ ساڵ لەمەو پێش سەردانی کوردەکانی کردووە، کوردەکان وتەیەکیان هەیە کە دەڵێت:"جیهان گوڵێکی سوورە، بۆنی بکە و بیدە بە دۆستەکانت".

کوردستان سەرچاوەی ئاو، نەوت، گاز و بەرهەمی کشتوکاڵی زۆری هەیە و دەتوانێت ئەم سەرچاوانە لەگەڵ گەلانی دەوروبەری خۆی لە جیهان دابەش بکات، بەڵام سەرەتا دەبێت

---

[5] Michael van Walt van Praag
[6] Dalai Lama
[7] Tibet

سەرکووتی کوردەکان کۆتایی پێبێت و کوردەکان بتوانن کاروباری خۆیان بەڕیوە ببەن و خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن و کونترۆلی سەرچاوەکانیان بگرنە دەست.

جان ئێف کنیدی[8]، سەرۆك کۆماری پیشووی ئەمریکا راست دەڵێت:

"هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر پێش بە دەستیوەردانی هەموو دەوڵەتەکان لە چارەی خۆنووسینی گەلان بگیردرێت، ئاشتی باشتر دەستەبەر دەبێت."

وایت ئایزینهاوێر[9] جەخت لە سەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە:

" مافی هەموو گەلان بۆ پێکهێنانی سیستمی دەوڵەتی و ئابووری خۆی ،مافێکی حاشا لێنەکراوە.هەولی گەلان بۆ سەپاندنی جۆری سیستمی دەوڵەتی خۆیان بە سەر گەلانی دیکە شتێکی قبولنەکراوە".

ئێمە دەبێ ئەم پرەنسیپانە بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ کوردەکان وە ئامانجەکانیان بە کار ببەین. یارمەتی سەربازیی ولاتە یەکگرتووەکان بە تورکیا دەبێ بەوە ببەسترێتەوە کە تورکیا بە سیاسەتەکانیدا بچێتەوە بە نیسبەت کوردستان. ئێمە دەبێ پشتیوانی لە دەستپێشخەرییەکانی کوردەکان بۆ چارەسەر کردنی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکان لە پەیوەندی لەگەڵ داگیرکرانی کوردستان بکەین.

لە هەمووی گرنگتر ئێمە دەبێ مافی چارەی خۆنووسینی کوردەکان بە فەرمی قبول بکەین، ئەو مافە کە بۆ گەلی ئازادیخوازی ئەمریکا پیرۆزە و هەموو گەلانی جیهان دەبێ هەیانبێت.

جەنابی سەرۆك من پاشان لە کاتێکی گونجاودا زۆرتر باسی ئەم مەسەلەیە دەکەم.

---

[8] John F. Kennedy
[9] Dwight D. Eisenhower

## پێویستی دادگایی کردنی ڕێبەرانی ڕژێمی عێراق لە دادگای نێونەتەوەیی تاواندا
## ١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ – ئەنجوومەنی نوێنەران

بەرێز "گیلمەن":

جەنابی سەرۆك من دەمەوێت ڕەزامەندی خۆم دەرببڕم بە نیسبەت بڕیارنامەی ١٣٧ کە هەستی کۆنگرێسی ئەمریکا دەردەبڕێت دەربارەی پێویستی دەستبەجێ دادگایی کردنی ڕێبەرانی ڕژێمی عێراق لە دادگای تاوانەکان بە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی.

ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە:

- بە هۆی ئەوەی ڕژێمی سەدام حوسەین ، مافی هاووڵاتیانی عێراق و خەڵکی دیکەی ناوچەی بە گشتی پێشێل کردووە، لەوانە لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجەو ڕەفتاری دڵڕەقانە و نامرۆڤانە، دەستگیرکردن و زیندانی کردنی سەرەڕۆیانە، بێ سەروشوێن کردن و سەرکوتی ئازادی دەربڕینی بیروڕا و هزر بە شێوازی تاکەکەسی و بە کۆمەڵ

- بەهۆی ئەوەی سەدام حوسەین و داروودەستەکەی بە شێوازی سیستماتیك هەوڵیان داوە خەڵکی کورد لە عێراق لە ناوببەن لە ڕێگای کەڵك وەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی سڤیلی کورد و شاڵاوی ئەنفال ١٩٨٧ – ١٩٨٨ کە لە ئەنجامیدا پتر لە ١٨٢ هەزار کەس بێ سەرو شوێن کراون و پتر لە ٤ هەزار گوند کاول کراون و پتر لە ١٠ میلیسون مین لە کوردستانی عێراق چێندراون و پاکتاوی ڕەگەزی شاری کەرکوك بەردەوامە

- بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە ڕێبەرایەتی سەدام حوسەین، عەشیرە سوننەکانی ڕۆژئاوای عێراقی سەرکوت کردووە ، گوند و کلیساکانی ئاشوور و کەلدانیەکان کاول کردووە ،

توركمانهكانى لهسێداره داوه و دوورخستوهتهوه، شيعهكانى به كۆمهڵ كوشتووه و "شارستانى كهونارى مارشى عهرهبى[1] " له ناو بردووه له ڕێگاى تێدانى ژينگهى ئهم شوێنه

- بههۆى ئهوهى چارهنووسى پتر له ٦٠٠ كوێتى هێشتا ناديارە كه له كاتى جهنگى كهنداو له لايهن ڕژێمى عێراقهوه به ديل گيراون و نزيكهى ههمان ژماره له خهڵكى ديكهى كوێت له لايهن دهوڵهتى عێراقهوه بێ سهروشوێن كراون و ژمارهيهكى زۆر مينى نهتهقێنراو له كوێت ماوه و ئێستا پاش ٦ ساڵ له كوتايى پێهاتنى جهنگى كهنداو، دهوڵهتى عێراق قهرهبوى ئهو زهرهر وزيانانهى نهكردوه كه سهربازانى عێراق له كوێتيان داوه

- به هۆى ئهوهى كۆمارى عێراق جاڕنامهى گهردوونى مافى مرۆڤ ، كنوانسيونى نێونهتهوهيى مافى مهدهنى و سياسى، كنوانسيونى پێشگيرى و سزادانى تاوانى ژێنوسايد و كنوانسيونى ١٢ تابى ١٩٤٩ى ژنيف ( دهربارهى شێوازى ههڵسوكهوت لهگهڵ ديلهكانى جهنگ )ى واژۆ كردووه و بهرپرسياره له بهرامبهر جێبهجێ كردنى ئهم ڕێكهوتننامه نێونهتهوهييانه

- بههۆى ئهوهى سهدام حوسهين و ڕژێمهكهى كهشوههواى ترساندن و تۆقاندنيان بهسهر عێراق و سهراسهرى ناوچهدا زاڵ كردووه له ڕێگاى سياسهتى پێشێلكردنى ڕێوشوێن و كنوانسيۆنه نێونهتهوهييهكان

- بههۆى ئهوهى كۆنگرێس زۆر نيگهرانه له پێشێل كردنى توندو بهردهوامى مافى مرۆڤ لهلايهن دهوڵهتى عێراق له ژێر ڕێبهرايهتى و ڕێنوێنى سهدام حوسين

كهوابوو كۆنگرێسى وڵاته يهكگرتووهكانى ئهمريكا:

١- پێشێل كردنى توندى مافى مرۆڤ لهلايهن دهوڵهتى عێراق شهرمهزار دهكات كه بووهته هۆى ههمهگير بوونى سيستمى سهركووت و جێگيربووى ئهم سيستمه له ڕێگاى سهركوت و ترساندن و تۆقاندنى بهرفراوان.

---

[1] ancient Marsh Arab civilization

٢- کەڵك وەرگرتنی بەردەوامی دەوڵەتی عێراق لە هێزی سەربازی و چەکە کۆمەڵکوژەکان دژی هاوولاتیانی خۆی و ولاتانی دراوسی شەرمەزار دەکات.

٣- سەرپێچی دەوڵەتی عێراق لە جێبەجێ کردنی یاسا نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ شەرمەزار دەکات، لەوانە بەشداری نەکردن و هاوکاری نەکردن لە گەڵ رێکخراوە چاودێرە نێونەتەوەییەکان وجەخت لە سەر گرتنەبەری میکانیزمەکان بۆ روون کردنەوەی چارەنووسی زیندانیە بێ سەروشوێن کراوە کوێتیەکان دەکاتەوە.

٤- سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ کار بکەن بۆ پێکهێنانی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بە مەبەستی دادگایی کردن سەدام حوسەین و هەموو کاربەدەستانی دیکەی عێراق کە بەرپرسیارن لە بەرامبەر تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، لەوانە کەڵك وەرگرتنی نایاسایی لە هێزی سەربازی، تاوان دژی ئاشتی، تاوانەکانی دژ بە کنوانسیونی ژنێڤ ( دەربارەی شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکانی جەنگ ) و تاوانی ژینوساید

٥- سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، دەستبەجێ و چالاکانە هاوکاری بکەن لە گەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ پەسەند کردنی بریارنامەیەك لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانە نێونەتەوەییەکان بۆ عێراق.

***

بەرێز "گیلمەن":

جەنابی سەرۆك ئەم بریارنامەیە کە ئەمرۆ لە بەر دەستی ئێمەدایە واتا بریارنامەی ١٣٧ ی کۆنگرێس کە من و نوێنەری ئەیالەتی "ئیلۆنۆیز" و هاوسەرۆکی کومیتەی مافی مرۆڤ ، بەرێز "پۆرتێر" خستومانەتە روو، هەستی کۆنگرێس دەردەبرێت بە نیسبەت پێویستی دەستبەجێ پێکهێنانی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بۆ دادگایی کردنی سەدام و ئەندامانی رێبەرایەتی رژێی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی. دەمەوێت سپاسی بەرێز "پۆرتێر" بکەم بۆ رێبەرایەتییەکەی لەپەیوەندی لەگەڵ ئەم مەسەلە گرینگەدا. پێویستی پێکهێنانی ئەم دادگایە

دوای رووداوەکانی ئەم دواییە زۆرتر بووە. بڕیارنامەی ١٣٧ ئاماژە بەوە دەکات کە سەدام حوسەینی دیکتاتور مافی هاووڵاتیانی عێراقی پێشێل کردووە، لەوانە لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجە، رەفتاری زاڵمانە و نامرۆڤایانە، دەستگیر کردن و زینـدانی کردنی سەرەڕۆیانە و بێ سەروشوێنی کردنی خەڵك.

سەدام حوسەین هەوڵی داوە خەڵکی کوردی عێراق لە رێگای چەکی کیمیایی لە ناو ببات، عەشیرەتە سوننەکانی رۆژئاوای عێراقی سەرکووت کردووە، کلیساو گوندەکانی ئاشووری و کەلدانیەکانی کاول کردووە، تورکمانەکانی لەسێدارە داوە و شیعەکانی بە کۆمەڵ کوشتووە. سەدام هەروەها درێژە بە لە ناوبردنی ژینگەی شارستانی کەوناری "مارشی عەرەبی" دەدات. رەفتارە دڕندانەکانی سەدام تەنها هاووڵاتیانی عێراق ناگرێتەوە، ئێمە رۆژە تاریکەکانی جەنگی کەنداو لە بیر ناکەین کە سەدام کوێتی داگیر کردبوو و خەڵکی بێ گوناهی کوێت بە ماوەی چەند مانگ بە بارمەتە گیرابوون. چارەنووسی پتر لە ٦٠٠ کوێتی کە لە کاتی شەری کەنداو بە دیل گیراون هێشتا نادیارە و دەوڵەتی عێراق هیچ حیسابێکیان بۆ ناکات.

کەوابوو بڕیارنامەی ١٣٧ هەستی کۆنگرێس دەردەبڕیت بۆ شەرمەزارکردنی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی عێراق و ئیدانەی سەرپێچی عێراق دەکات لە جێبەجێ کردنی رێکەوتننامە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ کە واژۆی کردوون.

ئەم بڕیارنامەیە هەروەها پشتیوانی دەکات لە پێکهاتنی دادگای تاوانە نێونەتەوەییەکان بۆ دادگایی کردنی سەدام و داروودەستەکای و داوا لە سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوی ئەمریکا دەکات چالاکانە کار بکەن بۆ پەسەند کردنی بڕیارنامەیەك لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. داوا لە هاوکارانم دەکەم بە تەواوی پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن.

بەرێز" هاستینگز[٢]"، نوێنەری ئەیالەتی" فلۆریدا":

سپاسی بەرێز "پۆرتێر" دەكەم بۆ هەوڵەكانی بۆ ئامادەكردنی ئەم بڕیارنامە بەوەختــە و هــەروەها سپاسی نوێنەری ئەیالەتی ئیندیانا، بەرێز "هامیلتۆن" دەكــەم بــۆ دەربڕینــی هەســتی ئێمــە لــە ڕێگای ئەم بڕیارنامە تایبەتەوە.

ئێمە دژی ئەم بڕیارنامەیە نین. منیش پەیوەست دەبــەم بــە ســەرۆكی كــۆنگرێس بــۆ شــەرمەزار كردنی عێراق بە هۆی پێشێل كردنی توندی مافی مرۆڤ . ئەوانەی كە ئەم تاوانانەیان ئــەنجام داوە دەبێ لە دادگای تاوانی نێونەتەوەیی دادگایی بكــرێن، هــەروەها كــە ئــەم بڕیارنامــە بەدروســتی ئاماژەی پێكردووە. بەڵام پرسیاری من و گەلێ لە هاوكــارانم ئەوەیــە كــە ئایــا ئــەم بڕیارنامەیــە ئەوەندە كاریگەری هەیــە. بڕیارنامەكــە داوای دادگــایی كردنــی ســەدام دەكــات لــە دادگایــەكی نێونەتەوەییدا بەڵام پێمان ناڵێت ئێمە لێرەوە چۆن دەتوانین شتێكی وابكەین. نیگــەرانی ســەرەكی من ئەوەیە كە ئەم بڕیارنامە كۆمەڵێك چاوەڕوانی دروست دەكات، بەتایبەت لە كوێت بــۆ ئــەوەی ئەم دادگایە پێكبێت بەڵام ئێمە تا ئێستا بەكردەوە نــەمانتوانیوە دادگایــەكی وا پێكبهێــنین. بــە هــەرحاڵ مــن بەتــەواوی پــشتیوانی لــەم بڕیارنامەیــە دەكــەم. ئــەم بڕیارنامەیــە داوا لــە وڵاتــە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكات كار بكات بۆ پەسەندكردنی بڕیارنامەیەك لە نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ پێكهاتنی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. هیوادارم ئێمە بەردەوام هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئەم ئەركە جێبەجێ بكات.

"خاتوون فۆرس[٣]":

جەنابی سەرۆك من پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە دەكەم. ئەوەی كە من دەمەوێت بیڵــێم ئەوەیــە كــە هەموو خەباتێك بۆ مافی مــرۆڤ بەرپرســیارێتی و قوربــانی دەوێــت. ئــەمڕۆ گروپێكــی تــازا لــە

Mr. HASTINGS [٢]
Ms. FURSE [٣]

مانگیراوانی کورد بۆ شەرمەزار کردنی پێشێل کردنی مافی کوردەکان لەلایەن دەوڵەتی تورکیا مانیان گرتووە. ئێمە دەبێت بریارنامەیەکیش لە پەیوەندی لەگەڵ پێشێل کردنی مافی کوردەکان و مافی ئەندامانی پارلمانی تورکیا کە لەلایەن کوردەکانەوە هەڵبژێردراون پەسەند کەین.

دەمەوێت ئەو نامەیە وەبیری هاوکارانم بهێنمەوە کە ۱۰۳ کەس لە ئەندامانی کۆنگرێس واژۆیان کردووە و ناردراوە بۆ سەرۆك کۆمار کە تێیدا ئاماژە بە بارودۆخی زۆر خراپی سیاسەتمەداری کوردی تورکیا "لەیلا زانا" کراوە کە لەلایەن خەڵکەکەیەوە وەك ئەندامی پارلمانی تورکیا هەڵبژێردراوە بەلام بەتاوانی پێشێل کردنی یاسای تورکیا ئێستا لە بەندیخانەدایە.

تەنها تاوانی لەیلا زانا ئەوە بووە کە بە زمانی کوردی قسەی کردووە و قسە کردنیش مافی هەموو پارلمانتاریکە، هەروەها کە من ئەمرۆ قسە لە سەر مافی مرۆڤ دەکەم. ئێمە لە نامەکەماندا بۆ سەرۆك کۆمار ئاماژەمان بەوە کردووە کە یەکێ لەو تاوانانەی کە خراوەتە پاڵ "لەیلا زانا" ئەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۹۳ لە سەر بانگهێشتی کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەردانی واشنگتۆنی کردووە. ئێمە تورەیی خۆمان لەوە دربری کە هەر چەند کە "لەیلا زانا" لەلایەن کۆنگرێسەوە بانگهێشت کرابوو بەلام لە ئاکامی چالاکیەکانیدا خرایە بەندیخانە.

ئەمرۆ ئێمە بەتوندی داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکەین کار بکات بۆ ئازادی لەیلا زانا و چاوێك بخشێنێت بە بارودۆخی زۆر خراپی خەڵکی کورد لە تورکیا. من رۆژێکی دیکە نامەیەکەم لەلایەن نوێنەری ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەندامی پێشووی کۆنگرێس، بەرێز" بیل ریچاردسۆن[٤]" بەدەست گەیشت کە تێیدا ئاماژە بەو کرابوو کە فایلی "لەیلا زانا" یەکێ لەو چوار فایلانەیە کە تەسلیمی کۆمیسیونی مافی مرۆڤی ئەوروپا کراوە.

جەنابی سەرۆك، ئێمە دەبێ ویژدانی ئەمریکا لە سەر ئەو خەڵکە چر بکەینەوە کە ئەمرۆ بۆ دەربرینی هاوخەمی خۆیان لەگەڵ هاوولاتیانی (کورد) مانیان گرتووە، چ ئەوانەی ناو تورکیا چ ئەوانەی ناو عێراق . بە تایبەت دەمەوێت سەرنجتان بەرەولای ئەو هاوولاتیە ئازانە رابکێشم کە

---

[٤] Bill Richardson

بڕیاریان داوە ژیان وتەندروستی خۆیان بخەنە ناو مەترسی و مان بگرن بۆ دەربڕینی هاوخەمی خۆیان لەگەڵ خاتوون" زانا" و سیاسەتمەدارانی دیکەی کورد کە لە تورکیا خراونەتە بەندیخانە .
سپاسی سەرۆکی کۆنگرێس دەکەم کە ڕێگەی پێدام باسی ئەم مەسەلەیە بکەم، ئەمە مەسەلەیەکە کە پەیوەندی بە مافی کوردەکانەوە هەیە هەروەها کە بڕیارنامەی ۱۳۷ پەیوندی بە مافی خەڵکی عێراقەوە هەیە. ئەرکی ئێمەیە(وەك ئەندامانی کۆنگرێس و هاوولاتی گەورەترین وڵاتی دیموکراسی جیهان) کە باسی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ بکەین، چ ئەم پێشێلکارییە لەلایەن دوژمنەکانمانەوە کرابێت چ لەلایەن دۆستەکانمانەوە. سپاسی نوێنەری ئەیالەتی فلۆریدا، بەڕێز" هاستینگز" دەکەم کە کاتی خۆی دا بە من و سپاسی هەوڵە زۆرەکانی دەکەم بۆ داکۆکیکردن لە مافی مرۆڤ و هەروەها سپاسی نوێنەری ئەیالەتی نیوریورك، بەڕێز " گیلمان" دەکەم کە داکۆکی دەکات لە مافی مرۆڤ لەم کۆنگرێسە.
پێموایە هەمووماو دەبێ پێکەوە هەوڵ بدەین بۆ ئازادی ئەم سیاسەتمەدارە کوردانە کە لە تورکیا خراونەتە بەندیخانە و داکۆکی لە مافی خەڵکەکەی خۆیان دەکەن. کەوابوو ئەمڕۆ من هاوخەمی خۆم لەگەڵ ئەم مانگرتووانە دەردەبڕم. هەندێك جار دەبیسم هەندێ کەس دەڵێن"بەڵێ ئەمانە تیرۆریستن". من ئەو کاتەمە دێتەوە یاد کە بە "نیلسۆن ماندیلا" لە باشووری ئەفریقایان دەگوت"تیرۆریست"، تیرۆریستێك کە جەنگاوەری ئازادیشە. ئەم سیاسەتمەدارە کوردە بەندکراوانە داوای ئازادی خەڵکەکەیان دەکەن.

بەڕێز "پۆرتێر":
به لەبەرچاو گرتنی ئەو شتانەی کە ئێستا لە عێراق ڕوودەدات ئەم بڕیارنامەیەی بەردەستمان ناتوانێت بڕیارنامەیەکی بەرۆژ بێت. جارێکی دیکە سەدام حوسەین سیمای ڕاستەقینەی خۆی وەك دیکتاتۆرێکی دڵڕەق نیشاندا کە دەیەوێت هەموو کارێك بکات بۆ ئەوەی لە دەستی گەمارۆکان و پشکنینەکانی چەکە کۆمەڵکوژەکان ڕزگاری بێت. جەنابی سەرۆك بەداخەوە من لە

سەردەمێکدا گەورە بووم کە سەردەمی دیکتاتورە دڵڕەقەکان(هیتلەر، موسولینی و ئیستالین) بوو. ئەمانە کەسانێك بوون کە تاوانگەلی بەزمان نەهاتوویان دژی خەڵکی خۆیان و کەمینەکانی خۆیان ئەنجام دا. رژێمی عێراقیش لە شێوەی هەمان حکومەتی ئاڵمانیای نازی، ئیتالیای فاشیست و یەکێتی سۆفیەتی کومونیستی ژێر دەسەڵاتی ئێستالینە. ئێمە دەبێت هەر ئێستا سەدام حوسەین رابوەستێنین، دەبێ گۆشەگیری بکەین و دڵنیابین لەوەی کە جیهان پەی بە سروشتی ئەم رژێمە دڵڕەقە بردووە. ئێمە دەبێ دڵنیابین لەوە کە سەدام حوسەین و هەموو ئەندامانی دارودەستەکەی وەك تاوانبارانی جەنگ و کەسانێك کە تاوانی دژی مرۆڤایەتیان ئەنجام داوە، بناسرێن. من خۆشحاڵم کە یەکێ لە پشتیوانە سەرەکییەکانی ئەم بڕیارنامەیە بووم بۆ سپاردنی سەدام بە دەستی دادپەروەری بە هۆی ئەو تاوانانە کە دژی خەڵکی عێراق و هاووڵاتیانی ولاتانی دیکە ئەنجامی داوە ، لەوانە خەڵکی ئەمریکا. کوردەکان، عەرەبە مارشەکان، کەمینەی ئاشووری، ئەندامانی کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق و دیلە کویتیەکانی جەنگ، تەنها چەند نمونەیەك لە قوربانیانی سەدام و رژێمە دڵڕەقەکەینی.

جەنابی سەرۆك، سەدام چەکی کیمیایی دژی خەڵکی خۆی بەکار هێناوە. لە ساڵی ١٩٨٨ ، ٨ هەزار کورد لە هەڵەبجە لە ئەنجامی هێرشی سەدام بە چەکی کیمیایی( کە خۆی بەرهەمی هێنابوو*) کوژران. ئێستا ئێمە لە عێراقداین و هەوڵ دەدین ئەوە روون بکەینەوە کە ئایا ئەم چەکانە لە عێراقدا ماون و بەتایبەت چەکی کیمیایی VX کە هەروەك کیمیایی "سارین°" دەتوانێ خەڵك بکوژێت بە هەمان شێوە کە کوردەکانی عێراقی لە هەڵەبجە کوشت. بە بیروبۆچوونی من سەدام بێ هیچ گومانێك تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی دژی ئاشتی ئەنجام داوە و یاساکانی مافی مرۆڤی بە توندی پێشێل کردووە. ئەگەر ئەمڕۆ تەنها یەك کەس لە جیهاندا هەبێت کە هەق بێ بدرێتە دەستی دادپەروەری، ئەو کەسە سەدام حوسەینە.

---

* ناڵێت ئەمریکا و ئەوروپا ئەم چەکیان پێدابوو- وەرگێڕ

° sarin

من پیرۆزبایی ئەم بڕیارنامەیە دەکەم لە هاوکارانم و داوا لە هەموویان دەکەم تەقلی من بن بۆ ئەوەی پەیامێکی بەهێز بنێرین بۆ سەدام حوسەین و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەربارەی ئەوە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاوانەکانی سەدامی لە بیر نەکردووە و ئێمە بە بەرپرسیاری دەزانین بۆ ئەم پێشلکارییانە و داوای دادپەروەری دەکەین بۆ قوربانیەکانی.

جەنابی سەرۆك هەر ئێستا چەند کوردێك لە سەر پلەکانی بینای کۆنگرێس مانیان لە خواردن گرتووە، ٢٥ رۆژە ئەم کوردانە بۆ ئازاد کردنی لەیلا زانا مانیان لە خواردن گرتووە کە پارلمانتارێکی کوردی تورکیایە کە لە ساڵی ١٩٩١ وەك ئەندامی پارلمان هەڵبژێردرا و لە ١٩٩٣ سەردانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد بۆ شایەتیدان لە بارەی پێشێلکردنی مافی کەمینەی کورد لە تورکیا و لە بەرامبەر کومیتەیەکی هەمیشەیی کۆنگرێس و کومیتەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس شایەتی دا. لەیلا زانا پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ ولاتەکەی لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە لە پۆستەکەی لابرا، دەستبەسەر کرا ، بەتاوانی خیانەت دادگایی کرا و حوکمی ١٥ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپا تەنها بە تاوانی ئەوەی کە هزری خۆی هێناوەتە سەر زمان و لە بەرامبەر کۆنگرێسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا شایەتی داوە.

جەنابی سەرۆك، ئێستا تورکیا و عێراق بەیەکەوە هێرش دەکەنە سەر کوردەکان لە باکووری عێراق. تورکیا بە دەیان هەزار سەربازی تایبەت سنووری عێراق دەبەزێنێ و بە بومبای ناپاڵم و هێشوویی هێرش دەکاتە سەر کوردەکانی خۆی کە لە تورکیا هەڵهاتوون. عێراقیش لەو لاوە هەروا دەکات. هەردوویان ئێستا کوردەکانی خۆیان دەچەوسێننەوە. هەمووی ئەو ولاتانەی کە کورد تێیدا دەژین واتا ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا کەمینەی کورد دەچەوسێننەوە. هەموویان کوردەکان دژی یەکدی هان دەدەن و هەوڵ دەدەن بەم شێوەیە سەرکوتیان بکەن و هەموویان بە خەڵکی کورد دەڵێن "تروریست"، لە کاتێکدا کە کوردەکان تەنها داوای مافە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن و تەنها خۆیان لە بەرامبەر چەوساندنەوەدا دەپارێزن.

جەنابی سەرۆك ئەم چەوساندنەوەیە دەبێ کۆتایی پێبێت. کورد تیرۆریست نیە. لەوانەیە هەندێ کەس لە سەر ئەو باوەڕە بن کە ئیللا کوردەکان تروریستن بەڵام کوردەکان تروریست نین. کوردەکان تەنها داوای مافی خۆیان دەکەن، ئەو مافەی کە دەوڵەتی تورکیا، دەوڵەتی ئێران، دەوڵەتی سوریا و رژێمی سەدام حوسەین لە عێراق، لێیانی زەوت کردووە. ئەو دەوڵەتانە تروریستن کە کوردەکان سەرکووت دەکەن، ئەو دەوڵەتانە تروریستن کە مافە سەرەتاییەکانی کوردەکان زەوت دەکەن و لە ناو کۆمەڵگای خۆیاندا رێزیان لێ ناگرن و هەر رۆژ خۆیان و منداڵەکانیان دەکوژن و هەوڵ دەدەن کوردەکان لە کۆمەڵگای خۆیان دەربکەن. جەنابی سەرۆك، تروریستی ڕاستەقینە ئەم دەوڵەتانەن. سەردەستەی ئەم دەوڵەتانە، سەدام حوسەینە کە رژێمەکەی وەڵامی هیچ کەس ناداتەوە و حیساب بۆ گوشاری بیروڕای گشتی و بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ناکات. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەم رژێمە گۆشەگیر بکەین، کاتی ئەوەیە ڕابگەیەنین سەدام کێیە، سەدام کەسێکە کە تاوانی دژی مرۆڤایەتی ئەنجام داوە کە هەموومان نفرەتی لێدەکەین، ئێستا کاتی ئەوەیە رووی ڕاستەقینەی سەدام نیشان بدەین و دادگایی بکەین و لەسەر دەسەڵات لای ببەین و دەوڵەتێك لە عێراق پێك بهێنین کە لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و دراوسێکانی بە ئاشتی بژی و پێش بەم رژێمە دیکتاتورە خوێنڕێژە دڵڕەقە بگرین بۆ سەرکووتی زیاتری خەڵکەکەی و هەڕەشەکردن لە دراوسێکانی.

بەڕێز "لانتۆس":

جەنابی سەرۆك سپاسی هاوسەرۆکی (سەربە پارتی کۆماری) کومیتەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس و نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنۆیز، بەڕێز "پۆرتێر" دەکەم بۆ لێدوانە بەهێز و پاراوەکەی و هەروەها سوپاسی سەرۆکی کومیتەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەکەم بۆ خەباتە بێ وچانەکەی بۆ مافی مرۆڤ و ئامادەکردنی بڕیارنامەی ١٣٧ . من بەتەواوی لەگەڵ ئەو وتانەدام کە سەبارەت بە سەدام و رژێمە سەرکوتکەرەکەی هێنایە سەر زمان .

جەنابی سەرۆك هەر ئێستا كەسانێك هەن لە رۆژئاوا كە داكۆكی لە سەدام و رژێمە درندەو دڵڕەقەی دەكەن. هەندێك لە وڵاتانی رۆژئاوا هەن كە ناتوانن لە بازرگانییە پڕ رەونەق و بەرفراوانەكەیان لەگەڵ عێراق چاوپۆشی بكەن، سەرەڕای ئەو ڕاستییە كە رژێمی سەدام حوسەین هەوڵی داوە پێشكەوتنە بەردەوامەكانی خۆی لە بواری بەرهەمهێنانی چەكە كۆمەڵكوژەكان بشارێتەوە و بە درۆی بخاتەوە و حاشای لێبكات.
پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ، كۆنگرێس هەلی ئەوەی بۆ دەڕەخسێت تاوتوێی بڕیارنامەیەك بكات كە ڕوانگەی كۆنگرێس دەردەبڕێت سەبارەت بەوەی كە ئەگەر ڕێگا ئاشتیخواز و دیپلۆماتیكەكان سەرنەكەوت دەبێ ڕێگاچارەی سەربازی(باشتر ئەوەیە لە ڕێگای هاوپەیمانی نێونەتەوەیی بێت) بەكار ببرێت بۆ لەناو بردنی توانایی كیمیایی، بیولوژیك، ناوكی و موشەكی سەدام حوسەین. بەڵام ئەم مەسەلەیە لە هەمان كاتدا كە مەسەلەیەكی سەربازییە، پەیوەندی بە مافی مرۆڤیشەوە هەیە.
رژێمێك كە بە چەكی كیمیایی هێرشی كردووتە سەر خەڵكی خۆی، رژێمێك كە خراپترین و توندترین پێشێلكارییەكانی مافی مرۆڤی لە سەدەی ٢٠ دژ بە خەڵكی خۆی ئەنجام داوە دەبێ ڕاكێشی دادگایەكی نیونەتەوەیی بكرێت و بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی دادگایی بكرێت. ئەگەر تەنها یەك كەسی سەرەكی هەبێت كە دەبێ لە بەرامبەر كۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی دادگایی بكرێت، ئەو كەسە سەدام حوسەینە. دڕندەیی، دڵڕەقی و بەخوێن تینووبوونی سەدام هیچ سنوورێك ناناسێ. داوا لە هەموو هاكارانم دەكەم پشتیوانی لە هەنگاوە گرنگەكانی ئەم بڕیارنامەیە بكەن.
بەرێز" رۆهراباچێر" [٦]:
جەنابی سەرۆك من بەتوندی پشتیوانی لە وتەكانی بەرێز "پۆرتێر" دەكەم سەبارەت بە دادگایی كردنی سەدام بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانەكانی جەنگ. من دەنگم دا بە جەنگی كەنداو، لە

---

Mr. ROHRABACHER [٦]

کاتێکدا کە لە ناخی دڵمەوە رازی نەبووم بەم دەنگە بەڵام دەمزانی بەرژەوەندی نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەییمان لە مەترسیدایە. پاشان بەخێرهاتنی سەربازەکانمان کرد لە کاتی گەڕانەوە سەرکەتووەکەیان بۆ وڵات کە یەکێ لە گەورەترین و درەوشاوەترین سەرکەوتنەکانی مێژووی وڵاتی ئەمریکایە.

بەڵام کاری ئێمە تەواو نەبووە، ئەگەر شتێك هەبێت کە سەرۆك بوش حەسرەتی بۆ بخوات ئەو ڕاستییەیەکە سەدان هەزار سەربازی نارد بۆ کەنداوی فارس بەڵام کاری سەدامی تەواو نەکرد. روونە کە دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خەڵکی عێراق نەبوون. وتەکانی ئەمڕۆی بەڕێز "پۆرتێر" لەسەر دوژمنێکی ڕاستەقینە چڕ بووەوە، دوژمنێك کە نەتەنها دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵکو دوژمنی ئەو خەڵکەیە کە باوەڕیان بە مافی مرۆڤ و مافە دیموکراتیکەکان هەیە و ئەم دوژمنەش سەدام حوسەین و داروودەستە خوێنڕێژەکەیەتی کە بە سەر عێراقدا دەسەڵاتداری دەکەن.

لە کاتی جەنگی کەنداو، ئێمە سەدان هەزار جوان و چەندەها ژن و منداڵمان کوشت کە دوژمنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبوون و گەلێکیان لەلایەن دیکتاتۆرێك بە ناوی سەدام حوسەینەوە لە سوپادا بەکارهێنرابوون. ئەم بڕیارنامەیە دەچێتە ناو ناخی مەسەلەکە. سەدام حوسەین دوژمنی ئێمەیە، ئێمە دەبێ ئەم پیاوە رسوا بکەین. دەبێ سەدام وەك تاوانبارانی دیکەی جەنگ دادگایی بکرێت، با ئەم تاوانبارە "ئادۆلف هیتلەر" بێت یان هەندێ لە پیاوکوژەکانی "سرب[٧] " کە ئەم دواییانە تاوانی ژینوسایدیان لە "بۆسنیا" ئەنجام دا.

جارێکی دیکە ئەم ڕووداوانە نیشان دەدات کە لە نێوان ئاشتی و ئازادی و خۆشبەختیدا پەیوەندی هەیە. ئەگەر ئێمە بۆ ئاشتییەکی وا کورتخایەن چووینەتە کەنداو و سەربازەکانمان بەم زووانە بگەڕێنینەوە وڵات و پەیوەندی خۆمان لە گەڵ دیکتاتۆرەکان نەپچڕێنین، نە ئاشتیمان دەست

---

Serbian[٧]

دەکەوێت و نە ئازادی. ئێمە ناتوانین لە سەر بایەخی ئازادی سازش بکەین لە بەر ئەوەی سەرەنجام دەماخاتە ناو بارودۆخێك کە ئاسایشەکەمان لەگەڵ هەڕشەی هێرش بەرەورِوو دەبێتەوە.
با ئەو ٦٠٠ کویتیە لە بیرنەکەین کە چارەنووسیان هێشتا نادیارە. هەزاران هەزار بنەماڵەی کوێتی، یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەکەیان لە دەست داوە کە لە کاتی داگیر کرانی ئەو وڵاتە لەلایەن هێزەکانی عێراق کوژراون یان بەدیل گیراون. ئەمە وەك ئەوە وایە میلیونەها ئەمریکایی یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەیان لە دەست بدەن یان هیچ ئاگایەکیان لە چارەنووسیان نەبێت. دەبێ حیسابێك بۆ دیلە کویتیەکانی جەنگ هەبێت، دەبێ حیسابێك بۆ تاوانەکانی سەدام حوسەین هەبێت. با ئەوە وەبیر بێنینەوە کە لەو کاتەوە کە یەکێتی سوڤیەت لە روسیای دیموکراتیکی ئەمرۆدا دەستی بە کرانەوە کردووە یان درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ ئەوەی ببێ بە روسیایەکی دیموکراتیك، شانسی ئاشتی زۆرتر بووە. داخوازی ئازادی عێراق و لەناوچوونی دیکتاتوری سەدام حوسەین، شانسی ئاشتی لە هەموو ناوچە زیاد دەکات و ئاسایشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش مسۆگەرتر دەکات. من بە توندی پشتیوانی لە پێشنیارەکەی بەرێز "پۆرتێر" دەکەم بۆ دادگایی کردنی سەدام.

بەرێز" وڵف "[٨]:
جەنابی سەرۆك من بە توندی پشتیوانی دەکەم لە بڕیارنامەی ١٣٧ ی کۆنگرێس کە دەوڵەتی عێراق شەرمەزار دەکات بە هۆی سەرکوتکردنی بەردەوام و ترساندن و تۆقاندنی کوردەکان. بەداخەوە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا رۆژئاوا سەرنجی بە کەشوهەوای ترساندن و تۆقاندنی سەدام نەداوە بەڵام لە ڕێگای ئەم بڕیارنامەیە و هەوڵی خودی کوردەکان، خەڵك زۆرتر سەرنجی پێ دەدات. ئەم بڕیارنامەیە پێکهاتنی دادگای تاوانەکانی جەنگ هان دەدات بۆ دادگایی کردنی سەدام حوسەین و کاربەدەستانی دیکەی دەوڵەتی عێراق بە هۆی تاوانەکانیان دژ بە مرۆڤایەتی.

---

Mr. WOLF [٨]

دەمەوێت سپاسی بەڕێز "پۆرتێر" و بەڕێز " گیلمان" و ئەندامانی دیکەی پشتیوانی ئەم بڕیارنامەیە بکەم. خۆشبختانە ئەم بڕیارنامەیە نە تەنها پەیامێکە بۆ خەڵکی ئەمریکا، بەڵکو پەیامێکە بۆ خەڵکی کورد لە سەراسەری جیهان و بەتایبەت خەڵکی ناوچە کە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا واتا خانووی خەڵکی ئەمریکا زۆر زۆر بەوردی چاودێری دەکات بە سەر بارودۆخەکەدا.

دەوڵەتی عێراق دەوڵەتێکی خراپە، سەدام حوسەین دیکتاتورێکی دڕندەیە کە لە بیری هیچدا نییە جگە لە پاراستنی دەسەڵاتی خۆی. سەدام خەڵکی عێراقی چەوساندووە و سەرکووت کردووە و لەگەڵ رۆژئاوا کەوتووتە ناو کایەکی مەترسیدار. سەدام لە کوشتنی ئەندامانی بنەماڵەی خۆی سڵ ناکات کە راستیەکانی رەفتارە دڕندەکانی ئەویان درکاندووە یان هەڕەشەیان لە دەسەڵاتەکەی کردووە.

سەدام بە شوێن ئەوەدایە کوردەکانی باکووری عێراق پاکتاو بکات کە بە هۆی جوگرافیاکەیان گیریان خواردووە. کوردەکانی باکووری عێراق هیچ شوێنێکیان نییە تا لەم بارودۆخە زۆر خراپە هەڵبێن و بچنە ئەو شوێنە. کوردەکان کوژراون و ئێستاش دەکوژرێن، زیندانی کراون و ئێستاش زیندانی دەکرێن، ئەشکەنجە دراون و ئێستاش ئەشکەنجە دەدرێن و سەرکووت کراون و ئێستاش هەر سەرکووت دەکرێن. خۆشبختانە لە رێگای ئەم بڕیارنامەیە ئەو پەیامە دەدرێت بە سەدام کە رۆژئاوا ئاگاداری کردەوەکانیەتی و ئەو پەیامەش دەگەیەنێت بە کوردەکان کە ئێمە بە وردی ئاگاداری بارودۆخەکەیانین و پشتیوانیان لێ دەکەین.

بەڕێز "پاوڵ":

جەنابی سەرۆك، بەدڵنیاییەوە منیش لە گەڵ ئەو رەخنە توندانەم کە لە دەوڵەت و رێبەرانی عێراق گیرا. بەڵام لەگەڵ ئەو شتانە نیم کە ئێمە هەوڵ دەدەین لێرە بیکەین، نە لە بەر ئەوە کە ئەم هەوڵانە بەباش نەزانم بەڵکوو بە هۆی ئەوەی ئەو دەسەڵاتە لە خۆماندا نابینم کە بتوانین

کتووپڕ سیستمی دادپەروەری خۆمان بە سەر سەراسەری جیهاندا بسەپێنین. پێموانییە ئەمە شتێکی کاریگەر و بە سوود بێت و پێموایە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەمریکا زیادتر دەکات لەباتی ئەوەی دادپەروەری دەستەبەر بکات. بەڵام لێرە تۆزێ پارادوکس بەدی دەکرێت. پێشتر ئاماژە بەوە کرا کە تەنها دەوڵەتی عێراق نییە کە مافی کوردەکان پێشێل دەکات، بەڵکو دەوڵەتی تورکیاش بە هەمان شێوە مافی کوردەکان پێشێل دەکات. کەوابوو بۆ ئەم بڕیارنامەیە تورکیاش لە خۆ ناگرێت؟ بۆ ئێمە ناوی تورکیاش نەهێنین و کردەوەکانی نیشان نەدەین و خوازیاری ئەوە نەبین کە دادپەروەریش بە نیسبەت تورکیا جێبەجێ بکرێت، با هاوپەیمانیشمان بێت.

لە هەمان کاتدا ئێمە کۆمەڵێك گیروگرفتی سەرەکی دیکەش پشتگوێ دەخەین. ئێمە چیمان کردووە و لە گەڵ چین؟ ڕێبەرانی دەوڵەتی" صین" هاتنە ئێرە ، فەرشی سوور لە بەر پێیان ڕاخرا و بەڵێنی پارەی زۆرتریان پێدرا. بەڵام دەوڵەتی "صین " لە مەیدانی "تیانانمێن[٩]" چۆن لە گەڵ خەڵکەکەی ڕەفتاری کرد و ئێستاش لە سەراسەری وڵاتەکەی ڕەفتار دەکات؟ ئەوان لە وێ کەڵکی خراپ لە ئازادییە مەدەنیەکان وەردەگرن. بەڵام ئایا ئێمە دەمانەوێت هەمان شت بکەین؟ ئایا ئەندامانی کۆنگرێس وابیردەکەنەوە کە ئێمە دەتوانین وابکەین؟

ئێمە ئەم دەست و ئەو دەست دەکەین و وا دەنوێنین کە دەمانەوێت ئەم سیستمە گەورە دادپەروەرییە لە جیهاندا جێبەجێ بکەین. ئەندۆنیزیاش هەروا، بە دەیان بیلیون دولار پارەی باجی هاووڵاتیانی ئەمریکا دەدرێت بە دەوڵەتی ئەندونیزیا، لە کاتێکدا کە ئەو ڕەفتارە زۆر خراپەیان هەیە لە گەڵ خەڵکی" تەیمووری ڕۆژهەڵات". بەڵام ئێمە لێرە کتوپڕ بڕیار دەدەین کە دەمانەوێت (لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ) پارەی باجی هاووڵاتیانی ئەمریکا خەرج بکەین و ژیانی سەربازانی ئەمریکا بکەین بە قوربانی بۆ ئەوەی دەمانەوێت دادپەروەری جێبەجێ بکەین. ئایا ئێمە ئەو دەسەڵاتمان هەیە کە ببین بە پۆلیسی جیهان؟ من پێموانییە ئەم دەسەڵاتمان هەبێت. پێموایە بەگشتی بە زەرەری ئاسایشی نەتەوەییمان بێت. پێموایە ئەمە هەڕەشەیە بۆ خەڵکی

---

[٩] Tiananmen Square

ئەمریکا و ناراستەوخۆ، بە گەلێ لە شێوەکان هەڕەشەیە بۆ باجدەرەکانی ئەمریکا. من دژی ئەم کارەم، دژی گەلێ لەم جۆرە پێشنیارانەم. دژ بەو سزا و ئەو تاوانانە نیم کە دەخرێنە پاڵ عێراق و ڕێبەرایەتیەکەی. من رەخنەی توندم هەیە بەنیسبەت شێوازی هەوڵەکانمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە زۆر جیدییانە.

بەڕێز "روهراباچێر":
جەنابی سەرۆك، ئایا مەبەستی بەرێز "پاوڵ" ئەوە بوو کە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان ئازادی و ئاشتیدا؟

بەڕێز "پاوڵ":
جەنابی سەرۆك، من بە دڵنیاییەوە نازانم بەڕێز" روهرا باچێر " بە شوێن چیدایە، بەڵام دەزانم گرنگترین شت بۆ ئازادی و ئاشتی بە لای منەوە، گوێڕایەڵبوون بەیاسای بنەڕەتییە. یاسای بنەرەتی لە کوێ ئەو دەسەڵاتەی بە ئێمە داوە کە ببین بە پۆلیسی جیهان؟

بەڕێز "رۆهراباچیر":
کەوابوو بەڕێز پاوڵ دەڵێت کە کۆنگرێس نابێت "ئادۆلف هیتلەر" شەرمەزار بکات لە بەر ئەوەی هێرشی نەکردووەتە سەر دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئایا مەبەستی بەڕێز پاوڵ ئەمەیە؟ ئایا ئەمە سیاسەتی دەرەوەی بەڕێز پاوڵە؟

بەڕێز "پاوڵ": پێموایە ئێرە شوێنی ئەم مشتومڕانە نییە. پێموایە کاتێك کە ئاسایشی نەتەوەیی ئێمە لەگەڵ مەترسی روبەڕوویە، خەڵکی ئەمریکا مافی ئەوەیان هەیە لە ڕێگای کۆنگرێسەوە جەنگ رابگەیەنن. ئەمە لە شێوەی ئەو بارودۆخەیە کە جەنگەکانی ڤیەتنام و گەمارۆکانی نەتەوە

یەككگرتووەكانی لێكەوتەوە، لە شێوەی ئەو بارودۆخەیە كە جەنگی كۆریا و ڤییەتنام و جەنگە بێ سوودەكانی دیكەی لێكەوتەوە. هەر بۆیە ئێمە جەنگی كەنداوی فارسمان نەبردەوە و هێشتاش لەگەڵ ئەم كێشەیە بەرەورووین.

بەڕێز "رۆهرا باچیر":

كەوابوو بە بیروبۆچوونی بەڕێز پاوڵ، ئەگەر ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا جەنگی دژی عێراق رانەگەیاندبایا، چی لە گەڵ ئەم دیكتاتورە بكردبایا؟

بەڕێز" پاوڵ ":

من لە سەر ئەو باوەڕەم كە كۆنگرێسی ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەوەی لەوە دڵنیابێت كە كاتی ئەوەیە جەنگ ڕابگەیەنێت. جەنابی سەرۆك، بە كورتی من هیچ رەخنەیەكم نییە لەو كەسانەی كە ڕێبەرایەتی عێراق دەبەنە ژێر پرسیار. من ڕێبەرایەتی عێراق شەرمەزاردەكەم. كێشەی من لەگەڵ ئەو تەكنیكەیە كە ئێمە بەكاری دەبەین، كێشەی من لەگەڵ ئەو رەوتەدایە كە ئێمە كەڵكی لێوەردەگرین، پێمانیە ئێمە دەسەڵاتی ئەوەمان هەبێت. لە درێژ خایەندا ئەمە بە قازانجمان نییە. كاتێ كە ئێمە باسی صین(چین) دەكەین بە تەواوی لە ناتەباییداین. ئەو بڕیارنامە دەستنیشانكراوانە كە ئێمە بۆ صین دەرمانكردوون، بۆ چارەسەركردنی ئەم كێشانە بەكار نایێت. لە هەمان كاتدا، ئێمە پارەی زۆرتر دەدەین بە صین، دەیدەین بە توركیا، دەیدەین بە ئەندونیزیا و هەموویان ئازادییەكانی هاوولاتیانی خۆیان پێشێل دەكەن.

بەڕێز "پۆرتێر":

جەنابی سەرۆك، تەنها دەمەوێت ئەوە بە بەڕێز "پاوڵ " بڵێم كە بە دڵنیاییەوە ڕێزم هەیە بۆ قسەكانی بەلام لەگەڵ بیروبۆچوونەكانی نیم. ئەگەر بەڕێز "پاوڵ" ئەم بیروبۆچوونانەی لە پارلمانی

تورکیا یا عێراق یا ئەندونیزیا دەربڕایا لەگەڵ چارەنووسێك وەك چارەنووسی لەیلا زانا و پارلّمانتارە کوردەکانی دیکە بەرەورِوو دەبوەوە واتا دەکەوتە بەندیخانە.
بە هەرحاڵ من لەگەڵ ئەو بەشە لە قسەکانی بەرێز "پاوڵ" دام سەبارەت بەوەی کە ئێمە نابێت ئیدی پارە بە دەوڵەتی تورکیا بدەین هەتا کاتێك کە کوردەکان سەرکووت بکات. یا ئیدی پارە بە دەوڵەتی ئەندۆنیزیا نەدەین کە ئازادییە ئایینیەکانی خەڵکی "تەیووری رۆژهەلات" زەوت دەکات، یا پشتیوانی لەو دیکتاتورانە نەکەین کە مافی بنەڕەتیەکانی خەڵکەکەیان پێشێل دەکەن. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئێمە دەبێت زۆر شەفاف کار بکەین و ناتەبایی لە کارماندا نەبێت. ئێمە ٩ بڕیارنامەمان دژی صین پەسەند کردووە. ئەم بڕیارنامانە کاریگەریان هەبووە، بەتایبەت ئەو بڕیارنامەیە کە پەیوەندی بە "رادیو ئاسیای ئازاد"ەوە هەیە کە بۆ صین و تەبەت و کوریای باکوور و برمێ بەرنامە بڵاو دەکاتەوە.
بە بیروبۆچوونی من ئێمە توانایی ئەوەمان هەیە کاریگەری ئەرێنیمان هەبێت لە سەر کۆمەڵگای ئەم وڵاتانە. با ئێمە قەد دەست لە ئیدەئالەکانمان و باوەڕەکانمان هەڵنەگرین بە نیسبەت ئازادی مرۆڤ کە بنەمای کۆمەڵگای ئێمەیە.

## سكاڵا كردن و دادگایی كردنی سهدام حوسهین
## ١٢ ی ئاداری ١٩٩٨ ـ ئهنجومهنی پیران

بهڕێز" سپێكتۆر":

جهنابی سهرۆك بڕیارنامهی ٧٨ لهلایهن من و سناتۆر "دۆرگان" پێشنیار كراوه بۆ سكاڵا كردن و دادگایی كردنی سهدام حوسهین به تاوانی جهنگ و تاوانهكانی دیكهی دژ به مرۆڤایهتی. بۆ ئهوهی به خێراترین شێوه بچمه ناو بڕیارنامهكه، ئاماژه به بڕگهیهكی دهكهم كه دهڵێت سهرۆك كۆمار دهبێ:

١ـ داوای پێكهاتنی كومیسیونێك بكات له بن چاودێری نهتهوه یهكگرتووهكان بۆ لێپرسینهوهی نێونهتهوهیی لهگهڵ تاوانهكانی سهدام و كاربهدهستانی دیكهی عێراق

٢ـ داوا له نهتهوه یهكگرتووهكان بكات دادگای نێونهتهوهیی تاوانهكان پێك بهێنێت به مهبهستی سكاڵاكردن و دادگایی كردن و زیندانی كردنی سهدام حوسهین و كاربهدهستانی دیكهی عێراق كه تاوانی دژه مرۆڤایهتی، تاوانی ژینوساید و پێشێلكارییهكانی دیكهی یاسا نێونهتهوهییهكانیان ئهنجام داوه.

٣ـ ههنگاوی پێویست ههڵبگریت بۆ پێكهاتنی دادگایهكی( تاوانه نێونهتهوهییهكانی) وا، لهوانه تهرخان كردنی پاره و بهدهستهێنانی پشتیوانی وڵاته یهكگرتووهكانی ئهمریكا بۆ سپاردنی سهدام حوسهین و كاربهدهستانی دیكهی عێراق به دهستی دادپهروهری.

ئهم بڕیارنامه كار دهكات بۆ ئهوهی سهدام حوسهین وهك تاوانباری جهنگ دادگایی بكرێت و دوایین ئاڵقهی زنجیره ههوڵهكانه بۆ ئهوهی سهروهری یاسا نێونهتهوهییهكان له ڕێگای دادگای نێونهتهوهی تاوانهكانهوه دهستهبهر بێت. مێژینهی ئهم چالاكیه دهگهڕێتهوه بۆ دادگای سهربازی نێونهتهوهیی "نۆرمبێرگ" كه بۆ دادگایی كردنی ههندێك كهس پێكهات كه له كاتی جهنگی جیهانی دووهم تاوانیان دژی یاسا نێونهتهوهییهكان ئهنجام دابوو. به گوێرهی شهرت و مهرجهكانی

دادگای نورمبێرگ "یاسای نێونەتەوەیی دژی ئەو کەسانە جێبەجێ دەکرێت و ئەو کەسانە سزا دەدات کە تاوانیان دژی یاسا نێونەتەوەییەکان ئەنجام داوە."
ئەم شەرتومەرجە ئەمڕۆش هەر وەك ساڵی ١٩٤٦ لە جێی خویدایە. پاش تێپەڕبوونی یەك دەیە، گەلێ لە ئێمە لە کۆنگرێسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەولّمان داوە دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان پێکبهێنین بۆ سزادانی ئەو کەسانەی کە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانە نێونەتەوەییەکانی دیکەیان ئەنجام داوە. من و سناتۆر" دۆد" کۆمەڵێك بڕیارنامەمان لەم پەیوەندییەدا لە ئەنجوومەنی پیرانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نووسیوە.
لە کۆنگرێسیش لە ژێر ڕێبەرایەتی کونگریسمەن "جیم لیچە" [1]، هەندێك بڕیارنامە پێشنیار کراوە. دادگای نێونەتەوەی تاوانەکان بەرەوپێش دەچێت ئەگەر نزیکایەتییەکی ڕاستەقینە هەبێت بۆ دروست کردنی دادگایەکی وەها لە داهاتوویەکی نەزۆر دووردا و لەم سەروبەندەدا دادگای تاوانەکانی جەنگ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دروست کراوە بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی لە یوگوسلاڤیای پێشوو و ئەو تاوانانەی کە لە بۆسنیا و ولاتانی پەیوەندیدار ئەنجام دران و هەروەها ئەو تاوانانەی کە لە "ڕواندا[2]" دژی مرۆڤایەتی ئەنجام دران. ئێستا دادگای تاوانەکانی شەڕ هەیە. من جارێکیان هەلی ئەوەم بۆ ڕەخسا لەنزیکەوە سەیری کاری ئەم دادگایە بکەم. دەبێ بازنەی کاری دادگای تاوانەکانی جەنگ ئەوەندە بەرفراوان بکرێت کە ئەم بڕیارنامەیەی بەردەستمان بکەوێتە ناوی بۆ ئەوەی سەدام حوسەین وەك تاوانباری جەنگ دادگایی بکرێت.
ئاشکرایە کە ساڵی ١٩٨٨ دەوڵەتی عێراق بەڕێبەرایەتی سەدام حوسەین شاڵاوێکی سیستماتیکی بۆ قڕکردنی خەڵکی کورد لە عێراق بەڕێوە برد. ڕێبەرە کوردەکان ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ئەنجامی ئەم شاڵاوەدا کوژراون لە نێوان ٥٠ هەزار تا ١٨٢ هەزار کەس

---

Jim Leach[1]
Rwanda[2]

هەڵدەسەنگێنن. لە ١٦ ی ئاداری ١٩٨٨ هێزی هەوایی عێراق شاری هەڵەبجەی بومباران کرد پاش ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران بە یارمەتی هێزە کوردەکان هەڵەبجەی گرت. ئەم بومبارانە بە چەکی کیمیایی ئەنجام درا و لە ئەنجامدا ٥ هەزار ژن و منداڵ کوژران. دەوڵەتی عێراق لە ١٩٨٢ و ١٩٨٤ لە شەری ئێران و عێراق کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە.

عێراق سەرەتا لە ساڵی ١٩٨٢ دژی ئێرانیەکان چەکی کیمیایی بە کار هێناو پاشان لە تەموز ١٩٨٣ گازی "موستارد"ی[٣] دژی هێزە ئێرانیەکان بە کار هێنا. برێکی زۆر گازی موستارد لە تشرینی دووەمی ١٩٨٣ و شوباتی ١٩٨٤ لەلایەن عێراقەوە بەکار هێنرا. هەروەها دەگوترێت عێراق لە هێرشەکەی شوباتی ١٩٨٤ گازی دەماری[٤] بەکار هێناوە. لە پەیوەندی لە گەڵ قەیرانی عێراق ـ کوێت لە ١٨ ی کانوونی دووەم تا ٢٥ ی شوباتی ١٩٩١، عێراق ٣٩ موشەکی قەدەغەکراوی Scud ی لە ١٨ هێرشی جیاوازدا هاویشتووە بۆ ئیسرائیل کە ٢ کسی بە شێوازی راستەوخۆ و ١٢ کەسی بە شێوازی ناراستەوخۆ کوشتووە و پتر لە ٢٠٠ کەسی بریندار کردووە.

لە ١٨ ی دیسامبری ١٩٩٠ رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی راپورتێکی بلاو کردەوە کە تێیدا هاتووە عێراق سەدان کوێتی ئەشکەنجە کردووە و کوشتووە بە گومانی ئەوە کە هێرشیان کردووەتە سەر هێزەکانی عێراق. هەزاران کوێتی بە تاوانی ملکەچ نەبوون بە فرمانی سەربازانی عێراق دستگیر کراون. رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی هەروەها راپورتی داوە کە نزیکەی ٣١٢ منداڵ لە زگی دایکیاندا مردوون پاش ئەوەی کە سەربازانی عێراق دایکی ئەم منداڵانەی کوشتووە. دەوڵەتی عێراق هەروەها تاوانی بە ئەنقەست و برنامەدارێژراوی تروریزمی ژینگەی لە ناوچە ئەنجام داوە بە ئاگر تێبەردانی بە ئەنقەستی ٧٠٠ بیری نەوتی کوێت لە شوباتی ١٩٩١.

لە بەهاری ١٩٩٣ دەوڵەتی کوێت دەوڵەتی ئەمریکای ئاگادار کردەوە کە کۆمەڵێك بەڵگەی دۆزیوەتەوە دەربارەی ئەوەی کە عێراق هەوڵی داوە سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکا، جورج

---

[٣] mustard gas
[٤] nerve gas

بوش له کاتی سەردانی جورج بوش بۆ کویت لە ١٤، ١٥ و ١٦ ی نیسان بکوژێت. لەم پەیوەندییەدا ئیدارەی فدراڵی لێکۆڵینەوە و ئاژانسە هەواڵگرییەکانی دیکەی ئەمریکا بۆ لێکۆڵینەوە ناردران بۆ کویت و لە ٢٤ ی حوزەیرانی ١٩٩٣ راپۆرتیان دا بە سەرۆك کۆمار و رایانگەیاند بەم ئەنجامە گەیشتوون کە عێراق لە پشتی ئەم پیلانەدا بووە. عێراق حاشای لەوە کردووە کە هەوڵی کوشتنی سەرۆك کۆماری ئەمریکای دابێت بەڵام راستبوونی ئەم مەسەلەیە سەلمێندرا، هەر بۆیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩٩٣، ٢٣ موشەکی Tomahawk[٦]ی دا لە بەڕێوەبەرایەتی ئیستیخباراتی عێراق. لە ٢٨ ی حوزەیرانی ١٩٩٣ سەرۆك کلینتۆن نامەیەکی نارد بۆ کۆنگرێس و ئاماژەی بەوە کردبوو کە هێرشی موشەکی سەر عێراق بە گوێرەی بڕیارنامەی دەسەڵاتەکانی جەنگ ئەنجام دراوە.

ئەمانە کورتەیەکی چڕوپڕ لە تاوانە جەنگیەکانی سەدام حوسەین و ڕێبەرانی دیکەی عێراقە. هەروەها سەدام کۆمەڵێك کردەوەی شایانی سەرزەنشی دیکەی بە گوێرەی رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان ئەنجام داوە. سەدام حوسەین بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی بە توندی پێشێل کردووە و لە گەڵ جیهان بەربەرەکانی دەکات بەڵام لە دوایین ساتەکاندا بادەداتەوە. ئەگەر سەدام سکاڵای لە سەر تۆمار بکرێت و وەك تاوانباری جەنگ دادگایی بکرێت دەبێ بە نموونەیەکی زۆر باش. روونە کە دادگایی کردنی سەدام مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆزە و لەوانەیە بێ کەڵك وەرگرتن لە هێزێکی زۆری سەربازی مومکین نەبێت.

هەندێك داواکاری هەیە بۆ رووخاندنی سەدام حوسەین. شتێکی دوور لە راستی نییە کە هێزە ناوخۆییەکانی نەیاری سەدام بتوانن شۆڕشێك دژی سەدام ئەنجام بدەن. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێت لە رێگای رادیو دەنگی ئەمریکا یارمەتی ئەم هەولانە بدات و دەتوانێت(بەهاوئاهەنگی لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی) پشتیوانی لەو کەسانە بکات کە دژی

---

[٦] تەوەرزین

سەدام خەبات دەکەن بۆ پەسەندکردنی بڕیارنامەیەکی وەها بۆ دادگایی کردنی سەدام وەك تاوانباری جەنگ. ئەم دادگایی کردنە تەنانەت ئەگەر خودی سەدامیش تێیدا ئامادە نەبێت ورەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەرز دەکاتەوە بۆ رووخاندنی سەدام.

بەڕێز" دۆرکان":

جەنابی سەرۆك، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ شتی زۆری نووسیوە سەبارەت بە شالاوی ئەنفال دژی کوردەکانی باکووری عێراق. ئەم شالاوە سیاسەتی کۆمەڵکوژی سیستماتیك و بە ئەنقەست بوو. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ گەیشتووەتە ئەو ئەنجامە کە دەوڵەتی عێراق لانیکەم ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کوردی کوشتووە.

شالاوی "ئەنفال" بریتی بوو لە کاول کردنی هەزاران گوندی کوردنشین و کوشتن و بێ سەروشوێن کردن و قەلاچۆ کردنی خەڵك بە چەکی کیمیایی و نیشتەجێ کردنی زۆرەملی سەدان هەزار کورد. ئەم شالاوە پاکتاوی ئەتنیکی بوو، پاشان دەستەواژەی "ئەنفال"ی لە سەر دانرا. مەسەلەی زۆر خراپتر ئەوەیە کە لە شالاوی "ئەنفال"دا کەڵك لە چەکی کیمیایی وەرگیراوە. راپۆرتی ئەنجوومەنی وەزیرانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت لە ١٩٨٧ و ١٩٨٨ گەلێ جار بە چەکی کیمیایی هێرش کراوەتە سەر دانیشتوانی گوندەکان . ئەم ڕاپۆرتە، ١٠ نمونە لە هێرشە کیمیاییەکانی عێراقی خستوتە ڕوو و دەڵێت عێراق ٥ جۆر گازی موستارد و "گازی ئەعسابی سارین و تابون[٧]"ی خستووەتە سەر بومبی هەوایی و "rocket"ی ١٢٠ میلیمی و چەند جۆر تۆپ.

عێراق بەرنامەی چەکی کیمیایی و بیولۆژیکی هەیە. ئەمباری چەکە کیمیاییەکانی عێراق، ٤٠ هەزار چەك و تەقەمەنی کیمیایی و ٤٨٠ هەزار لیتر سورتەمەنی چەکی کیمیایی و ٨ سیستمی هەڵگری بومب لە خۆ دەگرێت. ئەمباری چەکە بیولۆژیکەکانی عێراق، ٨/٥٠٠ لیترanthrax

[٧] nerve gases Sarin and Tabun

[8]، ١٩ هەزار لیتر botulinum toxin [9] و ٢٢٠٠ لیتر alfatoxin [10] لە خۆ دەگرێت.
ئەم بەرنامەیە پێشێل کردنی کونوانسیونی چەکە بیولۆژیکەکانە کە عێراق واژۆی کردووە.
هەروەها لیستی تاوانەکانی عێراق و پێشێلکارییەکانی پەیماننامەکان زۆر دوور و درێژە.
جەنابی سەرۆك با سەیرێکی رەفتار و کردەوەکانی سەدام حوسەین و رژێمی عێراق بکەین لە رێگای ئەو بەسەرهاتە ترسناکەی کە بەسەری کورێکی منداڵدا هاتووە بە ناوی "دژوار" کە تەمەنی ٥ساڵ بووە و ئێستا مردووە. بەسەرهاتی "دژوار" لە راپورتی سەیروسەمەرەی "رێکخراوی چاوەدێری رۆژهەلاتی ناوەڕاست" و "رێکخراوی پزیشکانی مرۆڤدۆست" وەرگیراوە. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ئەم راپۆرتەی لە کتێبێکدا بە ناوی "شالاوی ئەنفال لە کوردستانی عێراق " بلاو کردووەتەوە، ئەم کتێبە بەسەرهاتی زۆر ترسناکی "دژوار"مان بۆ دەگێڕێتەوە:

لە ئێوارەی رۆژی ٢٥ ی ئابی ١٩٩٨ باوکی "دژوار" کە جووتیار بووە و ناوی حەسەن بووە، لە گەڵ دایك و باوك و ٤ براکەی و هاوسەرەکەی و ٤ منداڵەکەی(کە "دژوار" یەکێ لەوانە بووە) لە گوندی "بیرجینی" [11] دەژیان. حەسەن باوکی "دژوار" سەرلەبەیانی ئەو رۆژە خۆی ئامادە کردبوو بچێتە باخەکەیان بەلاّم گوندەکەیان بومباران کرا. حەسەن دەڵێت تەقینەوەکانی سەرلەبەیانی ئەو رۆژە بە قەد بومبارانەکانی پێشووی گوندەکەیان بەدەستی عێراق بەهێز نەبووە. خەڵکی گوند(ئەوانەی کە لە هێرشەکە رزگاریان بووە) وتوویانە دووکەڵی بومباکان بەرەنگی سپی، رەش و زەرد بووە و بەرزایی دووکەڵەکەی ٥ تا ٦ مەتر بووە، بۆنی گازەکەی سەرەتا خۆش بووە و بۆنی سێو و هەروەها بۆنی شتێکی شیرینی داوە. گەلێ لە گوندنشینەکان وتوویانە:"

---

[8] ئانتراکس

[9] بوتۆلۆنیوم توکسین

[10] ئالفاتۆکسین

[11] Birjinni

گازەکە بۆنی ژەهری دژە ئافەتی کێڵگەکانی دەدا. پاش ماوەیەکی کورت بۆنەکە تاڵ بوو و کاری کردە سەر چاو و دەم و پێستمان. لە ناکاو بە زەحمەت دەمانتوانی هەناسە بکێشین. هەناسەمان نەدەهاتە سەرەوە و بەتەواوی پچڕا بوو."

خەڵکی ئەم گوندە ـ کە تەنها یەکێ لەو گوندانە بووە کە سەرلەبەیانی ئەو رۆژە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە هێرشی کراوەتە سەر ـ نەیاندەزانی لە کاتی بومبارانەکەدا چی بکەن و کەم کەم زانیویانە کە ئەمانە بومبی ئاسایی نین، بەڵکو بومبی کیمیایین. کاتێ کە دوکەڵی بومبە کیمیاییەکان نیشتووەتە سەر زەوی، وەك پەڵە هەور چۆم و کێڵگە و مەزراکانی داپۆشیوە. باوکی"دژوار" دەڵێت:" من دەستی ٣ منداڵەکەم و ژنەکەم گرت و بە هەڵهاتن چووینە سەر شوێنێکی بەرز. ئێمە بەرەو ئاراستەی پێچەوانەی دوکەڵەکە هەڵهاتین. بارودۆخەکە زۆر شڵەژاو بوو. خەڵك بەرەو هەموو لایەك هەڵدەهاتن. ئەندامانی بنەماڵە لەیەك دابڕابوون و منداڵەکان دایك و باوکی خۆیان ون کردبوو. هەموو کەسێك هەوڵی دەدا خۆی رزگار بکات. هەر کەسێك لە بیری خۆیدا بوو، تەنانەت دایکی منداڵەکانیش، لە بەر ئەوە کە منداڵەکان نەیاندەتوانی هەناسە بدەن".

بەڵام باوکی حەسەن و ئەندامانی دیکەی بنەماڵە هەر لە سەرەتاوە لە ماڵ نەهاتبوونە دەرەوە، لەبەر ئەوەی کە نەیاندەزانی ئەم دوکەڵە چییە بەڵام کاتێ کە زانیان ئەمە هێرشی کیمیاییە، گەلێکیان لە گوندەوە بەرەو باخێك هەڵهاتن کە لەنێو دۆڵێکی قووڵدا بوو. دووکەڵەکە بەشوێنیاندا دەچووە ناو چۆمەکە. ئەو کاتە حەسەن و باوکی زانیان یەکێ لە ٤ منداڵەکانیان لێیان جیابووتەوە، کە ئەو منداڵە ٥ساڵە بوو کە باسم کرد واتا "دژوار" بوو، "دژوار" ون ببوو، لەگەڵ باپیری چووبووە نێو باخەکەی نێو چۆمەکە و لەوێ مابووەوە. کاتێك کە دووکەڵەکە پاش نیو کاتژمێر تۆزێك لاچووبوو، ، حەسەن و کەسانی دیکە کە رزگاریان ببوو بە سەلامەت گەڕابوونەوە ناو گوند. حەسەن بینی دایك و خۆشکەکەی بە سەر زەویدا ڕاکێشراون و کیمیایی

گرتوونی، دەست و لاقیان سەقەت ببوو ودەلەرزی، هەولّیان دەدا ئاو بخۆن بەلاّم نەیاندەتوانی، گەرویان وشك ببوو و دەسووتا، دەرشانەوە. حەسەن دەلّی:" دایكم بە هەناسەدان وتی هەست دەكەم سەرم كونی تێبووە. لە ماوەی چەند كاتژمێر پاش كیمیابارانەكە دایك و خۆشكەكەم كوێر بوون. لە گوند چوومە دەرەوە و باوك و كورەكەم ("دژوار") دۆزییەوە كە مردبوون و لە دەرەوەی باخەكەمان كەوتبوون. هیچ نیشانەیەكیان پێوە دیار نەبوو. وەك ئەوە وابوو خەوتبن، تەنها ئەوە نەبێ كە دەموچاویان شین ببوو. پاشان زانیم كە دو براكەم لە ئەشكەوتێكی بچووكدا مردوون كە خۆیان تێدا داڵدە دابوو".

جەنابی سەرۆك، ئەمە تەنها چەند پاراگراف لەو كتێبەیە كە باسی بە سەرهاتی یەكێ لە گوندەكان دەكات كە لە لایەن دەولّەتی عێراق كیمیاباران كراوە. تەنها یەك كەس لەم جیهانەدا هەیە كە نەیەك جار بەلّكو چەند جار چەكی كۆمەلّكوژی دژی خەلّكی خۆی و دراوسێكانی بەكار هێناوە، ئەویش سەدام حوسەینە و تەنها یەك ولاّتیش هەیە كە كارێكی وای تێدا كرابێ ، ئەویش عێراقە. من و سناتوری ئەیالەتی پنسیلوانیا و ئەوانی دیكە دەلّێین ئێستا كاتی ئەوەیە( هەر چەند كە كاتی زۆری بە سەردا چووە) كە دادگایەكی نێونەتەوەیی پێكبهێنرێت بۆ دادگایی كردنی ئەو كەسانە كە ئەم كردەوە دلرەقانە و تاوانە جەنگیانە ئەنجام داوە. ئەم دادگایە دەتوانێ لەم پەیوەندییەدا كۆمەلّێك بەلّگەنامەی زۆرتر بخاتە روو ، لە چاو ئەو شتانەی كە ئەمرۆ سناتۆری ئەیالەتی پنسیلوانیا و من باسمان كرد.

لەوانەیە پاشان هەموو جیهان ئاگاداری ئەم بەلّگەنامانە و ئەو كردەوە ترسناكە بەزمان نەهاتووانە بێتەوە كە بە سەر ئەم ژن و پیاو و منداڵە بێ گوناهانەدا هاتووە. نەتەنها دەیان هەزار بەلّكو سەدان هەزار كەس بێ سەروشوێن كران و بە تاك و بە كۆمەلّ كوژراون كە هەندێكیان بە چەكی كیمیایی كوژراون. لەوانەیە پاشان خەلّكی جیهان ئاگادار ببنەوە كە سەدام، تەنها

سەركردەى ولاتێكى نييە، تەنها سەركردەى عێراق نييە، بەڵكو تاوانبارى جەنگە. دادگاى تاوانەكانى جەنگ دەبوايا پاش شەرى كەنداو پێكبهاتبايا .

سەدام حوسەين چ بە ئامادە بوون له دادگا و چ ئامادە نەبوون له دادگا، دادگايى بكرێت بۆ من جياوازى نييە، گرنگ ئەوەيە دادگايى بكرێت. ئێمە دەبێ( وەك خەڵكى جيهان) لە دەورى يەك كۆببينەوە و كردەوەيەكى دادپەروەرانەى وا ئەنجام بدەين. ئەو كردەوە ترسناكە بەزمان نەهاتووە كە دەوڵەتى عێراق بە سەر گەلێ لەم خەڵكە بێ گوناهەدا هێناويەتى، نابێ بێ وەلام بمێنێتەوە و دەبێ لێپرسينەوەى لەگەڵ بكرێ. ئێمە دەتوانين و دەبێ دادگايەكى نێونەتەوەيى پێكبهێنين. ئێمە كارێكى وامان له ڕابردوودا كردووە و ئێستاش دو دادگاى هاوشێوە هەيە.

بە ڕێبەرايەتى سناتورى ئەيالەتى پنسيلوانيا، ئێمە دەتوانين و دەبێ دادگايەكى نێونەتەوەيى بۆ عێراق پێكبهێنين. لەوانەيە ئەم بڕيارنامەيە بۆ هەندێ كەس ناتەبا بێ و بڵێن ديپلوماسى ناشەفافى جيهانى ئەمرۆ ئەم جۆرە كردەوە لێبڕاوانە و گرنگانە قبوڵ ناكات. ئەگەر دەستپێشخەريى ديپلوماتيك لە داهاتوودا لە كەنداوى فارس ئەنجام بدرێت، نابێت لە نێوان ديپلوماتە هێژاكان لە لايەك و سەدام حوسەين وەك سەركردەيەكى نەتەوەيى لە لايەكى ديكە بكرێت. دەبێ سەدام وەك تاوانبارى جەنگ دادگايى بكرێت و بەڵگەنامەكان كە هەموو خەڵكى جيهان لە داهاتوودا دەيانبينن، تاوانبار بوونى سەدام دەسەلمێنن.

## ژينوسايد و تاوانەكانى دژ بە مرۆڤايەتى

پێشيلكارييەكانى ياسا نێونەتەوەييەكان لە كويت لەلايەن عێراق سيستماتيك و بەرفراوان بووە بەلام دادگاى نێونەتەوەيى نابێت خۆى لە بازنەى جەنگى كەنداوى فارسدا بەرتەسك بكاتەوە و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ نمونە گەورەترەكانى تاوانەكانى سەدام حوسەين لە بەر چاو بگرێت كە داگير كردنى كويت تەنها يەكێ لەو تاوانانەيە. دادگاى تاوانەكان و لەوانە دادگاى تاوانەكانى سەدام

حوسەین یەکێ لە دادگا درێژخایەنەکانە و دەگەڕێتەوە بۆ پێش لە جەنگی کەنداوی فارس و پاش ئەم جەنگەش بەردەوام بووە.

گەورەترین تاوانێك کە سەرکردەکانی عێراق ئەنجامیان داوە، شالاَوی ئەنفالە بۆ ژینوسایدی خەڵکی کورد لە ناوچە گوندنشینەکانی باکووری عێراق. ئەنجامدانی پتر لە ٣٠٠ گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە کوردستانی عێراق و کەڵك وەرگرتن لە بەڵگەنامە دادگاپەسەندەکان و بەڵگەنامە فەرمییەکانی عێراق کە دەستیان بەسەردا گیراوە، ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤی گەیاندووەتە ئەو ئەنجامە کە لە شالاَوی ئەنفال دژ بە کوردەکانی عێراق، ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کورد بە شێوازی سیستماتیك و بە ئەنقەست کوژراون.

لەم شالاَوەدا هەزاران گوندی کوردنشین کاول کراون و گەلێ کەس بە چەکی کیمیایی کوژراون، بێ سەرو شوێن کراون و قەلاَچۆ کران یا سەدان هەزار کورد بە زۆر نیشتەجێ کراون. ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ئەوە نیشان دەدات کە چۆن ئەم شالاَوی ژینوسایدە گوندبەگوند بەڕێوە چووە. گوندەکان سەرەتا بومباران یا توپباران کراون و هەندێك جار هێرشی کیمیاییان کراوەتە سەر(بەهەمان جۆرە چەکی کیمیایی کە لە کاتی شەری ئێران و عێراقدا کەڵکی لێوەرگیراوە). دانیشتووانی گوندەکان هەوڵیان داوە هەڵبێن بەلاَم کەوتوونە داوی سەربازەکان کە گوندەکانیان گەمارۆ داوە. هێزەکانی ئیستخباراتی عێراق پیاو و کوڕەکانیان جیاکردووتەوە و بێ سەروشوێنیان کردوون. ئەو شاهیدانە کە ئەم ڕووداوانەیان بە چاوی خۆیان بینیوە وتوویانە ئەم کەسانە بە لۆری گوازراونەتەوە بۆ باشووری عێراق و لەوێ کوژراون و خراونەتە ناو گۆڕە بەکۆمەڵەکان.

ئەم کردەوانەی دەوڵەتی عێراق دژ بە خەڵکی کوردی خۆی، تاوانی ژینوسایدە بە گوێرەی ئەو پێناسەیەی کنوانسیونی ژینوسایدە کە دەوڵەتی عێراقیش لە ١٩٥٩ واژۆی کردووە. ئەم

کنوانسیونه، کۆمهڵکوژی خهڵك به هۆی رهگهزیانهوه قهدهغه دهکات. له بهڵگهنامهکانی خودی دهوڵهتی عێراقدا دهردهکهوێت که دهوڵهتی عێراق ههوڵی داوه کوردهکان به کۆمهڵ له ناوبهرێت تهنها لهبهر ئهوه که کورد بوونه. ئهم کردهوهیه، دهکهوێته ناو پێناسهی کونوانسیونی ژینوسایدهوه. دهوڵهتی عێراق له شاڵاوهکهی خۆی دژی خهڵکی کورد کهڵکی له چهکی کیمیایی وهرگرتووه که پاشماوهی چهکه کیمیاییهکهنی جهنگی ئێران و عێراق بووه.

به پێی راپۆرتێکی ئهنجوومهنی وهزیرانی ولاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا دهربارهی چهکه کۆمهڵکوژهکانی عێراق ، دهوڵهتی عێراق له ۱۹۸۷ و ۱۹۸۸ له ناوچهکانی سهر سنووری ئێران و تورکیا هێرشێکی کیمیایی گهورهی کردووهته سهر گوندنشینهکانی خۆی. ههمان راپورت ئاماژه به ۱۰۰ نمونه هێرشی کیمیایی عێراق دهکات دژ به سهربازهکانی ئێران یان خهڵکی کورد. بهگوێرهی ئهم راپۆرته عێراق له بواری بهرههمهێنانی چهکی کیمیایی پێشکهوتنی باشی به دهست هێناوه و له دهیهی ۱۹۸۰ ئهم چهکانهی دژ به ئێران و خهڵکی کوردی ولاتی خۆی بهکار هێناوه. هێزهکانی عێراق ههم به ئامانجی تاکتیکه سهربازییهکان و ههم به ئامانجی ترساندنی خهڵك، گازی کیمیاییان ( لهوانه گازی Mustard ی ٥ و گازی دهماری Sarin و Tabun ی٦ ) خستووهته سهر بومبه ههواییهکان و رۆکێتی ۱۲۰ میلیمی و چهند جۆر تۆپ.

## داڕشتنی بەرنامەیەك بۆ پشتگیری لە ئاڵوگۆڕی دیموكراتیك لە عێراق

### ٧ ی تشرینی یەكەمی ١٩٩٨ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز "لۆت":

خۆشحاڵم كە ئەنجوومەنی پیران تاوتوێی گەلاڵە یاسای ٤٦٥٥ ی كۆنگرێسی ئەمریكا دەكات بۆ ئازادی عێراق. من لە كۆبوونەوەی ٢٥٢٥ ی ئەنجوومەن لە هەفتەی رابردوو گەلاڵە یاسایەكم پێشنیار كرد كە ٧ كەس لە سناتورەكان پشتیوانی لێكردبوو. هەینی ڕابردوو، كومیتەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان ئەم گەلاڵە یاسایەی تاوتوێ كرد و تەنها چەند گۆڕانكاری تەكنیكی بچووكی تێدا كرد. لە ٥ ی تشرینی یەكەم كۆنگرێسی ئەمریكا یاسای ٤٦٥٥ ی بە ٣٦٠ دەنگی ئەرێنی لە بەرامبەر ٣٨ دەنگی نەرێنی پەسەند كرد. ئەم دەنگدانە و دەنگدانەكەی ئەمڕۆی ئێمە ، پشتیوانی توندی كۆنگرێس نیشان دەدات بۆ گرتنەبەری سیاسەتێكی نوێ بەنیسبەت عێراق، سیاسەتێك كە بۆ گۆڕینی رژێمی سەدام حوسەین لە ڕێگای پشتیوانی سیاسی و سەربازی لە ئۆپۆزسیونی عێراق هەوڵ دەدات. وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا گەلێك ئامرازی لەبەر دەستدایە بۆ پشتیوانی كردن لە ئازادی عێراق.

لە لوتكەی جەنگی سارددا، ئێمە پشتیوانیمان كرد لە خەباتكارانی ئازادی لە ئاسیا، ئافریقا و ئەمریكای لاتین كە دەیانەویست بۆ داهاتوویەكی دیموكراتیك خەبات بكەن و لەم ڕێگایەدا گیانی خۆیان بەخت بكەن. ئێمە ئێستا دەبێت و دەتوانین هەمان سیاسەت بە نیسبەت عێراق بگرینەبەر. حكوومەتی كلینتۆن بەردەوام بانگەشەی بێ لایەن بوونی ئێمە دەكات لە سیاسەتی دەرەوە، من پشتیوانی لەم بۆچوونە دەكەم. ئەمڕۆ ئێمە دەتوانین نمونەی روونی سیاسەتێك ببینین كە بەشێوازێكی بەرفەراوان لەلایەن هەر دو لایەنەوە(كۆماری و دیموكرات ـ وەرگێڕ) پشتیوانی

لێکراوە. من دەزانم حکوومەتی ئەمریکا دەرك بە قوڵایی هەستی ئێمە دەکات لە سەر ئەم مەسەلەیە.

ئێستا گوشارەکان زۆرتر بووە بۆ ئەوەی گەمارۆکانی سەر عێراق لابرێت، سەرەڕای ئەوەی کە عێراق سەرپێچی لە شەرت و مەرجەکانی ئاگربەستی جەنگی کەنداو دەکات. ئەگەر سەدام حوسەین لە سەر دەسەڵات بێت، بەرژەوەندییەکانی ئێمە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناپارێزرێت. ئەم یاسایەی بەر دەستی ئێمە، نەخشەی رێگامان پێشکەش دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانمان. ئەمساڵ کۆنگرێس ٥٠ میلیون دولاری تەرخان کردووە بۆ پشتیوانی لە ئۆپۆزیسیونی سیاسی عێراق. ئێمە ٥ میلیونمان تەرخان کرد بۆ دامەزراندنی "رادیو عێراقی ئازاد". ئێمە بە گوێرەی یاسای ئۆپەراسیونە بیانیەکان، ساڵی ١٩٩٩ سەرچاوەی زۆرتر تەرخان دەکەین بۆ پشتیوانی سیاسی لە ئۆپۆزسیونی عێراق، لەوانە تەرخان کردنی ٣ میلیون دولار بۆ کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق.

جێبەجێ بوونی ئەم یاسایە پێویستی بە کاری زۆر هەیە. پێویستی بەوە هەیە سەرۆك کۆماری ئەمریکا لانیکەم گروپێکی ئۆپۆزسیونی چەکدار دروست بکات و یارمەتی سەربازیان بدات و لەگەڵ گروپ یان گروپگەلێکی لێهاتوو دانیشتن بکات. گەلێ لە ئێمە کۆمەڵێك بیروکەی هەیە دەربارەی ئەوەی کە ئەم پرۆسەیە دەبێ چۆن بچێتە پێش. من بەردەوام وتوومە کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق لە رابردوودا چالاك و کاریگەر بووە و دەتوانێ لە داهاتووشدا هەروا بێ. کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق دەتوانێت ببێت بە بنەمای ئۆپۆزیسیونێکی بەرفراوانتر. کۆمەڵێك گروپی دیکە هەن کە ئێستا لە ناو خۆی عێراق چالاکن وەك "یەکێتی نیشتمانی کوردستان" و "پارتی دیموکراتی کوردستان" و "مەجلیسی باڵای شۆرش ئیسلامی عێراق".

وهزارهتی دهرهوهی ئهمریكا له سهر ئهو باوهڕهیه كه پتر له ٧٠ گروپی ئۆپۆزیسیون لـه عێراقـدا ههیه كه گهلێ لهم گروپانه پێوانهكانی یاسای ٤٦٥٥ یان تێدا نییه. گهلێ لهم گروپانـه بـوونێكی ئهوتۆیان نییه و پێگهیـهكی سیاسـی ئهوتۆشـیان نییـه. پـشتیوانی ئێمـه، ئـهم جـۆره گروپانـه ناگرێتهوه.

ئێمه ههروهها دهبێ زۆر ئاگادار بین به نیسبهت ئهوهی كه پـشتیوانی لـهو گروپانـه نهكـهین كـه ئامانج و دروشمهكانیان لهگهڵ ئامانجهكانی ئێمهدا نایهتهوه و هێـزه بیانیـهكان یـا سیاسـهتهكانی دهرهوهی ولاّت دروستی كردوون وهك "حیزبی شیوعی عێراق" یا "ویفاقی نیشتمانی عێراق". من خوشحاڵم ئێمه توانیومانه له پهیوهندی له گهڵ ئهم یاسایه لهگـهڵ سـهرۆك كۆمـاردا كاربكـهین، بهڵام ئێمه دهبێ زۆر شهفاف بین له دارشـتنی ئـهم رهوتـهدا. ئێمـه دهمانـهوێت بهرپرسـیارێتی و دهسهڵاتی ئهم كاره بگرینه ئهستۆ، ههر وهك له بهشی ٤ و ٥ ی ئهم یاسایهدا ئاماژهی پێكـراوه. ئهمه ههنگاوێكی گرنگه.

چاودێران نابێت به ههڵه لهم كارهی ئهنجوومهنی پیران تێبگهن. ههرچهند كه لهوانهیه ئهم یاسایه بهتێكرای دهنگ پهسهند نهكرێت بهڵام لـه ئـهنجامی كۆتـایی پێهـاتنی جـهنگی كهنـداوی فـارس ههنگاوێكی گرنگه بهرهوپێش. له ساڵی ١٩٩١، ئێمه و هاوپهیمانـهكانمان خوێنمـان دا بـۆ ئـازاد كردنی كویت. ئهمرۆش عێراقییهكان بههێز دهكهین بۆ ئهوهی ولاّتی خۆیان ئازاد بكهن.

بهڕێز "هیلمز":

جهنابی سهرۆك من یهكێ له پشتیوانه سهرهكییهكانی یاسای ٤٦٥٥ واتا یاسـای ئـازادی عێـراق بووم تـهنها لهبـهر یـهك هۆكـار، ئـهویش ئهوهیـه كـه سـهدام حوسـهین ههڕهشـهیه بـۆ ولاّتـه یـهكگرتووهكانی ئـهمریكا و دۆسـتهكانمان لـه رۆژهـهڵاتی ناوهڕاسـت. سـهدام زۆر شـهیدای

بەرهەمهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکانە و بە پەرۆشە ئەم چەکانە بەکاربهێنێ. نزیکەی ٨ ساڵە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی دوورەپەرێز گرتووە .

ئەم پرۆسەیە ئێستا لەدوایین قۆناخەکانی لەیەك هەڵوەشاندایە و هۆشداری ئەوە دەدات کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێت بێ دەنگ دابنیشێت و هیوادار بێت کە هەموو شتێك خۆی چاك دەبێت." سکات ریتر[1] "و چەند کەسی دیکە بەئێمەیان وتووە کە سەدام دەتوانێت لە ماوەی چەند مانگدا، سەر لە نوێ دەست بەبەرهەمهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکان بکاتەوە. هەر ئەم هەفتەی ڕابردووە، ڕۆژنامەی "واشنگتۆن تایمز" ڕاپۆرتی دا کە عێراق هێشتا هەر سێ جۆرە چەکە ناوکییەکەی هەیە واتا بومبی ناوکی هەیە و تەنها پلوتونیوم و ئورانیومی پێویستی نییە بیخاتە سەر ئەم چەکانە. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لەوە دڵنیابین کە سەدام لە ڕێگای چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق لانادات. کەوابو هەتا کاتێك کە سەدام و ڕژێمەکەی لەسەر دەسەڵات بن، عێراق هەروا هەڕەشەیەکی هەمیشەییە.

ئەم گەلاڵە یاسایەی بەردەستمان، دەست بە پروسەی درێژخایەنی رووخاندنی سەدام دەکات. ئەم یاسایە بە هیچ شێوەیەك داوای ناردنی سەربازانی ئەمریکا یا تیپەگەلانی هێزەکانی ئەمریکا لەم پرۆسەیەدا ناکات، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەرکەوتنەکانی "دوکتۆرینی رەیگان[2]" کە هەموو ئەو

---

[1] Scott Ritter

[2] دوکتۆرینی رەیگان(Reagan doctrine) بیرۆکەی ناردنە دەرەوەی دژە شۆرش و تروریزمی دەوڵەتی و ئوپەراسیونی لایەنگری لەو هێزانە بوو کە دژی شۆڕشە کومونیستییەکان لە سەراسەری جیهان کاریان دەکرد. بە گوێرەی ئەم بیرۆکەیە کە بە دوکتۆرینی رەیگان (سەرۆك کۆماری ئەمریکا) ناسراوە ولاتە یەکگرتووەکان دەبێ یارمەتی بدات بەو هێزانە کە بۆ رووخانی رژێمەکانی لایەنگری سۆڤیەت هەوڵ دەدەن. وەرگێڕ

کهسانه له خۆ دهگرێت که بهدهستی سهدام زۆرترین ئازار ومهینهتییان بینیوه و دهیانهوێت دژی سهدام شهر بکهن. ئهم یاسایه داوا له سهرۆك كۆمار دهكات گروپێك یان چهند گروپ بۆ ئۆپۆزسیونی عێراق دروست بکات و یارمهتی سهربازییان بدات، پێویست بهوهش ناکات سهرۆك كۆمار بۆ زۆر دوور بڕوانێ. كۆنگرێسی نیشتمانی عێراق سهرهتا باش گهشایهوه و کوردهکان، شیعهکان و سوننهکانی له ژێر چهتری یهك ڕێکخراودا كۆ کردهوه. ئهم كۆنگرێسیه دهتوانێ زیندوو ببێتهوه بهڵام پێویستی به یارمهتی ئێمه ههیه.

جهنابی سهرۆك، خهڵکی عێراق له ڕێگای ڕێکخراوه نوێنهرهکانیان وهك كۆنگرێسی نیشتمانی عێراق، ئهنجوومهنی باڵای شۆرشی ئیسلامی عێراق(INC ) سهر به شیعهکان، یهکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) و پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) داوای یارمهتیان له ئێمه کردووه. لهوانهیه ڕۆژێك بێت ئێمه ناچاربین بگهڕێینهوه بۆ بهغداد. بهبیروبۆچوونی من ئێمه دهتوانین پێش لهم شته بگرین، ئهگهر یارمهتی خهڵکی عێراق بدهین که خۆیان رزگار بکهن. نهیارانی ئهم دهستپێشخهرییه نوێانه(که دهستی کهمێکیان له دۆستهکانی سهدام نییه) دهڵێن ئۆپۆزسیونی عێراق تهنها ناوێکی ههیه و هیچ ناکات و زۆر لهوه پهرشوبڵاوتره که له دهوری یهك كۆ ببێتهوه. ئهم کهسانه تارادهیهك ڕاست دهڵێن، ههر بۆیه سناتۆر"لۆت" و سهرۆك "گیلمان"(که پشتیوانی سهرهکی ئهم بڕیارنامهیه بوون له كۆنگرێسدا)، به دیقهتهوه یاسای ٤٦٥٥ یان داڕژتووه بۆ ئهوه که تهنها یارمهتی ئهو گروپه دیموکراسیخواز و خاوهن پێگهی جهماوهرییانه بدرێت که سهرۆك كۆمار ههڵیان دهبژێرێت. من زۆرتر دهچمه پێش و پێشنیاری ئهوه به سهرۆك كۆمار دهکهم تهنها یهك گروپ ههڵبژێرێت واتا كۆنگرێسی نیشتمانی عێراق که کوردهکان، شیعهکان و سوننهکان تێیدا بهشدارن .

ئۆپۆزسیونی عێراق دهبێت یهکگرتوو بێت بهڵام لهوانهیه پێویست بهوه بکات که ڕێبهرایهتی وڵاته یهکگرتووهکانی ئهمریکا له دهوری یهك كۆیان بکاتهوه. سهرهنجام ئهم گهڵاڵه یاسایه

ڕێگایەك دەکاتەوە بۆ کۆنگرێسی ئەمریکا کە دەسەڵاتەکان دیـار بکـات و دایبڕێـژێت. مـن وەك سەرۆکی کومیتەی پەیوندییەکانی دەرەوە، دەمەوێت ئەم دەسەڵاتەم بەتەواوی پێ بدرێت. کۆشکی سپی و وەزارەتی دەرەوە رایانگەیاندووە پشتیوانی لەم گەڵاڵە یاسایە دەکەن. ئێمـە هـەلێکی بـێ وێنەمان بۆ رەخساوە و من دەمەوێت هەرچی لە دەسەڵاتمدایە بیکەم بۆ ئەوەی ئـەم هەلـەمان لـە کیس نەچێت. بەردیلی سەرنەکەوتن لەم پرۆسەیە، زۆر زۆرە.

بەرێز "جان کێری":

جەنابی سەرۆك منیش پشتیوانی لە یاسای ٤٦٥٥ دەکەم بۆ ئازادی عێراق. سپاسـی ڕێبەرایـەتی بەهێزی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی پیران دەکەم بۆ وەبیرهێنانـەوەی بەرپرسـیاریەتییەکانی دەوڵەتی ئەمریکا بەنیسبەت ئاماجەکانمان لە عێراق و ناوچە. ئەم یاسایە بەخێرایی دەچێتە پێش. من دەمەوێت لە ڕوانگەی خۆمەوە روونی بکەمەوە کە ئـەم یاسـایە چییە و بـۆ مـن پـشتیوانی لێدەکەم: یەکەم ئەوە کە بە بۆچوونی مـن ئـەم گەڵاڵـە یاسـایە ئامرازێـك نییـە بـۆ یارمـەتی و پشتیوانی ڕاستەوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هیچکام لـە بزووتنـەوە شۆرشـگێرەکانی عێراق. ئێستا هەندێك لە بزووتنەوەکانی عێراق دەکەونە ناو بازنەی ئەم گەڵاڵە یاسایە. بزووتنەوە عێراقیەکانی دیکە کە تا ئێستا لە دەوری یەك کۆ نەبوونەتەوە دەتوانن لە دەوری یـەك ببنـەوە و بکەونە ناو بازنەی ئەم گەڵاڵە یاسایە. ئەمە عێراقیەکانن (نە ئەمریکاییەکان) کە دەبێـت خۆیـان بەرێکخستن بکەن بۆ لە سەر دەسەڵات لابردنی سەدام، هەروەها کە خودی عێراقیەکان دەبێـت لـە عێراقی دیوکراتی داهاتوودا ڕێبەرەکانیان هەڵبژێرن. ئـەم گەڵاڵـە یاسـایە یارمـەتی حکومـەتی ئەمریکا دەدات کە پشتیوانی لە عێراقیەکان بکات و هانیان بدات بۆ شۆرش دژی سەدام.

دووەم ئەوە کە ئەم یاسایە ئامرازێك نییـە بـۆ تێوەگلانـدنی سـوپای ئـەمریکا لـە ئۆپەراسـیونی سەربازی دژی سەدام لە ناوخۆ یان دەوروبەری عێراق. شۆرشـی عێراقیـەکان بـۆ خـودی خـەلکی

عێراقە نە خەڵکی ئەمریکا. ئەم یاسایە کۆمەڵێك ئامرازی نوێ دەخاتە بەردەستی سەرۆك کۆمار بۆ یارمەتیدانی عێراقیەکان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە و لە هەمان کاتدا بەرژەوندییەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستێکی ئەمن و خاوەن ژیانی ئاشتیخوازانەدا بەرەوپێش دەبات . ئەم گەلاڵە یاسایە پاش ئەوە کە پەسەند کرا و بوو بە یاسا، ئەرکێکی روون دەخاتە سەرشانی سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی رژێمی سەددام لەناو ببات و رژێمێکی دیموکراتیك بخاتە جێگای.

ئەم گەلاڵە یاسایە راگەیاندراوێکە سەبارەت بەوەی کە ئەمریکا ناتوانێت لەگەڵ رژێمێکدا بژی کە چەکی کیمیایی دژی هاوولاتیانی خۆی و ولاتانی دراوسێی خۆی بەکار هێناوە و دوو جار بەبێ هیچ پاساوێك دەستدرێژی کردووەتە سەر ولاتانی دراوسێی خۆی، و بەرپرسیار نییە لە بەرامبەر ئەو کردەوە دڵڕەقانەی کە لە کوێت ئەنجامی داوە و موشەکی بالێستیکی هاویشتووە بۆ شارەکانی ۳ ولاتی دراوسێی خۆی و هەوڵ دەدات پەرە بە چەکە ناوەکی و بیولوژیکەکان بدات و بە ماوەی ۳۰ ساڵ بە شێوازێکی دڕندانە و تروریستانە خەڵکەکەی خۆی سەرکوت دەکات و دەچەوسێنێتەوە. من نازانم چۆن ولاتێکی دیموکرات دەتوانێت بوونی رژێمێکی وا قبوڵ بکات و ئەم گەلاڵە یاسایە دەڵێت ئەمریکا شتی وا قبوڵ ناکات. من زۆرتر شانازی بە ئەمریکایی بوونی خۆم دەکەم کاتێ کە دەبینم سیاسەتی ئەمریکا شتی وا قبوڵ ناکات و یارمەتی ماددی شۆڕشی عێراق دەدات دژی سەددام.

## یادكردنەوەی كۆمەڵكوژی هەڵەبجە

٢٤ ی ئاداری ١٩٩٩ ـ ئەنجوومەنی نوێنەران

بەڕێز "ستێنی هـ هۆییێر"[١] نوێنەری ئەیاڵەتی مریلەند:

جەنابی سەرۆك ئەمڕۆ دەمەوێت یەكێ لە ڕووداوە ترسناكەكانی مێژووی هاوچەرخی ئەم جیهانە بێنمەوە یاد. ١١ ساڵ پێش، سەدام حوسەین بە چەكی كیمیایی هێرشی كردە سەر شاری كوردنشینی هەڵەبجە و گازی ژەهراوی، لەوانە گازی Mustard و Sarin ی ڕژاندە سەر خەڵكی خۆی، لەبەر ئەوەی كە كورد بوون. ئەم كردەوە قێزەون و دزێوە بووە هۆی كوژرانی پتر لە ٥ هەزار خەڵكی بێ گوناه و بریندار بوونی پتر لە ١٠٠ هەزار كەسی دیكە. بەهەرحاڵ هێرشی كیمیایی سەر هەڵەبجە یەكەمین هێرشی كیمیایی سەدام دژی كوردەكانی عێراق نەبوو و دواییینیش نابێت.

لە سەراسەری ساڵی ١٩٨٨ ، ڕژێمی دڕندەی سەدام حوسەین درێژەی دا بە كەڵك وەرگرتن لە چەكی كیمیایی دژی خەڵكەكەی خۆی. لە شاڵاوی دڕندانەی ئەنفالدا تەنها لە ماوەی ٦ مانگ پتر لە ٢٠٠ گوندی كوردنشین هێرشیان كرایە سەر و بە هۆی چەكی كیمیایی ٢٥ هەزار كەس كوژران. ئەم شاڵاوە سەرەنجام بووە هۆی كاول بوونی ٤٥٠٠ گوندی كوردنشین و كوژرانی ٥٠٠ هەزار كورد و پتر لە ٢٠٠ هەزار كورد بێ سەروشوێنن و ٥٠٠ هەزار كوردی دیكە لە ناوخۆی عێراق ئاوارە بوونە.

---

[١] STENY H. HOYER

هەر چەند كە بێ گومان خەڵكی هەڵەبجە لە كاتی ڕووداوەكەی لە ١١ ساڵ پێش نەهامەتییەكی بەزماننەهاتوویان بەسەرداهات ، بەڵام منداڵەكانیان و منداڵی منداڵەكانیان نە نەوەكانی داهاتووش بە دەست كاریگەرییەكانی ئەم هێرشەی سەدام دەناڵێنن. پاش ١١ ساڵ ئاكامەكانی هێرشی كیمیایی هەڵەبجە هێشتا لە ڕاستیدا كۆتایی پێنەهاتووە. گەلێ لە دانیشتووانی ناوچەكە هێشتا بەدەست كێشەی هەناسەدان، كزەی چاو و تێكچوونی دەمار و نەخۆشی پێست و شێرپەنجە دەناڵێنن. ئەم نەخۆشییانە بۆ ماوەیەكی درێژ لە لە ڕێگای DNA وە لە نەوەیەك بۆ نەوەیەكی دیكە دەگوازرێتەوە.

ڕژێی عێراق قەد پەشیمانی هێرشەكەی بۆ سەر هەڵەبجە نییە و نە سەدام و نە دارودەستەكەی قەت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەكراوە بۆ ئەم تاوانانە كە دژی هاووڵاتیانی خۆیان ئەنجامیان داوە. ئێمە دەزانین ئەم هێرشانە( چ كرابێتە سەر خەڵكی عێراق چ كرابێتە سەر خەڵكی وڵاتانی دراوسێی عێراق) نامرۆڤانەیە و توخمی هاوبەشی سیاسەتەكانی سەدام حوسەینە. ئێمە نابێ قەد ئەو خەڵكە بێ گوناهە لە بیر بكەین كە لەم هێرشانەدا كوژراون و ئەو كەسانەی كە هێشتا ئێستاش بەدەست كردەوە دڵڕەقەكانی سەدام دەناڵێنن.

## یادکردنەوەی ١٢ هەمینساڵیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە

### ٩ ی ئاداری ٢٠٠٠ ـ ئەنجوومەنی پیران

بەڕێز" گرامز[١]":

داوا دەکەم ئەنجوومەنی پیران دەستبەجێ بڕیارنامەی ٩٥ تاوتوێ بکات دەربارەی یادکردنەوەی ١٢ هەمین ساڵیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە کە سناتۆر "لۆت" لەلایەن خۆی و کۆمەڵێک سناتۆری دیکەوە ئامادەی کردووە. ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە:

ـ بەهۆی ئەوەی لە ١٦ ئاداری ١٩٨٨، سەدام حوسەین بە چەکی کیمیایی(لەوانە گازی ئەعساب و VX و گازی Mustard) هێرشی کردووەتە سەر شاری کوردنشینی هەڵەبجە

ـ بەهۆی ئەوەی پتر لە ٥ هەزار پیاو، ژن و منداڵ لە ئاکامی هێرشی کیمیایی سەدام بۆ سەر هەڵەبجە کوژران کە پێشێلکردنی یەکجار توندی یاسای نێونەتەوەییە.

ـ بەهۆی ئەوەی هێرشی کیمیایی بۆ سەر هەڵەبجە بەشێك بوو لە شاڵاوی سیستماتیکی دەوڵەتی عێراق بۆ ژینوساید کردنی کوردەکانی عێراق کە بە شاڵاوی ئەنفال ناسراوە.

ـ بەهۆی ئەوی لە ئاکامی شاڵاوی ئەنفال پتر لە ١٨٠ هەزار پیاو و ژن و منداڵی کوردی عێراق کوژراون.

---

Mr. GRAMS[1]

- بەهۆی ئەوی سەرەڕای تێپەڕبوونی ١٢ ساڵ، هیچ هەوڵێکی سەرکەوتوو نەدراوە لەلایەن ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا رێکخراوە نێونەتەوییەکانی دیکە بۆ سپاردنی تاوانبارانی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە بە دەستی دادپەروەری.

- بەهۆی ئەوەی ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەران تا ئێستا لە ١٦ کاتی جیاوازدا، داوایان لە دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئەمریکا کردووە کە کار بکەن بۆ پێکهێنانی دادگاییەکی نێونەتەوەی بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانەکانی جەنگی رژێمی سەدام.
- بەهۆی ئەوەی بە ماوەی چەند ساڵ، پارەی ساڵانە تەرخان کراوە بۆ تۆمارکردنی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لەلایەن رژێمی سەدام و پێکهێنانی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ دادگایی کردنی سەدام و سەرکردەکانی دیکەی رژێمەکەی.

- بەهۆی ئەوەی رژێمی سەدام درێژە بە سەرکوتی دڕندانەی خەڵکی عێراق دەدات، لەوانە بێ بەش کردنی ئەم خەڵکە لە مافە سروشتیەکان و مافە سیاسی و مەدەنیەکانی سوننە، شیعە و کوردەکانی عێراق و هەروەها کەمینەکانی دیکەی عێراق.

- بەهۆی ئەوەی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەرساڵ بەشێوازی بەڵگەمەند رایگەیاندووە کە رژێمی سەدام حوسەین نەیتوانیوە پێداویستییە سەرەکیەکانی خەڵکی عێراق دابین بکات، لە کاتێکدا کە خۆراك لە شوێنە سەربازییەکانی بەغداد فراوانە.
- بەهۆی ئەوەی رژێمی سەدام حوسەین ساڵانە پتر لە ١٢ میلیارد دولاری لەبەردەستدایە(بەگوێرەی نرخی ئێستای نەوت) بۆ دابینکردنی هەموو جورێك پێداویستی خەڵکی عێراق.

- بەهۆی ئەوەی سەرەڕای ئەوەی کە هیچ بەربەستێکی ئەوتۆ لە سەر رێگای دەوڵەتی عێراقدا نییە بۆ کڕینی خۆراك، بەڵام رێژەی مەرگ ومیری منداڵە ساواکان لە ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی سەدام لە سەرووی رێژەی مەرگ ومیر لە کاتی جەنگدایە لە کاتێکدا کە ئەم رێژەیە لە ناوچە

کوردنشینەکانی ژێر کونترۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان کەمترە لە ڕێژەی مەرگ ومیر لە کاتی جەنگ دا.

ـ بەهۆی ئەوەی کە بەدوور لە دادپەروەرییە کە پاش تێپەڕبوونی ۱۲ ساڵ، دیکتاتوری دڕندە، سەدام حوسەین هێشتا سزا نەدراوە بە تاوانی کوشتنی سەدان هەزار خەڵکی بێ گوناه و کەڵك وەرگرتن لە چەکە کیمیاییە قەدەغەکراوەکان دژی خەڵکی کوردستانی عێراق و گەلێك پێشلکاری دیکەی مافی مرۆڤ .

کەوابوو ئەنجوومەنی پیران بڕیاری دا کە کۆنگرێسی ئەمریکا:

١ـ ساڵیادی ئێش و ئازارەکانی خەڵکی هەڵەبجە و سەرجەم قوربانیانی شاڵاوی ئەنفال بەرز ڕابگرێت.

٢ـ ڕژێمی سەدام حوسەین بەهۆی درێژەپێدانی ڕەفتارە دڕندەکانی دژی خەڵکی عێراق شەرمەزار دەکات.

٣ـ داوا لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەکات ئەو پەڕی هەوڵی خۆی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بدات بۆ پێکهێنانی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ سەرکردەکانی عێراق.

٤ـ داوا لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەکات بە خێرایی دەست بەکاربێت بۆ ئەوەی بە کاریگەرترین شێوە کەڵك لەو پارەیە وەرگرێت کە کۆنگرێس تەرخانی کردووە بۆ تۆمار کردنی تاوانەکانی ڕژێمی سەدام حوسەین.

٥ـ دووپاتی دەکاتەوە کە کردەوە دڕندەکان و دەستدرێژییەکانی سەدام هەڕەشەیە هەم بۆ خەڵکی عێراق و هەم بۆ هەموو ناوچەی کەنداوی فارس.

٦ـ دیسان جەخت دەکاتەوە لە سەر ئەوە کە سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئـەوە بێت کە پشتیوانی لەو هەوڵانە بکات بۆ لەسەر دەسەڵات لابردنی سـەدام حوسـەین لـە عێـراق و دەستبەجێ هاتنە سەر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی دیموکرات هـەروەها کـە لـە یاسـای گـشتی ٣٣٨ ـ ١٠٥ دا ئاماژەی پێکراوە .

## بەشی سێیەم:
## سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کوردستانی عیراق لە ساڵی ١٩٨٨ تا ٢٠٠٠

## هەڵویستی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەنیسبەت ئامانجە نەتەوەییەكانی كورد

### كونفرانسی چاپەمەنی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە، بەڕێز "ڕێدمەن"( Redman )

### ١٥ ی حوزەیرانی ١٩٨٨

پرسیار: هەفتەی رابردوو چاوپێكەوتنێك هەبوو لە نێوان ڕێبەری كورد، جەلال تاڵەبانی و كاربەدەستێكی وەزارەتی دەرەوە. ئایا ئێمە دەتوانین بڵێین وەزارەتی دەرەوە یا دەوڵەتی ئەمریكا ناوبژیوانی دەكات بۆ چارەسەربوونی ناكۆكیەكانی نێوان كوردەكان و دەوڵەتی عێراق، یا چ هۆكارێكی دیكە لە پشتی ئەم دیدارەدا دایە؟

بەڕێز "ڕێدمەن": چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز تاڵەبانی لەسەر داوای خۆی بوو. تاڵەبانی لە كاتی سەردانەكەی لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا داوای كردبوو چاوی بكەوێت بە كاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە و لە ٩ ی حوزەیران لەگەڵ بەرپرسی بەشی كاروباری كەنداوی باكوور لە ئیدارەی ڕۆژهەلاتی نزیك و باشووری ئاسیا دیداری كرد. تاڵەبانی هەروەها لەگەڵ هەندێ لە كاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە باسی مەسەلەی ئاوارەكان و مەسەلەی مافی مرۆڤی كرد. لەپەیوەندی لەگەڵ كێشەی كورد كە جەنابەت ئاماژەت پێ كرد، سیاسەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئەوەیە كە كوردەكان دەبێ هەوڵ بدەن لە چوارچێوەی وڵاتانی ناوچە، بەشێوازێكی ئاشتیخوازانە ئامانجەكانیان وەدی بێنن. وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەست وەرناداتە كاروباری نێوخـــــــــــــــــــــۆیی ئـــــــــــــــــــــەم وڵاتانـــــــــــــــــــــە.

پرسیار: ئایا ئێوە چاوپێكەوتن لەگەڵ تاڵەبانی بە دەستێوەردان لە كاروباری ناوخۆیی عێراق دەزانن؟

بەڕێز "ڕێدمەن": نەخەیر

## شەرمەزارکردنی کەڵك وەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی

### بەیاننامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا*

### ٨ ی ئەیلوولی ١٩٨٨

لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنی ئێمە لە بارودۆخەکە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکەوتووە کە عێراق لە شاڵاوە سەربازییەکانی دژی پێشمەرگە کوردەکان کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە. ئێمە نازانین عێراق تا چ رادەیەك کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە بەڵام هەر چەشنە کەڵك وەرگرتنێك لەم چەکانە، کارێکی پاساو هەڵنەگەر و دزێوە. ئێمە ئەم کەڵك وەرگرتنە لە چەکە کیمیاییەکان شەرمەزار دەکەین، هەروەها کە بەردەوام عێراقمان شەرمەزار کردووە.

بەهۆی کەڵك وەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان دژی ئێران لە شەڕی نێوان ئەم دوو وڵاتە، ئێمە نیگەرانی قووڵی خۆمان دەردەبڕین بەنیسبەت رەفتاری دەوڵەتی عێراق . دەوڵەتی عێراق باش ئاگاداری هەڵوێستی ئێمەیە بەنیسبەت ئەوەی کە کەڵك وەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان بەتەواوی پاساوهەڵنەگرە و قبوڵنەکراوە . وەزیری دەرەوەی ئەمریکا باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق، بەڕێز" سەعدون حەمادی[١] " لەمیانەی دیدارەکەی پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆی لەگەڵ بەڕێز "حەمادی".

---

* ئەم بەیاننامەیە لە لایەن بەڕێز رێدمەن، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە خوێندرایەوە

Mr. Saddoun Hammadi, [١]

## پشتیوانی نەكردنی حكوومەتی ئەمریكا لە گەمارۆكانی كۆنگرێس لەسەر عێراق

### ڕاگەیاندراوی جێگری یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ كاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیك و باشووری ئاسیا، بەڕێز بورلیگ

### ٢٢ی ئەیلوولی١٩٨٨

ئێمە پشتیوانی لە ئامانجەكانی ئەم گەلاڵە یاسایە دەكەین(گەلاڵە یاسای ٥٣٣٧ كـە لـە ٢٧ ی ئەیلولی ١٩٨٨ لە ئەنجوومەنی نوێنەران پەسـەندكراوە ) و شـێلگیرین لەسـەر ڕێگەپێنـەدان بـە عێراق بۆ كەڵك وەرگرتنی دووبارە لە چەكی كیمیایی دژی كوردەكان یا هەركەسێكی دیكە. ئێمە سپاسی هەوڵەكانی ئەم كومیتەیە دەكەین بۆ كاركردن لەگەڵ ئێمە بـۆ ئامـادەكردنی ئـەم گەلاڵـە یاسایە كە ئامانجە هاوبەشەكانی هەموومان دابین دەكات و ئەوە پشتڕاست دەكەینەوە كـە ڕێـژەی كاریگەری ئەم گەلاڵە یاسایە لە گەلاڵە یاساكەی ئەنجووكەنی پیران كەمترە.

ئەگەر ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە ببایین كە كـونترۆڵی نـوێ و بـەرفراوانی كەلوپەلـە هـەناردەكان بـۆ عێراق، دەمانگەیەنێتە ئەم ئامانجە، بێ هیچ دوودڵییەك پشتیوانیمان لە سەپاندنی ئەم گەمارۆوانە بەسەر عێراقدا دەكرد. ڕێگەپێنەدان بە كەڵك وەرگرتن لە چەكی كیمیایی لەلایەن هەر كەسـێك و لە هەموو شوێنێك، گرینگییەكی یەكجار زۆری بۆ دەوڵەتی ئەمریكا هەیە. پەیوەندییەكانی ئێمە لەگەڵ عێراق گرنگە بـەڵام مەسـەلەی كـەڵك وەرگـرتن لـە چـەكە كیمیاییـەكان لـە پەیوەندییـە دولایەنەكان گرنگترە.

ئێمە ناتوانین پشتیوانی لەم گەلاڵە یاسایە بكەین لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو بـاوەڕەین كـە خـستنی گەمارۆ لەسەر عێراق لەم قۆناخە نزیكمان ناكاتەوە لە ئامانجە هاوبەشەكانی ئـەم كومیتەیـە كـە ئەویش كۆتایی هێنانە بە كەڵك وەرگرتنی عێراق لە چەكە كیمیاییەكان بۆ هەمیشە.

هەروەها كە كومیتە ئاگادارە لە ١٧ ی ئەیلوول وەزیری دەرەوەی عێراق بەفەرمی جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە عێراق ملكەچە و رێز دەگرێت لە هەموو رێوشوێنەكانی یاسای نێونەتەوەیی و پروتوكولی ١٩٢٥ی ژنێڤ و رێككەوتنامەكانی دیكە لە چوارچێوەی یاسا مرۆڤییە نێونەتەوەییەكاندا.

بە بیروبۆچوونی ئێمە ئەمە لێدوانێكی گرنگە و هەنگاوێكی ئەرێنییە. ئێمە لەسەر گرنگی ئەم لێدوانە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق قسەوباس دەكەین. بەتایبەت هەوڵ دەدەین ئەوە پشتڕاست بكەینەوە كە عێراق لە ناوخۆی وڵات كەڵكی لە چەكی كیمیایی وەرگرتووە. كەڵك وەرگرتن لەم چەكانە ریسوایەكی ئەخلاقییە و لەلایەن یاسای نێونەتەوەییەوە قەدەخە كراوە، لەوانە كنوانسیونی ١٩٤٩ ی ژنێڤ دەربارەی پاراستنی خەڵكی سڤیل لە كاتی جەنگدا. ئەگەر ئەنجامی قسەوباسەكانی ئێمە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دڵخۆشكەر نەبێ یا نیشانەیەك هەبێ بەنیسبەت ئەوەی عێراق لە داهاتوودا كەڵك لە چەكی كیمیایی وەردەگرێتەوە، ئێمە ئەم هەڵویستەمان دووپات دەكەینەوە. بەڵام ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین كە پەسەندكردنی ئەم یاسایە لە ئێستادا زیان لە پەیوەندییەكانی ئێمە دەدات لەگەڵ عێراق و هەروەها زیان دەگەیەنێت بەو كومپانیانەی ئەمریكا كە كەلوپەل دەنێرن بۆ عێراق. ئێمە دەبێ زۆرتر بۆ ئەو ئامانجە هەوڵ بدەین كە عێراق كۆتایی بە كەڵك وەرگرتن لە چەكی كیمیایی بێنێت.

## راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ له عێراق له ساڵی ١٩٨٩

لێدوانی جێگری وەزیرەی دەرەوە بۆ مافی مرۆڤ و کاروباری مرۆڤی(بەرێز "شیفتێر[١] ")

٨ ی شوباتی ١٩٨٩

لەپەیوەندی لەگەڵ بارودۆخی مافی مرۆڤ له عێراق له ساڵی ١٩٨٨ ، دەبێ سەرنج بدرێت بە چارەنووسی گەلێ له کوردەکان له عێراق. هیچ گومان لەوەدا نییە کە چەند گروپێکی گرنگی کوردی عێراق، ماوەی چەند ساڵە دژی دەوڵەتی عێراق خەبات دەکەن بەڵام کاردانەوەکەی دەوڵەتی عێراق لەسەروبەندی کۆتایی پێهاتنی جەنگی ئێران و عێراق، بەڕاستی هەژێنەر بوو*.

له ئەنجامی دوو هێرشی عێراق بۆ سەر دو شاری کوردنشین، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سڤیل کوژراون. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان له ماوەی ٢ ساڵی ڕابردوودا پتر لە ٨ هەزار کەس کوژراون و پتر له ٥٠ هەزار کوردی عێراق له ترسی هێرشی کیمیایی عێراق( ئەم ترسە لە جێی خویدا بووە) له رۆژی کۆتایی مانگی ئاب هەڵهاتوون بۆ تورکیا و پتر لە ٥٠ هەزار کەسی دیکە هەڵهاتوون بۆ ئێران. لەمە زیاتر له ساڵی ١٩٨٨ عێراق درێژەی دا بە بەرنامەی گواستنەوەی کوردەکان له ناوچە گوندنشینەکان بۆ ناوچە شارییەکان و هەروەها بۆ کەمپەکان.

بنەمای ئابووری کشتوکاڵی ئەم خەڵکە بەتەواوی له ناو چووە و زیاتر لە ٥٠٠ گوند بەتەواوی کاول کراون. کەوابوو ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە زێدی خۆیان گوازراونەتەوە بۆ شوێنەکانی دیکە، زیاتر له نیومیلیون کەس دەخەملێندرێت.

---

Schifter [١]

* مەبەستی کیمیابارانی هەڵەبجەیە- وەرگێر

## عێراق و نموونەکانی تیرۆریزمی جیهانی

### راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە ئەمریکا بە کۆنگرێس- ٣٠ ی نیسانی ١٩٩٠

عێراق لە ساڵی ١٩٨٢ لە لیستی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئەو ولاتانەی کە پشتیوانی لە تروریزم دەکەن، دەرهێنرا. پاش دەرکرانی عێراق لەرێکخراوی نێونەتەوەیی ANO لە ساڵی ١٩٨٣ ، عێراق بەردەوام کاری کردووە بۆ ئەوەی وێنەی نێونەتەوەیی خۆی چاك بکاتەوە. عێراق لە ساڵی ١٩٨٩ پشتیوانی لە هیچ کردەوەیەکی تروریستی نەکردووە، بەڵام بەهەرحاڵ درێژە بە هەوڵەکانی داوە بۆ داڵدەدانی هەندێك لە گروپە فەلەستینەکان، لەوانە "بەرەی ئازادی عەرەب" کە عێراق دروستی کردووە و "بەرەی ئازادی فەلەستین" سەر بە ئەبوعەباس کە بەرپرسیارن بە نیسبەت بەبارمەتە گرتنی فرۆکەی Achille Lauro لە ساڵی ١٩٨٥ و کوشتنی موسافرە ئەمریکاییەکانی.

لەمە زیاتر راپۆرتی چاپەمەنیەکان نیشان دەدات کە ئەبوئیبراهیم، رێبەری پێشووی "رێکخراوی تروریستیی لەناوچووی ١٥ مای" گەڕاوەتەوە بۆ عێراق. ئەبو ئیبراهیم بە شارەزابوون لە دروستکردنی بومبی کوشندەی جانتایی بە ناوبانگە. عێراق درێژە بە پشتیوانی لە گروپەکانی نەیاری دەوڵەتی ئێران دەدات لەوانە موجاهیدینی خەلق(MEK ).

لەسەرەتای مانگی تەموزەوە، چەند هێرشێکی تروریستی لە بەغداد رووی داوە لەوانە تەقاندنەوەی بومب کە ئامانجیان بیانیەکان بووە. بەرپرسیارانی ئەم هێرشانە دیارنین هەرچەند کە رێکخراوێك بە ناوی "رێکخراوی یەکگرتووی شەهیدانی هەڵەبجە" کە گروپێکی توندڕەوی کوردە، بەرپرسیارێتی یەکێ لەم هێرشانەی گرتووەتە ئەستۆ کە تەقینەوەی بومب بووە لە کلوپی نوێی بریتانیا کە ٢٠ کەسی بریندار کردووە. هەروەها لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەم،

پاشنیوەڕۆیەك بومبێك لە شەقامی سەرەكی بازرگانی بەغداد تەقیوەتەوە و ژمارەیەكی زۆر لە ڕێبوارانی كوشتوە و بریندار كردووە.

كاربەدەستانی عێراق كار دەكەن لەگەڵ FAA بۆ باشتر كردنی رەوشی ئەمنی فڕۆكەخانەی بەغداد.

## بۆ کوردەکانتان لە بەرامبەر سەدام بە تەنها هێشتووەتەوە

کونفرانسی چاپەمەنی سەروك کۆماری ئەمریکا لە گەڵ توشیکی کایفۆ( Toshiki Kaifu )، سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن لە نیوپۆرت بیچ [1] ، کالیفۆرنیا

٤ی نیسانی ١٩٩١

پرسیار: جەنابی سەرۆك، رەخنەگران دەڵێن ئێوە کوردەکانتان لە بەرامبەر سەدام بە تەنها هێشتووەتەوە و یەکێ لەم رەخنەگران ئەم مەسەلەیەی چواندووە(شوبهاندووە) بە مەسەلەی "کەنداوی بەرازەکان"[2]. ئایا دەتوانن بۆمانی روون بکەنەوە کە بۆچی ئەمریکا ئەوندە بە پەرۆش بوو بۆ ئازادی کوێت و بۆ چی ئێستا بێ دەنگ دانیشتووە لە کاتێکدا کە کوردەکان دژی سەدام خەبات دەکەن؟

**سەرۆك کۆمار:** ئامانجی هێزە هاوپەیمانەکان قەد ئەوە نەبووە کە لە کاروباری ناو خۆی عێراقدا دەستێوەردان بکەن. لەراستیدا بە روونی پێتان دەڵێم کە ئێمە نەمانەویست بچینە ناو عێراق. من کردەوە درندانەکانی سەدام دژی خەڵکەکەی شەرمەزار دەکەم بەڵام نامەوێت هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (کە بەم شارەزایی و لێهاتوویە کاریان کرد لە جەنگی کەنداودا) بکەونە نێو شەڕێکی نێوخۆیی لە عێراقدا.

---

[1] Newport Beach,

[2] لە ١٧ی نیسانی ١٩٦١ لە کەنداوی بەرازەکان (Bay of Pigs) لە لێواری باشووری کۆریا نزیکەی ١٢٠٠ کەس لە هێزە دوورخراوە نەیارەکانی کاسترۆ، سەورۆك کۆماری کوبا بە پشتیوانی و هاندانی راستەوخۆی CIA هێرشیان کردە سەر هێزەکانی حکوومەتی کوبا بەڵام سەرنەکەوتن. ئەم رووداوە لە گۆڕەپانی سیاسیدا بە "کەنداوی بەرازەکان" ناسراوە. وەرگێڕ

هەتا کاتێك سەدام لە سەر دەسەلات بێت ئێمە پەیوەندی ئاساییمان لەگەل عێراق نابێت ، بەلام رۆژێکیان زۆر بە روونی وتم ئامانجی هاوپەیمانان ئەوە نەبوو کە سەدام حوسەین بە زۆر لە سەر دەسەلات لاببەن و بە بۆچوونی من تەنانەت یەك دایك وباوکی سەربازی ئێمە (کە لە ئۆپەراسیونی گەردەلوولی بیاباندا شەڕیان کرد) نییە کە بیەوێت هێزەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەونە ناو ئەم بارودۆخە ترسناك و دژوارە.

پرسیار: ئایا ئێوە مافی پەنابەری دەدەن بەو ئاوارە کوردانە، ئەگەر تورکیا سنوورەکانی خۆی دابخات؟

سەرۆك کۆمار: من گفتوگۆیەکی باشم هەبوو لەگەل سەرۆك وەزیرانی ژاپۆن، بەڕێز "کایفۆ "و رێککەوتین لە سەر ئەوی کە هەرچی لەدەستمان بێت بیکەین بۆ یارمەتیدانی ئاوارە کوردەکان.

پرسیار: جەنابی سەرۆك لە سالی ۱۹۸۹ و ۱۹۹۰ کاتێك کە رەخنەگران داوایان لە ئێوە دەکرد پشتیوانی توندتر بکەن لە راپەڕینە سەربەخۆخوازەکانی رۆژهەلاتی ئەورووپا و "لیتوانیا"، ئێوە راتانگەیاند دوودلن بە نیسبەت ئەم شتە لەترسی ئەوەی کە چاوەڕوانیەکان زۆرتر بێت هەروا کە لە سالی ۱۹٥٦ لە" هانگاریا " مەسەلەیەکی وا رووی دا. ئێستا خەلك دەلێن ئێوە داوای رووخانی سەدام حوسەینتان کردووە و کاتێ کە خەلك دژی سەدام راپەڕینیان کردووە، ئێوە بێ هیواتان کردوون. هەست و هەلویستی ئێوە چییە بەنیسبەت ئەم مەسەلەیە و ئایا ئێوە وێکچونێك دەبینن لە نێوان ئەم دو شتەدا؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە ئەو قسەی منە دروست بووە لە سالی ۱۹۸۹ و پێموایە ئێستاش هەر درووستە. من هەر لە سەرەتاوە روونم کردەوە کە ئامانجی هاوپەیمانان یا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوە نەبوو کە سەدام لە سەر دەسەلات لاببەن. کەوابوو پێمواننییە شیعەکان لە باشووری عێراق و ئەوانەی کە حەزیان لە سەدام نییە یان کوردەکان لە باکوور وا هەستیان کردبێت کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ رووخانی سەدام دێتە یارمەتیان.

ئێمە نامانەوێت بە تێوەگلان لەم شەڕە، گیانی هێزەكانی ئەمریكا بخەینە نێو مەترسی. ئێمە ئەركی خۆمان جێبەجێ كردووە. ئێستا ئایا ئێمە دەهەژێین كاتێك كە دەبیسین خەڵكی كورد دەچەوسێنرێنەوە و دەكوژرێن و رەفتاری هۆڤانەیان لە گەڵ دەكرێت؟ بەلێ. ئایا ئێمە نیگەرانین لە رەفتاری دڕندانەی سەدام لەگەڵ شیعەكانی باشووری عێراق؟ بەلێ. ئایا ئێمە دەمانەوێت خەڵكی عێراق خۆیان سەدام لە سەر دەسەڵات لاببەن؟ بەدڵنیاییەوە دەمانەوێت بەڵام دەربارەی ئامانج و نیازەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هاوپەیمانان (كە تا ئەو شوێنە كە من دەزانم، ئەوانیش لە گەڵ ئەم هەڵویستەی مندان) هیچ كەس بە لاڕێدا نابەم.

## ئەم تراژیدییە پێویستی بە هەوڵی زۆرتر هەیە

## ڕاگەیاندننامەی سەرۆك بوش دەربارەی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە ئاوارەكانی عێراق

## ٥ ی نیسانی ١٩٩١

ئەو تراژیدیە مرۆڤیە كە لە ناوخۆ و دەوروبەری عێراقدا هەیە، پێویست بە كردەوەی دەستبەجێ بە شێوازێكی بەرفراوان دەكات. ئامانجی ئەم كردەوەیە تەنها رزگار كردنی گیانی سەدان هەزان ژن، پیاو و منداڵی بێ گوناح نییە بەڵكوو پاراستنی ئاشتی و سەقامگیری ناوچەی كەنداوی فارسە. لە سەرەتای دەستپێكردنی شەڕی كەنداو لە ٢ ئاب، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ٣٥ میلیون دۆلاری تەرخان كردووە بۆ ئاوارەكان و خەڵكی دەربەدەری ناوچە. هەروەها گەلێ وڵاتی دیكەش یارمەتیان داوە.

بەهەر حاڵ روونە كە ئەم تراژیدییە پێویستی بە هەوڵی زۆرتر هەیە. لە ئەنجامدا من فەرمانم داوە كە هەوڵێكی نوێ بدرێت بۆ یارمەتیدانی ئاوارە عێراقیەكان. فڕۆكە بارهەڵگرەكانی هێزی هەوایی ئەمریكا لە سەرەتای ئەم یەك شەنبەیە دەفڕن بەرەو باكووری عێراق و خوراك و بەتانی و جلوبەرگ و خێوەت و پێداویستیەكانی دیكە دەخەنە خوارەوە بۆ ئاوارەكان و خەڵكی مەدەنی دیكەی عێراق كە لە ئاكامی بارودۆخی ئەو وڵاتە، زەرەرمەند بوونە و تووشی ئازار و ئەزیەت هاتوون.

دەمەوێت جەخت لە سەر ئەوە بكەمەوە كە ئەم هەوڵە تەنها بەنیگەرانیە مرۆڤدۆستەكان تەشویق دەكرێت. ئێمە چاوەڕوانی ئەوە لە دەوڵەتی عێراق دەكەین كە ڕێگە بەوەبدات كە ئەم هەوڵە بێ هیچ دەستێوەردانێك بەڕێوە بچێت. دەمەوێت ئەوەش زیاد بكەم كە ئێمە لە بەرنامەماندا هەیە هەوڵێكی دیكە بدەین بۆ دەستبەجێ یارمەتیدانی ئاوارەكان، هەروەها كە بەریتانیا، فەرانسا و هێزە هاوپەیمانەكانی دیكەش یارمەتی ئاوارەكان دەدەن. ئێمە لەگەڵ نەتەوە یەكگرتووەكان ڕاوێژ

دەکەین چۆن ئەم یارمەتیە بە باشترین شێوە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بگاتە دەستی ژمارەیەکی زۆر لە ئاوارەکان لە ناوخۆ و دەوروبەری عێراق. هەروەها ئێمە لەم هەوڵەدا و هەوڵەکانی دیکەدا درێژە بە راوێژەکانمان دەدەین لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکانمان کە بەرنامەیان بۆ داڕێژراوە بۆ باش کردنی بارودۆخی دژواری گەلێ لە خەلکی بێ گوناحی عێراق کە بەهۆی کردەوە دڕندانە و نامرۆڤانەکانی دەوڵەتی عێراق ژیانیان کەوتووەتە نێومەترسی. هەروەها دەمەوێت ئەوە زیاد بکەم کە ئەم یارمەتیە دەستبەجێیە تەنها یەکێ لەو چەند هەنگاوانەیە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ باش کردنی ئەم بارودۆخە ترسناکە هەڵیدەگرێت.

من تا ماوەیەکی کورتی دیکە فەرمانێك واژۆ دەکەم بۆ تەرخانکردنی ١٠ میلیون دولار لە "سندوقی یارمەتیە فریاگوزارییەکانی ئاوارەکان و کوچبەران" بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە. ئەم برە پارەیە بەشێك لە پێداویستیەکانی ئاوارەکان لە ناوچە دابین دەکات. هێزە سەربازییەکانی ئێمە لە باشووری عێراق درێژە بە یارمەتیدانی ئاوارەکان و دەربەدەربووان دەدەن. ئێمە هەروەها یارمەتییەکی بەرچاوی ئابووری و خوراك دەدەین بە دەوڵەتی تورکیا بۆ یارمەتیدانی ئەو ئاوارانەی کە چوونەتە ناو خاکی ئەو ولاتە.

ئێمە ئامادەین یەکینەیەکی پزیشکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بنێرینە ناوچە سنووریەکانی باشووری تورکیا بۆ دابینکردنی پێداویستیە فریاگوزارییەکانی ئاوارەکان. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروەها نیگەرانە بەنیسبەت رەوشی ژیانی ئەو ئاوارە عێراقیانە کە ئێستا هەڵهاتوون بۆ ئێران. ئێمە لە رێگای کاناڵەکانی خۆمانەوە، داخوازی خۆمان رادەگەیەنین بە ئێران بۆ تەشویق کردن و یارمەتیدانی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان کە یارمەتی فریاگوزاری دەگەیەنن بەم ئاوارانە.

لە هەوڵێکی دیکەدا بۆ یارمەتیدانی خەلکی بێ گوناح و بەتایبەت منداڵانی عێراق، ئێمە ٨٦٩ هەزار دولارمان داوە بە UNICEF(سندوقی منداڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان) بۆ پاراستنی منداڵانی عێراق. هەروەها ١٣١ هەزار دولار پارە و هەزار تەن خوراکمان داوە بە رێکخراوە نێونەتەوەییەکان بۆ ئەوەی لە نێو خەلکی سڤیلی عێراقدا دابەشی بکەن. لە کۆتاییدا داوام لە

وەزیرە دەرەوە، بەڕێز بەیکێر کردووە کە لە سەر ڕێگای سەفەر بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەردانی تورکیا بکات بۆ دیدار لەگەڵ سەروك ئۆزاڵ و سەردانی ناوچە سنوورییەکان بکات بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی ئاوارەکان و ڕاپۆرتەکەی بە من تەسلیم بکاتەوە.

***

بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٥ی نیسانی ١٩٩١

ئەنجومەنی ئاسایش:

بە سەرنجدان بە ئەرك‌و بەرپرسیاریەتییەکانی خۆی بەگوێرەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی،

بە وەبیرهێنانەوەی بڕگەی ٧ی مادەی 2 ی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان

- بە دەربڕینی نیگەرانیی قووڵ لە سەرکوتی خەڵکی مەدەنی عێراق لە گەلێ لە شوێنەکانی عێراق، لەوانە لەم دواییانە لە ناوچە کوردنشینەکان کە کۆڕەوی مەزنی ئاوارەکان بەرەو سنوورە نێونەتەوەییەکان، دەربازکردنی سنوورو بەزاندنی سنوورەکانی لێکەوتەوە کە هەڕەشە لە ئاشتی‌و ئاسایشی ناونەتەوەیی ناوچە دەکات.

- بە دەربڕینی ئەوپەڕی خەم‌و پەژارەی خۆی بە نیسبەت ئەم ئێش و ئازارە مرۆڤایەتییە

- بە سەرنجدان بە نامەکانی نوێنەرانی تورکیاو فەرانسا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرواری ٢و ٤ی نیسانی ١٩٩١(S/22435 S/22442)

- هەروەها بە سەرنجدان بە نامەکانی نوێنەری هەمیشەیی کۆماری ئیسلامی ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرواری ٣و ٤ی نیسانی ١٩٩١ (S/22436 S/22447)

- بە جەختکردنەوەی دووبارە لەسەر دەروەسبوونی سەرجەم وڵاتانی ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر سەروەری، یەکپارچەیی و سەربەخۆیی سیاسی عێراق‌و هەموو وڵاتانی ناوچە و

- بە لەبەرچاوگرتنی راپۆرتی سکرتێری گشتیی لە ۲۰ ئاداری ۱۹۹۱(S/22366)

۱ـ سەرکوتی خەڵکی مەدەنی عێراق لە گەلێ لە شوێنەکانی عێراق، لەوانە ناوچە کوردنشینەکان شەرمەزار دەکات کە ئاکامەکانی هەڕەشە لە ئاشتی‌و ئاسایشی نێونەتەوەیی ناوچە دەکات.

۲ـ داوا لەعێراق دەکات کە وەك یارمەتییەك بۆ سڕینەوەی هەڕەشەی سەر ئاسایش‌و ئاشتی نێونەتەوەیی ناوچە، دەستبەجێ کۆتایی بەم سەرکوتە بێنێ‌لاو هیوا دەردەبڕێت کە وتووێژی ئازاد بۆ گارانتیکردنی ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و مافی سیاسیی هەموو هاووڵاتیانی عێراق، ئەنجام بدرێت.

۳ـ لەسەر ئەوە پێداگری دەکات کە عێراق ڕێگە بە ڕێکخراوە نێونەتەوەییە مرۆڤدۆستەکان بدات تا دەستبەجێ دەستی بگات بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە هەموو شوێنەکانی وڵات پێویستیان بە یارمەتی هەیەو ئاسانکاری پێویست بۆ چالاکیی ئەم ڕێکخراوانە بکات.

٤ـ داوا لە سکرەتێری گشتیی دەکات درێژە بە هەوڵە مرۆڤدۆستانەکانی خۆی لەعێراق بدات‌و دەستبەجێ (ئەگەر گونجاو بێ لە ڕێگای ناردنی لێژنەی زۆرتر بۆ ناوچە) لەمەڕ ڕەوشی دژواری خەڵکی مەدەنی عێراق، بەتایبەت خەڵکی کورد کە لە هەموو شێوازەکانی سەرکوت بە دەستی کاربەدەستانی عێراقەوە ئازار دەبینن، راپۆرت بدات.

٥ـ هەروەها داوا لە سکرەتێری گشتیی دەکات لە هەموو ئامرازەکانی بەردەستی، لەوانە ڕێکخراوەگەلی پەیوەندیدار بە نەتەوە یەکگرتووەکان کەڵك وەربگرێت بۆ وەڵامدانەوەی خێرا بە پێداویستییە ژیانیەکانی ئاوارەکان‌و خەڵکی ئاوارە و دەربەدەربووی عێراق،.

٦ـ له هەموو وڵاتانی ئەندامو ڕێکخراوه مرۆڤدۆستەکان داوا دەکات لەم هەوڵه سارێژکەره مرۆڤدۆستانەیه بەشداری بکەن.

٧ـ داوا له عێراق دەکات بۆ گەیشتن بەم ئامانجانه لەگەڵ سکرتێری گشتیی هاوکاری بکات.

٨ـ بڕیاری داوه بەشوێن مەسەلەکەدا بچێت.

## نامەوێت سەربازە ئەمریكاییەكان بخەمە ناو شەڕێكی ناوخۆیی لە عێراقدا
## كونفرانسی چاپەمەنی سەرۆك بوش دەربارەی یارمەتیدانی ئاوارەكان
## ١١ ی نیسانی ١٩٩١

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئایا ئێوە هاوڕان لە گەڵ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، "جان مەیجێر" بۆ دروست كردنی هەرێمی پارێزراو لە عێراق ؟

سەرۆك كۆمار: بەڵێ بەتەواوی هاوڕام.

پرسیار: دەوڵەتی عێراق دەڵێت پێویست بە دامەزراندنی ناوچەی پارێزراو ناكات، مەبەستی ئێوە چ جۆرە هەرێمێكی پارێزراوە؟

سەرۆك كۆمار: ئێمە دەمانەوێت هەرچی لەدەستمان بێت بیكەین بۆ یارمەتیدانی مرۆڤدۆستانەی ئاوارەكان و لەم پەیوەندییەدا هیچ بیروڕایەكی جیاواز لە نێوان بەریتانیا و ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هەروەها لە نێوان سكرەتێری گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان و ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا نییە ، هیچ بیروڕایەكی جیاواز نییە لەم پەیوەندییەدا.

ئێمە دەمانەوێت یارمەتی فریاگوزاری بدەین بەم خەڵكە، لە هەر شوێنێك بن. ئێمە دەمانەوێت درێژە بەم رەوتە بدەین و چاوەڕوانی هیچ جۆرە دەستێوەردانێكی سەدام ناكەم لەم مەسەلەیەدا.

پرسیار: ئایا هەرێمی پارێزراو كیانێكی یاساییە؟

سەرۆك كۆمار: بە هەڵە تێمەگەن. ئەگەر باشتر گوێتان بۆ قسەكانی من گرتبایا لە مەبەستی من تێدەگەیشتن. ئەمە ئەو شتە نییە كە ئێمە دەیكەین، ئێمە دەمانەوێت یارمەتی ئەم ئاوارانە بدەین. تكاتان لێدەكەم هەوڵ مەدەن بۆ جیاكردنەوەی ئاوارەكان بە گوێرەی ناوچەكانیان. ئەگەر ئێوە باوەڕ بە من ناكەن، قسە لەگەڵ " جان مەیجێر" بكەن ، ئەو كاتە دەبینن هیچ جیاوازییەكی بیروڕا لە نێوان ئێمەدا نییە. ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەوری رێبەری دەبینێ لە ڕاكێشانی

پشتیوانی بۆ ئاوارەكان و ئێمە دەمانەوێت درێژە بەمە بدەین. ئێمە كارێكی زۆر گەورە دەكەین بە هاوكاری هێزە هاوپەیمانەكان.

من نامەوێت سەربازە ئەمریكاییەكان بخەمە ناو شەڕێكی ناوخۆیی لە عێراقدا. من دەمەوێت ئەم سەربازانە بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و هەروایش دەبێ. ئێمە دەمانەوێت ئەو كارە كە بە دروستی دەزانین بیكەین بۆ ئەم ئاوارانە و بە بۆچوونی من خەڵكی ئەمریكا چاوەڕوانی ئەمە لە ئێمە دەكەن و خوازیاری ئەمەن. بەڵام پێموانیە خەڵكی ئەمریكا بیانەوێت هێزەكانی ئێمە بكەونە نێو زەلكاوی شەڕێكی ناوخۆیی لە عێراقدا . دەمەوێت ئەم مەسەلەیە بۆتان روون بێتەوە. ئێمە ئەمڕۆ لە گەڵ هاوپەیمانە ئەوروپیەكانمان لێرە كۆبووینەتەوە، هەروەها كە لە جەنگی كەنداودا ئەو شاڵاوە پرشكۆمانە پێكەوە ئەنجامدا.

## ئایا ئەم خەڵكە دەبێ تا كۆتایی ژیانیان هەر ئاوارە بن؟

## كونفرانسی چاپەمەنی سەرۆك كۆماری ئەمریكا و پەرەپێدانی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە كوردەكانی عێراق ، ١٦ ی نیسانی ١٩٩١

سەرۆك كۆمار: من لێرە لێدوانێكی كورتم دەبێت پاشان وەڵامی چەند پرسیارێك دەدەمەوە :
١١ رۆژ پێش لە ٥ ی نیسان، من رامگەیاند كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەستپێشخەر دەبێت بۆ ئەنجامدانی هەوڵێك كە بەم زووانە دەبێت بە گەورەترین هەوڵی فریاگوزاری لە مێژووی هاوچەرخی سەربازی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دا. ئەم هەوڵە پێویست بوو، بەهۆی ئەو تراژیدیە مرۆڤییە ترسناكە كە لە ناوخۆ و دەوروبەری عێراق لە ئاكامی رەفتاری درندانەی سەدام لەگەڵ هاووڵاتیانی عێراق روودەدات . لەماوەی ٤٨ كاتژمێردا، شاڵاوەكەی تیمە چەند تەن خوراك ، ئاو ، جلوبەرگ، خێوەت، بەتانی و دەواودەرمانی دابین كرد بۆ كوردەكان لە باكووری عێراق و باشووری توركیا. پێوەری ئەم هەوڵە بەراستی بێ وێنە بوو. بەڵام راستیەكەی ئەوەیە كە كێشەكە زۆر لەوە گەورەترە. سەدان هەزار كوردی عێراق لە ناوچە شاخاوییە دووردەستەكانی باشووری توركیا و سەر سنووری توركیا و عێراقدان. دەوڵەتی توركیا لە پاڵ یەكینە سەربازییەكانی ئەمریكا، بەریتانیا و فەرانسا و گەلێ لە رێكخراوە نێونەتەوەییەكان شاڵاوێكی فریاگوزاری گەورەی بەرێوە بردووە.

بەڵام سەرەڕای ئەم هەوڵانە، برسێتی ، بەدخۆراكی، نەخۆشی و سەرماو سۆڵە زۆری هێناوە بۆ ئاوارەكان. هیچ كەس ناتوانێت ئەو راپورتانە ببینێت و ببیسێت( دەربارەی ئەم ئێش وئازارە مرۆڤییە كە ژن، پیاو و بەتایبەت منداڵە بێ گوناحەكان دەیكێشن) و دڵی بۆیان نەسوتێت. بۆیە پاشنیوەڕۆی ئەمرۆ، دوابەدوای راوێژ لە گەڵ "جان مەیجەر"ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، " فرانسوا میتران"ی سەرۆك كۆماری فەرانسا، "ئۆزاڵ"ی سەرۆك كۆماری توركیا، "كۆهل"ی

سەدری ئەعزەمی ئالمانیا و "پرێز دوکونیار"ی سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەوڵێکی فریاگوزاری گەورەتر و بەرفراوانتر ڕادەگەیەنم.

هەڵویستی ئێمە بە نیسبەت ئەم مەسەلەیە زۆر سادەیە: ئەگەر ئێمە نەتوانین خوراك، دەواودەرمان، جلوبەرگ و خێوت بەقەد پێویست دابین بکەین بۆ ئەو کوردانە کە سەر سنوورەکانی تورکیا و عێراقن، دەبێت کوردەکان تەشویق بکەین بچن بۆ ئەو ناوچانەی باکووری عێراق کە بە هۆی بارودۆخی جوگرافیایی، ئەم هەڵە فریاگوزارییە بەرفەراوانە لەوێ ئاسانتر ئەنجام دەدرێت. بە گوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان و هاوکاری نزیك لە گەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوە نێونەتەوەییە فریاگوزارییەکانی دیکە و هاوپەیمانە ئەوروپاییەکانمان، فەرمانم داوە بە سوپای ئەمریکا کە دەستبەجێ دەست بکات بە درووست کردنی چەند کەمپێك لە باکووری عێراق بۆ ئەوەی ئەم پێداویستیانە بە شێوازێکی رێکوپێك لە نێو ئاوارەکاندا دابەش بکرێت.

من دەرك بەوە دەکەم کە گەلێ لە کوردەکان لەوە دەترسن بگەرێنەوە بۆ عێراق و هۆکارەکەشی لە جێی خۆیدایە. بەڵام رێگەم پێبدەن جارێکی دیکە دڵنیایان بکەمەوە کە لەم کەمپە کاتییانەدا ئاسایشیان لە لایەن هێزی هەوایی و زەمینی ئەمریکا، بەریتانیا و فەرانسا بە گوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دابین دەکرێت . هیوادارین هێزە هاوپەیمانەکانی دیکەش پەیوەست بن بەم هەوڵە. دەمەوێت جەخت لە سەر ئەوە بکەمەوە کە ئەوەی کە ئێمە دەیکەین، بە نیگەرانیە مرۆڤدوستانەکان تەشویق دەکرێت . ئێمە چاوەڕوانی ئەوە لە دەوڵەتی عێراق دەکەین بە هیچ شێوەیەك دەستێوەردان نەکات لەم هەوڵە فریاگوزارییەی دواییە. قەدەغە بوونی فڕینی فڕۆکەکانی عێراق بە سەر باکووری هێڵی ٣٦ هەروا درێژەی دەبێت.

دەمەوێت جەخت لە سەر ئەوە بکەمەوە کە ئەم هەوڵە نوێیە سەرەڕای گەورەو بەرفراوان بوونی، رێگاچارەیەکی هەمیشەیی نییە بۆ بارودۆخی کوردەکانی عێراق، بەپێچەوانەوە ڕێگاچارەیەکی کاتییە بۆ دابینکردنی یارمەتیە مرۆڤییە زۆر پێویستەکان. ئامانجی درێژخایەنی ئێمە هەر ئەوە

دەبێت واتا ئاوارە كوردەكان و لە راستیدا هەموو ئاوارە عێراقیەكان لە هەر شوێنێك هەن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان و بە ئاشتی و بە دوور لە سەركوت بژین.
هەروەها دەمەوێت ئاماژە بەوە بكەم كە ئێمە لەراستیدا نیگەرانین بۆ كێشەی ئەو ئاوارە عێراقیانە كە ئێستا لە سەر سنووری ئێران و عێراق و ناو ئێرانن. من ستایشی ئەندامانی كۆمەڵگای ئەورووپا دەكەم بۆ هەوڵەكانیان بۆ كەم كردنەوەی ئێش و ئازاری ئاوارەكانی ئەم ناوچەیە. ئێمە خۆمان پێشنیاری یارمەتیمان داوە بە هەوڵە نێونەتەوەییەكان بۆ چارەسەر كردنی ئەم قەیرانە مرۆڤیە.
هەروەها كە پێشتر وتم، ئەمڕۆ لێرە هەوڵێكی فریاگوزاری ڕادەگەیەنرێت كە پێوەرەكەی و كاریگەرییەكەی جیاوازە لە هەوڵەكانی دیكە. ئەوە كە جیاواز نییە سیاسەتی بنەڕەتییە. من بەردەوام وتوومە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا نایەوێت لە كاروباری ناوخۆیی عێراق دەستێوەردانی سەربازی بكات و بكەوێتە ناو زەلكاوێك وەك ئەوەی ڤیەتنام. ئەم سیاسەتە هەروەك خۆی دەمێنێتەوە.
هەروەها ئێمە نامانەوێت ببین بە هێزێكی داگیركەر كە سەربازەكانمان شەقامەكانی بەغداد بپارێزن. ئێمە دەمانەوێت بەزووترین كات ئیدارە و ئاسایشی ئەم كەمپانە تەسلیم بە نەتەوە یەكگرتووەكان بكەین، هەروەها كە ئەركی خۆمان جێبەجێ دەكەین بۆ كشانەوەی سەربازەكانمان و تەسلیم كردنی بەرپرسیارێتی ئەم كەمپانە بە هێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان لە سەر سنووری باشووری عێراق و سنووری عێراق و كوێت. بەڵام ئێمە دەبێ هەموو كارێك كە لە دەستمان دێت بیكەین بۆ پاراستنی گیانی خەڵكی بێ گوناح. ئەمە نەریتی ئەمریكایە و ئێمە دەمانەوێت درێژە بەم نەریتە بدەین.

یارمەتیدانی ئاوارە عێراقیەكان

پرسیار: جەنابی سەرۆك، بە پێی هەڵسەنگاندنەكانی حكومەتی ئەمریكا هەزار كورد لە رۆژێكدا دەمرن. ئێوە چۆن وەڵامی ئەو رەخنانە دەدەنەوە كە دەڵێن ئێوە كاری زۆر كەمتان كردووە و زۆر درەنگ كارتان كردووە بۆ ئەم ئاوارانە و پشتتان لەو خەڵكە كردووە كە تەشویقتان كردن دژی سەدام راپەڕین بكەن.

سەرۆك كۆمار: من پێموانییە وەڵامی ئێمە زۆر درەنگ و زۆر كەم بووبێت. كێشەی دابینكردنی پێداویستیەكان، یەكجار ئەستەمە و هەروەها كە لە راگەیاندننامەكەدا ئاماژەم پێكرد، ئێمە كۆمەڵێك یارمەتی مرۆڤدۆستانەمان ناردووە بۆ ناوچە و نەتەنها وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەڵكو وڵاتانی دیكەش و گەلێ لە رێكخراوە نێونەتەوەییە نادەوڵەتیەكانی دیكەش یارمەتیان داوە. كەوابوو ئەمە سیاسەتی ئێمە بووە. بەڵام پێموایە ئێمە هەلێكی باشترمان دەبێت بۆ ئاسانكردنی ئەم هەوڵە و باشتر كردنی بارودۆخی تەندروستی كوردەكان لە رێگای ئەم پرۆگرامە نوێیە. من ئەمڕۆ ئەمەم راگەیاند. لەم پەیوەندییەدا ئێمە راوێژی زۆرمان كردووە لە گەڵ توركەكان و لایەنە پەیوەندیدارەكانی دیكە. ئێمە هیچ رێگایەكی دیكە بە سادەیی قبوڵ ناكەین.

پرسیار: بە بۆچوونی ئێوە، هێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان چەندە كاتیان هەیە بۆ وەرگرتنی ئەم بەرپرسیارەتییە لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و هاوپەیمانەكانی دیكە؟

سەرۆك كۆمار: ئێمە نازانین، بەڵام هەرچی زووتر بێ باشترە. هێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان واتا "كڵاوشینەكان" دەگوێزرینەوە بۆ باشووری عێراق و ئێمە هیوادارین و چاوەڕوانی ئەوە دەكەین كە ئەم رەوتە لە ماوەی چەند رۆژێكدا جێبەجێ ببێت. بەڵام ئەمجارە ئێمە تەنها دەست پێدەكەین و سەیر دەكەین بزانین چی لە دەستمان دێت ، لەوانەیە پێویست بە هێزی ئاشتیپارێزی نەتەوە یەكگرتووەكان لە ناوچە یا هێزە كڵاوشینەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان بكات كە ئەمەش پێویستی بە پەسەندكردنی بڕیارنامەیەكی نوێ هەیە لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكاندا ، ئەمەش كێشەیەكی ئاڵۆزە بە هۆی ئەو راستیە كە هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش كە

شێلگێرانه لەگەڵ ئێمه هاوپیمان بوون لەوانەیه ئێستا كێشەیان له گەڵ ئەم جۆره بڕیارنامانەدا هەبێت.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئێوه هیچ جۆره بەرپرسیارەتییەكتان نەگرته ئەستۆ، بەڵام بەرپرسیارێتی ئێوه زۆرتر دەبێت به هۆی ئەوەی كه داواتان له خەڵكی عێراق كرد كونترۆڵی هەمووشتێك بگرنه دەستی خۆیان بەڵام ئێوه قەد نەتانوت داوایەكی واتان له كوردەكان و شیعەكان كردووه. كەوابوو ئێوه چۆن له راستیدا درێژه دەدەن به پاساوهێنانەوه بۆ ئەم مەسەلەیه له بیری خۆتاندا لەكاتێدا كه ویژدانی جیهان.....

سەرۆك كۆمار: نه، فەرموون، پرسیارەكەتان تەواو بكەن؟

پرسیار: بەڵێ لەكاتێكدا كه ویژدانی جیهان لەم مەسەلەیه زیزه و ئێمه وێنەكانی ئەم ئێش و ئازاره ترسناكانه دەبینین. روونه كه ئێوه خافلگیر بوونه و سیاسەتێكی درێژخایەنتان نییه بۆ ئەو شتانەی كه ئێستا هێدی هێدی روو دەدات. ئایا ئەم خەڵكه دەبێ تا كۆتایی ژیانیان هەر ئاواره بن؟

سەرۆك كۆمار: هیوادارم وانەبێت. ئێمه بەقەد پێویست باسی ئەوەمان كردووه كه نابێت ئەم خەڵكه ببن به ئاوارەی هەمیشەیی و هەوڵ دەدەین بۆ ئەم مەبەسته كارێك له ناوچه ئەنجام بدەین. ئامانجەكانی ئێمه زوو هاتنه دی ، ئامانجی ئێمه قەت ئەوه نەبوو كه بچینه بەغداد یا خودی سەدام حوسەین یا دەسەڵاتەكەی له ناو بەرین. گەلێ كەس سەرەتا بەمنیان دەگوت با گەمارۆكان كار بكەن و دژی دەستدرێژییەكەی سەدام خۆتان قەت هیچ مەكەن. ئێمه هاوپەیمانیەكی نێونەتەوەیی بێ وێنەمان له كاتێكی مێژووییدا رێبەرایەتی كرد و گەیشتینه ئامانجەكانمان.

ئێوه له من پرسیار دەكەن ئایا من پێشبینی ئەوەم دەكرد كه كێشەی ئاواره كوردەكان ئەوەنده گەوره ببێت؟ نا من پێشبینی ئەوەم نەدەكرد بەڵام ئەگەر پرسیارەكەتان ئەوەیه كه ئایا پێموایه وڵاتەیەكگرتوەكانی ئەمریكا گوناهباره له بەر ئەوەی پێشنیاری ئەوەی به خەڵكی عێراق كردووه كه كونترۆڵی شتەكان بگرنه دەست و(وەها كه هەندێ كەس دەڵێن) وڵاته یەكگرتوەكانی ئەمریكا

دەبێ لەوێ بباپا بۆ پشتیوانی کردنی سەربازی لەم خەڵکە؟ وەڵامی من ئەوەیە کە نا گوناهبار نییە و شتی وا راست نییە، ئێمە قەد مەبەستێکی وامان نەبووە. بەڵام ئەگەر پرسیارەکەتان ئەوەیە کە ئێستا سەدام بە زۆر لە سەر دەسەڵات لابرێت، وەڵامەکەم ئەوەیە کە بە دڵنیاییەوە هەر وایە لە بەر ئەوەی کە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا( و پێموایە زۆربەی هێزە هاوپەیمانەکان) پەیوەندی ئاساییان نابێت لە گەڵ عێراق هەتا کاتێك کە سەدام لە سەر دەسەڵات بێت و ئێمە درێژە بە گەمارۆ ئابورییەکان دەدەین.

پرسیار: ئایا ئێوە ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە خەڵکتان بۆ راپەڕین دژی سەدام تەشویق کردووە و بوونەتە هۆکاری ئاوارە بوونیان؟

سەرۆك کۆمار: من ئەوە پشتڕاست ناکەمەوە کە بوومەتە هۆی ئاوارە بوونی خەڵك. من پێشنیاری ئەوەم کرد(ئەم پێشنیارە تۆمار کراوە) و وتم باشتر دەبێت ئەگەر خەڵکی عێراق کونترۆڵی شتەکان بگرنە دەستی خۆیان و سەدام لە سەر دەسەڵات لاببەن. من ئێستاش هەر ئەو هەستەم هەیە و هێشتاش هیوادارم کە خەڵك ئەوە بکەن.

پرسیار: ئێستا سەدان هەزار ئاوارە هەن کە بۆ یارمەتیدانیان پێویست بە ژمارەیەکی زۆر هێز هەیە. چۆن گەلێ لە هێزە هاوپەیمانەکان و هێزەکانی ولاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا دەچنە ناو باکووری عێراق؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە ژمارەی ئەو کەسانە کەمتر بێت لە بەر ئەوەی سەدام بە گوێرەی ئەو دڵنیاکردنەوانەی کە ئەمڕۆ داویەتی بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق( نەتەوە یەکگرتووەکان کۆمەڵێك نوێنەری هەیە لە عێراق ) کەڵك لە هێزی سەربازی وەرناگرێت. بەڵام کێشەکە ئەوە نییە کە ئێمە چۆن بیر لەم مەسەلەیە دەکەینەوە، بەڵکو ئەوەیە کە ئەم ئاوارە کوردانە کە بوونەتە قوربانی شێوازی بیرکردنەوەی درندانەی سەدام چۆن بیر دەکەنەوە. ئەم ئاوارانە وا بیردەکەنەوە کە ئێمە ئامانەوێت ئەم قسانەی سەدام بە هەند وەربگرین. ئێمە دڵنیایی ئاسایشمان لە سەدام دەوێت بۆ ئەم ئاوارانە.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئایا ئێوە لە راستیدا بە شێوازی فەرمی عێراقتان ئاگادار كردووەتەوە كە دەتانەوێت كەمپ دروست بكەن بۆ ئەم ئاوارانە؟

سەرۆك كۆمار: نەخەیر

پرسیار: مەبەستم ئەوەیە كە ئایا ئەمە یەكەم جارە كە عێراق لە رێگای ئەم كونفرانسەدا ئاگاداری ئەم مەسەلەیە دەبێت؟

سەرۆك كۆمار: پێموایە كاربەدەستانی عێراق لە گەڵ كاربەدەستانی نەتەوە یەكگرتووەكان دەربارەی ئەم كەمپانە گفتوگۆ دەكەن. بەڵام ئەمە یەكەم جارە كە ئاگاداری ئەوە دەبن كە نەتەوە یەكگرتووەكان دەیەوێت چ بكات.

پرسیار: ئایا ئێوە دڵنیان كە دەوڵەتی عێراق وەڵامی سەربازی ناداتەوە؟

سەرۆك كۆمار: نابێت بە شێوازی سەربازی وەڵام بداتەوە. عێراق جاری پێشوو، ولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكای دەستی كەم گرتبوو بەڵام نابێت جارێكی دیكە وابكات و پێشموانییە شتێكی وا بكات . كاربەدەستانی نەتەوە یەكگرتووەكان كە گفتگو لە گەڵ دەوڵەتی عێراق لە بەغداد دەكەن پێیان وانییە عێراق وەڵامی سەربازی بداتەوە. لەو كاتەوە كە ئێمە بە دەوڵەتی عێراقمان وتووە نابێت لە باكووری هێلی ٣٦ چالاكی بكات، ئەوانیش هیچ چالاكیەكی سەربازیان نەكردووە.

پرسیار: ئێوە پێشتر وتتان كە بیرۆكەی دامەزرانی هەرێمێكی پارێزراو لە ناوخۆی عێراقتان پێ باش نییە. بەڵام لە كردەوەدا ئایا چەند مانگە نییە كە ئەم هەرێمە دەپارێزرێت و ئایا پێشبینی ئەوە ناكرێت كە لە داهاتوودا وڵاتەیەكگرتوەكانی ئەمریكا بە شێوازی سەربازی ئاوارە كوردەكان لەو ناوچەیە بپارێزێت ؟ و ئایا وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا چی دەكات ئەگەر دەوڵەتی عێراق هەوڵ بدات هێرش بكاتە سەر ئاوارە كوردەكان؟

سەرۆك کۆمار: هیوادارم باس لە هەوڵێکی درێژخایەن نەکەین. ئێمە کار دەکەین لە گەڵ فەرانسا کە دەوری ڕێبەری بینیوە لە سیاسەتی تەشویق کردنی کوردەکان بۆ گەڕانەوە بۆ شارەکانیان. باس لەوە دەکرێت کە هەوڵ بدرێت نەتەوە یەکگرتووەکان لە کاتی گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان لە گەڵ ئاوارەکاندا بێت. ئەمە بیرۆکەیەکی زۆر سودمەندە و بە بەڕێز میتران، سەرۆك کۆماری فەرانسا-م وتووە کە بە توندی پشتیوانی لەم هەڵویستەی دەکەم بەڵام پێموانیە ئەمە مەسەلەیەکی درێژخایەن بێت. مەسەلەی گرنگ، چ درێژخایەن و چ کورتخایەن، هەر لە سەرەتاوە ئەوە بووە کە ئێمە هەوڵمان داوە گیانی ئەو ژن و منداڵ و پیاوانە بپارێزین و ئێستا ئەمە هەنگاوێکی دیکەیە بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە بە شێوازێکی ڕێکوپێکتر و مەعقولتر و هێمنتر وەدی بێت. هەندێ کەس لەوانەیە وایدابنێن کە ئەمە دەستێوەردانە لە کاروباری نێوخۆیی عێراقدا بەڵام پێموایە نیگەرانی مرۆڤدوستانە و نیگەرانی بۆ ئاوارەکان ئەوەندە باڵادەستە کە کۆمەڵێك تێگەیشتن هەیە لەم پەیوەندییەدا.

پرسیار: ئایا سوپای ئەمریکا بە شێوازی سەربازی ئەم ناوچەیە دەپارێزێت و ئایا سوپای ئەمریکا چ دەکات ئەگەر دەوڵەتی عێراق هێرش بکاتە سەر ئاوارەکان؟

سەرۆك کۆمار: پێش دەستپێکردنی شەڕ گەلێ جار ئەم پرسیارە لە من دەکرا کە ئێوە دەتانەوێت چی بکەن و چۆن وەڵام دەدەنەوە؟ من وەردەکارییەکانی ئەم پرسیارانە ناخەمە ڕوو بەڵام تەنها ئەوە دەڵێم کە ئەم خەڵکە دەپارێزین. ئێمە نامانەوێت پێیان بڵێین :"لە شاخەکان بێنەخوارەوە ، دەتانپارێزین" و پاشان نەیانپارێزین.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، بە لەبەر چاوگرتنی بارودۆخی گەلێ لەم ئاوارانە، ئێوە چۆن دەتانەوێت ئەم ئاوارانە بێنە نێو ئەم کەمپە نوێیانە. کەی ئەم کارە ئەنجام دەدرێت و دەوری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا یا هێزەهاوپەیمانەکان چ دەبێت لەم پەیوەندییەدا؟

سەرۆك کۆمار: ئێمە دەمانەوێت شەمەندەفەرێك بەڕێ بخەین کە پێداویستیە نێونەتەوەییەکانی ئاوارەکانی تێدا بێت. تورکەکان ئاسانکاری دەکەن بۆ ئەم ڕەوتە. ناتوانم وەردەکارییەکانی ئەم

مەسەلەیە بخەمە ڕوو بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم کە ٥ یا ٦ کەمپ لەو ناوچەنە کە تۆزاڵ ناوی ناوە "ناوچە تەختەکان"، دادەمەزرێت. کاتی دامەزرانی ئەم کەمپانە دوور نابێت بەڵام ئەوەی کە ئێمە ئێستا دەمانەوێت بیکەین ئەوەیە کە ئەم کەمپانە لە ناوچە دروست بکەین و بەرپرسیارێتی خۆمان بە نیسبەت دڵنیابوون لە ئاسایشی ئەم ئاوارانە ئەنجام بدەین و پێموایە هەرواش دەبێت.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئێوە پێشبینی دەکەن کە چەندە سەرباز بکەوێتە نێو ئەم ڕەوتە و چەندە دڵنیان لە ئاسایشی ئەم سەربازانە؟

سەرۆك کۆمار: ژمارەیەکی کەم سەرباز دەکەونە نێو ئەم ڕەوتە و زۆر دڵنیام بە نیسبەت ئاسایشی ئەم سەربازانە. ئێمە دەتوانین نەتەنها هێزەکانمان بەڵکو دەتوانین ئاوارەکانیش بپارێزین.

پرسیار: ئێوە هەست بە دڵنیایی دەکەن بە نیسبەت ئاسایشی ئەم سەربازانە، ئایا ئەمە ناکۆك نییە لە گەڵ وتەکانی پێشووترتان دەربارەی ئەوەی کە گیانی یەك سەربازی ئەمریکایی ناخەنە نێو مەترسی بۆ ئەم مەبەستە؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە ئەمە شتێکی بەتەواوی جیاوازە و هەست دەکەم ئەمە ئەو شتەیە کە دەبێ بکرێت بۆ یارمەتیدانی ئەو خەڵکە. لەوانەیە هەندێ کەس ئەمە بە شێوازێکی دیکە شرۆڤە بکەن بەڵام من وا بۆی ناچم. م پێموایە ئەمە شتێکی تەنها مرۆڤدۆستانەیە و شەواهیدەکان هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ وا نیشان دەدات کە ئەم خەڵکە لە ئاسایشدا دەبەن و هیوادارم ك هەراوش بێ.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئێوە هیچ ئاماژەیەکتان نەکرد بە بارودۆخی باشووری عێراق کە تێیدا هەزاران شیعە بە هەمان ئەندازە نیگەرانن لەوەی کە دوابەدوای پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا، چ ڕوو دەدات. ئایا ئەمریکا هەمان دڵنیاییش دەدات بە شیعەکان کە سەدام هێرشیان نەکاتە سەر؟

سەرۆك کۆمار: نەتەوە یەکگرتووەکان بەم زووانە دەگاتە باشووری عێراق و بە بۆچوونی ئێمە، ئەمە دڵنیاییەکی باشە کە هێرشیان ناکرێتە سەر. خەڵك لە بیریان چووەتەوە کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ کارێکی سەیروسەمەرەی کردووە بۆ ئەم

ئاوارانە. مـن ئـەمبینیوە کـەس دەستخۆشـانە لـە سـەربازەکانمان بکـات کـە بـەم دڵسـۆزی و دڵنگەرانییە کاریان کردووە، سەربازانی ئێمە کارێکی بێ وێنەیان ئەنجام دا. کـەوابوو ئـەوەی کـە ئێمە دەمانەوێت ئەنجامی بدەین ئەوەیە کە هێزە کلاوشینەکانی نەتەوە یـەکگرتووەکان بێنـە نێـو ئەم ناوچە بێ لایەنە و پاش ئەوە ئێمە بە زووترین کات دەست بە کشانەوەی هێزەکانمان دەکەین لە ناوچە. من دەمەوێت سەربازەکانمان بگەڕێنمەوە بۆ وڵات.

پرسیار: بەڵام ئەگەر هێزەکـانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان ژمارەیـان بـە قـەد پێویـست نـەبوو بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشەکانی خـەڵکی عێـراق، ئایـا هێزەهاوپەیمانـەکان بەرپرسـیار دەبـن بـۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئەو خەڵکە؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە ژمارەی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان تەواو بێت. ئێمە بەگوێرەی ئەوە چالاکی دەکەین کە ئەگەر هێزەکانی نەتەوە یـەکگرتووەکان لـەوێ بـن، دەوڵـەتی عێـراق هێـرش ناکاتە سەر خەڵك. بۆ سەدام حوسەین دەبێ بە کێشەیەکی جیدی ئەگەر بەرپرسیارەتییەکانی خۆی بە نیسبەت نەتەوە یەکگرتووەکان جێبەجێ نەکات کە لە رێککەوتننامەی ئاگربەستدا هاتووە.

پرسیار: جەنابی سەرۆك، هاوسەری ئێوە دوێنێ پێشنیاری ئـەوەی کـرد کـە سـەدام حوسـەین بـە تاوانی جەنگ دادگایی بکرێت و لە سێدارە بدرێت. ئایا ئێوە هاوڕان لە گەڵ ئەمەدا؟

سەرۆك کۆمار: بیروڕای من زۆر بە دەگمەن جیـاواز دەبـێ لـە گـەڵ بـیروڕای هاوسـەرەکەم و بـە نیسبەت ئەم مەسەلەیەش هەروایە. بە هەر حاڵ گرنگترین مەسەلە، لە سـەر دەسـەڵات لابردنـی سەدام حوسەینە. کەوابوو هیچ کێشەیەك لەوەدا نییە کە سەدام لە سەر دەسـەڵات لاببرێـت بـەڵام بتوانێت تا کۆتایی تەمەنی لە وڵاتێکی سێیەم بە هەموو پێداویستیەکانیەوە ژیانێکی باش بکات بەو مەرجە کە نەگەڕێتەوە بۆ عێراق و دیـسان خەڵکەکـەی نەچەوسـێنێتەوە. ئێمـە دەمانـەوێت سەدام لە عێراق بچێتە دەرەوە و پێموایە ئەمە شتێکی پێویست بێ بۆ ئارامبوونەوەی عێراق کـە لەم بارودۆخەدا دەبێ ئێمـە ئـەنجامی بـدەین. بـەڵام بـە نیـسبەت تاوانـەکانی شـەڕەوە، ئەگـەر پرسیارەکەتان ئەوەیە کە ئایا من پێموایە سەدام تاوانباری جەنگە، دەبێ بڵـێم سـەدام کۆمـەڵێك

تاوانی کردووە کە بە گوێرەی ئەوانە دەکرێ بە تـاوانی جـەنگ دادگـایی بکرێـت وەك زاڵ کردنـی کەشوهەوای ترس و تۆقان، دەستدرێژی و تاڵان کردنی کویت. سەدام چی کـردووە بـۆ خەڵکەکـەی خۆی؟

پرسیار: "نیکسۆن"، سەرۆك کۆماری پێشووتری ئـەمریکا، ماوەیـەك پـێش ئێـستا پێـشنیاری ئەوەی کردووە کە ئێوە رێککەوتنامەی ئاگربەست هەڵبوەشێننەوە و سەدام بکوژن. چی دەڵێن لەم پەیوەندییەدا؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە ئەمە شتێکی قبوڵ نەکراوە. دڵنیا نیم ئەمە ئەو شـتە بێـت کـە سـەرۆك "نیکسۆن" وتوویەتی.

## بارودۆخی عێراق

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئەگەر بۆ لە سەر دەسەڵات لابردنی سـەدام، پێویـست بـەوە بکـات کـە هێزێکی زۆرتری ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بگەڕێتەوە بۆ عێراق، ئێوە چۆن دڵنیا دەبەن لەوەی کە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ناکەوێتە ناو ئـەو بارودۆخـە ناوخۆییـەی عێـراق و ئـەو شـەڕە ناوخۆییە کە ئێوە ناتانەوێت بکەونە نێوی.

سەرۆك کۆمار: ئەمە شتێکی ئەرێنییە لە بیری منـدا. من وای بۆ دەچم و پێموایە ئەمە بۆچـوونی بەکۆمەڵی خەڵك بێت کە سەدام خۆی ناخاتە ناو مەترسییەکی وا. سەدام حوسەین نایەوێت دیسان تووشی کێشەیەکی وەها ببێتەوە، کەوابوو ئێمە ناچارین جارێ سەیر بکـەین بـزانین چـی دەبێـت. بەڵام بە دڵنیاییەوە هەموو هێزەکانی ئەمریکا(باسی ژمارەیەکی زۆر یان کەم ناکـەم و بـە وردی نازانم ژمارەیان چەند دەبێت) دەپارێزرین و زۆر باشیش دەپـارێزرێن، بـەڵام مـن چـاوەڕوانی ئـەوە ناکەم و پێموانییە سەرۆك کۆماری فەرانساش چاوەڕوانی شتێکی وابکـات. پێـشموانییە سـەرۆك وەزیرانی بەریتانیا و سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرۆك کۆماری تورکیا چاوەڕوانی شتی وابکەن. هەڵسەنگاندنی بە کۆمەڵی خەڵك( کە زۆربەی جاران راستە) ئەوەیە کـە ئـەم شـتە

روو نادات. بەڵام ئێمە ئامادەین ئەگەر هێرش کرایە سەر ئەم خەڵکە بێ پاراستنە لە کەمپەکاندا، هێزی سەربازی بەکار بهێنین.

پرسیار: جەنابی سەرۆك کۆمار، هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرێس کە دژی دەستپێکردنی جەنگ دەنگیان داوە ئێستا دەڵێن ئێوە کارتان تەواو نەکردووە و لە راستیدا ڤیەتنامێکی دیکەتان دروست کردووە. کاردانەوەی ئێوە چییە لەم پەیوەندییەدا؟

سەرۆك کۆمار: من دەبێ ئاگاداری کاردانەوەی خۆم بم لە بەر ئەوەی نازانم مەبەستی ئێوە کام بەش لە ئەندامانی کۆنگرێس بوو، ئەوانەی کە دەیانەوێت گەمارۆکان بخرێتە کار دژی عێراق یان ئەوانەی کە نایانەوێت لە هیچ بارودۆخێکدا ئێمە کەڵك لە هێزی سەربازی وەرگرین دژی عێراق؟

پرسیار: هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرێس ـ بۆ نمونە سناتۆر" کنیدی" ــ دوێنێ لە راگەیاندننامەیەکی گشتیدا وتیان ئێوە بەقەد پێویست نەچوونەتە پێش بۆ تەواو کردنی کاری عێراق.

سەرۆك کۆمار: ئەمە بیروڕای سناتۆر "کنیدی"یە. پێموایە ئێمە گەیشتین بەو ئامانجانەی کە بەرنامەمان بۆ داڕشتبوو و تەواوی جیهانیش ئەمە دەزانێ. ئێستا ئێمە کێشەیەکی دیکەمان هەیە کە کێشە بە شوێنی خۆیدا دێنێت. سەدام پێشتر رەفتاری دڕندانەی بووە لە گەڵ خەڵکەکەی خۆی و ئێستاش دەیەوێت ئەم رەفتارە دووپات بکاتەوە.

دەمەوێت سەرنجی رەخنەگران بەرەو لای ئەوە رابکێشەم کە ئامانجی ئێمە چ بوو و بڕیارنامەکەنی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای چییان دەکرد، ئەو کاتە پێموابێ دەستخۆشی لە ئێمە دەکەن. پێم سەیرە هەندێ کەس کە زۆر دژی بەکارهێنانی هێزی سەربازی بوون دژی عێراق، ئێستا دەنگی خۆیان بۆ من بەرز دەکەنەوە و لە دهۆڵ و زۆرنا لێدەدەن کە دەبێ کەڵك لە هێزی سەربازی وەربگیردرێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان لە بەغداد و ئەمە ئەوە نییە کە ئێمە دەمانەوێت بیکەین و ئەگەر کەسێك بیەوێت شتێکی وا بکرێت بەدڵنیاییەوە بە دوورە لە هەڵوێستی دیپلۆماتیك و بە دڵنیاییەوە من نامەوێت ئەم کارە بکەم لە کاتێکدا کە گەلێ لەم خەڵکە

پێویستیان بە یارمەتی هەیە. پێموانییە ئەمە پێویست بێت، پێموانییە ئێمە ناچار بین شتێکی وابکەین. پێموایە خەڵکی ئەمریکا دەیانەوێت کوڕ و کچەکانیان بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و خودی کوڕ و کچەکانیش ئەمەیان دەوێت.

ئێستا تەنها کێشەیەکی بچووك کە هەیە لە سەر ڕێگای گەڕانەوەی هێزەکانمان بۆ وڵات ئەوەیە کە ئێمە بەرپرسیارین لە بەرامبەر ئەوەی هەرچی لەدەستمان دێت بیکەین بۆ یارمەتیدانی ئەم ئاوارانە. ئێمە لە ڕۆژی یەکەمەوە یارمەتی ئەم ئاوارانەمان داوە و ئێستا کە کێشەکە خراپتر بووە و ترس کەوتووە ناو دڵی ئەم خەڵکە بۆ گەڕانەوە لە شاخەکان بۆ نێو شارەکان، ئێمە هەنگاوی دواتر هەڵدەگرین. بەڵام سیاسەتی بنەڕەتی ئێمە ئەوەیە کە کوڕ و کچەکانمان بگەڕێنینەوە بۆ ماڵ و لە ڕاستیدا ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە دەکەین لە باشووری عێراقدا.

"گیری جیرالد سەیب[٦] " لە ڕۆژنامەی" والّستریت جۆرناڵ[٧]" پرسیارێکی باشی کرد کە چە گارانتیەك هەیە لەم پەیوەندییەدا؟ گارانتەیەکە خودی ڕێککەوتننامەکەیە کە عێراق ڕەزایەتی لە سەر داوە و لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە جێبەجێ کراوە و بوونی هێزە کلاوشینە ئاشتیپارێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە ناوچەدا.

پرسیار: ئەگەر بە شێوازێکی بێ لایەن سەیر بکەین، مەبەستی سناتۆر کنیدی ئەوە بوو کە دەوڵەتی عێراق دژی ڕاپەڕیوان کەڵکی لە کۆپتەرە تۆپدارەکان وەرگرتووە پاش ئەوەی کە خەڵك لە لایەن ئێوەوە تەشویق کراوە بۆ ڕاپەڕین دژی سەدام؟

سەرۆك کۆمار: باشە سناتۆر "کنێدی" دەیەوێت ئێمە چی بکەین؟ بەدواداچوونەوەی ئەوەم نەکردووە کە بەڕێز کنیدی چی وتووە لەم پەیوەندییەدا.

---

Gerry Gerald Seib [٦]
Wall Street Journal [٧]

پرسیار: رەخنەکەی بەڕێز "کنیدی" ئەوەیە کە ئێوە نەچوونەتە پێش و ئەو کۆپتەرانەتان نەخستووەتە خوارەوە کە هێرشیان کردووەتە سەر خەڵکی عێراق.

سەرۆك کۆمار: دەزانم خەڵك وابیردەکەنەوە. دەرك بە رەخنەکانیان دەکەم. پاش ئەوە ئێوە چی دەکەن لە گەڵ ئەو تانك و هێزە چەکدارانە و بەشەکانی دیکەی سوپای عێراق کە لە باکووری عێراقدا ماونەتەوە؟ کۆپتەرەکان تەنها بەشێك لەم هێزانەن. لەوانەیە ئێوە بڵێن ئەگەر ئێمە کۆپتەرەکانمان بخستابایا خوارەوە لەوانەیە سناتۆر کنیدی تیدی رەخنەی نەگرتبایا. پێموانییە ئەمە راست بێت، بەڵام من سەرزەنشتی سناتۆر کنیدی ناکەم ئەگەر هەڵویستێکی وای هەبووبێ.

**پرسیار: جەنابی سەرۆك، کوردەکان دەڵێن کوردستانێکی سەربەخۆیان دەوێت. پاش جەنگی دووەمی جیهانی، بەڵێنی کوردستانی سەربەخۆ درا بە کوردەکان، بۆ دەبێ کوردەکان ئەم کوردستانە سەربەخۆیانە نەبێ؟**

**سەرۆك کۆمار:** پێشتر وتم کە ئامانجی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەوە نەبوو کە عێراق پارچە پارچە و ناسەقامگیر بێت. ئەمە هەڵویستی دەوڵەتی ئێمە و هەڵویستی هێزە هاوپەیمانەکانمانە.

**پرسیار: ببورن، مەبەستی من جەنگی جەهانی یەکەم بوو نە جەنگی جەهانی دووەم کە بەڵێنی کوردستانی سەربەخۆ درا بە کوردەکان. ئایا ئەم مەسەلەیە قورسایی ناکات بەسەر شانی ئێوەدا؟**

**سەرۆك کۆمار:** بەڵێنێك لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە؟

**پرسیار: بەلێ**

**سەرۆك کۆمار: نا، دەڵێم نا. بە بۆچوونی من عێراق دەبێ لە ئاشتیدا بژیت لە رێگای ئاشتبوونەوە لە گەڵ گروپە جۆراوجۆرەکانی نێو عێراق. لە باشووری عێراق شیعەکانن، لە ناوەراستی عێراق، سوننەکان و بەعسیەکانن و کەسانی دیکەن و کوردەکان لە باکووری عێراقن. ئەم گروپانە دەبێ ناکۆکیەکانیان بنێنە لاوە و ولاتەکەیان لە گەڵ نەریتە پڕ لە شانازییەکانیدا رابگرن بۆئەوەی ولاتەکەیان هەر وەك خۆی بمێنێتەوە. ئێمە هەوڵ نادەین پێشنیاری دابەش بوونی**

عێراق بدەین، ئەگەر مەبەست لە پرسیارەکەتان دابەشبوونی عێراقە. من هەر لە سەرەتاوە ئەم مەسەلەیەم روون کردەوە.

پرسیار: بەڵام ئایا ئەم ئاوارانە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان هەتا کاتێك کە سەدام حوسەین لە سەر دەسەڵات بێت؟

سەرۆك کۆمار: بەلێ هیوادارم بتوانن. ئەمە پرسیارێکی باشە. ئەوان لەوە دەترسن ئەگەر لە شاخەکان بێنە خوارەوە لەگەڵ مەرگ روبەڕوو دەبنەوە. زۆر باشە با خۆیان ئەمە هەڵبسەنگێنن. من پێموایە ئێمە دەبێ کۆمەڵێك بنکە دابنێین بۆ پاراستنی ئاوارەکان تا بتوانن بگەڕێنەوە. من زۆر خۆشبینم بە نیسبەت ئەوەی کە بەرنامەکەی بەرێز" فرانسوا میتران" سەمەری هەبێت.

ئێستا سەدام حوسەین بە ئاوارەکان دەڵێت بگەڕێنەوە، بەڵام ئەوان باوەڕیان بە سەدام نییە. ئەم خەڵکە ئێش و ئازاری سەدامیان چەشتووە. کەوابوو هیوادارم کە رۆژێك لە رۆژان بتوانن بگەڕێنەوە. ژمارەیەکی زۆر لەم ئاوارانە بەهاووڵاتی عێراق دانانرێن. دوێنێ لە دەنگوباسەکاندا بیستم کە پارێزەر و پزیشکە عێراقیەکان لە ژیانی ئازادەیەك خۆشی خۆیان هەڵهاتوون. کەوابوو هیوادارم ئەم خەڵکە لە گەڵ یەکدی ئاشت ببنەوە و ئاسانترین رێگا بۆ عێراق ئەوەیە کە رێبەرێکی دیکەی هەبێت، هیچ گۆمان لەمەدا نییە.

پرسیار: جەنابی سەرۆك کۆمار ئایا هیچ وتووێژێکی پشتی پەردە هەیە دەربارەی داهاتووی سەدام حوسەین. ئایا هیچ کەس بووە بە ناوبژیوانی ئەم مەسەلەیە؟

سەرۆك کۆمار: نا تا ئەو جێگایە کە من ئاگادارم نا.

پرسیار: ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کە سەدام لە داهاتوویەکی نزیك لە سەر دەسەڵات لابچێت؟

سەرۆك کۆمار: پێموایە وابێ، بەڵام ناتوانم بەدڵنیاییەوە پشتڕاستی بکەمەوە.

پرسیار: ئایا تا ئێستا هیچ کەس نەهاتووە باسی ناوبژیوانی بکات لەم مەسەلەیەدا؟

سەرۆك کۆمار: گەلێ کەس و گروپی بەرخۆدانی هەن کە دەیانەوێت سەدام لە سەر دەسەڵات نەمێنێت. ئەمانە تا ئێستا هیچیان بە من نەگووتووە بەڵام هیچ گومان لەوە دا نییە کە گەلێ لە

خەڵکی عێراق دەیانەوێت سەدام لە سەر دەسەڵات نەمێنێت. هیچ گومان لەمەدا نییە. بەڵام ئەگەر پرسیارەکەتان ئەوەیە کە ئەوان هاتوونەتە کوشکی سپی یا پێشنیارێکی وەهایان داوە، باوەڕ ناکەم.

## پەیوەندییەکانی ئێران و ئەمریکا

پرسیار: جەنابی سەرۆك کۆمار، ئێوە ئاماژەتان بە بارودۆخی ئێران کرد کە بە هەمان ئەندازە دژوارە. بەڵام وادیارە پلانەکەی ئێوە تەنها پەیوەندی بە بارودۆخی عێراقەوە هەیە و لەوانەیە بۆ یارمەتیدانی دۆستەکەتان، "ئۆزاڵ" سەرۆك کۆماری تورکیا بێت. بۆ لێرە هیچ باسێك لە ئاوارەکانی نێو ئێران نەکرا کە تەنانەت ژمارەیان لە ئاوارەکانی نێو تورکیا زۆرترە؟

سەرۆك کۆمار: ئێمە پێشنیاری یارمەتیمان داوە بە ئێران. هەروا کە دەزانن، پەیوەندییەکانی ئێمە لە گەڵ دەوڵەتی ئێران جیاوازە و دژوارە. دەوڵەتی ئاڵمانیا چەند سەد میلیون مارکی وەك یارمەتی داوە بە ئاوارەکانی نێو ئێران.

پرسیار: ٢٥٠ میلیون مارکی ئاڵمانیا؟

سەرۆك کۆمار: بەڵێ ٢٥٠ میلیون مارکی ئاڵمانیا دراوە بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکانی نێو ئێران ، کۆمەڵگای ئەورووپا لە ڕێگای هاوپەیمانەکانەوە یارمەتی ئاوارەکانی نێو ئێران دەدات. هەندێ ڕێکخراوی خێرخوازی نێونەتەوەیی ـ ئەمریکایی لە گەڵ دەواودەرمان چوونەتە ناو ئێران. بەڵام ئێوە دەبێ واقعبین بن، مەبەستم ئەوەیە کە دەوڵەتی ئێران هێشتا پەیوەندی ئاسایی نییە لە گەڵ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. ئێران ئەم مەسەلەیەی روون کردووەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە سەردانی ئێرانیان کردووە. بەڵام وڵاتانی دیکە هەنگاویان هەڵگرتووە و یارمەتی ئاوارەکانیان کردووە لە ئێران، هەروەها کە ئێمە یارمەتی شیعەکانی باشووری عێراق دەدەین و ٣٠ هەزار ئاوارەمان بە دڵسوزی و دڵفراوانییەوە پاراستووە. وڵاتانی دیکە یارمەتی ئاوارەکانی نێو ئێرانیان داوە.

پرسیار: ئایا ئەمە دەبێت بە هەلێك بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانتان لە گەڵ ئێران باش بکەن؟

سەرۆك کۆمار: هیوادارم وا بێت. چەند جار وتوومە و دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە پێمباشە پەیوەندییەکانمان لە گەڵ ئێران باش بکەین. ئێران دەزانێ کە نیگەرانی سەرەکی ئێمە چییە و ئەویش مەسەلەی بە بارمەتە گیراوەکانە. من نامەوێت ئەو ئەمریکاییانە لە بیر بکەم کە بە بارمەتە گیراون و نامەوێت ئەوەش بڵێم کە ئێران ئەو ئەمریکاییانەی راگرتووە، بەڵکو ئەوە دەڵێم کە ئێران دەتوانێ بە دەستڕۆیشتوویی و کاریگەریی خۆی ئازادیان بکات. بەڵام هیوادارم پەیوەندییەکانمان لە گەڵ ئێران باشتر بێت و لەوانەیە لە رێگای بارودۆخی خراپی ئەم ئاوارانە ئێمە بتوانین پێکەوە کار بکەین. ئێمە لە رێگای جۆراوجۆرەوە یارمەتی ئاوارەکان دەدەین. ئێرانیش یارمەتیان دەدات و بەم شێوەیە دەتوانین بنەمایەکی هاوبەشمان هەبێت. لەوانەیە ئەم بارودۆخە ببێتە هۆی باشتر بوونی پەیوەندییەکانمان لە گەڵ ئێران.

بەنیسبەت ئێرانەوە، دەوڵەتی ئێران هەر لە رۆژی یەکەمەوە زۆر زۆر نیگەران بووە لە بوونی هێزی سەربازی ئەمریکا لە کەنداو . هەر لە رۆژی یەکەمەوە کێشەی سەرەکی ئێران ئەوە بووە کە پێی وایە ئێمە قەد لە کەنداوی فارس ناچینە دەرەوە، لە کاتێکدا کە ئەم هێزە سەربازییە دژی دوژمنی سەرەکی ئێران بە کار دەبردرێت واتا سەدام حوسەین، هیوادارم ئێران ئەوە لە بەر چاو بگرێت کە چەند سەدهەزار کەس لە هێزەکانی ئێمە گەڕاونەتەوە بۆ وڵات و ئەم رەوتە بە خێراترین شێوە بەردەوام دەبێت، کەوابوو هیوادارم ئەم ترسە کە ئێرانی لە ئەمریکا جودا کردووەتەوە(ئەمە یەکێ لە هۆکارەکانی جیاکەرەوەی ئێران لە ئەمریکایە) کەم ببێتەوە و پێموایە هەرواش دەبێت.

## کردەوە سەربازییەکانی ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە باکووری عێراق پاش شەڕی کەنداو

### ڕاپۆرتی سەرۆك بوش بۆ کۆنگرێس دەربارەی بارودۆخی کەنداوی فارس

### ١٧ ی مایسی ١٩٩١

جەنابی سەرۆکی کۆنگرێس

لە ١٩ ی ئاداری ١٩٩١ من ڕاپورتم نارد بۆ ئێوە لەبارەی ڕێگەپێدان بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ ـ١٠٢) لە پەیوەندی لە گەڵ ئەنجامدانی سەرکەوتووانەی شالاّوی سەربازی بە ئامانجی ئازاد کردنی کوێت. لەو کاتەوە، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارنامەی ٦٨٧ ی دەربارەی پێشمەرجەکانی ئاگربەستێکی فەرمی پەسەند کردووە. عێراق ئەم شەرت و مەرجانەی قبوڵ کردووە و ئاگربەست کراوە و هێزە هاوپەیمانەکان لە باکووری عێراق پاشەکشەیان کردووە.

بە هەر حاڵ سەرکووتی خەڵکی کورد بە دەستی دەوڵەتی عێراق پێویستی بەوە کرد کە ژمارەیەکی سنووردار لە هێزەکانی ئەمریکا بە مەبەستی یارمەتی فریاگوزاری بچنە باکووری عێراق.

من ئەم شتانە بە ئێوە ڕاپورت دەدەم وەك بەشێك لە هەوڵە بەردەوامەکانمان بۆ ئەوەی کۆنگرێس بەتەواوی ئاگاداری ئەم بەرەپێشچوونانە بێت. بڕیارنامەی ٦٨٧ وەك پێشمەرجێك بۆ ئاگربەستێکی فەرمی پێویستی بەوە دەکرد کە عێراق بە شێوازی فەرمی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئاگادار بکردبایا کە شەرت و مەرجەکانی ئەم بڕیارنامەیەی قبوڵ کردووە. ئەم شەرت و مەرجانە بریتی بوون لە:

١ـ ڕێزگرتن لە سنووری نێونەتەوەیی بەو شێوازە کە عێراق و کویت لە ساڵی ١٩٦٣ لە سەری ڕێککەوتوون و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان گارانتی کردووە.

٢ـ دروست کردنی ناوچەیەکی مەدەنی غەیرە سەربازی لە پاڵ سنووری عێراق و کوێت و چالاکی یەکینەکانی چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان لەو ناوچەیە.

٣ـ لەناوبردنی هەموو جۆرە چەکی کیمیایی و بیولۆژیکی و موشەکی بالیستیك کە مەودای هاویشتنەکەی لە ١٥٠ کیلومەتر زیاترە و ئەو کەرەستە ناوکیانە کە لەگەڵ ئەم چەکانە بەکار دەبردێت لە گەڵ کەرەستە پەیوەندیدارەکانی و چاودێری و پشکنینی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بۆ پشتڕاست کردنی جێبەجێ بوونی ئەم شەرتومەرجە.

٤ـ دروستکردنی سندوقێك بۆ ڕاگرتنی پارەی داهاتی نەوتی عێراق لە داهاتوودا بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرە و زیانانەی کە کەوتووە لە کوێت بە هۆی داگیر کرانی کوێت.

٥ـ بەردەوامبوونی قەدەغەبوونی ناردنی هەموو جۆرە کەلوپەلێکی سەربازی و چەك بۆ عێراق.

٦ـ لابردنی قۆناخ بە قۆناخی هەندێ لە گەمارۆ تایبەتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دژی عێراق، ئەگەر عێراق بەرپرسیارەتییەکانی خۆی بەگوێرەی بڕیارنامەکە جێبەجێ بکات.

٧ـ دەستکێشانی عێراق لە پشتیوانی کردن لە تروریزمی نێونەتەوەیی.

عێراق بە شێوازی فەرمی ئەم شەرت ومەرجانەی لە ٨ ی ئاڤریل قبوڵ کردووە و ئاگربەستی فەرمی کەوتووتوە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە. کەوابوو هێزە چەکدارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە باشووری عێراق تەیار کرابوون دەستیان کردووە بە کشانەوە لەو ناوچەیە و هێزە ئاشتیپارێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو ناوچەیە تەیار کراون و ئەم کشانەوەیە لە ٩ ی مایس تەواو بووە. وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا یارمەتی سکرەتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانی داوە لە هەوڵەکانیدا بۆ جێبەجێ بوونی شەرت ومەرجەکانی بڕیارنامەی ٦٨٧ بە تایبەت ئەو شەرت ومەرجانە کە پەیوەندی هەیە بە قەرەبوو کردنەوەی کوێت و دیاری کردنی سنووری عێراق و کویت و لە ناوبردنی چەکە کۆمەڵکوژەکان.

بەهەرحاڵ لەماوەی هەمان قۆناخی کاتیدا هێزەکانی عێراق دەستیان کردووە بە سەرکوتی درندانەی راپەڕینی ناوخۆیی کە لە ئاکامدا سەدان هەزار خەڵکی سڤیل ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتووە و ئاوارەی ناوچە سنوورەیەکانی عێراق و تورکیا بوونە. لە وەڵامی ئەم بارودۆخەدا، لە ٥ ی نیسان، ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیارنامەی ٦٨٨ ی پەسەند کرد و پێی لە سەر ئەوە داگرت کە عێراق سەرکوتەکانی رابوەستێنێت و دەستبەجێ رێگە بدات بە چالاکی رێکخراوە مرۆڤدوستە نێونەتەوەییەکان و داوای لە سەرجەم دەوڵەتانی ئەندام کردووە کە یارمەتی بدەن لەم هەوڵە فریاگوزارییە مرۆڤدوستانەیە. من دەستبەجێ فەرمانم داوە بە هێزە چەکدارەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە بڕێکی زۆر خۆراك و پێداویستیەکانی دیکە لە رێگای فڕۆکە بخەنە خوارەوە بۆ ئەم ئاوارانە.

بەهەرحاڵ بەم زووانە روون دەبێتەوە کە ئەم هەوڵە بەرفراوانە بەس نییە بۆ وەڵامدانەوە بە بارودۆخی خراپی سەدان هەزار پیاو، ژن و منداڵی لێقەوماو کە لەم ناوچە شاخاوییانەدا ئێش و ئازار دەکێشن. کەوابوو لە ١٦ ی نیسان فەرمانم دا بە هێزە چەکدارەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە دەستبەجێ دەست بکەن بە دروست کردنی چەند کەمپی کاتی لە باکووری عێراق بۆ ئاوارەکان لەو شوێنانەی کە هەڵکەوتی جوگرافیایی گونجاوترە بۆ گەیاندنی یارمەتی فریاگوزاری. هێزەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و فرانسا ئاسایشی ئەم کەمپانە دابین دەکەن.

ئەم هەوڵە رێگاچارەیەکی هەمیشەیی نییە بۆ بارودۆخی خراپی کوردەکانی عێراق بەڵکو هەوڵێکی مرۆڤدۆستانەیە بۆ رزگار کردنی گیانی ئاوارەکان بەگوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان . هەروەها ئەمە هەوڵێك نییە بۆ دەستێوەردانی سەربازی لە کاروباری ناوخۆیی عێراق یان زیان گەیاندن بە یەکپارچەی خاکی عێراق. ئێمە دەمانەوێت بە زووترین کات، ئیدارە و ئاسایشی ئەم کەمپە کاتیانە تەسلیم بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەین(ئەم پڕۆسەیە دەستی پێکردووە) و بەتەواوی لە عێراق پاشەکشە بکەین.

## کورد و کوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

ئامانجی درێژخایەنی ئێمە هەر ئەو ئامانجەیە واتا گەڕانەوەی کوردەکانی عێراق و لەراستیدا سەرجەم ئاوارەکان و دەربەدەربووانی عێراق بۆ سەر ماڵی خۆیان بۆ ئەوەی بە ئاشتی و بە دوور لە سەرکوت و زەبروزەنگ بژین.

سپاسی پشتیوانی کۆنگرێس دەکەم و چاوم لە هاوکاری بەردەوامی کۆنگرێسە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە فریاگوزارییە مرۆڤدۆستانانە.

لەگەڵ رێزمدا

جۆرج بوش

## تەرخان کردنی پارە بۆ فریاگوزاری مرۆڤدۆستانە لە عێراق

### لێدوانی سەرۆك بوش دەربارە یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە ئاوارە و دەربەدەربووانی عێراق

### ١٣ ی حوزەیرانی ١٩٩١

ئەمڕۆ من گەلاڵەی یاسای ٢٢٥١ ی ئەنجوومەنی نوێنەرانم واژۆ کرد بۆ دابینکردنی پێداویستی و گەیاندنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە ئاوارەکان و خەڵکی دەربەدەر لە ناوخۆ و دەوروبەری عێراق و چالاکییە ئاشتیپارێزانەکان.
خۆشحاڵم بە هاوکاری بەدەر لە حیزبی و کاری خێرای کۆنگرێس بۆ پەسەند کردنی ئەم گەلاڵە یاسایە. ئەم یاسایە دەسەڵات بە وەزارەتی دەرەوە و "ئاژانسی پێشکەوتنە نێونەتەوەییەکان" دەدات کە درێژە بە هەوڵەکانیان بدەن بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان و دەربەدەربووانی ناوخۆ و دەوروبەری عێراق بۆ تازە کردنەوەی ئەو هەوڵانە کە لە "شالاوی دابینکردنی ئاسایش"دا دراوە.
ئەو پارەیە کە ئەم یاسایە تەرخانی کردووە، بۆ خەرجی زۆروولە زیاد بوونی "شالاوی گەردەلولی بیابان" و "شالاوی قەڵغانی بیابان" تەرخان کراوە.
لە ماوەی ٦٨ رۆژ لە سەرەتای "شالاوی دابینکردنی ئاسایش "ەوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە رێگای هێزی هەوایی و زەمینی پتر لە ١٧ هەزار تەن کەلوپەلی فریاگوزاری و یارمەتی پێداویستی پزیشکی و دەواو دەرمانی دابین کردووە بۆ هەزاران ئاوارە و دەربەدەربووی عێراق کە هەڵهاتوون بۆ ناوچەی سنووری تورکیا و عێراق. گیانی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەم خەڵکە رزگار کراوە و لە رێگای رێبەرایەتی ئەمریکا و هاوکاری باشی سوپا ٦٥٠ هەزار ئاوارە و دەربەدەربووی عێراق ناوچە نالەبارە شاخاوییەکانیان بەجێ هێشتووە و هاتوونەتە نێو ئەو

کەمپانەی کە ئێمە دروستمان کردوون. زۆربەی ئەم خەڵکە ئێستا دەگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان و دوایین کەمپ لە ناوچە شاخاوییەکان داخراوە.

ئەرکی وەڵامدانەوە بەم تراژیدییە مرۆڤییە کۆتایی پێ نەهاتووە بەڵام سپاسی ئەو ئەرکە دەکەین کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کێشاویەتی.

جۆرج بوش

کۆشکی سپی

١٣ ی حوزەیرانی ١٩٩١

## هەوڵەكان بۆ ملكەچكردنی عێراق بە جێبەجێ كردنی بڕیارنامەی نەتەوە یەكگرتووەكان

### راپۆرتی سەرۆك بوش بۆ كۆنگرێس دەربارەی بارودۆخی كەنداوی فارس

### ١٦ ی حوزەیرانی ١٩٩١

بەڕێز سەرۆكی كۆنگرێس

لە پەیوەندی لە گەڵ رێگەپێدان بە بەكارهێنانی هێزی سەربازی دژی بڕیارنامەی عێراق(یاسای گشتی ١ ـ ١٠٢) وەك بەشێك لە هەوڵە بەردەوامەكانم بۆ ئاگادار كردنەوەی تەواوی كۆنگرێس، جارێكی دیكە راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەكان بۆ ملكەچ كردنی عێراق بە جێبەجێ كردنی بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان.

هەروەها كە لە راپۆرتی ١٧ ی مایسی ١٩٩١ باسم كرد، جێبەجێ بوونی بڕیارنامەی ٦٨٧ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان ، پێشمەرجی ئاگربەستی فەرمییە، لە بەر ئەوەی كە عێراق قبوڵی كردووە هەمو جۆرێ چەكی كۆمەڵكوژ و بیولۆژیك و موشەكی ballistic كە مەودای هاویشتنەكەی لە ١٥٠ كیلومەتر زۆرترە و پێداویستیەكانی چەكی ناوكی لە ناو ببات و قبوڵی كردووە كە چاودێران و پشكنەرانی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی، جێبەجێ بوونی ئەم رێساو رێوشوێنانە پشتڕاست بكەنەوە. لە ١٧ ی حوزەیران، ئەنجوومەنی ئاسایش پلانێكی بۆ ئەم چاودێری كردنە و پشكنینە پەسەند كرد لە لایەن "ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ناوكی" و كومیسیونێكی تایبەت كە دروست دەكرێت بەگوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٧ .

بە پشتیوانی و تەشوێقی زۆری وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا، ئەم لێژنانە چالاكانە كاریان كردووە بۆ دۆزینەوە، پشكنین و هەوڵدان بۆ لە ناوبردنی ئەم چەكانە و كەرەستە پەیوەندیدارەكان. لە كاتێكدا كە پشكنینی هەندێ لە موشەك و چەكە كیمیاییە راگەیاندراوەكان كراوە، عێراق

بەگشتی خۆی لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی لادەدات. لەم هەفتانەی دواییدا، سەرنجی گشتی لەسەر کەرەستە و تەکنولوژیای ناوکی عێراق چڕ بووەتەوە بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی موشەکە ballistic و چەکە کیمیایە شاردراوەکانی عێراق و درێژەدان بە شاردنەوەی چالاکیەکانی بۆ پێشخستنی چەکە بیولوژیکەکان، ئەم مەسەلەیە وەڕاست دەگەڕێت. ئێمە ناهێڵین ئەم کردەوانەی عێراق سەرکەوتوو بێت و درێژە دەدەین بە پێداگری کردن لە سەر ئاشکراکردنی تەواو و لە ناوبردنی تەواوی هەموو کەرەستە و پێداویستیەکانی پەیوەندیدار بە چەکە کۆمەڵکوژەکان و سەپاندنی سیستمێکی چاودێری رێکوپێك و کارا بەسەر عێراقدا بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی کە عێراق لە درێژخایەندا بڕیارنامەی ٦٨٧ جێبەجێ دەکات.

لەمە زیاتر نەتەوە یەکگرتووەکان هەنگاوی بەرەو پێش هەڵگرتووە بۆ جێبەجێ بوونی شەرت و مەرجەکانی دیکەی بڕیارنامەی ٦٨٧ . ئەنجوومەنی ئاسایش، کومیسیونێکی قەرەبوو کردنەوەی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانی دروست کردووە بۆ بە دواداچوونەوە لەگەڵ ئەو سکاڵا و بانگەشانەی کە لەو زەرەر و زیانانە دەکرێت کە لە ئاکامی داگیرکرانی کوێت لە لایەن عێراق، لە کوێت کەوتووە و پارەی قەرەبووکردنەوەکەی لە داهاتی ناردنە دەرەوەی نەوتی عێراق کەم دەکرێتەوە. لێژنەی چاودێری عێراق ـ کوێت لەو ناوچە مەدەنییە جێگیر بووە کە ئەنجوومەنی ئاسایش لە پاڵ سنووری عێراق و کوێت دروستی کردووە و کومیسیونی دیاری کردنی سنووری عێراق و کوێت هەوڵێکی بەرچاوی دەست پێکردووە بۆ دیاریکردنی کۆتایی سنوری عێراق و کویت و بەم شێوەیە یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی هەڵگیرسانی شەڕ لە ناو دەبات. بەهەرحاڵ بە هۆی ملکەچنەبوونی سەدام حوسەین و سەرنەکەوتنی عێراق لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی بە گوێرەی بڕیارنامەکە، ئەنجوومەنی ئاسایش گەمارۆ ئابورییەکانی ئێستا لە سەر عێراق لانابات.

لە دوایین راپۆرتەکەمدا، باسی سەرکووتی کوردەکان و گروپەکانی دیکەی عێراقم کرد بە دەستی دەوڵەتی عێراق. بەهۆی ئەم سەرکوتە، هێزەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و هاوپەیانان چوونەتە نێو باکووری عێراق بۆ دابین کردنی حەسانەوە و ئاسایشی خەڵکی سیڤیل. هەروەها کە

پێشتر باسم کرد ئه‌م هه‌وڵه ڕێگاچاره‌یه‌کی هه‌میشه‌یی نییه بۆ کێشه‌که و ده‌ستێوردانی سه‌ربازی نییه له کاروباری ناوخۆیی عێراقدا، به‌ڵکو ڕێگایه‌کی مرۆڤدۆستانه‌یه بۆ رزگار کردنی گیانی خه‌ڵك. ئێستا به‌هۆی ره‌خساندنی بارودۆخێکی ئارام بۆ گه‌ڕانه‌وه‌ی ئاواره کورده‌کان له ناوچه سنورییه شاخاوییه‌کان، هێزه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان ئێستا له باکووری عێراق پاشه‌کشه ده‌که‌ن. به‌هه‌رحاڵ ئێمه ده‌وڵه‌تی عێراقمان ئاگادار کردووه‌ته‌وه که درێژه ده‌ده‌ین به چاودێری ورد به سه‌ر ره‌فتاری عێراق له‌گه‌ڵ هاووڵاتیانی خۆی و ئاماده‌ین هه‌نگاوی پێویست هه‌ڵبگرین ئه‌گه‌ر بارودۆخه‌که پێویست بکات. بۆ گه‌یشتن به‌م ئامانجه، هاوپه‌یمانان پلانی ئه‌وه‌یان دارشتووه که ژماره‌یه‌کی گونجاو هێزی سه‌ربازی له ناوچه بهێڵنه‌وه هه‌تا کاتێك که بارودۆخی عێراق پێویست بکات.

سپاسی پشتیوانی کۆنگرێس له‌م کرده‌وانه ده‌که‌م و چاوه‌ڕوانی هاوکاری به‌رده‌وامی کۆنگرێسم بۆ گه‌یشتن به‌م ئامانجانه.

له‌گه‌ڵ ڕێزمدا

جۆرج بوش

## دانیشتن لەگەڵ بەرەی کوردستانی عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

## ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ، ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١، جێگری سکرتێری NEA(ئۆفیسی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك و ئاسیا)، بەریز ئێدوارد جێرێجیان[1] لەگەڵ لیژنەیەکی بەرەی کوردستانی عێراق دیداری کرد کە جەلال تالەبانی، رێبەری یەکێ لە حیزبە سەرەکییەکانی کورد تێیدا ئامادە بوو. ئەم گروپە کە حەوتووی پێشووش لە وەزارەتی دەرەوە و پنتاگۆن(وەزارەتی بەرگری ئەمریکا- وەرگێر) دانیشتنی هەبووە، نوێنەری کۆمەڵگای ئاسووری و تورکمانەکانی عێراقیشی لە خۆ دەگرت.

دانیشتنەکەی ئێمە لەگەڵ لیژنەکەی بەرەی کوردستانی عێراق لە چوارچێوەی بەرنامەی حکوومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ بەرفراوانکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە گروپەکانی ئۆپوزیسیونی سەدام حوسەین و رژێمی ئیستای عێراق بوو. ئێمە پشتیوانی لە هیچ گروپێکی تایبەتی ئۆپوزیسیون ناکەین و ئامانجمان ئەوە نییە دەوڵەتێك پێکبهێنین بۆ ئەوەی جێگای دەوڵەتی سەدام حوسەین بگرێتەوە. ئەمە مەسەلەیەکە کە خەڵکی عێراق دەبێ بڕیاری لەسەر بدەن. وڵاتە یەکگرتووەکان پشتیوانی لە ریگاچارەیەکی سیاسی چاکسازانەی ئاشتیخوازانە لە ناو عێراق دەکات نە هەڵوەشانەوەی عێراق.

کاربەدەستانی ئەمریکا لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ لیژنەکی بەرەی کوردستانی عێراق جەختیان لە سەر پشتیوانی توندی ئێمە لە بەرەوپێشچوونی مافی مرۆڤ و بەشداری سیاسی سەرجەم خەڵکی عێراق کرد. ئێمە پشتیوانی لە عێراقێکی پلورالیست و دیموکرات دەکەین کە تێیدا هیچ گروپیکی

---

[1] Edward Djerejian

ئەتنیکی یا ئایینی لە ماڤە شارۆمەندییەکان و بەشداری تەواو لە دامەزراوەگەلی حکوومەتی و مافی شانازی کردن بە داب ونەریتی جیاوازی ئایینی و کولتووری خۆی بێبەش نەکریت .

دەوڵەتی ئێمە دەروەسە بە نیسبەت ئەوەی بە گوێرەی ڕێوشوێنەکانی بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایش و میکانیزمەکانی بڕیارنامەکانی ٧٠٦ و ٧١٢ی ئەنجوومەنی ئاسایش، یارمەتی مرۆڤدۆستانە بدا بە خەڵکی عێراق. ئێمە لە سەر ئەوە پێداده‌گرین کە دەبێ عێراق ئەو بەرپرسیارەتییانە جیبەجێ بکات کە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی داناوە، لەوانە ئاسانکاری بکات بۆ ئەوەی ئاژانسەکانی یارمەتیدەری نێونەتەوەیی بێ هیچ کەند و کۆسپ و سنورێك دەستیان بگات بەو خەڵکە کە لە هەموو شوێنەکانی عێراق پیویستیان بە یارمەتی هەیە.

ئێمە هەروەها باسی هێزە سەربازییەکانی هاوپەیمانانمان کرد کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا نیشتەجێن و بۆ پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری باکووری عێراق و بەرپەرچدانەوەی سەرکوتی عێراق کار دەکەن.

لە دانیشتنەکەدا ئێمە هەروەها پێشوازیمان لە باشتر بوونی پەیوەندییەکانی ڕێبەرایەتی کوردی عێراق و دەوڵەتی تورکیا کرد و ستایشی بەیاننامە روونەکەی بەرەی کوردستانی عێراقمان کرد بۆ پشتیوانی کردن لە یەکپارچەیی تورکیا.

پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئۆپۆزیسیونی عێراق لەیەك تێگەیشتنی ئێمە لە یەکدی باشتر دەکات و پەیوەندی درێژخایەنی ئێمە لەگەڵ خەلکی عێراق بەهێزتر دەکات . ئێمە چاومان لە گفتوگۆی بەردەوام لەگەڵ بەرەی کوردستانی عێراق و هەروەها گروپە ئوپوزیسیونەکانی دیکەی عێراقە .

## ئایا ئەمانە "کوردە باشەکانن" یا "کوردە خراپەکان"؟

### کونفرانسی چاپەمەنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا و سەرۆك وەزیرانی تورکیا
### ۱۹ ی نیسانی ۱۹۹٥

**بیل کلینتۆن:** بەخێرهاتنی "تانسۆ چیللەر"، سەرۆك وەزیرانی تورکیا دەکەم بۆ واشنگتۆن. تورکیا هاوپەیمانی پڕبایەخ و گرنگی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە و پەیوەندییەکانمان گرنگتر دەبێت لە سالانی داهاتوودا. ئێمە دەمانەوێت کۆبوونەوەیەك بگرین و باس و گفتوگۆ لە سەر هەندێ مەسەلە و بەرنامەکانی خاتوون "چیللەر" بکەین بۆ دیموکراسی و چاکسازی ئابووری لە تورکیا و شالاوی تورکیا لە باکووری عێراق ، ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیوادارە کات و مەودای ئەم شالاوانە بەرتەسك بێت. ئێمە گفتوگۆ دەکەین دەربارەی "قوبرس" و چەند مەسەلەیەکی دیکە کە سەرۆك وەزیرانی تورکیا بیەوێت گفتوگۆی لە سەر بکەین. من چاوم لە بەرەوپێش چوونی ئەم گفتگۆیانەیە و خۆشحالم کە "تانسۆ چیللەر" لێرەیە.

**شالاوەکانی تورکیا لە عێراق**

**پرسیار:** جەنابی سەرۆك کۆمار ئایا چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە کاتێك دیاری بکەن بۆ کشانەوەی هێزەکانی تورکیا لە عێراق و ئایا دەولەتی عێراق پشتیوانی دەکات لەم کردەوەیەی تورکیا دژی کوردەکان؟

**بیل کلینتۆن:** بۆ ئەم پرسیارانە لە خاتوون "چیللەر" ناکەن؟

پرسیار: باشە ئایا ئێوە دەتانەوێت کاتێك دیاری بکەن بۆ کشانەوەی هێزەکانتان لە عێـراق؟ ئایـا عێراق پشتیوانی دەکات لەم کردەوەیە دژی کوردەکان؟ ئایا ئەمانە "کوردە باشەکانن" یا "کوردە خراپەکان"؟

تانسۆ چیللەر: هەرواکە دەزانن ئێمە و ئەمریکا پێکەوە بوین لـە شـەڕ دژی عێـراق لـە قـەیرانی کەنداودا. پاش ئەوەش ئێمە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بووین لە "شاڵاوی دابینکردنـی ئاسایش" بۆ پاراستنی خەڵکی کورد لە باکووری عێراق دژی رژێمی سەدام حوسـەین و بەهـەرحاڵ تورکیا تەنها هاوپەیمانی ئەمریکا بوو کە بەردیلێکی زۆر گرانی دا لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ عێراق و هەروەها لە گەڵ باکووری عێراق هاوسنور بووین لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە بێ ئیدارەیە.
من لەگەڵ بڕیاری ئەنجامدانی شاڵاو نەبووم لە باکووری عێراق، بـەڵام تروریـستەکان لـە بـاکووری عێراق دانیشتوون و پیلانی ئەنجامدانی شاڵاو لە وڵاتی ئێمە دادەڕێژن و سنوور دەبەزێنن. پێموایە هەر وڵاتێکی رۆژئاوایی دیکەش بوایا هەر ئەو بڕیارەی دەدا کە من داومە. ئێمـە بـۆ ماوەیـەکی کەم لە باکووری عێراق دەبین. ئێمە دەمانەوێت ئەو بنکانـەمان هـەر لەدەسـتدا بێـت و زۆربـەی کارەکانمان لە باکووری عێراق ئەنجام داوە و زۆر بەم زووانە پاشەکشە دەکەین.
هەروەها کە لە سەرەتادا وتم هۆکاری ئەوەی کـە نـاتوانم رۆژێـك دیـاری بکـەم بـۆ پاشەکـشەی هێزەکانمان، ئەوەیە کە باش نابێت بۆ ئەو کەسانە کە ناوچە شاخاوییەکاندان(کـە ١٥٠٠ فیـت لـە سەروی زەوی بەرزە)، لە ئەشکەوتەکاندان، لە ناو بەرفدان لە نزیك سنوورەکانی ئێمەن. ئەوەی کە ئەم هێزانـە دەیکـەن، پـشکنینی ئەشـکەوتەکانی نێـو شـاخەکانە بـۆ دۆزینـەوەی ئـەو چـەك و تەقەمەنییە کە بەکاردبرێت بۆ کوشتنی خەڵکی بێ گوناح لە وڵاتی ئێمە . کەوابوو زۆر سپاسـی سەرۆك کلینتۆن دەکەم بۆ پشتیوانیەکەی و ئاگاداربوونی لەو شتانەی کـە روی داوە لـە بـاکووری عێراق کە سەرزەمینێکی بێ ئیدارەی بێ خاوەنە. ئەمە تەنها ئەرکی ئێمـە نییـە. ئێمـە دەبێـت

ڕێگایەك بدۆزینەوە بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە. بە واتایەکی دیکە تورکیا هەمیشە تەنها هاوپەیمانی ئەمریکا بووە کە بەردەوام بەردیلی ئەم شاڵاوەی داوە .
پرسیار: ئایا ئێوە هەروا بە کەلەڕەقییەوە دژی دروستبوونی دەوڵەتی کوردستانن؟ ئایا ئەمە هانا و بیانووی یاخیبووان نییە؟

تانسۆ چیللەر: هەڵویستی ئێمە زۆر دۆستانەیە بە نیسبەت خەڵکی کورد لە باکووری عێراق. ئێمە هیچ کێشەیەکمان نییە لەگەڵ ئەمەدا. لە راستیدا خەڵکی کورد لە باکووری عێراق زۆر خۆشحاڵن کە دەبینن ئێمە هاتووینەتە نێو خاکەکەیان و هێزە کوردەکان بەرەو باشوور ڕاو دەنێن و ناچاریان دەکەین باکووری عێراق بەجێ بهێڵن لەبەر ئەوەی تروریستن. ئێستا تروریستەکان لە باکووری عێراق هەڵدێن، بەلاّم لەوانەیە بگەڕێنەوە بۆ باکووری عێراق و لەوێ نیشتەجێ ببنەوە. هەروا کە دەزانن ئێمە سنوورەکانمان بەرووی خەڵکی کورد لە باکووری عێراق کردووەتەوە. نزیکەی میلیونێك کەس پاش قەیرانی کەنداو هاتە نێو خاکی ئێمە و ئێمە داڵدەمان دان و تێرمان کردن و تەنها پارساڵ ١٣/٥ میلیون دولارمان خەرج کرد بۆ دابینکردنی خۆراکی خەڵکی کورد کە لە باکووری عێراق دەژین و هەرساڵ کارەبا و پێداویستیە سەرەکیەکانی دیکەیان بۆ دابین دەکەین. کەوابوو ئێمە کێشەمان نییە لە گەڵ خەڵکی کورد .

پرسیار: جەنابی سەرۆك، ئیدارەی ئێوە بەدڵنیاییەوە تاڕادەیەك تەحەموولی هێرشی تورکیای کردووە بۆ باکووری عێراق. ئێوە چۆن دەتانەوێت هاوکاری نهێنی بکەن لەگەڵ تورکیا لە پەیوەندی لە گەڵ هێرش بۆ ئەم ناوچەیە؟ گ

**بیل کلینتۆن:** ئێمە دەمانەوێت لە دانیشتنەکەی ئەمڕۆمان باس و گفتوگۆ لە سەر ئەم مەسەلەیە بکەین و لەم پەیوەندییەدا هیچ ناڵێم تا پاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەمان. بەلاّم هەروا

كەدەزانن ولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا پەیوەندییەكی بەهێزی هەیە لـە گـەڵ توركیـا و پێمـوایـە ئەمە زۆر گرنگە كە ئێمە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە درێژە بەم پەیوەندییانە بدەین لە داهاتوودا. ئێمە دەمانەوێت لە هەڵویستی یەكدی، لە كێشەكانی یەكدی و لە بوارەكانی هاوكاری لە گـەڵ یەكـدی تێبگەین و من لەم پێناوەدا هەوڵم داوە و پەیوەندی باشـم هـەبووە لـە گـەڵ "تانـسۆ چـیللەر". "چیللەر" زۆر شێلگێر بوو لە سەر هاتن بۆ ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و دەربڕینی خواست و بەرژەوەندییەكانی خەڵكی توركیا و ئەمە یەكێ لەو مەسـەلانەیە كـە ئێمـە دەمانـەوێت بـاس و گفتوگـۆی لـە سـەر بكـەین و هیـوادارم سـەرجەم ئـەم مەسـەلانە بـەرەوپێش بـچێت. ولاتـە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئاگادارە توركیا چی دەكات و هیوادارە كوشتە وبریندارە مەدەنییـەكانی ئەم شالاوە زۆر كەم بێت و كات و پێوەری شالاوەكە سنووردار بێـت. ئێمـە دەمانـەوێت بـاس و گفتوگۆ لە سەر ئەم مەسەلەیە بكەین. خاتوون "چیللەر" كۆمـەڵێك بیرۆكـەی باشـی هەیـە لـەم پەیوەندییەدا و ئێمە گفتوگۆی لە سەر دەكەین.

## بەیاننامەی كلینتۆن، سەرۆك كۆماری ئەمریكا دەربارەی وەڵامی دەوڵەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە هێرشی سەدام بۆ هەولێر

## ٢ی ئەیلوولی ١٩٩٦

سێ رۆژ لەمەوبەر(٣١ی ئاب) سەرەڕای هۆشدارییە روونەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و كۆمەڵگای نێونەتەوەیی، هیزەكانی عێراق هێرشیان كردە سەر شاری هەولێر لە باكووری عێراق كە لە ژێر كونترولّی كوردەكان دایە و ئەم شارەیان داگیر كرد. راگەیاندنی پاشەكشەی سنووردار لە لایەن عێراقەوە هیچ لە مەسەلەكە ناگۆڕێت لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ سوپای سەدام حوسەین هەولێر كونترۆل دەكات و یەكینەكانی سوپای عێراق خۆیان بۆ هێرشی زۆرتر ئەیار دەكەن .

پێویستە وەڵامیكی بەهێز بەم كردەوانە بدرێتەوە و وەڵامیش دراوەتەوە. سەرلەبەیانی ئەمڕۆ من فەرمانم بە هێزەكانی ئەمریكا دا هێرش بكەنە سەر عێراق. موشەكەكانی ئێمە ئەم پەیامە دەنێرن بۆ سەدام حوسەین كە كاتیك كە ئێوە خەڵكی خۆتان ئازار دەدەن یا هەڕەشە لە دراوسێكانتان دەكەن، دەبێ بەهاكەیشی بدەن.

وادیارە گروپێكی كورد كە پێشتر دژی سەدام بووە، ئیستا بڕیاری داوە لەگەڵ سەدام هاوكاری بكات، بەڵام ئەمەش نابێتە پاساو بۆ هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر دانیشتووانی سیڤیلی هەولێر. لە حەوتوو و مانگەكانی رابردوودا ئێمە بەردەوام كارمان كردووە بۆ پێكهاتنی ئاگربەستێكی درێژخایەن لە نیوان گروپە كوردەكان بەڵام ئەم هێرشەی عێراق ئاگری شەڕی نیوان گروپە كوردەكانی تیژتر كرد و مەترسی ئەوە هەیە ناسەقامگیری لە سەراسەری ناوچە بڵاو بێتەوە.

ئامانجه‌كانی ئێمه سنووردارن به‌ڵام روونن، واتا ئه‌وه كه سه‌دام به‌های دوایین كرده‌وه درندانه‌كه‌ی خۆی بدات و توانایی سه‌دام بۆ هه‌ڕه‌شه كردن له دراوسێكانی و به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی ئه‌مریكا كه‌م بێته‌وه.

یه‌كه‌م: ئێمه ناوچه‌ی دژه‌فڕین له باشووری عێراق درێژ ده‌كه‌ینه‌وه. ئه‌مه ده‌بێته هۆی ئه‌وه‌ی سه‌دام كونترۆڵی هه‌ریمی هه‌وایی عێراق له سنووری كوێت تا باشووری ده‌ورو‌به‌ری به‌غدادی له ده‌ستدا نه‌مێنێت و به شێوه‌یه‌كی به‌رچاو توانایی عێراق بۆ ئه‌نجامدانی ئوپه‌راسیونی هێرشبه‌رانه له ناوچه كه‌م ده‌كاته‌وه.

دووه‌م: بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی فڕۆكه‌كانمان كه ئه‌م هه‌ریمی دژه‌فڕینه ده‌پارێزن، ئێمه به موشه‌كی "كروز" هێرش ده‌كه‌ینه سه‌ر سیستمی به‌رگری هه‌وایی سه‌دام له باشووری عێراق.

ولاته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا پشتیوان و هاوكاری بڕیارنامه‌ی ٩٨٦ی ئه‌نجوومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان بوو كه رێگای به عێراق ده‌دا بڕێك له نه‌وته‌كه‌ی بفرۆشێت بۆ كڕینی خۆراك و ده‌واو ده‌رمان بۆ خه‌ڵكه‌كه‌ی، له‌وانه كورده‌كان. شاری هه‌ولێر كه له لایه‌ن هێزه‌كانی عێراقه‌وه داگیر كراوه ناوه‌ندی سه‌ره‌كی دابه‌ش كردنی ئه‌م خۆراك و ده‌واوده‌رمانه‌یه. هه‌تا كاتێك كه ئێمه دڵنیا نه‌بین له‌وه كه ئه‌م پێداویستییه مرۆڤدوستانه‌یه ده‌گاته ده‌ستی ئه‌و كه‌سانه كه پێویستیان پێیه‌تی، ئه‌م به‌رنامه‌یه ناچێته پێش و ده‌وڵه‌تی عێراق له‌و سه‌رچاوه نوییانه بێبه‌ش ده‌كرێت كه چاوه‌ڕوانی ده‌كات.

ئامانجه‌كانی سه‌دام حوسه‌ین له‌وانه‌یه ئاڵوگۆڕی به سه‌ردا بێت به‌ڵام میتوده‌كانی (ده‌ستدرێژی و توندوتیژی دژی كورده‌كان و كه‌مینه ئه‌تنییه‌كیه‌كان و دراوسێكانی عێراق ) ئاڵوگۆڕی به سه‌ردا نایێت. وه‌ڵامی ئێمه به‌م گوستاخییه ده‌بێ ده‌ستبه‌جێ و به‌هێز بێت، هه‌روه‌ها كه سه‌رۆك بوش ئه‌م شێوه وه‌ڵامه‌ی له شالاوی "گه‌رده‌لوولی بیابان" له دوو ساڵ پێش دایه‌وه واتا ئه‌و كاته كه

عێراق هێزهکانی خۆی له سهر سنووری کوێت کۆ کردهوه، ئهمڕۆش دهبینین سهدام ههمان کاری دووپات کردووهتهوه.

ئێمه دهبێ روونی بکهینهوه که کردهوه گوستاخانهکانی سهدام ناکام و ئهنجامی ههیه، وهگهرنا ئهم کردهوانه زیاد دهبێت. ئێمه دهبێ توانایی عێراق بۆ هێرشکردن بۆ سهر دراوسێکانی کهم بکهینهوه و توانایی ئهمریکا زیاد بکهین بۆ ئهوهی عێراق بخاته ژێر کونترۆڵی خۆی.

ئهو ههنگاوانه که ئێمه ئهمڕۆ ههڵیدهگرین زیاتر ئهم ئامانجانه وهدی دێنێت. به جاران سهدام حوسهین به ئاشکرا سووکایهتی به رهفتاری شارستانی کردووه. سهدام به دڕندهویی رهفتاری لهگهڵ خهڵکهکهی خۆی کردووه، هێرشی کردووهته سهر دراوسێکانی، پشتیوانی له تروریزم کردوه و ههوڵ دهدات دهستی بگات به چهکی کۆمهڵکوژ. سیاسهتی ئێمهش روونه: ههرکاتێ ههڕهشه له بهرژهوهندی ئێمه له پهیوهندی لهگهڵ ئاسایشی دۆستهکانمان و هاوپهیمانهکانمان بکرێت، ئێمه ئهگر پێویست بکات به هێزی سهربازیش وهڵام دهدهینهوه. ئهمه ئهو کاره بوو که ئێمه سهرله بهیانی ئهمڕۆ له عێراق کردمان.

من دهزانم بیری ههموو خهڵکی ئهمریکا له لای ژن و پیاوه سهربازهکانمانه که ئهم ئهرکه ئهنجام دهدهن و ودوعای خهیریان بۆ دهکهن. خودا ئاگاداری ئهم سهربازانه و ئهو نهتهوهیه بێت که ئهوان خزمهتی دهکهن.

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ رێبەرایەتی کۆنگرێس دەربارەی عێراق

## ٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦

کۆشکی سپی
واشنگتۆن، ٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦
بەڕێز "نیوت گینگریش[1]"، سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران
واشنگتۆن دی سی
بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران

لە پەیوەندی لە گەڵ رێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ )، وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان . ئەم راپورتە قۆناخی پاش ٥ ی ئەیلوول تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

هێرشی سەدام حوسەین بۆ هەولێر لە کۆتایی مانگی ئاب و هەوڵە بەردەوامەکانی بۆ کەڵك وەرگرتن لە ململانێیە مەحەلییەکانی باکووری عێراق، نیشانەیەکی نوێیە کە نیشان دەدات سەدام هەروا هەڕەشەیە بۆ خەڵکەکەی خۆی و دراوسێکانی و بۆ ئاشتی ناوچە. هەروا کە من لە دوا راپۆرتمدا بە وردی باسم کرد، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە رێگای بەرفراوان کردنی "هەرێمی دژەفڕین"ی باشوری عێراق لە هێلی ٣٢ بۆ هێلی ٣٣ ی باکوور وەڵامی کردەوە سەربازییەکەی سەدامی لە باکووری عێراق دایەوە. وەڵامی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بریتی بوو لە هێرشکردنە سەر "بنکەی موشەکی زەوی بۆ هەوا" و "ناوەندی فەرماندەیی و کونترۆڵ کردنەکان" و "سیستمی بەرگری هەوایی باشووری هێڵی ٣٣" . بە مەبەستی باشتر کردنی ئاسایشی

---
[1] Newt Gingrich

هێزەکانمان کە هەرێمی دژەفڕین بەرفراوانتر دەکەن لەکاتی دوا راپۆرتم تا ئێستا ئێمە پێگەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکامان لە ناوچە بە مەبەستی سنووردار کردنی توانایی سەدام بەهێزتر کردووە. لە مانگی ئەیلوول ئێمە دو بەتالیونی گرانی تیپی ۳ ی هێزی یەکەمی سوارە و هێزێکی توپبارانی **Patriot** و ۸ فرۆکەی جەنگی ۱۱۷ ـ F مان ناردووە بۆ کوێت. هەروەها ۲۳ فرۆکەی پێشکەوتووی ۱٦ ـ F مان ناردووە بۆ کوێت و هێزێکی توپخانەی "پاتریوت"مان ناردووە بۆ عەرەبستانی سعودی، زێدەباری ئەو هێزانەی کە پێشتر ناردراون بۆ ناوچە بۆ ئەوەی دەستبەجێ وەلامی دەستدرێژی عێراق بدەنەوە. لە سەرەتای سپتامبر، گروپی **USS Enterprise Carrier Battle**نێردراوە بۆ کەنداو بۆ ئەوەی پەیوەست بێت بە گروپی **USS Carl Vinson Carrier Battle**. ئەم هێزە لە ۸ ی تشرینی یەکەم لە کەنداو دێتە دەرەوە. هەرێمی دژەفڕینی باکووری عێراق( شالاوی دابینکردنی ئاسایش) و هەرێمی دژەفڕینی باشووری عێراق(شالاوی چاودێری باشوور) هەروا لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان دەپارێزرێت. پارلمانی تورکیا دەبێ ماوەی "شالاوی دابینکردنی ئاسایش" پێش کۆتایی مانگی دیسامبر درێژ بکاتەوە.

ئێمە هۆشداری توندمان داوە بە عێراق(لە ٦ و ۱٦ ی ئەیلوول لە رێگای لیژنەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویورك) کە کێشە دروست نەکات بۆ فرۆکەکانمان کە هەرێمی دژەفڕین دەپارێزن و سیستمی بەرگری هەوایی خۆی چاك نەکاتەوە کە لە ئاکامی هێرشی ئێمەدا لە کارکەوتووە. ئێمە درێژە دەدەین بە چاودێری کردنی ورد بە سەر کردەوەکانی عێراقدا و لە باشترین بارودۆخداین بۆ ئەوەی وەلامی شەڕاشوبیەکانی عێراق بدەینەوە لە داهاتوودا.

بڕیارنامەی ۹٤۹ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNSCR ) کە لە تشرینی یەکەمی ۱۹۹٤ پەسەند کراوە داوا لە عێراق دەکات هەڕەشە نەکات لە دراوسێکانی و کێشە دروست نەکات بۆ چالاکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق و توانایی سەربازی خۆی لە باشووری عێراق وەگەڕ نەخاتەوە. بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە نابێت متمانە بە کردەوەکانی

سەدام بکرێت، پێویستە ژمارەیەکی بەرچاو لە هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە بێننەوە بۆ ئەوەی توانایی ئەوەیان هەبێت دەستبەجێ وەڵامی دەستدرێژی عێراق یا هەڕەشە کردن لە دراوسێکانی عێراق بدەینەوە.

بارودۆخی باکووری عێراق هەروا هەستیارە. دەوڵەتی ئەمریکا درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ لە دەوری یەك کۆ کردنەوە و واژۆکردنی ئاگربەست و ئاشتیدانەوەی دو گروپی سەرەکی کورد کە لە گەڵ یەکدی شەڕ دەکەن، لەوانە پێکهێنانی دیالۆگێکی چالاك لە گەڵ ئەم دو حیزبە. جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك، بەڕێز "رۆبێرت پیلیتریۆ[2]" لە ١٨ ی ئەیلوول و ٢١ی تشرینی یەکەم لە تورکیا لەگەڵ مەسعود بارزانی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و لە ٢٢ ی تشرینی یەکەم لە گەڵ جەلال تاڵەبانی، رێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) دیداری کردووە و پاش ئەوەش لە لە ٣٠ و ٣١ ی تشرینی یەکەم گەڵ نوێنەرانی PDK و PUK لە ئانکارا کۆبوونەوەی گرتووە. لەم کۆبوونەوەیەدا و کۆبوونەوە بەرزەکانی تردا، حکومەتی ئەمریکا بەردەوام هۆشداری داوە بەم دو گروپە کە بەردەوامبوونی جەنگ لە باکووری عێراق تەنها بە قازانجی سەدام حوسەین تەواو دەبێت. لە وەڵامی ناسەقامگیریی رۆژ بە رۆژی باکووری عێراق، ئێمە بە شوازی کاتی "ئیدارەی یارمەتی کارەساتی بیانی و ناوەندی هاوئاهەنگی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا"مان لەو ناوچەیە کێشاوەتەوە.

لە ئەیلوول و تشرینی یەکەم، بە یارمەتی تورکیا ئێمە نزیکەی ٢٧٠٠ دانیشتووی باکووری عێراقمان لە ناوچە بردووەتە دەرەوە کە بە هۆی پەیوەندی نزیك لە گەڵ دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا شاڵاوەکانی دژبە عێراق ژیانیان راستەوخۆ لە گەڵ هەڕەشەی رژێمی عێراق روبەڕوو بووە. گروپی یەکەمی ئەم دانیشتوانە کە ٢١٠٠ کەس دەبوون لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوول بەهاوکاری ئاژانسەکانی دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باکووری

---

[2] Robert Pelletreau

عێراق له شالاوێکی دەربازبوونی خێرادا له ناوچه برانه دەرەوه. گروپی دووەم که ٦٠٠ کەس له ئەندامانی ئوپوزسیونی عێراق دەبوون، له ١٩ ـ ٢١ ی تشرینی یەکەم له ناوچه برانه دەرەوه. هەمووی ئەم کەسانه کەڵك وەردەگرن له پرۆگرامی ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ نیشتەجێ کردنی ئاوارەکان له "گوام[3]".

ئێمه هەروا نیگەرانین به نیسبەت ئاسایشی کارمەندانی مەحەلی ڕێکخراوه ناحکوومیەکانی سەر به ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا که له باکووری عێراق ماونەتەوه و گارانتی ئاسایشی ئەوانمان وەرگرتووه له پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ). ئێمه چالاکانه چاودێری ئاسایشی ئەوان دەکەین و هەموو ڕێگاکان تاوتوێ دەکەین بۆ مسۆگەر کردنی ئاسایشی ئەم کارمەندانه و بنەماڵەکانیان.

ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا کار دەکات له ڕێگای نەتەوه یەکگرتووەکان و ڕێکخراوه مرۆڤدۆستەکان بۆ درێژەپێدان به یارمەتیدانی مرۆڤدۆستانەی خەڵکی باکووری عێراق. بارودۆخی ئاسایشی باکووری عێراق هەروا زۆر خراپه و چالاکی ئێران و PKK (پارتی کرێکارانی کوردستان) زیاد بووه به سەر هەڕەشەی ئێستای دەوڵەتی عێراقدا. ئێمه هیچ دەورێك نادەین به ئێران له ناوچه و هەروا مۆچیاری هەموو لایەنه پەیوەندیدارەکان دەکەین که پەیوەندییان نەبێت لەگەڵ ئێران.

ئێمه هەروەها درێژه دەدەین به پشتیوانی کردن له بڕیاری سکرەتێری گشتی نەتەوه یەکگرتووەکان بۆ چاودێری ورد له سەر ڕەوتی جێبەجێ بوونی بڕیارنامەی ٩٨٤ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوه یەکگرتووەکان که به گوێرەی ئەوه عێراق دەتوانێ بڕێك له نەوتەکەی بفرۆشێت بۆ کڕینی خۆراك، دەواودەرمان و پێداویستیه سەرەکیەکانی دیکەی خەڵك و تەرخانکردنی پاره بۆ خەرجی چالاکیه زۆر پێویستەکانی نەتەوه یەکگرتووەکان به نیسبەت عێراقەوه. ئێمه دەمانەوێت ئەم بڕیارنامەیه به شێوەیەك جێبەجێ بێت که پێداویستیه مرۆڤدۆستانەکانی خەڵکی عێراق بەم پارەیه بکرِدرێت

---

Guam [3]

و بـه گـوێرەی رێـساكانی بڕیارنامـەی ٩٨٦ ی UNCSR بگاتـه دەسـتی ئـەو خەڵكـه كـه پێویستیان پێیەتی.

له ٩ ی تشرینی یەكەم، جێگری سكرەتێری گشتی نەتەوه یەكگرتووەكان ، بـەڕێز "خارەخـان[4]" راپۆرتی دا به ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتـەوه یـەكگرتووەكان (UNSC ) كـه ئێـستا دەوڵـەتی عێراق دەیەوێت وتووێژ بكات له سەر ئەو بەشه لـه شـەرت ومەرجـەكانی بڕیارنامـەی ٩٨٤ كـه پەیوەنـدییان هەیـه بـه ژمـارەی چـاودێران و كەندوكۆسـپەكانی چـالاكی كارمەنـدانی نەتـەوه یەكگرتووەكان له ناوخۆی عێراق. به له بەرچاو گرتنی ئەوەی كه عێراق رەزامەندی داوه لـه سـەر ئەم پلانه و له یادداشتنامەیەكی له یەك تێگەیشتن دا له نێوان عێراق و نەتەوه یەكگرتووەكان له ٢٠ ی مایس وەبیر هێنراوەتەوە، ئەم داواكارییەی عێراق بۆ وتووێژ تەنها بۆ ئەوەیه كـه جێبـەجێ كردنی بڕیارنامەی ٩٨٤ زۆرتر بخاته دواوه.

له كاتی دوایین راپۆرتەكەم تا ئێستا، دەوڵەتی عێراق درێـژەی داوه بـه خـۆ بـواردن لـه ئـەرك و بەرپرسیارەتییەكانی بڕیارنامەكانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوه یەكگرتووەكان. بەگوێرەی شەرت و مەرجەكانی ئاگربەستی جەنگی كەنداو له گەڵ عێـراق(كـه لـه بڕیارنامـەی ٦٨٧ دا ئامـاژەی پێكـراوه) عێـراق دەبێـت رێگـه بـدات بـه كومیـسیونی تایبـەتی نەتـەوه یـەكگرتووەكان بـۆ عێراق(UNSCOM ) كه دەستبەجێ و بێ شەرت و مەرج و بێ كەندوكۆسپ دەسـتی بگـات به هەر شوێنێك له عێراقدا كه ئەم كومیسیونه دەیەوێت سەردانی بكات و گفتوگۆ بكات له گەڵ هەر بەرپرسێكی عێراقی كه بیەوێت بۆ ئـەوەی UNSCOM ئـەركی خـۆی بەتـەواوی ئـەنجام بدات. عێراق هەر وەك ٥ ساڵی رابردوو، درێژه دەدات به پشتگوێ خستنی ئەم ئەركانه.

سەرۆكی UNSCOM بەڕێز "رۆڵف ئیكویز[5]" له دوایین راپـۆرتی ٦ مانگـەی خـۆی لـه ١٧ ئوكتـۆبر باسـی چـۆنیەتی جێبـەجێ بـوونی بڕیارنامەكـەی ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نەتـەوه

---

Gharekhan [4]
Rolf Ekeus [5]

یەککگرتووەکانی کردووە و بە وردی ئاماژەی کردووە بە هەوڵەکانی عێراق لە رابردوو و ئێستا بۆ لە ناوبردنی ئاسەواری پرۆگرامی چەکە کۆمەلکوژەکانی(WMD ) و بە واتەیەکی دیکە کەندوکوسپ دروستکردن بۆ کاری کومیسیون. هەتا کاتێك کە سەدام سەرپێچی لە هاوکاری تەواو لە گەڵ پشکنەرانی چەکی نەتەوە یەککگرتووەکان بکات، UNSCOM ناتوانێت درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ دڵنیابوون لەوەی کە پرۆگرامی چەکە کۆمەلکوژەکانی عێراق کۆتایی پێهاتووە. ئێمە درێژە دەدەین بە پشتیوانی تەواو لە چاودێری و هەوڵەکانی کومیسیونی تایبەتی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ملکەچ بوونی عێراق بە جێبەجێ کردنی هەموو بڕیارنامە پەیوەندیدارەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان . ئێمە نامانەوێت باسی ئاڵوگۆڕ لە بڕیارنامەکانی UNSC بکەین.

لە ١ ی تشرینی یەکەم دەست کرا بە جێبەجێ کردنی مکانیزمەکانی چاودێری کردن بە سەر ناردنە دەرەوە و هاوردنە ناوەوەی کەلوپەلّ بۆ عێراق کە بڕیارنامەی ١٠٥١ ی ئەنجوومەنی ئاسایش دایناوە. بڕیارنامەی ١٠٥١ کۆمەڵێك میکانیزمی پەسەند کردووە بۆ پێشگرتن لە سەرلەنوێ دەستڕاگەیشتنی عێراق بە توانایی بەرهەمهێنانی چەکە قەدەغەکراوەکان. جێبەجێ بوونی ئەم مەسەلەیە پێویستی بەوە هەیە کە ئەو وڵاتانەی کە ئەو کەرەستانە هەناردەی عێراق دەکەن(کە دەکرێت بۆ دروستکردنی چەکە قەدەغەکراوەکان کەڵکیان لێوەربگیردرێت) لەم پەیوەندییەدا نەتەوە یەککگرتووەکان ئاگادار بکەنەوە.

عێراق لە باتی ئەوەی بە نیاز پاکییەوە کار بکات، درێژە دەدات بە پشتگوێ خستن و خۆبواردن لە ئاشکرا کردنی چارەنووسی ئەو سەدان کوێتییە و هاوڵاتیانی وڵاتانی سێیەم کە بێ سەروشوێن کراون بە دەستی کاربەدستانی عێراق لە کاتی داگیر کرانی کویت و هەروەها خۆی دەبوێرێت لە گەڕاندنەوەی ئەو کەرەستە سەربازییەیانەی کوێت کە لە کاتی داگیر کرانی کوێت دزراون و هەروەها ئەو بەرهەمە کوولتووری و مێژووییانە کە بە فەرمانی کاربەدەستانی بەغداد تاڵان کراون.

هەروەها عێراق درێژە دەدات بە داڵدەدانی تروریستە نەناسراوەکان. سەرکوتی دانیشتووانی شیعە بە دەستی دەوڵەتی عێراق بەردەوامە و ئامانجی ئەم سیاسەتە لە ناوبردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان[6]" لە باشووری عێراقە و هەروەها لە ناوبردنی ژینگەی "مارشەکانی باشوورە[7]". بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراسەری عێراق گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە. سەدام حوسەین هیچ مەیلێك نیشان نادات بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەی ٦٨٨ ی UNSCR کە داوا لە عێراق دەکات سەرکوتی خەڵکەکەی خۆی رابوەستێنێت. "هێزە لەمپەرە فرەڕەگەزەکان"(MIF ) درێژە دەدەن بە سەپاندنی گەمارۆکان بە سەر عێراقدا. لە مانگی سێپتامبر و نیوەی یەکەمی مانگی ئۆکتۆبر، ٤ کەشتی سنووری باکوور و ٥ کەشتی سنووری باشوور بە هۆی پێشێل کردنی گەمارۆکان لە بەندەرەکانی کەنداو دەستیان بە سەردا گیراوە. چەند دانە لەم کەشتیانە باری نایاساییان لە ناو کەشتیەکەدا شاردووەتەوە و پتر لە ٣ میلیۆن گالۆن نەوتی عێراقیان قاچاخ کردووە بۆ دەرەوە. ئاشکرا کردنی دەستبەجێی ئەم پێشلکاریانەی گەمارۆکان لە لایەن کەشتیەکانەوە بە دەستی کویت و ئەمارەتە عەرەبیە یەکگرتووەکان ، ژیستی پێشگیرانەی ئێمە بەهێزتر دەکات و پتر لە پێشتر ئەوە دەسەلمێنێت کە MIF سەرچاوەیەکی پڕبایەخی جێبەجێ بوونی ئەم گەمارۆانەیە. ئێمە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ گەیشتن بە ئامانجە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەرەوەمان لە رێگای راگرتنی پێکهاتەی فەرەرەگەزی MIF . دەوڵەتی "نیوزلەند" ئەم دواییانە کەشتییەکی رەوانەی ناوچە کردووە بۆ ئەوەی کە کار بکات لە گەڵ MIF ، بەریتانیا هاوکارییەکی زۆر نزیك هەیە لەگەڵ هێزەکانمان لە باکووری کەنداو و هیوادارین لە سەرەی ١٩٩٧ ، کانادا، بەلژیکا و هۆڵەندا، کەشتی بنێرن بۆ ناوچە بۆ ئەوەی دیسان پەیوەست ببنەوە بە MIF .

---

Marsh Arabs[6]
southern marshes[7]

ئێمە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ تێوەگلاندنی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە گەمارۆ دەریاییەکانی سەر عێراق. زۆربەی ئەو کەشتییانەی کە گەمارۆکانیان پێشێل کردووە لەم قۆناخەدا، لە ئەمارەتە عەرەبیە یەکگرتووەکان ئالآیان خراوەتە سەر. لە سەر داوای ئێمە، دەوڵەتی ئەمارەتە یەکگرتووە عەرەبیەکان، ئەم دواییانە سزای توندتری سەپاندووە بە سەر ئەو کەشتیانەی کە گەمارۆکان پێشێل دەکەن. هیوادارین کە ئەم کردەوانە پێش لە شاڵاوەکانی ئەمارەتە یەکگرتووە عەرەبیەکان بگرێت دژی ئەو کەشتیانەی کە گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دژی عێراق پێشێل دەکەن.

ئێران درێژە دەدات بە یارمەتیدانی ئەو کەشتیانە کە گەمارۆکان پێشێل دەکەن، لە بەر ئەوەی رێگە دەدات بەو کەشتیانە کە لە عێراقەوە دێن تا لە قەڵەمڕەوی دەریایی ئێرانەوە تێپەر بن بۆ ئەوەی تووشی هێزەکانی MIF نەبن لە باکووری کەنداو. ئێمە بەڵگە ونیشانەکانی هەبوونی دەستی ئێران لە پێشیلکارییەکانی گەمارۆکانمان تەسلیمی کومیتەی گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە و داوامان لە کومیتە کردووە کە بە شێوازی فەرمی ئەم کردەوانەی ئێران شەرمەزار بکات.

سیاسەتی ئێمە بە نیسبەت جێبەجێ کردنی گەمارۆکان هەمان سیاسەتی پێشوووە واتا ئەم گەمارۆانە پەیامێکی روونە بۆ دەوڵەتی عێراق و ئەوانەی کە دژی گەمارۆکانن کە ئەم گەمارۆانە کەم ناکرێنەوە و ئاڵۆگۆڕیان بە سەردا نایێت هەتا کاتێك کە عێراق بە تەواوی نیاز و ویستی ئاشتیخوازانەی خۆی نیشان نەدات بۆ جێبەجێ کردنی سەرجەم بڕیارنامەکانی UNSC .
کومیسیونی قەرەبوو کردنەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNCC ) کە بەگوێرەی بڕیارنامەی ٦٨٧ ی UNSCR دامەزراوە، درێژە دەدات بە بەدواداچوونەوەی ئەو سکاڵایانەی کە دەخرێنەڕوو بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو زەرەر و زیانانە بکرێتەوە کە لە ئاکامی داگیرکرانی نایاسایی کویت لە لایەن عێراق لێیان کەوتووە.

UNCC لێپێچینەوەی کردووە لە گەڵ ۹۸۰ هەزار سکاڵانامە کە پارەی قەرەبوو کردنەوەکەی دەکاتە ٤٠ بیلیون دولار. UNCC تەنها بڕیاری قەرەبوو کردنەوەی ئەو کەسانەی دەرکردووە کە لە ئاکامی داگیر کرانی کویت بریندار بوونە یا کوژراون لە بەر ئەوەی عێراق سەرپێچی دەکات لە جێبەجێ کردنی سەرجەم بڕیارنامە پەیوەندیدارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ، کەوابوو گەمارۆ ئابووریەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەروا جێبەجێ دەکرێت. ئێستا UNCC لە گەڵ قەیرانێکی جیدی ماددی روبەڕوویە بۆ قەرەبوو کردنەوەی زیانەکان و دابینکردنی خەرجی رۆژانەی چالاکیەکانی. ئەگەر عێراق هێدی هێدی بتوانێ بە گوێرەی شەرت و مەرجەکانی بڕیارنامەی ۹۸٦ ی UNSCR نەوتی خۆی بەتەواوی بفرۆشی، داهاتی ئەم نەوتە دەخرێتە سندوقێکی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بۆ ئەم مەبەستە دەکرێتەوە و ۳۰ ٪ ی تەرخان دەکرێت بۆ قەرەبوو کردنەوەی زیانەکان و دابینکردنی خەرجی رۆژانەی UNCC .

لە ئەنجامدا، عێراق هەروا مەترسییەکی جیدییە بۆ ئاشتی و سەقامگیری ناوچە. ئێمە شێلگیر دەبین لە سەر هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی تەواوی ئەرکەکانی بە گوێرەی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان.

ئیدارەی ئێمە بەردەوام دەبێت لە سەر دژایەتی کردن لە گەڵ هەر جۆرە کەم کردنەوەی گەمارۆکان، هەتا کاتێك کە عێراق نیازی ئاشتیخوازانەی خۆی نیشان بدات بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارنامانە.

سپاسی پشتیوانی کۆنگرێس دەکەم لە هەوڵەکانمان و بەردەوام دەبم لە ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس لە بارەی ئەم مەسەلە گرینگە.

لە گەڵ رێزمدا

ویلیام ج کلینتۆن[8]

[8] William J. Clinton.

## ڕاپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ کۆنگرێس دەربارەی عێراق،
## ٧ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٧

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس
له پەیوەندی لەگەڵ ڕێگه پێدان به بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك له هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، ڕاپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق به جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم ڕاپۆرتە قۆناخی ٤ ی تشرینی دووەم تا ئێستا له خۆ دەگرێت.
سەدام حوسەین هەروا مەترسییە بۆ خەڵکی عێراق و ناوچە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەڵامێکی سەرکەوتووانەی دایەوە بەو هەڕشە ڕوو له زیاد بوونەی که له ئەنجامی هێرشی سەدام بۆ سەر هەولێر له مانگی ئاب دروست بوو، بەڵام سەدام بەردەوامە له هەوڵەکانی بۆ قۆزتنەوەی ململانێیە مەحەلییەکانی باکووری عێراق به قازانجی خۆی. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی درێژە دەدەن به پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باشووری عێراق.
سەرەڕای سەر له نوێ داڕشتەوەی پێکهاتەی شاڵاوەکان، پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باکووریش بێ وچان بەردەوامە. به هۆی ئاڵۆگۆڕ له ئەرکەکانی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش له ئەنجامی داخرانی ناوەندی فەرماندەیی سەربازی(MCC ) له شاری زاخۆ له عێراق و گۆڕینی ئاراستەی یارمەتیە مرۆڤدۆستانەکانی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بەگوێرەی بڕیارنامەی ٩٨٤ ی UNSCR ، ئیدی "شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش" له ژێر ئەم ناوە بەردەوام نابێت. بەریتانیا درێژە دەدات به بەشداری کردن لەم ئەرکەدا بەڵام فەرانسا بڕیاری داوە ئیدی بەشداری نەکات لەم ئەرکەدا. هیچکام لەم ئاڵۆگۆڕانە کاریگەری نابێت له سەر بەرپرسیاریتی فەرمی ئێمە بۆ پاراستنی تەواوی هەرێمی دژەفڕینی باکووری عێراق.

جگە لە شالاوە هەواییەکانمان، ئێمە درێژە دەدەین بە هێشتنەوەی هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە بە ئامانجی کونترۆڵ کردنی سەدام. هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڕاونەتەوە بۆ ئەو شوێنانەی پێش "شالاوی زەبری بیابان". بە هێزی زەمینی و هەوایی و دەریایی و هێزێکی چەکداری دەریایی و زەمینی، بەتالیونێکی موشەکی **Patriot** و بەتالیونێکی میکانیزە پشتیوانی لە شالاوەکانی USCINCCENT دەکات. هەروەها لە کردەوەیەکی دیکەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی عێراق، فرۆکەیەکی( ١١٧ ـ F ) مان ناردووە بۆ کویت.

لە کاتی تەسلیم کردنی دوا راپورتەکەم تا ئێستا، UNCINCCENT قۆناخە سەرەتاییەکانی "شالاوی چڕبوونەوەی بیاوان"ی تەواو کردووە و سەرجەم هێزە شەڕکەرەکانی عەرەبستانی سعودی لە ناوچە ئارامترەکانی سەراسەری ئەم وڵاتە سەر لە نوێ جێگیر کردووە و قایم کردووە. بۆ بەهێزتر کردنی هێزی پاراستن لە سەراسەری ناوچە، هێزی ئاسایشپارێزی سەربازی زیادە جێگیر کراوە بۆ سوڕی بەردەوامی هێزەکانمان.

USCINCCENT بەردەوامە لە چاودێری توند بە سەر باروردۆخی ئاسایشی ناوچە بە مەبەستی مسۆگەر کردنی هێزی پارێزەر بەقەد پێویست. بڕیارنامەی ٩٤٩ ی UNSCR کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ پەسەند کراوە داوای لە عێراق کردووە هەڕەشە نەکات لە دراوسێکانی و کێشە دروست نەکات بۆ چالاکیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق و توانایی سەربازی خۆی زیاد نەکات لە باشووری عێراق. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ناکرێت متمانە بە سەدام بکرێت، پێویستە هێزێکی بەرچاوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە جێگیر بێت بۆ ئەوەی توانایی ئەوەیان هەبێت وەڵامی خێرا بدەنەوە بە دەستدرێژی عێراق یا هەڕەشە کردن لە دراوسێکانی.

ئێمە بەرەوپێشچوونێکی سنووردارمان لە باکووری عێراق بەدەست هێناوە بۆ باشتر کردنی ئاگربەستی ٢٣ ی تشرینی یەکەم و تەشویق کردنی ئاشتی سیاسی نێوان دو گروپی سەرەکی

کوردی عێراق واتا پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) . جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك، بەڕێز "رۆبێرت پلیتریۆ[1]" لە ۳۰ ی تشرینی یەکەم و ۱۵ ی تشرینی دووەم سەرۆکایەتی وتووێژەکانی نێوان PDK و PUK کردووە لە تورکیا و هەروەها نوێنەرانی تورکیا و بەریتانیاش دانیشتنیان بووە لە گەڵ ئەم دو گروپە. لەم وتووێژانەدا، ئێمە رەزامەندی ئەم دو حیزبەمان بە دەست هێناوە بۆ ئەوەی هێزی چاودێری ئاشتی(PMF ) – کە بێ لایەن و خۆجێیی بێت- هێڵی ئاگربەستی نێوان PDK و PUK دیاری بکات و چاودێری بە سەردا بکات. بۆ پشتگیری لە PMF ، من بە گوێرەی دەسەڵاتەکانی بەشی ۵۵۲ و ٦١٤ ی "یاسای یارمەتی بیانی ساڵی ١٩٦١" فەرمانم دا بڕی ٤ میلیون دولار لە حیسابی "ئیدارەی خزمەت و بەرگری" تەرخان بکرێت و وەزارەتی دەرەوە بڕیاری ئەوەی داوە کە پتر لە ۳ میلیون دولار تەرخان بکات بۆ دابینکردنی یونیفۆرم، خێوەت، موەلیدە و پێداویستیەکانی خۆپاراستنی تاکەکەسی بۆ هێزەکانی PMF . مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە چالاکیەکانی PMF بەردەوام و بە شێوازی رێکوپێك لە لایەن گروپێکی باڵای چاودێری ئاشتی ئاوتوێ دەکرێت کە لە ئانکارا کۆ دەبێتەوە و لە نوێنەرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا ، تورکیا و هەروەها ئەندامانی حیزبە پەیوەندیدارەکانی باکووری عێراق(مەبەستی یەکێتی و پارتییە- وەرگێڕ) پێکدێت. لەم کۆبوونەوە ئاست بەرزانە و کۆبوونەوە ئاست بەرزەکانی دیکە، حکومەتی ئەمریکا بەردەوام هۆشداری داوە بە لایەنە پەیوەندیدارەکان کە شەڕی ناوخۆ لە باکووری عێراق تەنها بە قازانجی سەدام حوسەین و ئێران تەواو دەبێت کە بە باوەڕی ئێمە نابێ هیچ دەورێك ببینن لە ناوچەدا. لەم پەیوەندییەدا ئێمە هەروا نگەرانین بە نیسبەت پەیوەندی PDK لە گەڵ دەوڵەتی عێراق و پەیوەندی PUK لە گەڵ ئێران.

سەرەڕای ئاگربەستی نێوان PUK وPDK و هەوڵەکانی دیکە، گەلێ لە دانیشتووانی باکووری عێراق بەردەوام لەگەڵ مەترسیەکانی دەوڵەتی عێراق روبەڕوون بە هۆی هاوکاری کردن لەگەڵ

---

[1] Robert Pelletreau

ڕێکخراوە ناحکومیەکانی سەر بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لەم چەند ساڵەی دواییدا کاری "دابینکردنی ئاسایش و حەسانەوە" یان لە باکووری عێراق ئەنجام داوە. لە وەڵامدا، حکومەتی ئەمریکا بە هاوکاری تورکیا، قۆناخی سێیەمی شاڵاوی لە ناوچە بردنەدەرەوەی نزیکەی ٣٧٨٠ کەس لە دانیشتوانی باکووری عێراقی ئەنجام داوە کە ژیانیان لە بەردەم مەترسی ڕاستەوخۆی ڕژێمی عێراقدا بووە. هەمووی ئەم کەسانە بە گوێرەی پرۆگرامی نیشتەجێ کردنی پەنابەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە "گوام[2]" نیشتەجێ کراون. زۆربەی ئەو ٢٧٠٠ کەسە کە لە دو قۆناخی پێشووتردا لە ناوچە براونەتە دەرەوە، ئێستا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیشتەجێ کراون.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە مرۆڤدۆستە فریاگوزارییەکان کار دەکات و بەردەوامە لە دابینکردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە خەڵکی باکووری عێراق. ئێمە ئەمساڵ بری ١٥ میلیون دۆلارمان تەرخان کردووە بۆ سندوقی فریاگوزاری نێونەتەوەیی منداڵانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و پرۆگرامی جیهانی خۆراک(WFP ) بۆ باکووری عێراق. بارودۆخی ئاسایشی باکووری عێراق هەروا زۆرە ئاڵۆزە و چالاکیەکانی PKK (پارتی کرێکارانی کوردستان) و ئێران زیاد بووە بە سەر مەترسیەکانی دەوڵەتی عێراق دا.

---

[2] Guam

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی عێراق
## ٧ ی ئاداری ١٩٩٧

بەرێز سەرۆکی کۆنگرێس
لە پەیوەندی لە گەڵ رێگە پێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی ٧ی کانوونی دووەم تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

سەدام حوسەین هەروا مەترسییە بۆ خەڵکی عێراق و ناوچە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەڵامێکی سەرکەوتووانەی دایەوە بەو هەڕەشە روو لە زیاد بوونەی کە لە ئەنجامی هێرشی سەدام بۆ سەر هەولێر لە مانگی ئاب دروست بوو، بەڵام سەدام بەردەوامە لە هەوڵەکانی بۆ قۆزتنەوەی ململانێیە مەحەلییەکانی باکووری عێراق بە قازانجی خۆی. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی درێژە دەدەن بە پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باشووری عێراق. سەرەڕای سەر لە نوێ دارشتنەوەی پێکهاتەی شاڵاوەکان، پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باکووریش بێ وچان بەردەوامە. بە هۆی ئاڵۆگۆڕ لە ئەرکەکانی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش لە ئەنجامی داخرانی ناوەندی فەرماندەیی سەربازی(MCC ) لە شاری زاخۆ لە عێراق و گۆڕینی ئاراستەی یارمەتیە مرۆڤدۆستانەکانی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان بەگوێرەی بڕیارنامەی ٩٨٤ ی UNSCR ، ئیدی "شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش" لە ژێر ئەم ناوە بەردەوام نابێت. بەریتانیا درێژە دەدات بە بەشداری کردن لەم ئەرکەدا بەڵام فەرانسا بڕیاری داوە ئیدی بەشداری نەکات لەم ئەرکەدا. هیچکام لەم ئاڵۆگۆڕانە کاریگەری نابێت لە سەر بەرپرسیاریتی فەرمی ئێمە بۆ پاراستنی تەواوی هەرێمی دژەفڕینی باکووری عێراق.

جگە لە شاڵاوە هەواییەکانمان، ئێمە درێژە دەدەین بە هێشتنەوەی هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە بە ئامانجی کونترۆڵ کردنی سەدام. هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڕاونەتەوە بۆ ئەو شوێنانەی پێش "شاڵاوی زەبری بیابان". بە هێزی زەمینی و هەوایی و دەریایی و هێزێکی چەکداری دەریایی و زەمینی، بەتالیونێکی موشەکی Patriot و بەتالیونێکی میکانیزە پشتیوانی لە شاڵاوەکانی USCINCCENT دەکات. هەروەها لە کردەوەیەکی دیکەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی عێراق، فڕۆکەیەکی( ١١٧ ـ F ) مان ناردووە بۆ کویت.

لە کاتی تەسلیم کردنی دوا راپورتەکەم تا ئێستا، UNCINCCENT قۆناخە سەرەتاییەکانی "شاڵاوی چڕبوونەوەی بیاوان"ی تەواو کردووە و سەرجەم هێزە شەڕکەرەکانی عەرەبستانی سعودی لە ناوچە ئارامترەکانی سەراسەری ئەم وڵاتە سەر لە نوێ جێگیر کردووە و قایم کردووە. بۆ بەهێزتر کردنی هێزی پاراستن لە سەراسەری ناوچە، هێزی ئاسایشپارێزی سەربازی زیادە جێگیر کراوە بۆ سوڕی بەردەوامی هێزەکانمان.

USCINCCENT بەردەوامە لە چاودێری توند بە سەر باروودۆخی ئاسایشی ناوچە بە مەبەستی مسۆگەر کردنی هێزی پارێزەر بەقەد پێویست. بڕیارنامەی ٩٤٩ ی UNSCR کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ پەسەند کراوە داوای لە عێراق کردووە هەڕەشە نەکات لە دراوسێکانی و کێشە دروست نەکات بۆ چالاکیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق و توانایی سەربازی خۆی زیاد نەکات لە باشووری عێراق. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ناکرێت متمانە بە سەدام بکرێت، پێویستە هێزێکی بەرچاوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچە جێگیر بێت بۆ ئەوەی توانایی ئەوەیان هەبێت وەڵامی خێرا بدەنەوە بە دەستدرێژی عێراق یا هەڕەشە کردن لە دراوسێکانی.

لە پەیوەندی لەگەڵ باکووری عێراق، ئێمە تا ئێستا لە٣ قۆناخدا گفتوگۆمان لەگەڵ حیزبە سەرەکییە کوردەکانی باکووری عێراق واتا یەکێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) و پارتی

دیموکراتی کوردستان (PDK) کردووه و شەریکە "بەریتانی و تورکیا" ییەکانیشمان بەشدارن لەم گفتگۆانەدا. ئامانجی راستەوخۆ و کتوپڕی ئێمە ئەوەیە کە ئاگربەستی ٢٣ ی تشرینی یەکەمی نێوان PUK و PDK بەهێز بکەین( کە بە ناوبژیوانی ئێمە پێکهاتووە و تا ئێستا هەروەك خۆی ماوەتەوە) و ئاشتەوایی سیاسی نێوان PUK و PDK هان بدەین. حکومەتی ئەمریکا بەردەوام هۆشداری دەدات بە لایەنە پەیوەندیدارەکان کە شەری یەکدی کوشتن لە باکووری عێراق تەنها بە قازانجی سەدام حوسەین و ئێرانە کە بە باوەڕی ئێمە نابێت هیچ دەورێکیان بێت لە ناوچەدا. لەم پەیوەندییەدا نیگەرانی ئێمە بەردەوامە بە نیسبەت پەیوەندییەکانی کوردەکانی عێراق لە گەڵ دەوڵەتی بەغداد و تاران.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی سیاسی، مالی و لۆجستیکی دابین دەکات بۆ هێزی چاوەدێری ئاشتی(PMF )-کە بێ لایەن و خۆجێیی بێت- لە باکووری عێراق کە هێڵی ئاگربەستی نێوان PUK و PDK یان دیاری کردووە و چاودێری دەکەن بە سەر ئەم ئاگربەستەدا. هێزەکانی PMF لە چەند هەفتەی داهاتوودا، بە تەواوی لە ناوچە جێگیر دەبەن. پشتیوانی ئێمە لە PMF بە شێوازی کالا و خزمەتگوزاری دەبێت بە گوێرەی ئەو فەرمانەی کە لە ١١ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٦ دەرم کردووە و بە گوێرەی ئەوە بڕە پارەیە کە بۆ دابینکردنی یارمەتییەکانی دیکە (بە پێی بڕیارێکی دیکەی وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا، بەڕێز "کرسیتۆفێر" لە ١٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦) خەرج دەکرێت .

ئێمە هەروەها هەر دوو گروپە کوردەکە تەشویق دەکەین بەرەو ئاشتبوونەوە هەنگاو هەڵبگرن. لە دوایین خولی وتووێژە ئاست بەرزەکان لە ئانکارا لە ١٥ ی کانوونی دووەم، کوردەکانی عێراق رەزامەندی خۆیان دەربڕیوە لە سەر پێکهێنانی کومیتەیەکی هاوبەش بۆ هاوکاری کردن لە بواری پەروەردە، تەندروستی و گوازتنەوە لەم ناوچانە. نوێنەرە مەحەلییەکانی ئەم دو گروپە کوردە و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا ، تورکیا و PMF بەردەوامن لە کۆبوونەوەکانیان لە ئانکارا کە دوهەفتە جارێك بەرێوەدەچێت. هەموو هەولی ئێمە بە گوێرەی رەوتی ئانکارا(هەر

وەك هەوڵەکانی دیکەمان له پەیوەندی له گەڵ عێراقدا) ئەوەیه که بەردەوام پشتیوانی بکەین له یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی عێراق.

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا به کۆنگرێس دەربارەی عێراق
## ٨ ی مایسی ١٩٩٧

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس
له پەیوەندی لەگەڵ رێگەپێدان به بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك له هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق به جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی ٧ی ئادار تا ئێستا له خۆ دەگرێت.
سەدام حوسەین هەروا مەترسییە بۆ خەڵکی عێراق و ناوچە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەڵامێکی سەرکەوتووانەی دایەوە بەو هەڕەشە روو له زیاد بوونەی که له ئەنجامی هێرشی سەدام بۆ سەر هەولێر له مانگی ئاب دروست بوو، بەڵام سەدام بەردەوامە له هەوڵەکانی بۆ قۆزتنەوەی ململانێیە مەحەلییەکانی باکووری عێراق به قازانجی خۆی. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی درێژە دەدەن به پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باشووری عێراق.
سەرەڕای سەر له نوێ داڕشتنەوەی پێکهاتەی شاڵاوەکان، پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی باکووریش بێ وچان بەردەوامە. به هۆی ئاڵۆگۆڕ له ئەرکەکانی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش له ئەنجامی داخرانی ناوەندی فەرماندەیی سەربازی(MCC ) له شاری زاخۆ له عێراق و گۆڕینی ئاراستەی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکانی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان بەگوێرەی بڕیارنامەی ٩٨٤ ی UNSCR ، ئیدی "شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش" له ژێر ئەم ناوە بەردەوام نابێت. بەریتانیا درێژە دەدات به بەشداری کردن لەم ئەرکەدا بەڵام فەرانسا بڕیاری داوە ئیدی بەشداری نەکات لەم

ئەركەدا. هیچكام لەم ئالۆگۆڕانە كاریگەری نابێت لە سەر بەرپرسیاریتی فەرمی ئێمە بۆ پاراستنی تەواوی هەرێمی دژەفڕینی باكووری عێراق.

جگە لە شاڵاوە هەواییەكانمان، ئێمە درێژە دەدەین بە هێشتنەوەی هێزەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ناوچە بە ئامانجی كۆنترۆڵ كردنی سەدام. هێزەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا گەڕاونەتەوە بۆ ئەو شوێنانەی پێش "شاڵاوی زەبری بیابان". بە هێزی زەمینی و هەوایی و دەریایی و هێزێكی چەكداری دەریایی و زەمینی، بەتالیونێكی موشەكی Patriot و بەتالیونێكی میكانیزە پشتیوانی لە شاڵاوەكانی USCINCCENT دەكات. هەروەها لە كردەوەیەكی دیكەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی عێراق، فڕۆكەیەكی( F ـ ١١٧ ) مان ناردووە بۆ كویت.

لە كاتی تەسلیم كردنی دوا ڕاپورتەكەم تا ئێستا، UNCINCCENT قۆناخە سەرەتاییەكانی "شاڵاوی چڕبوونەوەی بیاوان"ی تەواو كردووە و سەرجەم هێزە شەڕكەرەكانی عەرەبستانی سعودی لە ناوچە ئارامترەكانی سەراسەری ئەم وڵاتە سەر لە نوێ جێگیر كردووە و قایم كردووە. بۆ بەهێزتر كردنی هێزی پاراستن لە سەراسەری ناوچە، هێزی ئاسایشپارێزی سەربازی زیادە جێگیر كراوە بۆ سوری بەردەوامی هێزەكانمان.

USCINCCENT بەردەوامە لە چاودێری توند بە سەر بارودۆخی ئاسایشی ناوچە بە مەبەستی مسۆگەر كردنی هێزی پارێزەر بەقەد پێویست. بڕیارنامەی ٩٤٩ ی UNSCR كە لە تشرینی یەكەمی ١٩٩٤ پەسەند كراوە داوای لە عێراق كردووە هەڕەشە نەكات لە دراوسێكانی و كێشە دروست نەكات بۆ چالاكیەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان لە عێراق و توانایی سەربازی خۆی زیاد نەكات لە باشووری عێراق. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی كە ناكرێت متمانە بە سەدام بكرێت، پێویستە هێزێكی بەرچاوی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ناوچە جێگیر بێت بۆ ئەوەی توانایی ئەوەیان هەبێت وەڵامی خێرا بدەنەوە بە دەستدرێژی عێراق یا هەڕەشە كردن لە دراوسێكانی.

لە پەیوەندی لە گەڵ باکووری عێراق، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە دەدات بە ڕێبەرایەتی کردنی هەوڵەکان بۆ زیاد کردنی ئاسایش و سەقامگیری باکووری عێراق و کەم کردنەوەی هەوڵەکانی دەوڵەتی ئێران و عێراق بۆ هەڕەشە کردن لە هاوولاتیانی باکووری عێراق. جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەلاتی نزیك، بەڕێز "دەیڤید وێلش"، بە سەرۆکایەتی لیژنەیەك لە ٣ و ٤ ی نیسانی سەردانی باکووری عێراقی کردووە کە یەکەم سەردانی کاربەدەستێکی فەرمی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لە باکووری عێراق لە کاتی هێرشی دەوڵەتی عێراق بۆ ناوچە لە ئەیلوولی ١٩٩٦ و یەکەم سەردانێکە کە لە ماوەی سالانی ڕابردوو لەم ئاستە بەرزەدا ئەنجام دراوە .

بەڕێز "وێلش " لە گەڵ ڕێبەرانی دو گروپی سەرەکی کوردی عێراق واتا مەسعود بارزانی، ڕێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان( PDK) و جەلال تالەبانی، ڕێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) دیداری کردووە. هەر دوی ئەم دو ڕێبەرە کوردە عێراقییە جەختیان لە سەر پشتیوانی کردن لە سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دەروەسبوونیان بە هاوکاری کردن لە گەڵ ئێمە کردووەتەوە لە ڕێگای "ڕەوتی ئاشتبوونەوی ئانکارا". بەڕێز "وێلش " هەروەها لەگەڵ ڕێبەرانی سیاسی ئاشوری و تورکمانەکانی عێراق و کارمەندانی PMF و کاربەدەستانی نەتەوە یەکگرتووەکان دیداری کردووە.

دەربارەی ڕەوتی ئانکارا بۆ یارمەتیدانی PUK و PDK بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانیان، ئێمە کارئاسانیمان کردووە بۆ دەستپێکردنەوەی خولی سێیەمی وتووێژە ئاست بەرزەکانی PUK و PDK لە گەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ،تورکیا و بەریتانیا. ئامانجی کتوپڕی ئێمە لەم ڕەوتە ئەوەیە کە ئاگربەستی ٢٣ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦ بەهێز بکەین کە بە ناوبژیوانی ئەمریکا پێکهاتووە و هەروەها ئاشتی سیاسی نێوان PUK و PDK تەشویق بکەین .

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی سیاسی، مالی و لۆجستیکی دابین دەکات بۆ هێزی چاوەدێری ئاشتی(PMF )- کە بێ لایەن و خۆجێیی بێت- لە باکووری عێراق کە هێڵی

ئاگربهستی نێوان PUK و PDK یان دیاری كردووه و چاودێری دهكهن بهسهر ئهم ئاگربهستهدا. پشتیوانی ئێمه له PMF به شێوازی كالاّ و خزمهتگوزاری دهبێت به گوێرهی ئهو فهرمانهی كه من له ١١ ی كانوونی یهكهمی ١٩٩٦ دهرم كردووه وهەروهها به شێوازی ئهوه بڕه پارهیه كه خهرج دهكرێت بۆ دابینكردنی یارمهتییهكانی دیكه به گوێرهی بڕیارێكی دیكهی وهزیری دهرهوهی پێشووی ئهمریكا، بهڕێز "كرسیتۆفێر" له ١٠ ی تشرینی دووهمی ١٩٩٦.

PMF له ناوهڕاستی مانگی نیسانهوه دهستی كردووه به جێگیر بوونی تهواو له ناوچه و تا ئێستا توانیویهتی چهند جار پێش له پێشێل كردنی ئاگربهست بگرێت. PMF ههروهها توانیویهتی یارمهتی به لێكنزیكبوونهوهی ئهم دو حیزبه كورده بدات، بۆ نمونه له ٤ ی نیسانی نزیكهی ٧٠ كهس له دیلهكانی ههر دولای ئازاد كردووه. ئهم دو گروپه كورده عێراقیه ههروا درێژه دهدهن به كار كردن بۆ ئاشتبوونهوه، لهوانه كۆبوونهوهی ١٢ ی ئادار بۆ پێكهێنانی كومیتهیهكی هاوكاری هاوبهشی بهرزتر بۆ باشتر كردنی هاوكاری خزمهتگوزاری مهدهنی وهك كارهبا و تهندروستی. نوێنهرانی مهحهلی دو حیزبه كوردهكه و ئهمریكا ، بهریتانیا ، توركیا و PMF درێژه به كۆبوونهوهكانیان له ئانكارا دهدهن كه ههر ١٥ رۆژ جارێك بهڕێوه دهچێت.

بارودۆخی ئاسایشی باكووری عێراق ههروا ئاڵۆزه و چالاكی ئێران و PKK (پارتی كرێكارانی كوردستان) زیاد بووه به سهر مهترسیهكانی دهوڵهتی عێراق. ههموو ههوڵی ئێمه له رهوتی ئانكارا(ههر وهك ههوڵهكانی دیكهمان له پهیوهندی له گهڵ عێراقدا) ئهوهیه كه پشتیوانی بكهین له یهكێتی و یهكپارچهیی خاكی عێراق.

راپۆرتی سهرۆك كۆماری ئهمریكا به كۆنگرێس دهربارهی عێراق

٩ ی تهموزی ١٩٩٧

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس

لە پەیوەندی لەگەڵ ڕێگە پێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، ڕاپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم ڕاپۆرتە قۆناخی ٨ی مایس تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

بە نیسبەت باکووری عێراق، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە دەدات بە ڕێبەرایەتی کردنی هەوڵەکان بۆ زیاد کردنی ئاسایش و سەقامگیری باکووری عێراق و کەم کردنەوەی هەوڵەکانی دەوڵەتی ئێران و عێراق بۆ هەڕەشە کردن لە هاووڵاتیانی باکووری عێراق. جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیك، بەڕێز "دەیڤید وێلش"، پاش سەردانە سەرکەوتووەکەی بۆ باکووری عێراق لە سەرەتای نیسان، لە ١٤ ی مایس لە تورکیا سەروکایەتی لیژنەیەکی کردووە بۆ یارمەتیکردن بە چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانی نێوان دو گروپی سەرەکەی کوردی واتا پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK) بە ڕێبەرایەتی مەسعود بارزانی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK) بە ڕێبەرایەتی جەلال تاڵەبانی.

لە میانەی ئەم کۆبوونەوەیەی دواییە بە گوێرەی ڕەوتی ئانکارا، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ، بریتانیا و تورکیا کە پشتیوانی ئەم وتووێژانەن، ڕەزامەندی لیژنەکانی PDK و PUK یان بە دەست هێناوە بۆ هەلگرتنی هەنگاوی جۆراوجۆر بۆ بەهێزتر کردنی ئاگربەستی ٢٣ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦ ی نێوان ئەم دو گروپە کوردە عێراقییە و تەشویق کردنی ئاشتبوونەوەی سیاسی نێوان ئەم دو گروپە.

هەروەها نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی تورکمان و ئاشورییەکانی عێراق کە سەربە هێزی بێ لایەن و خۆجێیی چاودێری ئاشتی(PMF )ن لە خولی چوارەمی وتووێژەکان لە ئانکارا بەشداری دەکەن. بەشداری بووانی PMF لەم وتووێژانە درێژە دەدەن بە یارمەتیدانی گروپە کوردەکانی عێراق بۆ بەرەوپێشچوون لە بوارەکانی دیکە کە دواییان، پێکهێنانی چەند کومیتەی دانیشتنی هاوبەش

بوو له ۲۹ ی مایس که تێیدا باسی خزمەتگوزارییە مەدەنیەکان و مەسەلە مرۆڤدۆستانەکانی پەیوەندیدار بە دانیشتووانی باکووری عێراق کراوە. نوێنەرە مەحەلیەکانی PDK و PUK و ئەمریکا ، بەریتانیا ، تورکیا و PMF درێژە بە دانیشتنەکانیان دەدەن که هەر ۱۵ رۆژ جارێك له ئانکارا بەرێوەدەچێت و بەرەوپێش دەچەن له رێگاکانی پتەو کردنی متمانەی هەر دوو لا بە یەکدی.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی سیاسی، مالی و لۆجستیکی دابین دەکات بۆ هێزی چاوەدێری ئاشتی(PMF )- که بێ لایەن و خۆجێیی بێت- له باکووری عێراق که هێلی ئاگربەستی نێوان PUK و PDK یان دیاری کردووە و چاودێری دەکەن بە سەر ئەم ئاگربەستەدا. پشتیوانی ئێمە له PMF بە شێوازی کالا و خزمەتگوزاری دەبێت بە گوێرەی ئەو فەرمانەی که من له ۱۱ ی کانوونی یەکەمی ۱۹۹٦ دەرم کردووە وهەروەها بە شێوازی ئەوە برە پارەیە که خەرج دەکرێت بۆ دابینکردنی یارمەتییەکانی دیکە بە گوێرەی بریارێکی دیکەی وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا، بەرێز "کرسیتۆفێر" له ۱۰ ی تشرینی دووەمی ۱۹۹٦.

PMF له ناوەراستی مانگی ئاڤریلەوە دەستی کردووە بە جێگیر بوونی تەواو له ناوچە و تا ئێستا توانیویەتی چەند جار رێ له پێشێل کردنی ئاگربەست بگرێت.

بارودۆخی ئاسایشی باکووری عێراق هەروا ئالۆزە و چالاکی ئێران و PKK (پارتی کرێکارانی کوردستان) زیاد بووە بە سەر مەترسیەکانی دەولەتی عێراق. هەموو هەولی ئێمە له رەوتی ئانکارا(هەر وەك هەولەکانی دیکەمان له پەیوەندی له گەل عێراقدا) ئەوەیە که پشتیوانی بکەین له یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی عێراق.

راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی عێراق

۲۳ ی ئەیلوولی ۱۹۹۷

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس

لە پەیوەندی لە گەڵ ڕێگە پێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی ٩ی تەموز تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

لە پەیوەندی لەگەڵ باکووری عێراق، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژە دەدات بە ڕێبەرایەتی کردنی هەوڵەکان بۆ زیاد کردنی ئاسایش و سەقامگیری باکووری عێراق و کەم کردنەوەی هەوڵەکانی دەوڵەتی ئێران و عێراق بۆ هەڕەشە کردن لە هاوڵاتیانی باکووری عێراق. بەشێکی گرینگ لەم هەوڵە کار کردن بووە بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی نێوان دو گروپی سەرەکی کوردی عێراق واتا پارتی دیموکراتی کوردستان( PDK) بە ڕێبەرایەتی مەسعود بارزانی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) بە ڕێبەرایەتی جەلال تاڵەبانی. تاڵەبانی لە کۆتایی مانگی تەموز سەردانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کردووە بۆ دیدار لە گەڵ راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، بەڕێز "سەندی بیرگێر[1]" و جێگری وەزیری دەرەوە، بەڕێز "توماس پیکرینگ[2]" و باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان ، بەڕێز "بیل ریچاردسۆن[3] " . جەلال تاڵەبانی لەم دانیشتنانەدا جەختی کردووەتەوە لە سەر پشتیوانی کردن لە "ڕەوتی ئانکارا" بۆ بەرەوپێشبردنی وتووێژەکانی ئاشتی نێوان PDK و PUK کە بە پشتیوانی ئەمریکا ، تورکیا و بەریتانیا بەڕێوە دەچێت. لەم دواییانە، مەسعود بارزانی، ڕێبەری PDK یش بانگهێشتی ئێمەی قبوڵ کردووە بۆ واشنگتۆن. وەك بەشێك لە پرۆسەی ئانکارا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی سیاسی، ماڵی و لوجێستیکی دابین کردووە بۆ هێزی بێ لایەنی خۆجێیی چاودێری ئاشتی(PMF ) کە ئاشورییەکان و تورکمانەکانیش تێیدا

**Sandy Berger**[1]
**Thomas Pickering**[2]
**Bill Richardson**[3]

بەشدارن. PMF لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٦ هێڵی ئاگربەستی نێوان PDK و PUK دیاری کردووە و چاودێری دەکات بە سەر ئاگربەستەکەدا .
PMF لە ناوەڕاستی نیسانی ١٩٩٧ -ەوە دەستی کردووە بە جێگیر بوونی تەواو لە ناوچە و چاوەڕوان دەکرێت ژمارەی هێزەکانی تا کۆتایی ئەمساڵ بۆ ٤٠٠ کەس دوقات بکرێتەوە. PMF درێژە دەدات بە لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی راپۆرتەکانی پەیوەندیدار بە پێشێل کردنی ئاگربەست. کاری PMF دژوارتر بووە لە بەر ئەوەی کە هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK ) لە سنووری تورکیا هاتوون بەرەو هێڵی ئاگربەستی نێوان PDK و PUK . PDK بانگەشەی ئەوە دەکات کە هێزەکانی PKK لە هێڵی ئاگربەست دەرباز دەبن بۆ هێرش کردنە سەر PDK. PDK هەروەها بانگەشەی ئەوەش دەکات کە PUK پەیوەست بووە بە هەندێ لەم هێرشانەی PKK ، بەڵام PUK ئەم بانگەشانەی رەت کردووەتەوە.
وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە گەڵ بەریتانیا و تورکیا درێژە دەدەن بە جەخت کردنەوە لە سەر گرنگی چاوەدێری ورد بە سەر ئاگربەستدا. بەشێکی دیکەی بەرپرسیارێتی ئێمە لە بەرامبەر خەڵکی باکووری عێراق، دابینکردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەیە بۆ ئەو کەسانە کە پێویستیان بەم یارمەتییە هەیە . وەك بەشێك لەم بەرپرسیارێتییە، "ئیدارەی کارەساتی بیانی"( AID) ٤ میلیون دولاری دیکەی تەرخان کردووە بۆ پرۆژە خزمەتگوزارییەکان لە ناوچە. ئەم پرۆگرامە کە لە ٣١ ی تەموز راگەیاندراوە، پێداویستی تەندروستی و خوراك دابین دەکات بۆ ٨٠ هەزار ژن و منداڵی دەربەدەر و پێداویستیەکانی ئاوی خواردنەوە و پاك و خاوێن دابین دەکات بە تایبەت لە پارێزگای سلیمانی کە لە ژێر کونترۆڵی PUK دایە.
بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەرتاسەری عێراق هەر وەك خۆی ماوەتەوە و هیچ ئاڵوگۆڕێکی بە سەردا نەهاتووە. سەرکوتی خەڵکی شیعە بە دەستی دەوڵەتی عێراق هەروا بەردەوامە و سیاسەتگەلێك بەڕێوە دەچێت بۆ لە ناوبردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان" لە باشووری عێراق و لە ناوبردنی ژینگەی "مارشەکانی باشوور ".

نەتەوە یەکگرتووەکان لـە دوایـین راپۆرتـەکانی دەربـارەی جێبـەجێ کردنـی بڕیارنامـەی ٩٨٦ ی UNSCR ، ئەوەی پشتڕاست کردووەتـەوە کـە دەوڵـەتی عێـراق درێـژە دەدات بـە دەرکردنـی زۆرەملێی دانیشتووانی کەرکوك و ناوچەکانی دیکەی باکووری عێراق کە هێشتا لە ژێر کونترۆڵی دەوڵـەتی عێراقـدان. دەوڵـەتی عێـراق هـیچ نیـشانەیەکی دەرنەخـستووە بـۆ جێبـەجێ کردنـی بڕیارنامـەی ٦٨٨ ی UNSCR کـە داوا لـە عێـراق دەکـات سـەرکووتی خـەڵکی عێـراق رابوەستێنێت. هەوڵی گروپە ئۆپۆزوسیونەکانی عێراق و رێکخراوە نادەوڵەتیـەکان بەردەوامـە بـۆ بەڵگەمەند کردنی تاوانەکانی جەنگی عێـراق و پێـشلکارییەکانی دیکـەی یاسـای مرۆڤدۆسـتانە نێونەتەوەییەکانی دیکە کە بە INDICT ناسراوە.

### راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی عێراق

### ٢٦ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧

**بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس**

**لە پەیوەندی لە گەڵ رێگە پێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێـراق(یاسـای گـشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتـان بـۆ دەنێـرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بـە جێبـەجێ کردنـی بڕیارنامـەکانی ئەنجوومـەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی ٢٣ی ئەیلول تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.**

دەربارەی شالاوە سەربازییەکان، ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی درێـژە دەدەن بـە پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی عێراق بـە گـوێرەی شـالاوی چـاودێری بـاکوور و شـالاوی چـاودێری باشوور. ئێمە هەزاران دەستدرێژی دەوڵەتی عێراقمـان بـۆ سـەر ئـەم هەرێمـە دژەفڕینـە کەشـف کردووە. لە کاتێکدا کە ئەم رووداوانە چەند کاتژمێر پاش هێرشی هەوایی ئێران بۆ سەر بنکەکانی

تێرۆریستەکان(مەبەستی هێرش بۆ سەر بنکەکانی "موجاهیدینی خەلق" لە نزیکی بەغدادە-وەرگێڕ) لە ناوخۆی عێراق دەستی پێکرد، روونە کە ئامانجی عێراق ئەوە بوو کە بە هاوپەیمانان نیشان بدات عێراق چەندە دەتوانێ قەدەغە بوونی فڕین لەم ناوچانە پێشێل بکات. هەوڵی زۆری هێزەکانی "شالاوی چاودێری باشوور" کە بە هاتنی گروپی USSNIMITZ ئەنجام درا، بە شێوازێکی بەرچاو دەستدرێژییەکانی دەوڵەتی عێراقی بۆ سەر هەرێمی دژەفڕینی باشوور کەم کردەوە و لە ئەنجامی زیاد بوونی ژمارەی فڕۆکە پشتیوانەکانی هەرێمی دژەفڕینی باکوور و چوونە سەرەوەی توانایی شالاوەکە، ژمارەی دەستدرێژییەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ سەر هەرێمی دژەفڕینی باکوور کەم بووەتەوە.

ئێمە بەردەوام بۆ دەوڵەتی عێراق و سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکانی دیکەمان روون کردووەتەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەردەوام دەبن لە پاراستنی هەر دوو هەرێمی دژەفڕینی باکوور و باشوور و ئێمە بە مافی خۆمانی دەزانین کە وەڵامی گونجاو و خێرا بدەینەوە بە هەر چەشنە دەستدرێژییەکی عێراق. دەربارەی باکووری عێراق، هەوڵەکانی ئێمە بۆ یارمەتیدانی چارەسەر بوونی ناکۆکیەکانی نێوان مەسعود بارزانی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و جەلال تاڵەبانی، رێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) هێشتا نەگەیشتووە بە چارەسەرییەکی هەمیشەیی و سەقامگیرانە کە خەڵکی باکووری عێراق چاوەروانی دەکەن.

هێزی چاودێری ئاشتی ـ کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا و تورکیا بە گوێرەی رەوتی ئانکارا پشتیوانی لێدەکەن و لە ئاشووری و تورکمانەکانی عێراق پێکدێ ـ ناچار کراوە لە هێڵی ئاگربەستی نێوان PUK و PDK پاشەکشە بکات کاتێك کە هێزەکانی PUK لە گەڵ هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK ) هێرشێکی بەربلاویان کردووەتە سەر بنکەکانی PDK لە ١٣ ی تشرینی یەکەم. PDK یش لە ٨ ی تشرینی دووەم بە پشتیوانی هێرشە

هەواییەكان و هێــزە زەمینیــەكانی ســوپای توركیــا، دژە هێرشــێكی كردووەتــە ســەر هێزەكــانی PUK.

ئێمە یارمەتی هەر دوولامان داوە بۆ گەیشتن بە ئاگربەستێكی كاتی و گەیانـدنی خزمــەتگوزاری مرۆڤدۆستانە لە كاتی ئەم شەڕەدا، بەڵام هۆكارە سەرەكیەكانی ئەم ناكۆكییە هەر لە جێی خۆیدا. ئێمە درێژە بە هەوڵەكانمان دەدەین بۆ گەیشتن بە ڕێگاچارەیەكی هەمیشەیی لە ڕێگای ناوبــژیوانی كردن لە نێوان ئەم دو لایەنە بۆ ئەوەی هەل بۆ دەوڵەتی ئێران یا عێراق نەڕەخـسێت دەست بخەنــە ناو ناكۆكیەكە و هەڕەشە بكەن لە دانیشتووانی عێراق لەم ناوچەیە.

راپۆرتی سەرۆك كۆماری ئەمریكا بە كۆنگرێس دەربارەی عێراق

٣ ی شوباتی ١٩٩٨

بەڕێز سەرۆكی كۆنگرێس

لە پەیوەندی لە گەڵ ڕێگە پێدان بە بەكارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێـراق(یاسـای گـشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەكانم بۆ ئاگادار كردنەوەی تەواوی كۆنگرێس، راپۆرتتــان بــۆ دەنێـرم دەربارەی هەوڵەكانمان بۆ ملكەچ كردنی عێراق بــە جێبــەجێ كردنــی بڕیارنامــەكانی ئەنجوومــەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان. ئەم راپۆرتە قۆناخی٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ تا ئێــستا لــە خۆ دەگرێت.

دەربارەی باكووری عێراق، ئاگربەستی نێوان حیزبە كوردەكان كە لــە ئــەنجامی هەوڵــەكانی وڵاتــە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لــە ٢٤ ی تــشرینی دووەمــی ١٩٩٧ پێكهــات، هــەروا راگــیراوە. لــەم هەفتانەی دوایی هەم مەسعود بارزانی، ڕێبــەری پــارتی دیمــوكراتی كوردســتان(PDK ) و هــەم جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری یەكێتی نیشتمانی كوردستان(PUK ) لێدوانی ئەرێنی و هیوابەخـشیان

داوە دەربارەی ئاشتبوونەوەی سیاسی کە لەوانەیە نیشانەیەك بێت بۆ چارەسەر کردنی هەندێ لە ناکۆکیەکانیان .
ئێمە لە ڕێگای ناوبژیوانی کردن لە نێوان گروپە کوردەکان درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ گەیشتن بە ڕێگاچارەیەکی هەمیشەیی. بە مەبەستی یارمەتیدانی خەڵکی باکووری عێراق بۆ ئەوەی بگەن بە سازشێکی هەمیشەیی و سەقامگیر(کە شایانیان بێت) و کەم کردنەوەی هەل بۆ دەوڵەتی ئێران و عێراق بۆ دەستێوەردان لە ناکۆکیەکان و هەڕەشە کردن لە هاوولاتیانی عێراقی لەم ناوچەیە، هێزی چاودێری ئاشتی ـ کە بە گوێرەی ڕەوتی ئانکارا لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا و تورکیا پشتیوانی لێدەکرێت و لە ئاشووری و تورکمانەکانی عێراق پێکدێت ـ لە بنکەکانی خۆی دەمێنێتەوە.

راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بریارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش نەتەوە یەکگرتووەکان
٢٤ ی حوزەیرانی ١٩٩٨

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس
لە پەیوەندی لەگەڵ ڕێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ ـ ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی٣ی نیسان تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

شالاّوی چاودێری باکوور و شالاّوی چاودێری باشوور

ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزه هاوپەیمانەکان بەردەوامن له پاراستنی هەرێمی دژەفـڕینی عێراق به گوێرەی "شالاّوی چاودێری باکوور" و "شالاّوی چاودێری باشوور". له وەلاّمی زنجیرەیەك دەستدرێژی عێراق بۆ سەر هەرێمی دژەفڕین له تشرینی یەکەم و تشرینی دووەمی ١٩٩٧ ، ئێمـه ژمارەی فروکەکانمان زیاد کردووه لەم شالاّوەدا، پاش ئەوه هیچ دەسـتدرێژییەکی عێـراق بـۆ سـەر هەرێمی دژەفڕین نەبینراوە. له سەرەتای مانگی نیسان ئێمـه سـەرلەنوێ ئاسـتی هێزەکانمـان لـه "شالاّوی چاودێری باکوور" بەرز کردووەتەوە.

ئێمه بۆ دەوڵەتی عێراق و سەرجەم لایەنه پەیوەندیدارەکانی دیکەمان روون کردووەتەوە که ولاّتـه یەکگرتووەکانی ئـەمریکا و هێـزه هاوپەیمانـەکان درێـژە دەدەن بـه پاراسـتنی هـەر دو هـەرێمی دژەفڕینی باکوور و باشوور. له سەرەتای"بەرنامەی نەوت له بەرامبـەر خـوراك" ئێمـه بـەردەوام کارمان کردووه له گەڵ نەتەوه یەکگرتووەکان و دەولـەتانی ئەنـدامی نەتـەوه یـەکگرتووەکان بـۆ دۆزینەوەی رێگاگەلێك بۆ ئەوەی ئـەم بەرنامەیـه باشـتر وەلاّمـی پێداویـستە مرۆڤدۆسـتانەکانی هاوولاّتیانی عێراق بداتەوە. به هەرحاڵ عێراق وەك هەمیشه نەیتوانیوه به تەواوی له گەڵ نەتـەوه یەکگرتووەکان هاوکاری بکات بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانی "بەرنامەی نەوت له بەرامبەر خـۆراك" ، بۆ نمونه له ساڵی ١٩٩٧ دەوڵەتی عێراق سەرپێچی کردووه له ناردنه دەرەوەی نەوت به مـاوەی ٣ مانگ به پێچەوانەی بڕیارنامەی ٩٨٦ ی UNSCR ، ئەمه له کاتێکدا که هەموو کەسێك سەرزنشی نەتەوه یەکگرتووەکان و ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکـات بـۆ بـچڕانی خـۆراك و دەواو دەرمانی عێراق که خودی دەوڵەتی عێراق بەرپرسیارێتی.

دەوڵەتی عێراق پاش تەشوێق کردنەکانی دەفتـەری سـکرتێری گـشتی نەتـەوه یـەکگرتووەکان ، سەرەنجام بەرنامەیەکی باشی بۆ دابەشکردنی خۆراکی تەسلیم به نەتەوه یەکگرتووەکان کردووه که بـــه بڕیارنامـــەی ١١٥٣ ی UNSCR ناســـراوە. بڕیارنامـــەی ١١٥٣ داوای کـــردووه هەڵسەنگاندنێکی سەربەخۆ له سەرچاوەی نەوتی عێراق بکرێـت بـۆ ئـەوەی دیـاری بکرێـت ئایـا

عێراق ده‌توانێ ٥/٢ بیلیون دولار نه‌وت له‌ قۆناخێکی ١٨٠ رۆژیدا هه‌ناردە‌ی ده‌ره‌وه‌ بکات. ئه‌م راپۆرته‌ که‌ له‌ ١٥ ی نیسان ته‌سلیم به‌ UNSC کراوه‌، پێشنیاری ئه‌وه‌ی کردووه‌ که‌ کومیته‌ی گه‌مارۆکان پتر له‌ ٣٠٠ میلیون دولار ته‌رخان بکات بۆ چاککردنه‌وه‌ی دامه‌زراوه‌ نه‌وتیه‌کانی عێراق له‌ ماوه‌ی قۆناخێکدا که‌ بریارنامه‌ی ١١٥٣ ی UNSCR دیاری ده‌کات. ولاته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا نیازی خۆی ده‌ربڕیوه‌ بۆ پشتیوانی کردن له‌ پێشنیاری چاککردنه‌وه‌ی دامه‌زراوه‌ نه‌وتیه‌کانی عێراق به‌ مه‌رجێك که‌ به‌ ته‌واوی له‌ گه‌ڵ ئامانجه‌ مرۆڤدۆستەکانی بریارنامه‌ی ١١٥٣ ی UNSCR سازگار بێت و نه‌ته‌وه‌ یه‌کگرتووه‌کان بتوانێ چاودێری گونجاو بکات به‌سه‌ر هه‌موو قۆناخه‌کانی ئه‌م ره‌وتی چاککردنه‌وه‌یه‌. ئێمه‌ به‌رده‌وامین له‌ کار کردن له‌ گه‌ڵ ئه‌ندامانی ئه‌نجوومه‌نی ئاسایش بۆ چاره‌سه‌ر کردنی نیگه‌رانیه‌کان.

بریارنامه‌ی ١١٥٣ هه‌روه‌ها به‌رنامه‌یه‌کی جیاوازی داناوه‌ بۆ باکووری عێراق که‌ راسته‌وخۆ له‌ لایه‌ن نه‌ته‌وه‌ یه‌کگرتووه‌کان به‌ راوێژ له‌ گه‌ڵ دانیشتوانی ناوچه‌ جێبه‌جێ ده‌کرێت. ئه‌م به‌رنامه‌یه‌ ١٣ تا ١٥٪ له‌ داهاتی "به‌رنامه‌ی نه‌وت له‌ به‌رامبه‌ر خۆراك" ته‌رخان ده‌کات بۆ باکووری عێراق. ولاته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا به‌ توندی پشتیوانی له‌م به‌رنامه‌یه‌ ده‌کات. ئه‌م به‌رنامه‌ جیاوازه‌ له‌ به‌ر ئه‌وه‌ بۆ باکووری عێراق دانراوه‌ که‌ رژێمی عێراق هیچ بایه‌خێك نادات به‌ بارودۆخی ژیانی مرۆڤی که‌مینه‌ی کورد ، ئاشووری و تورکمانی باکووری عێراق و ئاماده‌یه‌ به‌ درندانه‌ترین شێوه‌ بیانچه‌وسێنێته‌وه‌. زنجیره‌ هێرشه‌ کیمیاییه‌ به‌ڵگه‌مه‌نده‌کانی ده‌یه‌ی پێشوو له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌تی عێراق دژی خه‌ڵکی سڤیلی باکووری عێراق ته‌نها یه‌کێ له‌ نمونه‌کانی ئه‌م درندایه‌تییه‌یه‌. له‌ باکووری عێراق که‌ له‌ ژێر کونترۆڵی ده‌وڵه‌تی ناوه‌ندیدا نییه‌ "به‌رنامه‌ی نه‌وت له‌ به‌رامبه‌ر خۆراك" بێ هیچ راوه‌ستانێك جێبه‌جێ کراوه‌. حیزبه‌ کورده‌کان هه‌وڵ ده‌ده‌ن ناکۆکیه‌کانیان بنێنه‌ لاوه‌ و پێکه‌وه‌ کار بکه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی بریارنامه‌ی ١١٥٣ ی UNSCR به‌ باشترین شێوه‌ جێبه‌جێ بکرێت. له‌ ئه‌نجامدا جیاوازی نێوان باکوور و شوێنه‌کانی دیکه‌ی عێراق زه‌ق ده‌بێته‌وه‌.

نەتەوە یەكگرتووەكان دەبێ بە دیقەتەوە چاودێری بكات بەسەر جێبەجێ بوونی بڕیارنامەی ١١٥٣ . دەوڵەتی عێراق بەردەوامە لە پێداگری كردن لە سەر پێویستی هەڵگرتنی دەستبەجێی گەمارۆكان، ئەمە لە كاتێكدا كە بەهەرحاڵ ئەنجامنامەی ملكەچ نەبوونی عێراق بە ئەرك و بەرپرسیاریتیەكانی بە گوێرەی بڕیارنامەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان ئاشكرایە، ئەنجامنامەیەك كە لە كۆبوونەوەی ٣٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایش (بۆ چاودێری كردن بە سەر گەمارۆكان) لە ٢٧ ی نیسان بەتێكڕای دەنگ بە فەرمی ناسراوە.

ئێمە درێژە دەدەین بە كار كردن لەگەڵ سكرەتێری نەتەوە یەكگرتووەكان ، ئەنجوومەنی ئاسایش و ئەندامانی دیكەی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ مسۆگەر كردنی ئەوەی كە پێداویستە ژیانیەكانی خەڵكی عێراق دابین بكرێت و لە هەمان كاتدا رژێمی عێراق هیچ قازانجێكی ئابووری یا سیاسی دەست نەكەوێت.

## بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراسەری عێراق بەردەوام مایەی نیگەرانی قووڵی ئێمەیە. لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە و نادادپەروەرانە، نیگەرانی یەكەمی ئێمەیە. لە ١٠ ی ئادار، راپۆرتێری تایبەتی عێراق، بەڕێز "ماكس وان دێرستویل"[1] راپورتی دا كە لێكۆڵێنەوە بەردەوامەكەی نیشانی داوە و بەڵگەی بەهێزی لە بەر دەستدایە كە لە ئابی ١٩٩٧وە سەدان بەندكراو لە بەندیخانەی "ئەبوغرێب"[2] و "رادوانیە"[3] لەسێدارە دراون. بە گوێرەی راپورتە متمانە پێكراوەكان، گەلێ لەوانەی كە لەسێدارەدراون بۆ تاوانگەلێك وەك سووكایەتی كردن بە رژێمی عێراق یا بە ئەندامبوون لە حیزبە سیاسیەكانی ئۆپۆزسیونی عێراق حوكمی ١٥ تا ٢٠ ساڵ زیندانیان لە سەر دراوە. بنەماڵەكان گەلێ جار تەرمی لەسێدارەدراوەكانیان وەرگرتووەتەوە كە هەندێ جار

---

Max Van der Stoel [1]
Abu Gharaib [2]
Radwaniyah [3]

ئاسەواری ئەشکەنجەیان پێوە دیار بووە. لە مانگی نیسان کومیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارنامەیەکی توندی دژی ئەم کردەوانە و پێشیلکارییە بەردەوامەکانی دیکەی مافی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتی عێراق دەرکرد. ئەم بڕیارنامەیە دەسەلاتی چاودێری راپۆرتێری تایبەتی بەرفراوان کردەوە و هەموو کردەوە سەرکوتکەرانە و چەوسێنەرانەکانی دەوڵەتی عێراقی شەرمەزار کردووە.

لە باشووری عێراق، دەوڵەت درێژە دەدات بە سەرکوتی خەڵکی شیعە و لەناو بردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان[4]" ، و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشوور[5]" لە ناو دەبات. لە باکووری عێراق، لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر کونترولی کوردەکان، دەوڵەت بەردەوامە لە دەرکردنی زۆرەملێی دەیان هەزار کورد و تورکمان لە کەرکوك و شارەکانی دیکە. دەوڵەت بەردەوامە لە کەندوکۆسپ دروست کردن لە سەر رێگای روون کردنەوەی چارەنووسی ٦٠٠ هاووڵاتی کویتی و وەلاتانی دیکە کە بە دەستی کاربەدەستانی عێراق لە کات یان پاش داگیر کرانی کویت بێ سەروشوێن کراون. لە میانەی ئاڵوگۆڕی ئەم دواییانەی دیلەکان کە بە ناوبژیوانی ICRC ئەنجام دراوە، عێراق ٣٠٠ دیلی جەنگی ئێرانی ئازاد کردووە(کە لە کاتی شەڕی ئێران و عێراق بە دیل گیرابوون) لە بەرامبەر ٥٦٠٠ دیلی عێراقی کە لە لایەن ئێرانەوە بە دیل گیرابوون. لە گەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی عێراق هیچ نیشانەیەکی دەرنەخستووە بۆ جێبەجێ کردنی بڕیاری ٦٨٨ ی UNSCR کە داوا لە عێراق دەکات سەرکوتی خەڵکەکەی خۆی رابوەستێنێت.

## باکووری عێراق: پەیوەندییەکانی PDK ـ PUK

لە باکووری عێراق ئاگربەستی نێوان حیزبە کوردکان کە لە تشرینی دووەمی ١٩٩٧ لە ئەنجامی هەوڵەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێکات، هەروا بەردەوامە. هەم مەسعود بارزانی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و هەم جەلال تاڵەبانی، رێبەری یەکێتی نیشتمانی

---

Marsh Arabs [4]
southern marshes [5]

کوردستان(PUK ) لێدوانی ئەرێنی و هیوابەخشیان داوە لە بارەی ئاشتبوونەوەی سیاسی و وتووێژەکانی نێوان ئەم دو گروپە ئێستا پێی ناوەتە خولی شەشەم.
ئێمە لە ڕێگای ناوبژیوانییەوە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ گەیشتن بە ڕێگاچارەیەکی هەمیشەیی بە مەبەستی یارمەتیدانی خەڵکی باکووری عێراق بۆ ئەوەی بگەن بە سازشێکی هەمیشەیی و سەقامگیر(کە شایانیان بێت) و کەم کردنەوەی هەل بۆ دەوڵەتی ئێران و عێراق کە دەستێوەردان لە ناکۆکیەکاندا بکەن و هەڕەشە لە هاوولاتیانی عێراقی لەم ناوچەیە بکەن. گوشارەکانی دەوڵەتی عێراق لە سەر ئەم دو حیزبە کوردە بەردەوامە بۆ ئەوەی خۆی بخاتە نێو وتووێژەکانی نێوان ئەم دوو گروپە.

## ڕاپورتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش نەتەوە یەکگرتووەکان لە لایەن عێراق ٣ ی ئەیلوولی ١٩٩٨

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس
لە پەیوەندی لەگەڵ ڕێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، ڕاپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم ڕاپۆرتە قۆناخی٢٤ی حوزەیران تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.
بڕیارنامەی ١١٥٣ بەرنامەیەکی جیاوازی داناوە بۆ باکووری عێراق کە ڕاستەوخۆ لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان بە ڕاوێژ لە گەڵ دانیشتوانی ناوچە جێبەجێ دەکرێت. ئەم بەرنامەیە ١٣ تا ١٥٪ لە داهاتی "بەرنامەی نەوت لە بەرامبەر خۆراك" تەرخان دەکات بۆ باکووری عێراق. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە توندی پشتیوانی لەم بەرنامەیە دەکات. ئەم بەرنامە جیاوازە لە بەر

ئەوە بۆ باکووری عێراق دانراوە کە رژێمی عێراق هیچ بایەخێك نادات بە بارودۆخی ژیانی مرۆڤی کەمینەی کورد ، ئاشووری و تورکمانی باکووری عێراق و ئامادەیە بە دڕندانەترین شێوە بیانچەوسێنێتەوە. زنجیرە هێرشە کیمیاییە بەڵگەمەندەکانی دەیەی پێشوو لەلایەن دەوڵەتی عێراق دژی خەڵکی سڤیلی باکووری عێراق تەنها یەکێ لە نمونەکانی ئەم دڕندایەتییەیە. لە باکووری عێراق کە لە ژێر کونترۆڵی دەوڵەتی ناوەندیدا نییە "بەرنامەی نەوت لە بەرامبەر خۆراك" بێ هیچ راوەستانێك جێبەجێ کراوە. حیزبە کوردەکان هەوڵ دەدەن ناکۆکیەکانیان بنێنە لاوە و پێکەوە کار بکەن بۆ ئەوەی بڕیارنامەی ١١٥٣ ی UNSCR بە باشترین شێوە جێبەجێ بکرێت. لە ئەنجامدا جیاوازی نێوان باکوور و شوێنەکانی دیکەی عێراق زەق دەبێتەوە.

نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ بە دیقەتەوە چاودێری بکات بەسەر جێبەجێ بوونی بڕیارنامەی ١١٥٣ . دەوڵەتی عێراق بەردەوامە لە پێداگری کردن لە سەر پێویستی هەڵگرتنی دەستبەجێی گەمارۆکان، ئەمە لە کاتێکدا کە بەهەرحاڵ ئەنجامنامەی ملکەچ نەبوونی عێراق بە ئەرك و بەرپرسیاریتیەکانی بە گوێرەی بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاشکرایە، ئەنجامنامەیەك کە لە کۆبوونەوەی ٣٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایش (بۆ چاودێری کردن بە سەر گەمارۆکان) لە ٢٧ ی نیسان بەتێکڕای دەنگ بە فەرمی ناسراوە.

ئێمە درێژە دەدەین بە کار کردن لەگەڵ سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان ، ئەنجوومەنی ئاسایش و ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ مسۆگەر کردنی ئەوەی کە پێداویستە ژیانیەکانی خەڵکی عێراق دابین بکرێت و لە هەمان کاتدا رژێمی عێراق هیچ قازانجێکی ئابووری یا سیاسی دەست نەکەوێت.

## بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراسەری عێراق مایەی نیگەرانی قوڵی ئێمەیە. کێشە تایبەتەکانی مافی مرۆڤ بریتین لە کوژرانی دو مەلای بلیمەتی شیعە، "ئایەتوڵا بروجیردی[1]" لە ٢٢ ی نیسان

Ayatollah Borujerdi [1]

و "ئایەتوڵا ئەلعوزما میرزا عەلی غەرەوی[2]" له ١٨ ی حوزەیران. تاوانی ئەم کوشتنانە خراوەتە پاڵ رژێمی بەغداد و دوابەدوای ئەوە کەشوهەوای ئەمنی بە سەر شارە شیعەنشینەکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق وەك نەجەف و کەربەلا توندتر بووە.

ئەم ڕووداوانە نیشانەی ئەوەیە کە رژێمی عێراق بە هیچ شێوەیەك گرنگی نادات بە ژیانی خەڵك و ئازادی ئایینی. لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە و نادادپەروەرانە و بەدەر لە یاسا هەروا مایەی نیگەرانی یەکەمی ئێمەیە. دەوڵەتی عێراق هێشتا ناهێڵێت پشکنەرە سەربەخۆکان سەردانی گرتووخانەکانی عێراق بکەن، سەرەڕای ئەوەی کە راپۆرتێری تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ عێراق، "ماکس وان دیرستوتیل" لە راپۆرتەکەی خۆیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە بەڵگەی حاشاهەڵنەگەری لەبەر دەستدایە دەربارەی ئەوەی کە لە کۆتایی ساڵی رابردوو سەدان بەندکراو لە بەندیخانەی "ئەبووغرێب" و "رادوانیە" لەسێدارە دراون.

هەروەها کە لە دوایین راپۆرتەکەمدا(کە بە گوێرەی کۆمەڵە راپۆرتەکانی لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە و پێشێلکاریەکانی دیکەی مافی مرۆڤ ئامادە کرابوو) ئاماژەم پێکرد، کومیسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان لە مانگی نیسان بە توندی سەرجەم کردەوە چەوسێنەرەکانی دەوڵەتی عێراقی شەرمەزار کرد. لە گەڵ ئەمەشدا، سەرچاوەکانی ناوخۆی عێراق راپۆرتیان داوە کە شەپۆلێکی دیکەی لە سێدارەدان لە مانگی حوزەیران بەڕێوە چووە کە تێیدا نزیکەی ٦٠ کەس لە ماوەیەکی زۆر کەمدا کوژراون.

لە باشووری عێراق، دەوڵەت درێژە دەدات بە سەرکوتی خەڵکی شیعە و لەناو بردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان[4]" ، و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشوور[5]" لە ناو دەبات. لە باکووری عێراق، لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی کوردەکان، دەوڵەت بەردەوامە لە دەرکردنی

---

Grand Ayatollah Mirza Ali Gharavi [2]
Marsh Arabs [4]
southern marshes [5]

زۆرەملێی دەیان هەزار کورد و تورکمان له کەرکوك و شارەکانی دیکـه. دەوڵـەت بەردەوامـه لـه کەندوکۆسپ دروست کردن له سەر ڕێگای ڕوون کردنەوەی چارەنووسـی ٦٠٠ هـاووڵاتی کـویتی و وەلاتانی دیکه که به دەستی کاربەدەستانی عێراق له کـات یـان پـاش داگـیر کرانـی کویـت بـێ سەروشوێن کراون. له میانەی ئاڵوگۆڕی ئەم دواییانەی دیلەکان که به ناوبژیوانی ICRC ئـەنجام دراوه، عێراق ٣٠٠ دیلی جەنگی ئێرانی ئازاد کردووه(که له کاتی شەڕی ئێران و عێراق بـه دیـل گیرابوون) له بەرامبەر ٥٦٠٠ دیلی عێراقی که له لایەن ئێرانـەوه بـه دیـل گیرابـوون. لـه گـەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی عێراق هیچ نیشانەیەکی دەرنەخـستووه بـۆ جێبـەجێ کردنـی بڕیـاری ٦٨٨ ی UNSCR که داوا له عێراق دەکات سەرکووتی خەڵکەکەی خۆی ڕابوەستێنێت.

## باکووری عێراق: تێوەگلانێکی قووڵتر

له باکووری عێـراق، ئاگربەسـتی نێـوان حیزبـه کوردەکـان کـه لـه ئـەنجامی هەوڵـەکانی وڵاتـه یەکگرتووەکانی ئەمریکا له تشرینی دووەمی ١٩٩٧ پێکهات، هەروا بەردەوامه. ئەم ئاگربەسـته به هۆی هاوکاری کاریگەر و ڕوو له زیاد بوونی حیزبـه کوردەکـان لـه پەیوەنـدی لـه گـەڵ بـواره مرۆڤدۆستانەکان، به تایبەت بوارەکانی پەیوەندیدار به بەرنامەی"ئەوت له بەرامبـەر خـۆراك" ی نەتەوەیەکگرتووەکان بەهێزتر بووه. کوردەکان له گەڵ نەتـەوه یـەکگرتووەکان هاوکـاری دەکـەن و توانیویانه کێشەکانی خـۆراك و دەواو دەرمـان چارەسـەر بکـەن و چاویان لەوەیـه کـه ژێرخـانی وڵاتەکەیان به گوێرەی بەرنامەکانی پێشکەوتنی نەتەوه یەکگرتووەکان ببوژێننەوه .

"دەیڤید وێلش"، یارمەتیدەری سەرەکی وەزیری دەرەوه بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیـك لـه ١٧ - ٢٠ ی تەمموز بەسەرۆکایەتی لێژنەیەك سەردانی باکووری عێراقی کـردووه." وێڵـش "هەوڵـەکانی کوردەکانی بەرەو ئاشتی هان داوه و جەختی کردووەتەوه له سەر پشتیوانی وڵاته یـەکگرتووەکانی ئەمریکا له مافی مرۆڤ و خوشبژێوی و ئاسایشی دانیـشتووانی بـاکووری عێـراق، و تێـوەگلانی درێژخایەنی ئێمەی له کێـشەکەیان دووپـات کردووەتـەوه. لـه کـاتی ئـەم سـەردانەدا مەسـعود

بارزانی، ڕێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) لێدوانی ئەرێنی و هێوابەخشیان داوە بۆ ئاشتبوونەوەی سیاسی و بانگهێشتە جیاجیاکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان قبوڵ کردووە بۆ ئەوەی ئەمساڵ سەردانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەن .

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوازی فەرمی پشتیوانی دەکات لە یەکپارچەکی خاکی عێراق و پشتیوانی دەکات لە ژیانێکی باش بۆ کوردەکانی عێراق لە چوارچێوەی عێراقدا و ئەم دو جۆرە پشتیوانیکردنە پێکەوە ناتەبا نین. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەروەسە لە بەرامبەر مسۆگەر کردنی بەردەوامبوونی یارمەتی نێونەتەوەیی بۆ باکووری عێراق بۆ ئەوەی ڕێز لە مافی مرۆڤی کوردەکان و کەمینەکانی دیکە بگیردرێت و هەرێمی دژەفڕین بپارێزێت لە ڕێگای "شالاوی چاودێری باکوور"ەوە.

ئێمە لە ڕێگای ناوبژیوانییەوە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ گەیشتن بە ڕێگاچارەیەکی هەمیشەیی بە مەبەستی یارمەتیدانی خەڵکی باکووری عێراق بۆ ئەوەی بگەن بە سازشێکی هەمیشەیی و سەقامگیر(کە شایانیان بێت) و کەم کردنەوەی هەل بۆ دەوڵەتی ئێران و عێراق کە دەستێوەردان لە ناکۆکیەکاندا بکەن و هەڕەشە لە هاوولاتیانی عێراقی لەم ناوچەیە بکەن. گوشارەکانی دەوڵەتی عێراق لە سەر ئەم دو حیزبە کوردە بەردەوامە بۆ ئەوەی خۆی بخاتە نێو وتووێژەکانی نێوان ئەم دوو گروپە.

### كونفرانسی چاپەمەنی دەربارەی ئاكامی كووبوونەوەكەی مادلین ئالبرایت(وەزیری دەرەوەی ئەمریكا) و جەلال تاڵەبانی(سەرۆكی یەكێتی نیشتمانی كوردستان) و مەسعود بارزانی(سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان)

واشنگتۆن دیسی، ١٩ ی ئەیلوولی ١٩٩٨

مادلین ئالبرایت(وەزیری دەرەوەی ئەمریكا):

زۆر خۆشحاڵم كە ئەمرۆ بەخێرهاتنی بەڕێز مەسعود بارزانی( سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان) و بەڕێز جەلال تاڵەبانی(سەرۆكی یەكێتی نیشتمانی كوردستان) دەكەم بۆ وەزارەتی دەرەوە. هەروەها كە ئەم دو بەڕێزە پاشان بە كورتی باسی دەكەن، كوبوونەوەی هاوبەشی ئەم دو بەڕێزە لەم هەفتەیە لە وەزارەتی دەرەوە، لاپەڕەیەكی نوێ و هیوابەخش دەكاتەوە لە هەوڵی ئەم دو بەڕێزە لەلایەن خەڵكەكەیانەوە بۆ كار كردن لەگەڵ یەكدی.

دانیشتنەكانی ئێمە لێرە، دوابەدوای ٦ مانگ دانیشتن و وتووێژی ئەم دو لایەنە لە باكووری عێراق و هەروەها ڕاوێژەكانی ئەم دواییانە لەگەڵ هەر دو لایەن لە ئانكارا و لەندەن ئەنجام درا.

ئەمرۆ ئێمە هەنگاوێك بەرەوپێش هەڵدەگرین، وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا زۆر نیگەرانە بەنیسبەت ئاسایش، ئارامی و بارودۆخی ئابووری كورد و شیعە و سوننە و خەڵكی دیكەی عێراق كە بوونەتە قوربانی هێرشی دڕندانەی ڕژێمی عێراق، لەوانە هێرشەكانی ئەنفال لە ١٩٨٨ و شاڵاوە سەربازییەكانی ١٩٩١ . ئێمە لەگەڵ كۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەوڵمان داوە خەڵكی عێراق لە بەرامبەر سەركوتی سەدام حوسەین بپارێزین و پێداویستییە مرۆڤدوستانەكانیان دابین بكەین.

لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک ئێمە وەبیری دەوڵەتانی هاوکارمان هێناوەتەوە کە ئامانجی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، بەتایبەت بڕیارنامەی ٦٨٨ ، تەنها بەرتەسک کردنەوەی بەرنامەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق نییە، بەڵکو پاراستن و دابینکردنی ئاسایشی خەڵکی عێراقە لە باکوور و باشووری وڵات. ئەم کارە بەتەواوی تەبایە لەگەڵ بەرپرسیارێتی ئێمە بەنیسبەت یەکپارچەیی و سەروەری عێراق.

ڕۆحی ئاشتبوونەوە لە نێوان بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی کە لە دانیشتنە دوقۆڵییەکان و ڕاگەیاندنە هاوبەشەکەیاندا دەردەکەوێت، کاری یارمەتیدانی خەڵکەکەیان لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی دیکە ئاسانتر دەکات.

بەڕێز تاڵەبانی و بارزانی خشتەیەکی کاتییان دیاری کردووە بۆ ئەوەی بە گوێرەی پرەنسیپەکانی ڕێکەوتنەکانی ١٩٩٦ ی ئانکارا، ناکۆکیەکانیان چارەسەر بکەن. بەبێ یەکێتی، ڕێگای بەرەوپێش چوون زۆر زەحمەت دەبێت. کوردەکانی عێراق ئەگەر یەکێتیان هەبێ دەتوانن بە هەموو شێوەیەک هیوادارن بن بەداهاتووی خۆیان.

هەروەها کە ئێمە لەم کۆبوونەوەیەدا باسمان کرد، عێراق جارێکی دیکە هەڕەشەی ئەوەی کردووەتەوە کە وەك دژکردەوەیەك لە بەرامبەر بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ هەڵواسانی سکاڵای عێراق لە بڕیارنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆتایی بە هەموو جۆرە هاوکارییەك لەگەڵ پشکنەرانی چەکەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دێنێت. ئەنجوومەنی ئاسایش لە وەڵامی بڕیاری (بە هیچ شێوەیەك قبول نەکراوی) مانگی ئابی عێراق بۆ بچڕاندنی هاوکاری لەگەڵ UNSCOM کە کار بۆ چەك داماڵینی عێراق دەکات ئەم بڕیارەی دەرکردبوو. زۆر زۆر پێویستە کە ئەنجوومەنی ئاسایش بە شێوەیەکی گونجاو و بنەڕەتی، وەڵامی کردەوە هاندەرانە و ناتەباکانی عێراق بداتەوە. ئەنجوومەنی ئاسایش ناتوانێت ڕێگا بە عێراق بدات دەست بکاتەوە بە خولێکی نوێی هەڕەشە

کردن و شه‌ڕاشۆیی. مه‌سه‌له‌ی متمانه و کاریگه‌ری ئه‌نجوومه‌نی ئاسایش له ئارادایه. ئه‌نجوومه‌نی ئاسایش ده‌بێ پێداگری بکات له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که عێراق ملکه‌چی هه‌موو بڕیارنامه په‌یوه‌ندیداره‌کانی ئه‌نجوومه‌نی ئاسایش بێت.

ولاّته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا بڕیار ده‌دات چۆن و که‌ی وه‌لاّمی کرده‌وه‌کانی به‌غداد بداته‌وه، به گوێره‌ی هه‌ڕه‌شه‌ی عێراق له‌سه‌ر دراوسێکانی و ئاسایشی ناوچه و به‌رژه‌وه‌ندییه یه‌کلاییکه‌ره‌وه‌کانی ولاّته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا و خه‌ڵکی عێراق، له‌وانه خه‌ڵکی باکووری عێراق. ئێمه هیچ ڕێگاچاره‌یه‌ك له‌سه‌ر مێز لانابه‌ین. ئه‌گه‌ر عێراق هه‌وڵ بدات هه‌موو ڕێگاچاره‌کان ره‌ت بکاته‌وه وه‌لاّمی ئێمه به‌هێز و یه‌کلاییکه‌ره‌وه ده‌بێت. به‌لاّم ئێمه به‌گوێره‌ی خشته‌ی کاتی خۆمان کار ده‌که‌ین نه خشته‌ی کاتی سه‌دام حوسه‌ین.

ولاّته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا چاوی بڕیوه‌ته ڕۆژێك که عێراق بتوانێت وه‌ك ئه‌ندامێکی به‌رپرسیار و ملکه‌چی یاسا بێته‌وه ریزی کۆمه‌ڵگای نێونه‌ته‌وه‌یی. من به‌و عێراقیانه‌ی ناوخۆ و ده‌ره‌وه‌ی عێراق که ده‌یانه‌وێت داهاتوویه‌کی دیموکراتیك بۆ نه‌ته‌وه‌که‌یان دروست بکه‌ن، ده‌ڵێم" ولاّته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا پشتی ئێوه ده‌گرێت".

"ڕادیو عێراقی ئازاد" ئاماده‌یه ڕاسته‌وخۆ به‌رنامه په‌خش بکات بۆ خه‌ڵکی عێراق. ئێمه زانیاری کۆ ده‌که‌ینه‌وه ده‌رباره‌ی کرده‌وه دڵڕه‌قانه‌کانی سه‌دام حوسه‌ین بۆ یارمه‌تیدانی خه‌باتی کۆمه‌ڵگای عێراق له ده‌ره‌وه‌ی ولاّت به ئامانجی دادگایی کردنی سه‌دام حوسه‌ین، و هه‌روه‌ها که له کۆبوونه‌وه‌که‌ی ئه‌مڕۆدا باس کرا، ئێمه هه‌وڵه‌کانمان زیاتر ده‌که‌ین بۆ یارمه‌تیدانی خه‌ڵکی عێراق- چ عه‌ره‌ب، چ کورد، چ شیعه، چ سوننه ـ بۆ گه‌یشتن به هه‌ست و ئامانجێکی هاوبه‌شی قووڵتر و ئیستراتژییه‌کی کاریگرتر له‌پێناو عێراقێکی دیموکرات و پلوڕالیست.

دیارە ئەمانە رێگاچارە نین و نابێت هیوا و چاوەڕوانی هەڵە دروست بکەن بەلآم ئێمە ناتوانین پشت لە خەڵکی عێراق بکەین کە بە ماوەیەکی دوورودرێژ ئازادی، ئاسایش و خۆشبەختیان لێ زەوت کراوە. ئەم خەڵکە نابێت جارێکی دیکە ئەنفال بکرێن و شالآوی قڕکردنی ژن و پیاو و منداڵی بێ گوناح بەڕێوە بچێت.

من بەخێرهاتنی بەڕێز تاڵەبانی و بەڕێز بارزانی دەکەم و پیرۆزباییان لێ دەکەم بۆ ئەو هەنگاوە بوێرانە کە هەڵیدەگرن و بە نوێنەرایەتی لەلایەن ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆشبینم بە کارکردنی زۆرتر لەگەڵ ئەم دوو بەڕێزە لەپێناو باشتر کردنی بارودۆخی مرۆڤی، مافی مرۆڤ و ئاسایشی خەڵکەکەیان .

بەڕێز مسعود بارزانی(لە رێگای وەرگێڕەوە):

سەرەتا دەمەوێت سپاسی وەزیری دەرەوە، خاتوون ئالبرایت و دەوڵەتی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەم بۆ بەپەرۆش بوونیان بۆ نیگەرانی و گیروگرفتەکانی خەڵکی ئێمە و ئاشتکردنەوەی ئێمە و خانەخێوی کردنیان لە ئێمە لێرە. ئێمە شتێکی گرنگمان لەم چەند رۆژەی دواییدا کردووە. بە یارمەتی خودا، ئێمە ئەو شتانە جێبەجێ دەکەین کە لەسەری رێککەوتوین و دەبێ ئەو شتانە بە رێکوپێکی و بە دیقەتەوە جێبەجێ بکەین. بنەمای ئەمەش، نیازپاکی و یارمەتی دۆستەکانمانە. خەڵکی ئێمە چاوی لە ئەنجامەکانی ئەم وتوێژانەیە. ئەوەی کە ئێمە کردومانە، داهاتوویەکی خۆشبەخت بۆ گەلەکەمان مسۆگەر دەکات.

لێرە دەمەوێت جەخت لەسەر نیگەرانی و بەرژەوەندییەکانمان بکەمەوە بۆ یەکێتی عێراق. ئەوەی کە ئێمە کردوومانە، دژی بەرژەوەندییەکانی هیچ ولآتێك نیە لە ناوچەدا، بەڵکوو بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانە.

جارێکی دیکه زۆر سوپاستان دەکەم جەنابی وەزیری دەرەوە.

بەڕێز جەلال تاڵەبانی:

ئەمرۆ ڕۆژێکی مێژوویيه. ئێمە لاپەڕەیەکی خەمباری مێژووی گەلی کوردمان بەست کە لە مێژووی خۆیدا ئێش و ئازاری زۆری بینیوە. ئەمرۆ ڕۆژێکی نوێیە و هیوادارم ڕۆژێك بێت من و بەڕێز بارزانی و دوحیزبەکەمان، پارتی و یەکێتی هەرچی کە لە دەستمان دێت بیکەین بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ڕێککەوتننامە مێژووییە کە ئێمە بە پشتیوانی دۆستە ئەمریکاییەکانمان پێیگەیشتووین بەتایبەت خاتوون ئالبرایت، وەزیری دەرەوە کە ئێمە زۆر سپاسی دەکەین، زۆر سپاسی یارمەتیە تاکەکەسییەکانی دەکەین، زۆر سپاسی هاندان و مۆچیارییەکانی دەکەین.

هەروەها زۆر سپاسی دۆستەکانمان دەکەین، لەوانە دەمەوێت ئاماژە بە دەوری گرنگی دۆستی بەڕێزمان "دەیڤید وێلش"[1] بکەم کە قبوڵی مەترسی کردووە و سەردانی ئێمەی کردووە لە کوردستانی عێراق و بواری ئەم ڕێککەوتنەی خۆش کردووە. هەروەها سپاسی هەموو دۆستانی دیکەمان دەکەم لە وەزارەتی دەرەوە، لە کۆشکی سپی و شوێنەکانی دیکە کە پشتیوانیان کرد لە ئێمە بۆ گەیشتن بەم دەستکەوتە مێژوویی و گرنگە.

خەڵکی ئێمە چاوی لە عێراقێکی یەکگرتوو، دیموکرات و فیدراڵییە. ئێستا ئەو هەلە بۆ ئێمە ڕەخساوە دڵنیاتان بکەینەوە کە ئێمە هێزێکی جیاییخواز نین، ئێمە بەهێزبوونی یەکێتی نەتەوەیی عێراقمان دەوێت، ئێمە هەڕەشە نین بۆ هیچ وڵاتێك لە ناوچە، بەپێچەوانەوە ئامانجمان ئاشتی و سەقامگیری ناوچەیە کە یارمەتی بە هەموو دراوسێکانی عێراق دەدات.

---

[1] David Welch

## کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

ئێمە دەمانەوێت پەیوندیی باشترمان لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەبێت. گەلی کورد قەد لە بیر ناکات کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وەزارەتی دەرەوە، دۆستانی وەزارەتی دەرەوە و بەشەکانی دیکە یارمەتی ئێمەیان داوە بۆ گەیشتن بەم رێککەوتنە گرنگە. ئێمە وەك گەلی ئەمەکناسی کورد، پێیان وەفادار دەمێنینەوە. هیوادارم ئەم رێککەوتنە یارمەتی بدات بە باشتر بوونی پەیوەندییەکانی گەلی ئەمریکا و گەلی عێراق، لە ناویدا گەلی کورد. جارێکی دیکە سپاس و پێزانینی خۆم دەردەبڕەم بۆ خاتون ئالبرایت و دۆستانی دیکە لە وەزارەتی دەرەوە.

زۆر سپاستان دەکەم.

### رێککەوتننامەی باکووری عێراق بە ناوبژیوانی ئەمریکا و پەیوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق

وتووێژ لەگەڵ "دەیڤید وێلش"، جێگری وەزیری دەرەوە لە ئیدارەی کاروباری رۆژهەلاتی نزیك لە بەرنامەی "Worldnet's Dialogue "

## کورد و کوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

### ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨

بەڕێز"فوچوکز"[٢]: مانگی ڕابردوو "مادلین ئالبرایت"، وەزیری دەرەوە، ڕێککەوتننامەیەکی بە ناوبژیوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاگەیاند بۆ دابەش کردنی دەسەڵات لە نێوان جەلال تاڵەبانی، سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و مسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان. گەلێ کەس هیوادارن کە ئەم ڕێککەوتننامە تایبەتە، هەڵبژاردنێکی گشتی لێبکەوێتە لە ساڵی داهاتوودا.

لە بەرنامەی ئەم جارەی Worldnet's Dialogue دا دەمانەوێت لەگەڵ دەیڤید وێلش، جێگری وەزیری دەرەوە لە ئیدارەی کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیك، ڕێککەوتننامەی باکووری عێراق و کاریگەرییەکانی لەسەر ناوچە و پەیوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق تاوتوێ بکەین .

بەڕێز" فوچوکز": پێش ئەوە کە بچینە سەر پرسیارەکانمان، دەتوانی هەندێك لەو ڕووداوانەمان بۆ باس بکەی کە پاش ڕاگەیاندنی ئەم ڕێککەوتننامەیە قەوماون.

"دەیڤید وێلش": بە دڵنیاییەوە. کاتی واژۆکرانی ئەم ڕێککەتننامەیە، یەکەم جار بوو کە ڕێبەرانی دوو حیزبی سەرەکی کورد لە باکووری عێراق لە ماوەی ٤ ساڵدا دیداریان دەکرد. لەم ڕووەوە ئەمە ڕووداوێکی بەرچاو بوو. پاش ئەوەش ئەوان درێژەیان بە سەفەرەکانیان دەدەن لە

---

MR. FOUCHEUX[٢]

ڕێگای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لەسەر ڕێگای گەڕانەوەیان بۆ زێدی خۆیان لە باکووری عێراق. خشتەیەکی کاتی دیاری کراوە بۆ جێبەجێ بوونی ئەم ڕێککەوتننامەیە و ئێمە لە قۆناخە سەرەتاییەکانی جێبەجێ بوونی ئەم ڕێککەوتننامەیەداین. هیوادارین کە ڕووداوی داهاتوو ئەوە بێت کە ئەم دو ڕێبەرە(بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی) لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەم لە ئانکارا پێکەوە دابنیشنەوە.

بەڕێز" فوچوکز": زۆر باشە، چەند بەشداربوویەك لە ئانکارا و لە لەندەن پرسیاریان هەیە، با لە ئانکارەوە دەست پێبکەین:

پرسیار: پرسیارەکەم ئەوەیە کە هەروا کە ئاگادارن ئێستا بارودۆخی نێوان تورکیا و سوریا زۆر ئاڵۆزە. ئێوە چۆن ئەم بارودۆخە هەڵدەسەنگێنن؟

"دەیڤید وێڵش": پێش لە هەموو شتێك دەبێ بڵێم کە من لە جێگایەکدا نیم کە بتوانم پێشهاتەکانی نێوان سوریا و تورکیا ڕۆژ بە ڕۆژ شرۆڤە بکەم لە بەر ئەوەی کە بە پێچەوانەی بەیاننامە هاوبەشەکەی ڕێبەرە کوردەکان لە واشنگتۆن، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەوری ناوبژیوان لەم ناکۆکییەدا ناگێڕێ. پێموایە دەوڵەتی میسر ئەم دەورە دەگێڕێ، کەوابوو بارودۆخەکە لەم چەند ڕۆژەی دواییە لە ئەنجامی هەوڵە باشەکانی میسر ئارامتر بووە. بەبیروبۆچوونی من ئێستا هەردولا بە قازانجیانە ڕێگاچارەیەك بدۆزنەوە بۆ کێشەکانیان و هیوادارم ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانیان.

لە پەیوەندی لەگەڵ بیروڕای ئێمە(بیروڕای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت ئەو مەسەلانە کە تورکیا و سوریای لە یەك جیا کردووتەوە) هەڵویستی ئێمە ئەوەیە کە نابێت هیچ دەوڵەتێك لە ناوچە، لەوانە سوریا دالدەی تووریستان بدات. ئێمە هانی میسرمان داوە ناوبژیوانی بکات بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە.

پرسیار: سەرەڕای ئەوەی کە بەڵگەنامە فەرمییەکانی دەوڵەتی ئەمریکا نیشان دەدات سوریا یەکێ لەو دەوڵەتانەیە کە پشتیوانی لە تروریزم دەکات، بۆ ئێوە بە ئاشکرایی پشتیوانی لە تورکیا ناکەن، لە کاتێکدا کە تورکیا هەوڵ دەدات قەناعەت بە سوریا بهێنێت کە کۆتایی بە پشتیوانی لە PKK بهێنێت.

"دەیڤید وێلش": من بە دڵنیاییەوە نازانم مەبەستی ئێوە لەم پرسیارە چییە. پەیوەندیەکانی ئێمە لەگەڵ سوریا و تورکیا زۆر لە یەك جیاوازە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەکەوە کۆمەڵێك ریوشوێنی توندی بە سەر سوریادا(وەك دەوڵەتێك کە ئەمریکا بە پشتیوانی تروریزمی دادەنێت) سەپاندووە، لە لایەکی دیکەوە تورکیا هاوپەیمانێکی لە مێژینەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەندامی ناتۆیە، کەوابوو پەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ ئەم دو وڵاتە لە راستیدا زۆر لە یەك جیاوازە. ئێمە پشتیوانی لە رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم کێشەیە دەکەین.

پرسیار: ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەزانێ کە رێبەری PKK (عەبدوڵا ئۆجەلان) ئێستا لە کوێیە؟

"دەیڤید وێلش": بەداخەوە ناتوانم هیچ شتێك لەم پەیوەندیەدا بڵێم. ئەو شتانەی کە من دەیزانم، ئەنجامی راپۆرتی رۆژنامەکان و پەیوەندییە دیپلوماتیکە تاکەکەسیەکانە، بە تایبەت لەپەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا. باشتر وایە ئەچمە ناو وردەکارییەکانی ئەم مەسەلەیە. بەهەرحاڵ بە سەرنجدان بە هەندێك لە لێدوانەکانی هەندێ لە کاربەدەستانی تایبەتی دەوڵەتی تورکیا بۆمان دەردەکەوێت کە بارودۆخەکە هێور بووەتەوە.

پرسیار: بە بۆچوونی ئێوە ئایا هەتا کاتێك کە سوریا دەست لە پشتیوانی کردن لە PKK هەڵنەگرێت، ئیمکانی دیالۆگ لە نێوان سوریا و تورکیادا هەیە؟

"دەیڤید وێلش": دیالۆگ دەبێت لە هەر بارودۆخێکدا هەبێت، بە باوەڕی من دیالۆگێکی وەها دەگاتە ئەنجام. ئێمە هیواداریین هەر دوولا کۆمەڵێك ڕێگا بدۆزنەوە بۆ دانیشتن لەگەڵ یەکدی بۆ تاوتوێکردنی ئەم ناکۆکیانە بە شێوازێك کە نەتەنها ناکۆکیەکانیان چارەسەربکەن بەڵکو هەردوو لا بگەنە ئەو قەناعەتە کە ئەو ڕێگایە کە هەڵیانبژاردووە، ڕاستە. ئەگەر وا نەبێت بارودۆخی نێوان ئەم دو لایەنە خراپتر دەبێت کە بە بۆچوونی من زەرەر بە نیگەرانیەکانی ئێمە دەگەیەنێت.

پرسیار: هەروا کە دەزانن دەوڵەتی تورکیا لەراستیدا خۆشحاڵ نییە لە کۆبوونەوەکەی ئەم دواییەی بەڕێز بارزانی و تاڵەبانی لە واشنگتۆن. ناکۆکی سەرەکی نێوان تورکیا و حکوومەتی ئەمریکا چییە لەسەر باکووری عێراق ؟

"دەیڤید وێلش": خۆشحاڵم کە دەچینە سەر مەسەلەی باکووری عێراق. سپاس بۆ ئەم پرسیارە. لە ڕاستیدا من لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە ناکۆکییەکی ئەوتۆ هەبێت لە نێوان تورکیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بە یەکەوە( لەگەڵ بریتانیا) پشتیوانیان کردووە لە ڕەوتی ئانکارا بۆ ئاشتکردنەوەی کوردەکان . هەندێ جار جیاوازی تاکتیکی یان جیاوازی لە شرۆڤەکاندا هەیە، بەڵام ئەم بەربەستە دوورە لە ڕێککەوتنی بنەڕەتی لە سەر ئامانجەکان. ئامانجەکە چییە لێرە؟ ئامانجەکە ئەوەیە ئاشتی و سەقامگیری ئەم ناوچەیە لە باکووری عێراق دەستەبەر بێت کە بە ماوەی چەندساڵ بە هۆی ناکۆکیە حیزبییەکان و دەستێوەردانی لایەنە بیانیەکان و بەداخەوە چالاکییە تیرۆریستیەکان ئاڵۆز بووە. ڕەوتی ئانکارا بۆ چاککردنەوەی ئەم بارودۆخە بە باشترین شێوازی مومکین دارێژرا.

بە تێپەڕبوونی چەند ساڵ ئەم بارودۆخە ئاڵۆز بووە، هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەم دو ڕێبەرە کوردە نەیانتوانیوە ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی لەسەر مەسەلە زۆر گرنگەکان کە ئەوانی لە یەك جیا کردوەتەوە لەگەڵ یەکدی دانیشتن بکەن. هەروا کە پێشتر ئاماژەم پێکرد، ئەوان هەتا ئەم جارە لە

واشنگتۆن بە ماوەی ٤ ساڵ دیداریان لەگەڵ یەکدی نەکردبوو. ئەوەی کە ئێمە توانیمان بیکەین ئەوە بوو کە بۆ یەکەم جار لە دەوری یەك کۆیان بکەینەوە و رەوتێکی نوێ دابنێین بۆ ئەوەی ناکۆکیەکانیان چارەسەر بکەن. ئەم جارە خشتەیەکی کاتی دانراوە و بەرنامەیەکی تۆکمەی کاری دارێژراوە بۆ ئەوەی هەر دوو لا کۆمەڵێك شتی تایبەت بکەن و پشتیوانانی ئەم رەوتە(تورکیا ، ئەمریکا و بەریتانیا) چاودێری بکەن بە سەر بەرەوپێشچوونی ئەم رەوتە .

پرسیار: دەوڵەتی تورکیا دەڵێت رێککەوتننامەکەی نێوان بارزانی و تاڵەبانی کە لە واشنگتۆن واژۆ کرا پێشتر بە تورکیا نیشان نەدراوە یا تورکیا لە بارەی ئەم رێککەوتنامەیە پێشتر ئاگادار نەکراوەتەوە. ئێوە لەم پەیوەندییەدا چی دەڵێن؟

"دەیڤید وێلش": ئێمە لە سەرتاسەری ئەم رەوتەدا لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا راوێژمان کردووە. دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ ئێمە راوێژی کردووە دەربارەی هەوڵەکانی بۆ هاندانی سەقامگیری باکووری عێراق، ئێمە زۆر هەوڵمان دا بۆ ئەوەی پشتیوانی دیکە بهێنینە ناو ئەم رەوتە. بەڵام لە کۆتاییدا گەیشتینە ئەنجامێکی بنەڕەتی، لەبەر ئەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی دەوری ناوبژیوان ببینێ بۆ دیدار و دانیشتنی ئەم دو رێبەرە. ئێمە وا هەستمان کرد کە ئەم کۆبوونەوەیە زۆر گرنگە بۆ شکاندنی بەربەستەکان و بەرەوپێشچوون و دەبێ لێرە لە واشنگتۆن بەرێوە بچێت. نیگەرانی ئێمە، هەمان نیگەرانی بەنیسبەت ئامانجەکانی پێشوە واتا ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەین کە ئاسایشی هەموو لایەنێك لە ناوچە باشتر دەبێت ئەگەر تێگەیشتنێکی بنەڕەتی لە نێوان دو رێبەری سەرەکی کورد لە باکووری عێراقدا هەبێت بەنیسبەت ئاسایشی تورکیا. ئەگەر ئەم دو حیزبە بتوانن هاوکاری یەکدی بکەن، بواری دەستێوەردانی بیانی و ترووریزم و دەستدرێژییەکان بۆ سەر سنووری تورکیا کەم دەبێتەوە.

پرسیار: له كاتێكدا كه ئێستا كۆمەڵێك وتووێژ دەربارەی داهاتووی گروپه كوردەكـان لـه ناوچـه لەنارادایه، بـه گـوێرەی رێككەوتننامـەی واشـنگتۆن ئێـوه چـی دەڵـێن بەنیـسبەت داهـاتووی توركمانەكان له باكووری عێراق؟

"دەیڤید وێلش": سپاس بۆ ئەم پرسیاره گرنگه. ئەركی من وەك ناوبژیكار لەم رەوتەدا ئەوه بـووه كه سودێكی زۆرتر بگەیەنه سەرجەم ئەو خەڵكەی كه لەو ناوچەیه دەژین. ئێمه وا بیر دەكەینـەوه كه باشترین رێگا بۆ گەیشتن به ئامانج ئەوەیه كه ئەوان دەبێ بەپەرۆش بن بۆ كاروبـاری خۆیـان و هەوڵ بدەن له یەكدی تێبگەن. وتووێژی ئێمه لەگەڵ دو گروپی چەكداری سەرەكی لـه ناوچـه، بـه واتای ئەوه نییه كه ئێمه دەمانەوێت لایەنێكی دیكه بخەینه پەراوێزەوه.

هەروەها كه دەزانن، من له ٢ ساڵی رابـردوودا دوو جـار سـەردانی بـاكووری عێـراقم كـردووه. كاربەدەستانی ئەمریكا به دەگمەن ئەم جۆره سەفەرانه ئەنجام دەدەن. لەمیانەی ئـەو سـەردانانەدا من لەگەڵ نوێنەره جۆراوجۆرەكانی توركمانەكان دیدارم كردووه و له توركیاش لـه گـەڵیان قـسەم كردووه. ئێمه زۆر نیگەرانین بەنیسبەت داهاتووی سەرجەم خەڵكی ناوچه، چ كورد، چ توركمان، چ مەسیحی، چ سەریانی و چ نەتەوەكانی دیكه. ئێمه به راستگۆییەوه دەڵێین داهاتوو باشتر دەبێـت ئەگەر ئەم گروپانه بتوانن له رێگای یەكگرتوویی زۆرتر و سەقامگیرتر بوونی ناوچه خۆیان بپارێزن بۆ ئەوەی نەبن به قوربانی دەستێوەردانی دەوڵەتی عێراق یا دەوڵەتی ئێران یا هەندێ لایەنی بیانی دیكه كه دەیانەوێت كەڵكی خراپ له بارودۆخەكه وەربگرن.

ئەو رێككەوتنامەیه كه له واشنگتۆن واژۆ كرا، رێگا خۆش دەكات بـۆ دەوری سیاسـی سـەرجەم خەڵكی ناوچه. كۆمەڵێك بیروڕای جیاواز هەیه له سەر ئەوەی كه ئەم دەوره چۆن بگێڕدرێت، بەڵام ئەم جیاوازییانه زۆرتر لەو ناوچانه هەیه كه چەند ئەتنیكێك پێكـەوه دەژیـن و كێـشەكە لەسـەر ئەوەیه كه ژمارەی دانیشتووانی شوێنەكان چەنده و ئەگەر هەڵبژاردن كرا بـۆ ئەنـدامانی پارلمـان،

دەنگەکان چۆن دابەش بکرێت. کێشەکانی ئەم ناوچانە دەبێ لە رەوتی وتووێژەکاندا روون بکرێنەوە، لەوانەیە لە رێگای یارمەتی سیاسی بۆ نمونە سەرژمێرییەکی متمانەپێکراو ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی ژمارەی دەنگەکانی هەر ناوچەیەك دیاری بکرێت.

پرسیار: هەروا کە ئاگادارن، دەوڵەتی تورکیا لەم دواییانە بڕیاری داوە کە پەیوەندییە سیاسییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق تازە بکاتەوە و باڵوێزخانەکەی بکاتەوە لە بەغداد. ئێوە چۆن ئەم بڕیارە هەڵدەسەنگێنن؟

**"دەیڤید وێلش"**: بە بۆچوونی ئێمە کاتی ئەوە نەهاتووە شێوازی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بگۆڕین لە بەر ئەوەی کە ئێستا رژێمی عێراق خۆی لە ئەرك و بەرپرسیارەتیەکانی دەدزێتەوە کە بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی دیاری کردووە. بۆ نمونە عێراق هاوکاری ناکات لەگەڵ کۆمیسیونی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە سەرەتای مانگی ئاب ئەم کومیسیونە لە عێراقدا نەماوە. کەوابوو لە کاتێکدا کە دابڕانێکی وا هەیە لە نێوان دەوڵەتی عێراق و کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا، ئێمە هەست دەکەین باش نییە پەیوەندییەکان لەگەڵ عێراق باش بێتەوە.

پرسیار: لە سەرەتای ناکۆکی تورکیا و سوریا هەندێك لە وڵاتانی عەرەبی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئیسرائیل لە پشتی سیاسەتی تورکیایە لە بەرامبەر سوریا و هانی تورکیا دەدات. ئێوە وەك دیپلوماتێکی زۆر سەرەکی وەزارەتی دەرەوە، چۆن پەیوەندییەکانی تورکیا و ئیسرائیل هەڵدەسەنگێنن و ئایا پێتان وایە کە پەیوەندییەکانی تورکیا و ئیسرائیل هەڕشەیە بۆ ناوچە و هاوسەنگییەکان دەگۆڕێت؟

**"دەیڤید وێلش"**: بەداخەوە من لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نیم کە ئیسرائیل لە پشتی سیاسەتی تورکیایە لەم پەیوەندییەدا. بیروبۆچوونی من و دەوڵەتی ئەمریکا لەم بارەیە زۆر روونە. زۆر

سروشتیه که تورکیا وەك دەوڵەتێکی گرنگ له ناوچه و جیهان، دەتوانێ پەیوەندی هەبێت لەگەڵ هەر دەوڵەتێك که پێی خۆش بێت. ئیسرائیل دۆستێکی باشی ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا یە، تورکیاش هەروا. ئاساییه که ئێمه پێمان خۆشه تورکیا و ئیسرائیل پەیوەندی باشیان لەگەڵ یەکدی هەبێت. ئێمه ئەمه به شتێکی باش دەزانین بۆ ناوچه، نه کێشەیەك بۆ ناوچه. پێموانییه که ئەم پەیوەندییه هەڕەشه بێت بۆ ناوچه و به دڵنیاییەوە لەسەر ئەو باوەڕە نیم که ئیسرائیل به هیچ شێوەیەك پشتیوانی له کردەوەکانی تورکیا بکات دژی ئەو تروریستانه که له دەرەوە هەڕەشه له تورکیا دەکەن. دەوڵەتی تورکیا خۆی بڕیار دەدات لەسەر ئەم شتانه و پێموایه تورکیا دەتوانێت سەربەخۆانه کار بکات و بەرپرسیارێتی ئەمه بگرێته ئەستۆ. به باوەڕی من زۆر بەهەڵەدا دەچین ئەگەر بڵێین کۆمەڵێك پیلانی گەورە له پشتی ئەم مەسەلەدا هەیه.

پرسیار له رۆژنامەی "لۆس ئانجلێز تایمز"ەوە: پێش سەفەر بۆ واشنگتۆن، مەسعود بارزانی وتی هۆکاری ڕاستەقینەی هاتنی ئەو بۆ واشنگتۆن ئەوە بووە که ئێوە له کاتی دیدار له باکووری عێراق له مانگی حوزەیرانی ڕابردوو، بۆ یەکەم جار به ئاشکرا پشتیوانی خۆتان دەربڕیوە له کوردەکان و سەرەنجام کۆمەڵێك گارانتیتان داوە به کوردەکان؟ ئێوە چ چۆرە گارانتییەکتان داوە به کوردەکان؟

"دەیڤید وێلش": لەراستیدا گرنگترین گارانتیەك که ئێمه داومانه به خەڵکی باکووری عێراق - هەموو خەڵکی باکووری عێراق، نەتەنها کوردەکان - تێوەگلانی کۆمەڵگای نێونەتەوەییه له کێشەکەیان دا. بۆچوونی من ئەوەیه که ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێت بێ هەڵوێست و بێ دەنگ بێت له بەرامبەر چارەنووسی خەڵکی ئەم ناوچەیه. ئێمه له وانه دڵتەزێنەکانی پێشتر فێر بووین که ئەگەر ئێمه بێ دەنگ بین، تراژیدییەکه دووپات دەبێتەوە. با وەبیری خۆمانی بهێنینەوە که خەڵکی باکووری عێراق قوربانی پێشێلکاری یەکجار زۆری مافی مرۆڤ بووە له دەیەی ۱۹۸۰ و سەرەتای دەیەی ۱۹۹۰ . کۆمەڵگای نێونەتەوەیی له سەرەتای دەیەی ۱۹۹۰ یەکی گرت بۆ

پشتیوانی کردن لە کوردەکان و پێموایە گەورەترین کێشەیەك کە کوردەکان پاش ئەم قۆناخە هەیانبووە، جیابوونەوە و یەکنەگرتوویی سیاسی بووە. ئەگەر ئێمە بمانتوانیبا یارمەتیان بدەین بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە، ئاسایش و ژیانی خەڵکی ئەم ناوچەیە (خەڵکی باکووری عێراق بەگشتی) باشتر دەبوو.

ئەوەی کە من جەختی لەسەر دەکەمەوە بۆ بەڕێز بارزانی و تاڵەبانی و هەموو کەسانی دیکە کە لە باکووری عێراق دیدارم لەگەڵ کردوون، ئەوەیە کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کەوتووەتە نێو کێشەکەیان. هەر بۆیە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی، لەوانە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرنج بە بارودۆخەکەیان دەدات بەڵام ئەوان بەرپرسیارن لە بەرامبەر خەڵکەکەیان کە باش ڕێبەرایەتی بکەن بۆ ئەوەی کە بارودۆخەکە باشتر بێت، ئەگەرنا مەترسی لەسەر خەڵکەکەیان زۆرتر دەبێت.

من هیچ گارانتیەکی تایبەتم نەداوە بە ڕێبەرە کوردەکان. سەرەتا کە ئەوان هاتن بۆ واشنگتۆن، ئێمە ڕوانگەی خۆمانمان بۆیان ڕوون کردەوە کە لە بارودۆخێکدا کە دو پارتی سەرەکی کوردی پێکەوە ناکۆکن و لەگەڵ یەك شەڕ دەکەن ئەگەر پاشان دەوڵەتێکی بیانی یان دەوڵەتی بەغداد هێرشیان بکاتە سەر، زۆر زەحمەتە بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا هەر دەوڵەتێکی دیکە کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەگەڕ بخات بۆ پشتیوانی کردن لە کوردەکان. وەزیری دەرەوە زۆر بە جوانی ئەم مەسەلەیەی بۆ بەڕێز تاڵەبانی و بەڕێز بارزانی ڕوون کردەوە. بەڵام ئەگەر ئەوان یەکگرتوو بن و دەست بە پروسەی ئاشتبوونەوە بکەن، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتیان دەدات و ئەگەر هەڕەشەیەکی دیکە لەلایەن بەغدادەوە لە سەریان بکرێت، ئێمە بێ دەنگ نابین لە بەرامبەری و پشتیوانی لە کوردەکان دەکەین. وەزیری دەرەوە پێش لە ڕاگەیاندننامە هاویەشەکەی نێوان بەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی، ئەم مەسەلەیەی پێراگەیاندوون.

پرسیار: ئه‌گه‌ر ئێمه چاو له ڕێككه‌وتننامه‌كه‌ی نێوان بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵه‌بانی بكه‌ین، كۆمه‌ڵێك خاڵی سه‌رنجراكێشی تێدا دەبینین، بۆ نمونه باسی بیرۆكه‌ی فدرالیزم له نێوان گروپه كوردەكان له داهاتوودا كراوه. ئه‌م بیروكه‌یه دەبێته هۆی پێكهاتنی دەوڵه‌تێكی سه‌ربه‌خۆ له داهاتوودا له ناوچه، ئێوه چۆن بیری لێ دەكه‌نه‌وه؟

"دەیڤید وێلش": خوشحاڵم كه پرسیارێكی واتان هێنایه گۆڕێ له‌به‌ر ئه‌وەی كه من له كاتی گفتوگۆ له‌گه‌ڵ دۆسته‌كانم له دەوڵه‌تی توركیا بۆم دەردەكه‌وت كه ئه‌م مه‌سه‌له‌یه كۆمه‌ڵێك نیگه‌رانی له توركیا دروست كردووه. با به چه‌ند شێوه وەڵامی ئه‌م پرسیاره بدەمه‌وه: یه‌كه‌م له په‌یوەندی له‌گه‌ڵ ئه‌وەی كه له‌م ڕێككه‌وتنه‌دا هاتووه، دەبێ بڵێم له یه‌كه‌م به‌شی ڕاگه‌یاندننامه هاوبه‌شه‌كه‌دا ئاماژه به‌وەكرا كه ئامانجی خه‌ڵكی عێراق، عێراقێكی یه‌كگرتوو، پلورالیست و دیموكراته. له په‌یوەندی له‌گه‌ڵ ئامانجی دو حیزبه كوردەكه، ئه‌وان جۆرێك سیستمی فدراڵییان دەوێت له چوارچێوەی عێراقدا. هه‌ڵویستی وڵاته یه‌كگرتووەكانی ئه‌مریكا به‌نیسبه‌ت ئامانجی ئه‌م دو حیزبه كورده ئه‌وەیه كه ئێمه ڕێز له ئامانجه‌كه‌یان دەگرین به‌ڵام ڕێزیشمان هه‌یه بۆ ئامانجی خه‌ڵكی عێراق بۆ وڵاتێكی یه‌كگرتوو، پلورالیست و دیموكرات، ئه‌گه‌ر وابێت زۆر باشه. له‌م په‌یوەندییه‌دا، ئێمه ڕێز له مافی خه‌ڵك دەگرین بۆ ئه‌وەی خۆیان بڕیاری داهاتوی خۆیان له وڵاتی خۆیاندا بدەن. ئه‌مه به‌شێكه له میراتی نه‌ته‌وەیی ئێمه و زۆربه‌ی ئه‌مریكاییه‌كان باوەڕیان پێیه‌تی. پاش ئه‌وەش ئێمه خۆیشمان دەوڵه‌تێكی فیدراڵین. ئه‌مه به واتای ئه‌وه نییه كه وڵاته یه‌كگرتووەكانی ئه‌مریكا ڕێگاچاره‌یه‌كی تایبه‌ت پێشنیار دەكات به نه‌ته‌وەی عێراق. ئه‌مه شتێكه كه خه‌ڵكی عێراق خۆیان دەبێ بڕیاری له سه‌ربدەن كه كوردەكانیش به‌شێكی گه‌ورەی ئه‌م پێكهاته‌یه‌ن.

دووەم ئه‌وه كه هه‌ڵویستی وڵاته یه‌كگرتووەكانی ئه‌مریكا چیه به‌نیسبه‌ت سه‌ربه‌خۆیی كوردستان، له به‌ر ئه‌وەی كه من دەزانم خه‌ڵك له‌م په‌یوەندییه‌دا پرسیاریان هه‌یه. با لێره ئه‌وه ڕوون بكه‌مه‌وه

كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پشتیوانی ناكات لە كوردستانێكی سەربەخۆ، چ لـە بـاكووری عێراق، چ لە شوێنەكانی دیكە. ئێمە پشتیوانی لە عێراقی یـەكگرتوو دەكـەین و لەسـەر ئـەو باوەڕەین كە عێراق خاوەن یەكپارچەیی خاكە و ئێمە نامانەوێت ئەم كیانە بگۆڕین. ئەمە روانگەی ئێمەیە بە نیسبەت عێراق.

پرسیار: ئایا لـە میانـەی گفتوگـۆ لەگـەڵ بـەڕێز بـارزانی و بـەڕێز تاڵـەبانی، باسـی مەسـەلەی ئۆپوزسیونی عێراق كراوە، ئەگەر شتێكی وابووە ئەوان دەیانەوێت چ دەورێك لەمەدا بگێڕن و بە لەبەرچاوگرتنی سەرنەكەوتنی ئەزموونی پێشووتری ئێوە لەگەڵ ئۆپوزسیونی عێراق، ئێوە بە شوێن چ مودێلێكی نوێ یان دەورگێڕیكی نوێدان؟ و كاردانەوەی ئێوە چیە لـە بەرامبـەر پێـشنیارەكەی دوكتۆر ئەحمەد چەلەبی سەبارەت بەوەی كە شازادەی ئۆردۆن، مەلەك حەسەن ببیێ بە رێبەری نوێی عێراق؟

"دەیڤید وێلش": بەلێ چەند پرسیار خرایە روو. من هەوڵ دەدەم وەڵامی گرنگترینیان بدەمـەوە، ئەویش ئەوەیە كە چ جۆرە گفتوگۆیەك كراوە لەگەڵ بارزانی و تاڵەبانی سەبارەت بـە ئۆپوزسـیونی عێراق. من ئەو شتەی كە پێشتر وتم دووپاتی دەكەمەوە، ئامانجی ئێمـە لـە هەوڵەكـەی مـانگی ئەیلوولمان ئەوە بوو كە بارودۆخی باكووری عێراق باشتر بكەین. ئێمە ئامانجێكی وامان نەبوو كـە ئەم دو رێبەرە خۆیان وەك رێبەرانی ئۆپوزیسیون رابگەیەنن یان جـۆرە بەرەیـەكی یـەكگرتوو دژی دەوڵەتی عێراق دابمەزرێنن. خۆشبختانە لەسەر ئەو باوەڕە نـیم كـە لـەم بارودۆخـەدا شـتێكی وا پێویست بێت یان گونجاو بێت. با لەبیرمان نەچێت ئەم دو رێبەرە سیاسیە، ئەزموونێكی بەرچاویان هەیە لەگەڵ رژێمی سەدام حوسەین و پێویستیان بەوە نییە كە كەسێكی دیكە فێریـان بكـات كـە قوربانی بوونی سەدام واتـای چـیە. لـەم بـارەوە ئـەوانیش وەك زۆربـەی خـەڵكی عێـراقن و زۆر بەدەستی سەدام چەوساونەتەوە و كۆمەڵێك ئەنجامیان بەدەست هێناوە. پێویست بەوە ناكات ئێمە ئەوان فێری ئەم مێژووە بكەین. ئەوان رێبەری خۆراگەیانـدراوی ئۆپوزسـیونن، لەبـەر ئـەوەی كـە

دەسەڵات و كونترۆڵی سەدام حوسەین قبوڵ ناكەن لە ناوچەی خۆیاندا. ئەوان بە شتێكی زۆر خراپی دەزانن كە لە ژێر كونترۆڵ و دەسەڵاتی سەدام حوسەیندا بن و ئەركی هاوبەشی ئێمە وەك ئەندامانی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئەوەیە كە گارانتی ئەوە بكەین كە ئەوان دیسان نەكەونە ژێر دەسەڵات و كونترۆڵ سەدام.

پرسیار: هەروەك دەزانن توركیا هەندێ جار شاڵاوی سەربازی لە باكووری عێراق ئەنجام دەدات بۆ راماڵینی PKK. ئەم شاڵاوانە كاردانەوەی هەندێ لە وڵاتانی ناوچە یا جیهانی لێدەكەوێتەوە، بەڵام ئێوە پشتیوانی لەم شاڵاوانە دەكەن، ئێوە پشتیوانیتان كردووە لە توركیا بۆ ئەم شاڵاوانە لەبەر ئەوەی كە دژی ترووریزم ئەنجام دەدرێن. ئەگەر لە داهاتوودا ئاڵوگۆڕ بەسەر هاوسەنگیەكان دا بێت ، ئایا ئەمریكا هەروا بەگەرمی پشتیوانی لە شاڵاوەكانی توركیا دەكات؟

"دەیڤید وێڵش": با هەڵوێستی خۆمان روون بكەمەوە: یەكەم توركیا دۆست و هاوپەیمانی ئێمەیە. دووەم ئێمە رێز لە مافی خۆپاراستنی توركیا دەگرین و پشتیوانی لێدەكەین، لەوانە دژی تروریزم. سێیەم توركیا راوێژ ناكات لەگەڵ ئێمە بۆ ئەنجامدانی ئەم شاڵاوانە. چوارەم كاتێ كە توركیا هەست دەكات پێویستە ئەم شاڵاوانە ئەنجام بدات، هەڵوێستی ئێمە ئەوەیە كە دەبێ پێوەر و ماوەی ئەم شاڵاوانە سنووردار بێت و زیان بە مافی خەڵكی ناوچە نەگەیەنێت. كەوابوو ئەمە خۆی لە خۆیدا جیاوازە لەگەڵ پشتیوانی كردن لەم شاڵاوانە. وڵاتانی دیكە هەڵوێستی جیاوازیان هەیە بەڵام دەبێ ئاماژە بەوە بكەم كە گەلێ لەو وڵاتانە كە ئەم شاڵاوانە شەرمەزار دەكەن، خۆیان بەپرسیارن لەبەرامبەر ئەو بارودۆخەی كە ئەم شاڵاوانەی لێدەكەوێتەوە یا لەراستیدا بەرپرسیارن لەبەرامبەر ئەو پشتیوانیە كە لە PKK دەیكەن. ئێمە دیالوگی باشمان هەیە لەگەڵ دەوڵەتی توركیا لەم پەیوەندییەدا.

بەبۆچوونی من راگەیاندننامە هاوبەشەکەی بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی هەندێك گارانتی ئەمنی زۆر گرنگی تێدایە بۆ ئاسایش و پاراستنی تورکیا. ئایا من نیگەرانم بەنیسبەت جێبەجێ بوونی ئەم گارانتیە؟ بە دڵنیاییەوە ، من زۆر بە وردی چاودێری ئەم مەسەلەیە دەکەم لەگەڵ هاوکارانم لە دەوڵەتی تورکیا و بەریتانیا. زۆر گرنگە کە ئەم بەشە لە رێککەوتننامەکە بە شێوەی فەرمی جێبەجێ بکرێت و شتێکی بنەڕەتییە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە تورکیا لەم رەوتەدا قازانجێکی ئەمنی دەست بکەوێت.

پرسیار: دەمەوێت پرسیارەکەم دووپات بکەمەوە دەربارەی ئۆپوزیسیونی عێراق و ئەوەی کە ئێوە چ فورمولێکتان داوە بە ئۆپوزسیون. ئایا ئێمە دەتوانین چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە چالاکی ئۆپوزیسیون، سەر لە نوێ لە باکووری عێراق دەست پێبکاتەوە؟

"دەیڤید وێلش": ئێمە پشتیوانی لە ئۆپوزیسیونی عێراق دەکەین. هەروا کە هەموومان دەزانین، عێراق ئۆپوزیسیونی هەیە کە زۆربەی خەڵکی عێراق تێیدا بەشدارن. مەسەلەی ئێمە ئەوەیە کە دەنگی خۆمان بخەینە پاڵ ئەم ئۆپوزسیونە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا خۆی وەك ئاڵترناتیڤێکی بەهێز نیشان بدات. ئەمە هەوڵێکی درێژخایەنە. بەداخەوە، یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی رژێمی عێراق ئەوەیە کە دەسەڵاتخوازی لە ڕادەبەدەری ئەم دەوڵەتە، بەشێوازێکی زۆر سەرکەوتوانە توانیویەتی نارەزایەتیە ناوخۆییەکانی عێراق کونترۆڵ بکات، ئەڵبەتە نە لە هەموو شوێنەکانی عێراق بەڵکوو بەتایبەت لە ناوەڕاستی عێراقدا. ئێمە وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە هەوڵەکانی ئۆپوزیسیون دەکەین بۆ بەرێکخستن کردنی خۆی و راکێشانی پشتیوانی نێونەتەوەیی و ناوخویی. ئەم مەسەلەیە چەند توخمی هەیە: یەکەم پشتیوانی کردن لە پەخشی بەرنامەی رادیویی کە بیروڕای جیاواز بخاتە بەردەستی خەڵکی عێراق. دووەم پشتیوانی لە هەوڵەکانی ئۆپوزیسیون بۆ بەرێکخستن کردنی خۆی و کۆکردنەوەی ئەندامە جۆراوجۆرەکانی ئۆپوزیسیون لە دەوری یەك بۆ دیالۆگ و لە یەك تێگەیشتن. سێیەم ئێمە هەروەها پشتیوانی لە هەوڵێکی چڕوپڕ و

بەرێکخستنکراو دەکەین بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی پێشیلکارییەکانی مافی مرۆڤ و تاوانەکانی جەنگی دەوڵەتی عێراق بۆ ئەوەی لە داهاتوو لە یەك فایلدا تاوتوێ و شرۆڤە بکرێت و لەوانەیە ببێت بە بنەمایەك بۆ کردەوەی نێونەتەوەیی زۆرتر دژی سەدام.

پرسیار: هەرواکە دەزانن بەرێز بارزانی و تاڵەبانی لە بەرنامەیاندا هەیە سەردانی تورکیا بکەن بۆ ئەوەی دیسان لە ئانکارا لەگەڵ یەك دابنیشن. ئایا ئێوە هاوڕێیەتیان دەکەن لەم سەفەرەدا بۆ ئانکارا و ئایا ئێوە هیچ پلانێکتان هەیە بێن بۆ ئانکارا بۆ ئەوەی لە نیگەرانیەکانی کاربەدەستانی تورکیا سەبارەت بە رێککەوتننامەی واشنگتۆن کەم بکەنەوە؟

"دەیڤید ویڵش": لەراستیدا من کاتێکی کەمم لەم هەفتانەی دواییدا لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا بەسەر بردووە و هیوادارم ئەم دانیشتنە بەردەوام بێت. ئێمە پێشنیارمان کردووە هەنگاوی دواتر لە رەوتی ئاشتبوونەوە ئەوە بێت کە بارزانی و تاڵەبانی لە ئانکارا لەگەڵ تورکیا، بەریتانیا و ئەمریکا دابنیشن. با ئاماژە بەوەش بکەم کە ئەجێندای ئەم کۆبوونەوەیە لەوانەیە شتانی دیکەش لە خۆ بگرێت. ئێمە پێشنیاری ئەوەمان کردووە کە ئەجێندای کۆبوونەوەکە، مەسەلەی ئەمنی بێت. بۆ ئێمە ئەم پێشنیارەمان کردووە؟ لە بەر ئەوەی کە(هەروەها کە پێشتر وتم) مەسەلەی ئەمنی، توخمی سەرەکی تێوەگلانی ئێمەیە لەم مەسەلەیەدا و بنەمای ناوبژی کردنەکەی ئێمەیە. ئێستا لە سەر دەوڵەتی تورکیایە کە هەموومان بانگهێشت بکات بۆ ئەم کۆبوونەوەیە و هیوادارم بانگهێشتمان بکات. ئەگەر تورکیا بانگهێشتمان بکات، من بۆ خۆم زۆر خۆشحاڵم دەبەم کە بەشداری لەم کۆبوونەوەیەدا بکەم. خاتوون ئالبرایت، وەزیری دەرەوە، چاوەڕوانە کەمن بچم بۆ ئەو کۆبوونەوەیە. پێم وتن لەم رۆژانەی دواییدا بە جیا قسەم کردووە لە گەڵ بەرێز بارزانی و تاڵەبانی کە ئێستا لە ئوروپا و ناوچەی کەنداوی فارسن و هەردوویان ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بۆ بەشداری کردن لەم کۆبوونەوەیە ئەگەر لە ئانکارا پێشوازیان لێبکرێت. ئەڵبەتە لە سەر دەوڵەتی تورکیایە کە ئەم پێشوازییە بکات.

پرسیار: من دوو پرسیارم هەیە: یەکەم ئەوە کە هەندێ راپۆرت بڵاو بووەتەوە سەبارەت بەوەی کە خاتوون ئالبرایت لە کۆبوونەوەکەی واشنگتۆندا بەڵێنی داوە بە بەرێز تاڵەبانی و بارزانی کە ئەگەر سوپای عێراق هێرش بکاتە سەر باکووری عێراق، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرگریان لێدەکات، هەرواکە بەرگری لە کوێت کرد، ئایا ئێوە ئەمە پشتراست دەکەنەوە؟ پرسیاری دووەمی من ئەوەیە کە ئێوە وتتان کە سیاسەتی ئەمریکا دژی پارچە پارچە بوونی عێراقە، بەلام روانگەی جیهانی عەرەب ئەوەیە کە ئێستا دەوڵەتێکی نیمچە سەربەخۆ لە باکووری عێراق هەیە کە بنەما خۆش دەکات بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی.

"دەیڤید وێلش": لە پەیوەندی لەگەڵ پرسیاری یەکەمدا دەبێ بڵێم لە کاتی راگەیاندنە هاوبەشەکە، خاتوون "ئالبرایت"دو شتی بە گشتی باس کرد: یەکەم ئەوە کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێت رێگە بەوە بدات کە رووداوەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ و سەرەتای ١٩٩٠ دووپات بێتەوە کە تێیدا هەزاران عێراقی، زۆرتر کوردەکان گیانیان لە دەست دا و هەروەها کە ئێوە لەوانەیە بتانەوێت وەبیری بهێننەوە، دەوڵەتی عێراق سەرەتا چەکی کیمیایی دژی خەڵکی بێ گوناهی ولاتی خۆی بەکارهێناوە. مەسەلەی دووەم کە خاتوون ئالبرایت باسی کرد ئەوە بوو کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە خەڵکی عێراق و بە تایبەت خەڵکی باکووری عێراق دەکات، ئەگەر دەوڵەتی عێراق هێرش بکاتە سەریان. بە بۆچوونی من ئەمە هۆشدارییە بۆ سەدام کە قەد هێرشەکانی دووپات نەکاتەوە، لەبەر ئەوەی کە بەردیلەکەی دەدات.

بەنیسبەت پارچە پارچە بوونی عێراق، ئێمە رامانگەیاندووە کە پشتیوانی لە عێراقێکی یەکگرتوو دەکەین. لە راستیدا دەوڵەتی عێراق هەر لە کۆنەوە کونترۆڵی هەندێ بەشی ولاتی خۆی لە دەستدا نەبووە، بۆ نمونە پێش ئەوەی کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە راستیدا بکەوێتە ناو کێشەی باکووری عێراق . نازانم مەبەستتان ئەوە بوو کە ئەمە پارچە پارچە بوونی عێراقە، من ئەمە بە شکستی رژیمی عێراق دەزانم و هەروەها شکستێکە بۆ خەڵکی عێراق. ئێمە پشتیوانی لە

جیابوونەوەی بەشێك له عێراق لەو وڵاته ناکەین و هەروەها پشتیوانی له دروستبوونی دەوڵەتێکی نیمچە سەربەخۆ ناکەین له بەشێك لەم وڵاتەدا و باوەڕیش ناکەم ڕێبەرە کوردەکان به دوای شتێکی وا بن. ئەگەر به دیقەتەوە ڕاگەیاندننامەکە بخوێنینەوە، دەبینین که بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی داوای عێراقێکی یەکگرتوو، پلورالیست و دیموکرات دەکەن . ئەوان پێشنیاری ئەوە دەکەن که سیستمی عێراق، فدراڵی بێت. ئەمە شتێکە که سەرجەم خەڵکی عێراق دەبێ بڕیاری لە سەر بدەن. هیوادارین ڕۆژێك بێت که خەڵکی عێراق سیستمێکی وا هەڵبژێرن.

پرسیار: ئێوه ئاماژەتان بەوە کرد که ناتانەوێت بەشێك له عێراق لەم وڵاته جیا بکەنەوە و ڕێبەرە کوردەکانیش داوای سیستمی فدراڵی دەکەن، بەڵام له کردەوەدا شتێکی وا لە سەروبەندی ڕوودان دایە. ئێوه ڕادیۆیەکتان داناوە بۆ ئۆپۆزسیونی عێراق و ئەندامانی CIA لە باکووری عێراق ماوەیەك پێش ئێستا چالاك بوون واتا کاتێك که بارزانی هێرشی کردە سەر تاڵەبانی له سلێمانی و هەموو نیشانەکان نیشان دەدات که ئێوه بەرەو پێش دەچەن و دەتانەوێت کۆمەڵگای ئێونەتەوەیی زۆرتر بکێشنە ناو باکووری عێراق. بەڵام هەروەك دەزانن کردەوە لە گەڵ لێدوان جیاوازە. ئێوه چی دەڵێن لەم پەیوەندییەدا؟

"دەیڤید وێلش": من لەگەڵ زۆربەی ئەم بۆچوونانە دا نیم. ئێستا گەلێ ڕادیو هەن که سەر بە ئۆپۆزسیونی عێراقن، بۆ تەنها پەنجە بەرەولای ڕادیۆکەی ئێمە ڕاکێشراوە که دەیەوێت عێراق پارچە پارچەبکات. ئەوەی که ئێمە بۆ خەڵکی عێراق دەمانەوێت، شتێکی جیاوازە ، ئێمە پشتیوانی له هەر کەسێك دەکەین که لەگەڵ ئەم ڕاونگەیەی ئێمەدا بێت. به باوەڕی ئێمە خەڵکی عێراق شایانی ئەوەن داهاتوویەکی جیاوازیان هەبێت. ئامانجی ئێمە، ئەمەیە.

جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە که هەڵوێستی ئێمە ئەوەیە که یەك نەتەوە هەیە له عێراقدا. دەوڵەتی عێراق له ماوەی ٢٠ تا ٣٠ ساڵی ڕابردوودا، ڕێبەرایەتییەکی لاوازی هەبووە به بەراورد

لە گەڵ دەوڵەتانی دیکەی ناوچە. عێراق خاوەن سەرچاوەی سروشتی زۆرە و خەڵکێکی زیرەك و چالاکی هەیە. بەڵام چ بە سەر ئەم نەتەوەیەدا هاتووە؟ ئەم نەتەوەیە لەلایەن رژیمی سەدامەوە قەلاچۆ کراوە و ئەم رژیمە بەرپرسیارە لە بەرامبەر مێژووی ئەم ٢٥ ساڵەی دوایەی عێراق. هەموومان ئەوە دەزانین سەرەرای ئەو کێشە بنەرەتیانەی کە رژیمی عێراق بۆ خەڵکەکەی دروستی کردووە، ئەم نەتەوەیە هێشتا بەیەکگرتوویی ماوەتەوە.

بە باوەری من ئەم هاوپەیوندییە کە تا ئێستا عێراقی بە یەکگرتوویی هێشتووەتەوە عێراق بەرەو یەکپارچەیی دەبات نە هەڵوەشاندنەوە. جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە کە ئامانجی ئێمە پارچە پارچە کردنی عێراق نییە. زۆر راستگۆیانە پێتان دەڵێم کە تەنانەت ئەگەر ئێمەش بمانەوێت، ئایا دەتوانین عێراق پارچە پارچە بکەین؟ جگە لەمەش لە کاتی جەنگی ٨ ساڵەی ئێران و عێراق، گەلێ کەس دەیانگوت لەوانەیە بەشێك لە خەڵکی عێراق لەم وڵاتە جودا ببنەوە و پەیوەست بن بە بەشێکی دیکە. بەڵام شتێکی وا رووی نەدا، رووی دا؟ رووی نەدا لە بەر ئەوەی کە بە بۆچوونی من زۆربەی خەڵکی عێراق خۆیان بە عێراقی دەزانن و ئەگەر دراوسێیەکی نزیك عێراق نەیتوانی عێراق پارچە پارچە بکات، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ناتوانێت پارچە پارچەی بکات، تەنانەت ئەگەریش بیەوێت شتێکی وا بکات.

بەڵام دیسان پشتڕاستی دەکەمەوە کە شتێکی وا لە ئارادا نییە. با بە شێوازێکی دیکە بۆتان روونی بکەمەوە: ئەگەر سبەینێ رژێمێکی دیکە لە عێراق بگات بە دەسەڵات و سەدام لە سەر دەسەڵات لابرێت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیوەندییەکی جیاواز لەگەڵ ئەم دەوڵەتە دەگرێتە بەر . خاتوون ئالبرایت، وەزیری دەرەوە لە لێدوانێکدا لە سەرەتای ١٩٩٧ ئەم مەسەلەیەی راگەیاند و من داواتان لێدەکەم بگەرێنەوە بۆ دواوە و ئەم لێدوانە بخوێننەوە لە بەر ئەوەی نیشان دەدات ئێمە تەنها کێشەمان لە گەڵ رژێمی عێراق هەیە، نە لە گەڵ وڵات یان خەڵکی عێراق.

پرسیار: ئێوە چۆن ئەم کردەوەیەی دەوڵەتی تورکیا شرۆڤە دەکەن کە دەستبەجێ پاش ڕێککەوتننامەی واشنگتۆن ڕایگەیاند دەیەوێت پەیوندییە دیپلۆماتیکەکانی خۆی لەگەڵ عێراق تا ئاستی کردنەوەی باڵوێزخانە لەم وڵاتە بەرز بکاتەوە؟ ئایا ئێوە لە سەر ئەو باوەڕە نین کە دەوڵەتی تورکیا لەوە دەترسێت کە ئەگەر کیانێکی جیاواز لە باکووری عێراق پێك بێت، کیانێکی هاوشێوەش لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دروست دەبێت؟

"دەیڤید وێڵش": من پێشتر وەڵامی نیگەرانیەکانی دەوڵەتی تورکیام بە نیسبەت ڕاگەیاندننامە هاوبەشەکەی دو ڕێبەرە کوردەکە دایەوە. بە نیسبەت بڕیاری تورکیا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق، وەڵامی ئەم پرسیارەم تۆزێك لەمەوبەر دایەوە و دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم بڕیارە پەیوەندی بە تورکیاوە هەیە. ئەمە کۆمەڵێك نیگەرانی بۆ ئێمە دروست کردووە. بە بۆچوونی ئێمە لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عێراق لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دابڕاوە، بیروکەی بەرزکردنەوەی ئاستی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەم دەوڵەتە، بیروکەیەکی باش نییە. ئێمە سەیر دەکەین بزانین چۆن ئەم بڕیارە جێبەجێ دەبێت.

پرسیار: لە ڕێککەوتنامەکەی نێوان بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی بە ناوبژیوانی ئەمریکا لە واشنگتۆن، خشتەیەکی کاتیی دیاری کراوە بۆ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن لە مانگی حوزەیران. هەندێ لە ڕەخنەگران پێیان وایە ئەم ڕێککەوتنەننامەیە واقعبینانە نییە و کۆمەڵێك شت هەیە و لە ڕاستیدا کۆمەڵێك کێشە هەیە وەك دابەش کردنی داهاتەکان لە باکووری عێراق . هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارێتی شتێکی گرتووەتە ئەستۆ کە ناتوانێ جێبەجێی بکات.

"دەیڤید وێڵش": پێموایە گەلێ ڕێککەوتنامەی نێونەتەوەیی هەیە لەم ناوچەیە لە جیهان کە جێبەجێ کردنیان زەحمەتە. بەڵام من خۆشبینم بە نیسبەت جێبەجێ بوونی ئەم ڕێککەوتننامەیە،

لەبەر ئەوەی کە هەر دو رێبەری کورد بەڵێنیان داوە بە خۆم، هەروەها کە بەرپرسیارێتی و رێبەرایەتی خۆیان لای بەرزترین کاربەدەستی دەوڵەتی ئەمریکا دەربڕیوە. ئاشکرایە کە ئەمە بەتەنهایی بەس نییە، دەمێنێتەوە سەر دەروەسبوونی ئەوان و هەوڵدان بۆ قایم کردنی بارودۆخی خۆیان. ئێمە نیشانمان داوە کە دەتوانین یارمەتیان بدەین. دەتوانین یارمەتیان بدەین کە لە دەوری یەك کۆ ببنەوە بەڵام ناتوانین هیچ رێگاچارەیەکیان بۆ بدۆزینەوە، ئەوان خۆیان دەبێ ئەم رێگاچارەیە بدۆزنەوە. ئێمە ئاگاداریان دەبین، هانیان دەدەین و یارمەتیان دەدەین ئەم هەنگاوانە هەڵبگرن کە پێویستە بۆ تەواو بوونی ئەم رەوتە. پێموایە ئەنجامی کۆتایی بە قازانجی خەڵکەکەیان دەبێت و ئەگەر ئەوان ئەمە نەکەن، دەبێ لە خۆیان پرسیار بکەن کە ئایا بەرپرسیارێتی خۆیان لە ئاستی رێبەرایەتی کردنی خەڵکەکەیان ئەنجام داوە بۆ ئەوەی داهاتوویەکی باشتریان بۆ دابین بکەن.

پرسیار: ئێوە چۆن سەیری کاردانەوەی وڵاتانی عەرەبی دەکەن لە بەرامبەر ئەم رێککەوتننامەیەی کوردەکان، مەبەستم وڵاتە عەرەبیە میانەڕەوەکانە. ئایا ئەم وڵاتانە پێشوازی لەم رێککەوتننامەیە دەکەن یا تۆزێ رەخنەیان هەیە لێی؟

"دەیڤید وێلش": لە راستیدا کاردانەوەی ئەوان زۆر باش بووە. ئێمە لە کاتی ئەم وتووێژانە و پاش ئەوەش گەلێ لە دۆستە عەرەبەکانمان ئاگادار کردووەتەوە و زانیمان کە کاردانەوەیان زۆر باشە. ئەوان بە روونی سەیری ئامانجی ئێمە دەکەن کە ئەویش هەوڵدانە بۆ زیندووکردنەوەی ئاشتی و سەقامگیری ناوچە. دەوڵەتە عەرەبە میانەڕەوەکان کە دۆستی ئەمریکان هیچ تێروانینێکی پێچەوانەی ئامانجی ئێمەیان نییە. ئەوان وا بیرناکەنەوە کە ئێمە دەمانەوێت عێراق پارچە پارچە بکەین. هەروا کە ئاماژەم پێکرد یەکێ لە رێبەرە کوردەکان دوابەدوای رێککەوتننامەکە سەردانی وڵاتانی عەرەبی کردووە. من بە تەواوی لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئەگەر وڵاتانی عەرەبی حەزیان لەم رێککەوتنامەیە نەبوایا، پێشوازیان لەم رێبەرە کوردە نەدەکرد.

پرسیار: با وای دابنێین کە ئەم ڕێککەوتننامەیە لە داهاتوودا بەرەوپێش دەچێت و گەلێ لە بەشەکانی جێبەجێ دەکرێت و بارودۆخێك بێتە پێش کە دەوڵەتی عێراق وا بزانێت کە ئەمە هەوڵێکە بۆ جیابوونەوە لە عێراق و پاشان هێرش بکاتە سەر کوردەکان. لەم کاتەدا هەڵویستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چ دەبێت، ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێزی زەمینی خۆی دەنێرێت بۆ ناوچە؟

"دەیڤید وێلش": سەیر کەن من نامەوێت وەڵامی پرسیارە گریمانەییەکان بدەمەوە. بەڵام پەیامی ئێمە زۆر روونە. بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەوڵەتی عێراقی دەروەس کردووە کە نابێت خەڵکەکەی خۆی سەرکوت بکات، عێراق قەد رێزی لەم بڕیارنامەیە نەگرتووە و هەتا ئەمڕۆ خەڵکەکەی خۆی سەرکووت دەکات.

هەروا کە سەرنجی هەمووومان لە سەر رێوشوێنە سەربازییەکانی گەمارۆکانی سەر رژێمی عێراق چڕ بووتەوە، دەبێ سەرنجیش بدەین بە لایەنی مافی مرۆڤی ئەم مەسەلەیە. ئەوەی کە ئێمە لەم ڕاگەیاندننامە هاوبەشەدا و هەموو ڕاگەیاندننامەکانی دیکەدا گونجاندومانە ئەوەیە کە هۆشدارییەك لێرە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە رێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێ دەنگ نابێت ئەگەر دەوڵەتی عێراق هەوڵ بدات رووداوێکی وەك رووداوەکانی دەیەی ١٩٨٠ و سەرەتای ١٩٩٠ بخولقێنێت.

پرسیار: ئایا ئێوە هیچ پەیوەندییەك دەبینن لە نێوان ڕێککەوتننامەکەی بەڕێز تاڵەبانی و بارزانی لە واشنگتۆن لە لایەك و پەرەسەندنی گرژییەکانی نێوان سوریا و تورکیا لە لایەکی دیکەوە؟

"دەیڤید وێلش": پێموانییە پەیوەندییەك هەبێت لە نێوان ئەم دو مەسەلەیەدا. بەڵام ریشەی کێشەی نێوان تورکیا و سوریا، مەسەلەی (PKK) یە. باشترە ئەم پرسیارە لە دەوڵەتی تورکیا بکەن.

پرسیار: ئێوە وتتان کە بەشوێن دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورددا نین و لە ڕاستیدا من باوەڕ ناکەم شتێکی وا لە ناوچە قبوڵ بکرێت لە بەر ئەوەی هاوسەنگی هێزە ناوچەییەکان (تورکیا لە لایەك و عێراق و ئێران لە لایەکی دیکە) تێکدەچێت. بەڵام من وا لە مەبەستەکەی ئێوە تێگەیشتم کە ئێوە پشتیوانی لە سەرهەڵدانی کیانێك دەکەن لە باکووری عێراق کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ڕۆژبەرۆژ زۆرتر یارمەتی بدات. ئایا ئەمە سەرەتایەك نییە بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد ؟

"دەیڤید وێلش": مەبەستم مسۆگەر کردنی پاراستن و ئاسایشی گروپێکە کە مافی چارەی خۆنووسینی هەیە لە چوارچێوەی وڵاتی خۆیدا و لە ڕابردوودا بووەتە قوربانی لە بەر ئەوەی ئەم جۆرە سەرنجە نێونەتەوەییەی نەبووە.

من باوەڕ ناکەم و بۆ خویشم ناتوانم بێ هەڵوێست بم بەنیسبەت چارەنووسی ئەم خەڵکە. لە ڕێگای نمونەی باکووری عێراق ئێمە دەمانەوێت بە هەموو خەڵکی عێراق نیشان بدەین کە ئەوانیش دەتوانن ڕێگایەکی وا هەڵبژێرن. با لە بیرمان نەچێت خەڵکی باکووری عێراق تەنها قوربانیانی ئەم بارودۆخە نین. بۆ نمونە دەتوانین هەر ئێستا ئاماژە بە دژەکردەوەکانی دەوڵەتی عێراق بکەین دژی خەڵکی باشووری عێراق.

بەداخەوە هەروەها کە دەزانن بارودۆخی عێراق بە جۆرێکە کە خەڵك سەرنجێکی ئەوتۆ نادەن بەم شتانە. هەروەها مافی مرۆڤ لە ناوەڕاستی عێراق هەر ئێستا بە توندی پێشێل دەکرێت. ساڵی پار ڕاپۆرتێری تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاپـورتی دا کە سەدان کەس لەلایەن ڕژێمی عێراق لەسێدارە دراون و هەموومان دەبێ لە خۆمان پرسیار بکەین کە ئایا باشتر نییە بە هەموو عێراقیەك نیشان بدەین کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئاگاداری ئەم شتەیە و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ خەڵکی عێراق داهاتوویەکی باشتریان هەبێت. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانەوێت

بیكەین. ئێمە هەوڵ نادەین بۆ دروستكردنی دەوڵەتێكی سەربەخۆ(له باكوور یان باشووری عێراق) یان هەڵوەشاندنەوەی ئەم ولاتە، ئێمە تەنها دەمانەوێت نیشان بدەین كە ئاڵترناتیڤێك هەیە بۆ خەڵكی عێراق بۆ ئەوەی داهاتوویەكی باشتریان هەبێت.

پرسیار: ئایا ئۆپوزیسیونی عێراق وەك پێگەیەك دیسان كەڵك وەردەگرێت له باكووری عێراق، وەك ئەوەی كه پێشتر قەوما و ئەو كارەساتەی لێكەوتەوە.

"دەیڤید وێڵش": نازانم مەبەست لەم پرسیارە چییە. ئێوە ئاماژەتان بە ئۆپوزیسیونی عێراق كرد، ئۆپوزوسیونی عێراق ئێستا تارادەیەك پەخش وبلاوە و من نازانم كە ئەوان دەیانەوێت لەسەر بنەمای كام پرنسیپ یان كردەوە خۆیان بەرێكخستن بكەن. با ئەوەش بڵێم كە كۆمەڵێك ناكۆكی هەیە لە نێوان پارتی(PDK ) و یەكێتی(PUK ) دا لەسەر ئەوەی كە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئۆپوزسیون بكەن. ئێوە دەبێ ئەم پرسیارانە لەوان بكەن. بەلام له روانگەی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاوە، ئێمە هەوڵ نادەین لە رێگای ئەم رەوتەوە چوارچێوە یا پێگەیەك دروست بكەین بۆ چالاكی ئۆپوزسیون، بە تەواوی بە پێچەوانەیە. ئێمە وای بە باشتر دەزانین كە رەوتێكی ئاشتبوونەوە هەبێت لە نێوان PDK وPUK و ببێتە ئەنجامی باشتربوونی بارودۆخی باكووری عێراق و پاراستنی خەڵكی ئەوێ. ئەگەر لە داهاتوودا PDK وPUK بریاریان دا كە ئۆپوزسیونی عێراق لە ناوچەی ئەواندا دژی دەوڵەتی عێراق چالاكی بكات، ئەمە شتێكە كە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە. بەلام ئامانجی ئێمە لەم رەوتەدا، ئەمە نییە و پێشنیاریان پێناكەین شتێكی وا بكەن.

بەرێز " فوچوكز": بەرێز "وێڵش" ئێمە زۆر باسی كاریگەری( رێككەوتننامەكەی واشنگتۆن) مان كرد لە سەر توركیا و باكووری عێراق. با مەسەلەكە بەشێوازێكی بەرفراوانتر باس بكەین.

ئایا به بۆچوونی ئێوه ئەم ڕێککەوتننامەیه کاریگەری دەبێت لـه سـەر سـەقامگیری ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست.

"دەیڤید وێلش": بەڵێ کاریگەری دەبێت. ئـەم ناوچـەیه بەگـشتی ناوچـەیەکی زۆر هەسـتیارە و هەندێ له جیدیترین کێشەکان بۆ ئاشتی و سەقامگیری ناوچه لـەم دەیـەدا لـه دەوروبـەری عێـراق سەری هەڵداوە، به تایبەت لەلایەن ڕژێمی سەدام حوسەینەوە و هەنـدێ جـاریش داوێنـی خـەڵکی باکووری عێراقی گرتووە. بۆ نمونه من تۆزێك لەمەو پێش ئاماژەم کرد به پێشێلکاری مافی مرۆڤ له کۆتایی دەیەی ۱۹۸۰ ، لەوانه بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی بـێ گونـاح. ئێـستا من وا بیردەکەمەوە که ۱۰ سـاڵی دیکـه کۆمـەڵگای نێونەتـەوەیی تووشـی بـارودۆخێکی وەهـا نابێتەوە.

دووەم، هەتا ڕادەیەك ئاشتی و سەقامگیری باکووری عێـراق زۆرتـرە و شانـسی جیابوونـەوەی لـه عێراق کەمترە که لەوانەیه هەندێ لەلایەنه بیانیەکان به قازانجی خۆیـان کـەڵکی لـێ وەربگـرن و ئاکام و لێکەوتەی هەبێت بۆ هەموو ناوچه. نمونەیەکی دیکه ئەوەیه که ئەگەر ناوچه سەقامگیرتر بێت و ئەم دو حیزبه هاوکاری یەکدی بکەن، بەرپرسیارن له بەرامبەر کـونترۆڵ کردنـی بزووتنـەوە تیرۆریستیەکان و دەرکردنیان له ناوچە، به تایبـەت PKK. ئەمـە لـه کێـشەکانی تورکیـا کـەم دەکاتەوە وەك دەستدرێژی کردنه سەر سنوور و چالاکیه تیرۆریستیەکان دژی تورکیا و له ئەنجامـدا مەترسی جیابوونەوە کەمتر دەبێت ئەگەر ئەم دو حیزبه ناچار بن وەڵام بدەنەوە.

بەڕێز " فوچوکز": کەوابوو ئەمە دەتوانێ ببێ به بەردی بناخەیەکی گرنگ. سەیرکەن گەلێ کێشه هەیه لەم ناوچه و ئەم هەنگاوە نایەوێت هەموویان چارەسەر بکات. بەڵام یەکێ لـەو هەنگاوانەیـه که دەتوانێ ئێش و ئازارەکانی ساڵانی ڕابردوو سارێژ بکاتەوە و ئەمە هـەنگاوێکی گرنگـه بـەرەو پێش.

بەڕێز " فوچوکز": زۆر باشه، با جارێکی دیکه بگەڕێینەوه بۆ ئانکارا بـۆ وەرگرتنـی پرسـیارێکی دیکه.

پرسیار: ئێـوه بـەردەوام نیگـەرانی خۆتـان دەربڕیـوه بـه نیـسبەت مـافی کوردەکـانی عێـراق و مافەکەیان ئەوەیه که جۆری ئەو دەوڵەته هەڵبژێرن که له عێراقدا له گەڵیـدا دەژیـن. ئایـا ئێمـه دەتوانین پێشبینی ئەوه بکەین که ئێوه له داهاتوودا نیگـەرانی خۆتـان بـه نیـسبەت کوردەکـانی تورکیاش دەربڕن؟

"دەیڤید ویڵش": تورکیا وڵاتێکی دیموکراته. پێموایـه خـەڵکی تورکیـا دەبـێ کـەڵك لـه مافـه دیموکراتیکەکان وەربگرن.. ئێستا نیگەرانی من ئەوەیه که خەڵکی عێراق له مافـەکانی خـەڵکی تورکیا بێ بەشن و ئەگەر وەبیریان بێت هەرکاتێك که پرسیاری پشتیوانی ئێمه لـه کوردەکـان لـه من دەکرا، من روونم دەکردەوه که ئێمه پشتیوانی لەم مافانه بۆ هەموو خەڵکی عێراق دەکـەین. من ئارەزوو دەکەم خەڵکی دیکەی عێراق لـه بارودۆخێـك دا ببـان کـه ئـەو مافانـەیان هـەبایا. ئارەزووم ئەوەیه که خەڵکی عێراق، کەمترینی ئەو مافانەیانه هەبایا که خەڵکی باکووری عێـراق هەیانه که ئەویش هەتا رادەیەك ئازادبوون له دەسەڵات و کونترۆڵی سەدام حوسەینه.

پرسیار: له ئاژانسی دەنگوباسی "رۆیتێرز" : هەڵویستی ئێوه چییه به نیسبەت بازرگانی ماتۆڕ و مووەلیده له نێوان بـاکووری عێـراق و تورکیـا کـه دژی بڕیارنامەکـەی نەتـەوه یەکگرتووەکانـه .هەروەها ئەمه یەکێ له خاڵه ناکۆکی له سەرەکانی نێوان حیزبه کوردەکانه که دەوڵـەتی تورکیـا پشتیوانی لێدەکات که هاوپەیمانی ئەمریکایه و دژی بڕیارنامەکانی نەتەوه یەکگرتووەکانه .

"دەیڤید ویڵش": به بۆچوونی من دەوڵەتی تورکیا له راسـتیدا هـەوڵ دەدات کۆمـەڵێك هـەنگاو هەڵبگرێت بۆ کونترۆڵ کردنی ئەم بازرگانییه. دوو ناوچه هەیه که دەوڵەتی بەغـداد دەتوانێـت لـه رێگایانەوه گەمارۆکانی نەتەوه یەکگرتووەکان پێشێل بکات: یەکەم بازرگانی کردنی گاز ـ نـەوت

لە سنووری باکووری عێراق و دووەم بازرگانی کردنی بەرهەمە نەوتییەکان لە ڕێگای باکووری کەنداوی فارس کە قاچاق دەکرێت بۆ بەندەرەکانی کەنداو. ئێمە هەوڵ دەدەین ئەم دو ڕێگایە کونترۆڵ بکەین. ئەوان بیروڕای جیاوازیان هەیە لە سەر شێوازەکانی ئەم کونترۆڵ کردنە. دەوڵەتی عێراق هەندێ سەرچاوەی داهاتی هەیە کە من نامەوێت لە سەر گرنگی ئەم داهاتە زیادەڕۆیی بکەم، بەڵام بۆ نمونە بە بەروارد لەگەڵ داهاتی نەوتی عێراق پێش لە جەنگی کەنداو، کەمترە، بەڵام هەر گرنگە و بە باوەڕی ئێمە دەبێ کونترۆڵ بکرێت و بە گوێرەی ڕێسا و ڕێوشوێنی بڕیارنامەکان ڕێکوپێك بکرێت. ئێمە هەندێك پێشنیارمان داوە بە دەوڵەتی تورکیا بۆ شێوازی ئەم کونترۆڵە و ئێستا سەرقاڵی وتووێژین لە گەڵیان لەبارەی ئەم پێشنیاریانە.

بەڕێز " فوچوکز": ئێمە بەگشتی باسی هەندێ لە کێشەکانمان کرد لە گەڵ دەوڵەتی عێراقدا. بە بۆچوونی ئێوە ئێستا گرنگترین مەترسیگەلێك کە دەوڵەتی عێراق هەیەتی بۆ ناوچە، چین؟

"دەیڤید وێلش": بە باوەڕی ئێمە عێراقی ژێر دەسەڵاتی سەدام مەترسییەکی گەورەیە بۆ ئاشتی و سەقامگیری ناوچە. ئێستا کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە عێراق هاوکاری ناکات لەگەڵ کومیسیونی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ناوکی (IAEA ) لە ڕەوتی چەك داماڵینی عێراق کە بڕیارنامەکانی پاش جەنگی کەنداو دیاری کردووە. ئەوەی کە تا ئێستا کراوە ئەوەیە کە عێراق توانایی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە یەك پچڕاندووە بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەوە کە ئایا عێراق هەموو ئەم چەکە قەدەغەکراوانەی ئاشکرا کردووە و لە ناو بردووە یان نا. بەداخەوە کۆمەڵێك شك وگومانی زۆر لەم ڕەوتەدا ماوە کە کەم نابێتەوە مەگەر کاتێك کە دەوڵەتی عێراق سەرلەنوێ ئەم بڕیارنامانە جێبەجێ بکات.

ئێستا کومیسیونی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و IAEA بەشێوازێکی سنووردار و ناتەواو لە عێراق چالاکی دەکەن. باوەر ناکەم هەتا کاتێك کە ئەم دو ڕێکخراوەیە نەتوانن بەتەواوی لە

عێراق چالاك بن ، هیچ كەس لە كۆمەڵگای نێونەتەوەیی بتوانێت بگاتە هیچ قەناعەتێك بە نیسبەت بەرنامەی چەكەكانی عێراق و هەتا كاتێكیش كە ئەوان نەگەنە سەر ئەم قەناعەتە، هیچ روانگەیەك بەدی ناكرێت بۆ ئەوەی عێراق بتوانێت لە گەمارۆكان رزگاری بێت.

كەوابوو هەتا كاتێك كە دەوڵەتی عێراق بڕیارنامەكان جێبەجێ نەكات ئەم گەمارۆانە هەروا بەردەوام دەبێت. بە باوەڕی من ئەم ئالترناتیڤە زۆر زۆر هەڕەشەیە بۆ ئاشتی و سەقامگیری ناوچە، كام ئالترناتیڤ؟ ئەو ئالترناتیڤە كە ئێمە قبوڵی ئەوە بكەین كە عێراق دیسان خۆی بە چەك تەیار بكات و هەندێ توانایی بە كردەوە بە دەست بهێنێت بۆ كەڵك وەرگرتن لەم چەكە كۆمەڵكوژانە. نابێت ئەم شتە هەروا بە ئاسانی روویدات. كۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بڕیارنامەی ٦٨٧ بڕیاری دا كە عێراق نابێت ئەم چەكە كۆمەڵكوژانەی هەبێت و ئەمە هێڵی سوورە بۆ عێراق.

## راپۆرتی سەرۆك كۆماری ئەمریكا بە كۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بڕیارنامەكانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان لە لایەن عێراقەوە

### ٥ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨

بەڕێز سەرۆكی كۆنگرێس

لە پەیوەندی لەگەڵ رێگەپێدان بە بەكارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەكانم بۆ ئاگادار كردنەوەی تەواوی كۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم

دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی٣ی ئەیلوول تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.
پێشکەوتنەکانی ئەم دواییانە لە باکووری عێراق، جارێکی دیکە کاریگەربوونی پێداگری لە سەر دیپلوماسی لە ١٧ ی ئەیلوول نیشان دا. رێبەرانی دو حیزبی سەرەکی کورد ، مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی بۆ یەکەم جار لە ماوەی ٤ ساڵی رابردوودا لەگەڵ یەکدی دیداریان کرد بۆ ئیمزا کردنی بەیاننامەیەکی هاوبەشی هیوابەخش کە هەر دوولا بەرپرسیار دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ یەکدی ئاشت ببنەوە. وتووێژەکانی نێوان مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی کە لە ژێر چاودێری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە وەزارەتی دەرەوە بەرێوەچوو، پاش ٦ مانگ دانیشتن و گفتوگۆ و راوێژی راستەوخۆ لە گەڵ حیزبە کوردەکان و هاوپەیمانە تورکیایی و بەریتانیاییەکانمان پێک هات.
دەستکەوتە سیاسییەکانی رێبەرانی کوردی عێراق نیشانەی دەستپێکردنی قۆناخێکی نوێ و هیوابەخشە بۆ هەموو خەڵکی باکووری عێراق.
لە ٣١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ من یاسای ئازادی عێراقی واژۆ کرد. هەروەها ئێمە بەردەوام کار دەکەین لە سەر بەرنامەی ئێستای ئۆپۆزوسیونی عێراق بۆ یارمەتیدانی گروپە ئۆپۆزوسیونەکانی عێراق کە لە رووی سیاسیەوە یەکگرتوون و "رادیۆ عێراقی ئازاد" سەر لەی نوێ دەستی بەپەخش کردووە. ئەم بەرنامە نوێیانە یارمەتیمان دەدات کە خەڵکی عێراق تەشویق بکەین بۆ دروستکردنی عێراقێکی پلورالیست و ئاشتیخواز کە رێز لە یاسای نێونەتەوەیی و مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ بگرێت. عێراقێکی وەها دەتوانێت بە ئاسانی جێگای شیاوی خۆی لە ناوچە و لە کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بدۆزێتەوە.

## باکووری عێراق: ئاشتبوونەوەی کورد

له ١٦ و ١٧ ی ئەیلوول مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیوکرتی کوردستان (PDK) و جەلال تالەبانی، سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) بۆ یەکەم جار لە ماوەی ٤ ساڵی رابردوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پێکەوە وتووێژیان کرد. خاتوون" ئالبرایت"، وەزیری دەرەوە پێشوازی لە هەر دوو رێبەرەکە کرد و پیرۆزبایی لێکردن بەبۆنەی ئەو هەنگاوە بوێرانەیە کە بە نوێنەرایەتی لەلایەن خەڵکەکەیانەوە هەڵیانگرتووە. خاتوون" ئالبرایت" نیگەرانی قووڵی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای دەربڕی بۆ ئارامی، ئاسایش و ژیانی ئابووری کوردەکان ، شیعەکان و سوننەکانی عێراق و خەڵکی دیکە کە کەوتوونەتە بەر هێرشە دڕندانەکانی رژێمی بەغداد. وەزیری دەرەوە هەروەها ئەوەی روون کردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیار دەدات کەی و چۆن وەڵامی کردەوەکانی دەوڵەتی عێراق بداتەوە کە مەترسییە بۆ دراوسێکانی و ئاسایشی ناوچە و بەرژەوەندییە یەکلاییکەرەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و خەڵکی عێراق، لەوانە خەڵکی باکووری عێراق.

لە واشنگتۆن بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی بەیاننامەیەکی هاوبەشیان واژۆ کرد و خۆیان بە بەرپرسیار زانی کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا، ئیدارەی ناوچەیی ٣ پارێزگای باکووری عێراق بە گوێرەی رێککەوتنەکانی ١٩٩٦ ی ئانکارا باشتر بکەن. لە ماوەی ٩ مانگی داهاتوودا ئەم دو رێبەرە کوردە هەوڵ دەدەن بۆ یەکخستنی ئیدارەکانیان و دابەش کردنی داهاتەکانیان و پێناسە کردنی بارودۆخی شارە سەرەکییەکانیان و بەڕێوە بردنی هەڵبژاردنەکان. مەرجی سەرەکی بۆ سەرکەوتنی ئەم بەرنامەیە، دانیشتن و کۆبوونەوە بەردەوامەکانی نێوان ئەم دو رێبەرەیە.

بۆ ئەم مەبەستە هەر دو حیزب شەڕی ناوخۆیان شەرمەزار کرد و بەڵێنیان دا کەڵك لە رێگاگەلی توندوتیژانە وەرنەگرن بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانیان و لە رێگای دامەزراندنی پاسەوانی بەهێزتر لە سەر سنوورەکانی عێراق تروریزم لە ناو ببەن. وتووێژەکانی واشنگتۆن پاش ٦ مانگ هەوڵی چڕوپڕی دیپلوماتیك پێکهات، لەوانە سەردانی"دەیڤید وێڵش" ، یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك لە باکووری عێراق و راوێژی هەر دو حیزبە کوردەکە لەگەڵ

بەریتانیا و تورکیا. له کاتی وتووێژەکانی واشنگتۆن تا ئێستا ئێمه بەردەوام لـه نزیکـەوه لەگـەڵ کوردەکانی عێراق و تورکیا و بەریتانیا له سەر ئەم مەسەلانه کار دەکـەین. دو رێبـەرە کوردەکـه هەروەها له گەڵ بەرپرسانی نەتەوە یەکگرتووەکان له نیویورك دیداریان کرد و له لایەن ئەنـدامانی "کومیتەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی ئەنجوومەنی پیرانـی ئـەمریکا" وەك میـوان پێـشوازیان لێکرا.

وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا به شێوازی فەرمی پشتیوانی دەکات لـه یـەکێتی و یەکپارچـەیی خاکی عێراق و له هەمان کاتدا پشتیوانی دەکات لـه مـافی خۆشـبژیوی کوردەکـانی عێـراق لـه ناوخۆی عێراق و ئەم دو هەڵویسته پێکەوه ناتەبا نین. بەڕێز تاڵەبانی و بەڕێز بارزانی له بەیاننامه هاوبەشەکەیاندا به روونی جەختیان له سەر ئەم پرەنـسیپانه کردووەتـەوە. وڵاتـه یـەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیارە له بەرامبەر ئەوەی یارمەتی نێونەتەوەیی بەردەوام بگاته بـاکووری عێـراق و مافی مرۆڤی کوردەکان و گروپه کەمینەکانی باکووری عێراق وەك تورکمانـەکان، ئاشـوورییەکان و ئیزدیەکان و گروپەکانی دیکه رێزی لێ بگیردرێت و هەرێمی دژەفڕین له رێگای "شالآوی چاودێری باکوور" بپارێزرێت.

## بارودۆخی مافی مرۆڤ له عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ له سەراسەری عێراق هەروا مایەی نیگەرانی قوڵی ئێمەیە. هەروەها که لـه راپۆرتەکەی ۳ ی ئەیلوولدا ئاماژەم پێکرد، ، پاش کوژرانی دو مـەلای بلیمـەتی شـیعه ، رژێـمی عێراق ژمارەی هێزە ئەمنیەکانی خۆی له باشووری عێراق زیاد کردووە که زۆرتـر شـیعه نـشینه. تاوانی کوشتنی ئەم دو کەسایەتیه خراوەته پاڵ رژێمی عێراق. لەوکاتـەوە سـوپای عێـراق دەسـتی داوە به زنجیرەیەك کردەوەی سەرکوتکەرانه دژی شیعەکان له پارێزگای "ناسرییە" و "ئەمارە".

به تایبەت دەوڵەت درێـژە دەدات بـه هەوڵـەکانی بـۆ لـه نـاو بردنـی شـێوەی ژیـانی "عەرەبـه مارشەکان" و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشووری عێراق". ئەم رووداوانه به بێ رێزییـەکی یەکجار زۆر به ژیانی مرۆڤ و ئازادی ئاینی بەرێوە دەچێت.

## كورد و كوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

له ۱۰ ی ئادار، راپۆرتێری تایبەتی عێراق، بەڕێز "ماکس وان دێرستویل[1]" راپورتی دا کە لێکۆڵینەوە بەردەوامەکەی نیشانی داوە و بەڵگەی بەهێزی لە بەر دەستدایە کە لە سابی ۱۹۹۷وە سەدان بەندکراو لە بەندیخانەی "ئەبوغرێب[2]" و "رادوانیە[3]" لەسێدارە دراون. بە گوێرەی راپورتە متمانە پێکراوەکان، گەلێ لەوانەی کە لەسێدارەدراون بۆ تاوانگەلێك وەك سووکایەتی کردن بە رژێمی عێراق یا بە ئەندامبوون لە حیزبە سیاسیەکانی ئۆپۆزسیونی عێراق حوکمی ۱۵ تا ۲۰ ساڵ زیندانیان لە سەر دراوە. بنەماڵەکان گەلێ جار تەرمی لەسێدارەدراوەکانیان وەرگرتووەتەوە کە هەندێ جار ئاسەواری ئەشکەنجەیان پێوە دیار بووە. لە مانگی نیسان کومیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارنامەیەکی توندی دژی ئەم کردەوانە و پێشێلکارییە بەردەوامەکانی دیکەی مافی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتی عێراق دەرکرد. ئەم بڕیارنامەیە دەسەڵاتی چاودێری راپۆرتێری تایبەتی بەرفراوان کردەوە و هەموو کردەوە سەرکوتکەرانە و چەوسێنەرانەکانی دەوڵەتی عێراقی شەرمەزار کردووە.

له باکووری عێراق، لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی کوردەکان، دەوڵەت بەردەوامە لە دەرکردنی زۆرەملێی دەیان هەزار کورد و تورکمان لە کەرکوك و شارەکانی دیکە. لەم مانگانەی دواییدا، ٤٥٤ بنەماڵە لە کەرکووك (پارێزگای ئەلتەئیم) دەرکراون و عەرەبە هاوردەکان لە ۷ شوێن لە جێگای کوردەکان نیشتەجێ کراون. ئەم خەڵکە دەرکراوە کە چوونەتە ناو ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی کوردەکان، رایانگەیاندووە کە ناچار کراون زێدی خۆیان بە جێ بهێڵن بێ ئەوەی رێگەیان پێ بدرێت کەلوپەلەکانیان لە گەڵ خۆیان بهێنن. بە هۆی نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون، ئەم خەڵکە دەرکراوە هێشتا لە خێوەتدا دەژین لە کاتێکدا کە زستان نزیك دەبێتەوە.

---

Max Van der Stoel [1]
Abu Gharaib [2]
Radwaniyah [3]

ده‌وڵه‌ت به‌رده‌وامه له که‌ندوکۆسپ دروست کردن له سه‌ر ڕێگای روون کردنه‌وه‌ی چاره‌نووسی ٦٠٠ هاووڵاتی کویتی و وه‌ڵاتانی دیکه که به ده‌ستی کاربه‌ده‌ستانی عێراق له کات یان پاش داگیر کرانی کویت بێ سه‌روشوێن کراون. له میانه‌ی ئاڵوگۆڕی ئه‌م دواییانه‌ی دیله‌کان که به ناوبـژیوانی ICRC ئه‌نجام دراوه، عێراق ٣٠٠ دیلی جه‌نگی ئێرانی ئازاد کردووه(که له کاتی شه‌ڕی ئێران و عێراق به دیل گیرابوون) له به‌رامبه‌ر ٥٦٠٠ دیلی عێراقی که له لایه‌ن ئێرانه‌وه به دیل گیرابوون. له گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا ده‌وڵه‌تی عێراق هیچ نیشانه‌یه‌کی ده‌رنه‌خستووه بۆ جێبه‌جێ کردنی بڕیاری ٦٨٨ ی UNSCR که داوا له عێراق ده‌کات سه‌رکوتی خه‌ڵکه‌که‌ی خۆی رابوه‌ستێنێت.

## یادداشتنامه‌ی یارمه‌تیدانی ڕێکخراوه ئۆپۆزسیونه دیموکراته‌کانی عێراق
## ٤ ی شوباتی ١٩٩٩
## بڕیاری ژماره ١٣ ـ ٩٩ ی سه‌رۆك کۆماری ئه‌مریکا

بۆ وه‌زیری ده‌ره‌وه

بابه‌ت: به‌رنامه‌کانی یاسای ١٩٩٨ ی ئازادی عێراق

به گوێره‌ی ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ی که دراوه به من وه‌ك سه‌رۆك کۆماری وڵاته یه‌کگرتووه‌کانی ئـه‌مریکا، له‌وانه به گوێره‌ی خاڵی ٥ ی یاسای ١٩٩٨ ی ئازادی عێراق(یاسـای گـشتی ١٠٥ ـ ٣٣٨ ) بـه‌م

شێوەیە رادەگەیەنم کە هەرکام لەم گروپانەی خوارەوە رێکخراوە ئۆپۆزسیونە دیموکراتەکانی عێراقن و شەرت و مەرجەکانی برگەی ٥ ی یاساکەیان تێدایە:
"رێککەوتنی نیشتمانی عێراق"، "کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق"، "بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق"، "پارتی دیموکراتی کوردستان"، "بزووتنەوەی حکوومەتی یاساسەروەری پاشایەتی"، "یەکێتی نیشتمانی کوردستان" و "ئەنجوومەنی بالآی شۆرشی ئیسلامی عێراق".
بەم شێوەیە رادەگەیەنم کە سەرجەم ئەم رێکخراوانە شایانی ئەوەن بە گوێرەی برگەی ٤ ی یاساکە یارمەتی بدرێن.
ئێوە(وەزیری دەرەوە) رێگەتان پێدەدرێت و فەرمانتان پێ دەدرێت راپۆرتی ئەم بریار و بەرنامەیە تەسلیمی کۆنگرێس بکەن و کار بکەن بۆ بلآوبوونەوەی ئەم یادداشتنامەیە لە تۆمارنامەی فدراڵ دا.
ویلیام ج کلینتۆن

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش نەتەوە یەکگرتووەکان
## ٣ ی ئاداری ١٩٩٩

بەرێز سەرۆکی کۆنگرێس
لە پەیوەندی لەگەڵ رێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی

ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

باکووری عێراق: ئاشتبوونەوەی کورد

لە کاتی کۆبوونەوەکەیان لە گەڵ خاتوون "ئالبرایت"، وەزیری دەرەوە لە مانگی سپتامبر، مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و جەلال تاڵەبانی، سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK )، سێ جار دیداریان کردووە بۆ درێژە پێدانی کارەکانیان بۆ ئاشتبونەوەی تەواو. بۆ ئەم مەبەستە هەر دو حیزب شەڕی ناوخۆیان شەرمەزار کرد و بەڵێنیان دا کە کەڵك لە ڕێگاگەلی توندوتیژانە وەرنەگرن بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانیان و تروریزم لە ناو ببەن لە ڕێگای دامەزراندنی پاسەوانی بەهێزتر لە سەر سنوورەکانی عێراق. ئێمە زۆر نگەرانین بە نیسبەت ئارامی، ئاسایش و ژیانی ئابووری کوردەکان و شیعەکان و سوننەکانی عێراق و خەڵکی دیکە کە کەوتوونەتە بەر هێرشە دڕندانەکانی رژیمی بەغداد.

لە ٤ ی تشرینی دووەم دەوڵەتی تورکیا و بەریتانیا پەیوەست بوون بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ بەرفەرمی ناسین و پێشوازی کردن لە دەستکەوتەکانی بەڕێز بارزانی و بەڕێز تاڵەبانی کە لە ئەنجامی هاوکاری ئەم دوو لایەنە بە دەست هاتووە. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، تورکیا و بەریتانیا جەختیان لە سەر گرنگی پاراستنی یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی عێراق کردەوە و بە خۆشییەوە PDK و PUK ڕێککەوتوون لە سەر ئەم پرەنسیپە. ئێمە هەروەها پێشوازیمان کرد لە بەرپرسیارێتی و دەروەسبوونی PDK و PUK بۆ دالدەنەدانی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK ) و سڕینەوەی هەموو بنکەکانی PKK لە ناوچە و پاراستنی سنووری تورکیا.

لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە لە سەر ئەو باوەڕەن کە مەسەلە سەرەکییەکانی پەیوەندیدار بە داهاتووی عێراق، دەبێ لە لایەن سەرجەم خەڵکی عێراق لە کاتی گونجاو و لە پروسەیەکی سیاسی

ڕێکوپێکدا بڕیاری لەسەر بدرێت. کاری ئەم لایەنانە بۆ گەیشتن بەو پرەنسیپانە کە لە بەیاننامەکانی ئانکارادا ئاماژەی پێکراوە بەواتای جێبەجێ کردنی چوارچێوەی ئیدارەیەکی ناوچەیيە هەتا ئە کاتە کە عێراقێکی یەکگرتوو، پلورالیست و دیموکرات پێکدێت.
لە ٨ ی کانوونی دووەم بەڕێز تاڵەبانی و بەڕێز بارزانی بە بێ بوونی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و تورکیا، ڕاستەوخۆ لە سەلاحەدین لە باکووری عێراق پێکەوە دیداریان کرد و دیسان جەختیان کردەوە لە سەر شێلگیر بوونیان بۆ جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنی ئەیلوول و پێشکەوتنی چروپڕیان بە دەست هێنا لە سەر مەسەلە سەرەکیەکان وەك دابەش کردنی داهات و داخستنی بنکەکانی PKK و ڕێککەوتوون لە سەر ئەوەی درێژە بە پەیوەندییەکانیان بدەن.

## بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراسەری عێراق هەروا مایەی نیگەرانی قووڵی ئێمەیە. هەروەها کە لە ٥ ی تشرینی دووەم ڕاپۆرتم دا، سوپای عێراق شاڵاوی سەرکوتی شیعەکانی لە باشووری عێراق ئەنجام داوە . لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم، ئێمە کۆمەڵێك ڕاپۆرتی پشتڕاست نەکراومان لە لایەن ئۆپۆزوسیونی عێراق پێگەیشت کە ١٥٠ کەس لە "ئەمارە" لەسێدارە دراون و تەرمی ٣ کەس خراوەتە ژێر پردی سەرەکی نێو شاری "ئەمارە" لە سەر ڕووباری دیجلە بۆئەوەی هۆشداری بدەن بەوانەی کە نەیاری ڕژێمی عێراقن. هەروەها ڕاپۆرت دراوە کە ١٧٢ کەس ـ کە هەندێکیان لە ساڵی ١٩٩١ەوە لە بەندیخانەدا بوونە ـ لە بەندیخانەکانی "ئەبووغرێب" و "ڕادوانیە" لەسێدارە دراون و پێشتر چەند شەپۆلێکی کوشتن بەڕێوە چووە کە کاتێ کە تەرمەکانیان ڕادەستی بنەماڵەکانیان کراوە، ئاسەواری ئەشکەنجە لە سەر جەستەیان دیار بووە. هەروەها کۆمەڵێك ڕاپۆرت لە کانوونی یەکەم گەیشتووەتە دەستی ئێمە کە گۆڕێکی بە کۆمەڵ لە نزیکی ڕووباری

"خورایسان[1]" لە پارێزگای "دیالە" لە رۆژهەلاتی بەغداد دوزراوەتەوە کە تەرمی لانیکەم ٢٥ کەسی تێدا بووە.

دەوڵەتی عێراق درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ لە ناو بردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان "و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشووری عێراق". لە ماوەی ٢ مانگی رابردوو پتر لە ٧ گوند لە لێواری "مارشەکان" کاول کراون و سیستمی ئاودێرییان کوێر کراوەتەوە و گەژوگیاکەی سووتێندراوە و لە ناوبراوە و ئەو کەسانەی کە نەیتوانیوە لە "مارشەکان" هەڵبێن ـ بە تایبەت ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتووەکان ـ لە لایەن هێزەکانی رژێمەوە بە بارمەتە گیراون.

لە ١٩ ی شوبات مەلایەکی شیعە بەناوی "ئایەتوڵلا عوزما محمد ئەلسەدر[2]" لەگەڵ چەند کەس لە خزمەکانی لە عێراق کوژرا. سەرچاوەکانی ئۆپۆزسیونی عێراق دەڵێن ئەم کوشتنە کاری رژێمی سەدام بووە. رژێمی عێراق هەروەها بە توندی ئەو خۆپیشاندانانەی سەرکوت کردووە کە دوابەدوای کوژرانی "ئایەتوڵلا ئەلسەدر" لە بەغداد و شارەکانی دیکە کراوە.

لە باکووری عێراق لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر کونترۆلی کوردەکان، دەوڵەت بەردەوامە لە دەرکردنی زۆرەملێی دەیان هەزار کورد و تورکمان لە کەرکوك و شارەکانی دیکە. لەم مانگانەی دواییدا، سەدان بنەماڵە لە کەرکوك (پارێزگای ئەلتەئیم) دەرکراون و عەرەبە هاوردەکان لە ٧ شوێن لە جێگای کوردەکان نیشتەجێ کراون. ئەم خەڵکە دەرکراوە کە چوونەتە ناو ناوچەکانی ژێر کونترۆلی کوردەکان، رایانگەیاندووە ناچار کراون زێدی خۆیان بە جێ بهێڵن بێ ئەوەی رێگەیان پێ بدرێت کەلوپەلەکانیان لە گەڵ خۆیان بهێنن. بە هۆی نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون، ئەم خەڵکە دەرکراوە هێشتا لە خێوەتدا دەژین.

لە ١٨ ـ ١٩ ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ کونفرانسێك دەربارەی لێکۆڵینەوە و هەڵسوکەت لە گەڵ قوربانیانی هێرشە کیمیایی و بیولۆژییەکانی باکووری عێراق بەرێوەچوو کە لە لایەن"

---

Khoraisan River[1]
Grand Ayatollah Mohammed al-Sadr[2]

ئینیستیتۆی کوردی واشنگتۆن" بەرێکخستن کرابوو و لـە لایـەن وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکاوە پشتیوانی لێکرابوو. ئەم کونفرانسە چڕ بـووەوە لـە سـەر کاریگەرییـە درێژخایەنـەکانی هێرشـە کیمیاییەکانی عێراق بۆ سەر شارۆچکەی هەڵەبجە کە تێیـدا نزیکـەی ٥ هـەزار کـەس لـە سـاڵی ۱۹۹۸ کـوژران. بـە وتـەی بەشـداربووانی ئـەم کونفرانـسە تێکـەڵ کردنـی ترسـناکی گـازی Mustard، tabun، VX ، گازی فرمێسکرێژ و لەوانەیە aflatoxin لەگـەڵ ئـەو چـەکە کیمیاییانە کە هێرشیان پێکراوەتە سەر هەڵەبجە، بووەتە هۆی ئەوەی ڕێژەی شێرپەنجە، کێشەکانی هەناسەدان، جەڵتەی دڵ، نەزۆکی، لە بارچوونی منداڵ و نەخۆشییە ژنیتیکیەکان لە نـاو خـەڵکی هەڵەبجە زیاد بێت.

لە ۱ ی کـانوونی یەکـەم، ڕێکخـراوی INDICT کـە بنکەکـەی لـە لەندەنـە ڕایگەیانـد ۱۲ کاربەدەستی باڵای عێراق ـ لەوانە سەدام حوسەین و "عودەی" و" قوسـەی" کـوڕی و زڕبراکـەی "برزان التکریتی" و جێگری سەرۆك کۆمار، "تاها یاسین ڕەمەزان" وجێگـری سـەرۆك وەزیـران، "تارق عزیز" دەبن بە ئامانجی سەرەکی خەباتی ئەم ڕێکخراوەیە بۆ دادگایی کردن لە دادگایـەکی نێونەتەوەییدا.

دەوڵەتی عێراق بەردەوامـە لـە کەندوکۆسـپ دروسـت کـردن لـە سـەر ڕێگـای ڕوون کردنـەوەی چارەنووسی ٦۰۰ هاووڵاتی کویتی و وەڵاتانی دیکە کە بە دەستی کاربەدەستانی عێراق لـە کـات یان پاش داگیر کرانی کویت بێ سەروشوێن کراون. لە میانەی ئاڵوگۆڕی ئەم دواییانەی دیلەکان کە بە ناوبژیوانی ICRC ئەنجام دراوە، عێراق ۳۰۰ دیلی جەنگی ئێرانی ئازاد کردووە(کە لە کـاتی شەڕی ئێران و عێراق بە دیل گیرابوون) لە بەرامبەر ٥٦۰۰ دیلی عێراقی کە لە لایەن ئێرانەوە بە دیل گیرابوون. لە گەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی عێـراق هـیچ نیـشانەیەکی دەرنەخـستووە بـۆ جێبـەجێ کردنی بڕیاری ٦۸۸ ی UNSCR کە داوا لـە عێـراق دەکـات سـەرکوتی خەڵکەکـەی خـۆی ڕابوەستێنێت.

دەوڵەتی عێراق ئێستاش ناهێڵێت چاودێرانی سەربەخۆی مافی مرۆڤ بچنە نێو عێراق، سەرەڕای داواکارییە بەردەوامەکانی ریپورتێری تایبەتی عێراق، "ماکس وان دێرستۆیل". کومیسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرجەم کردەوە سەرکوتکارانە و چەوسێنەرەکانی عێراقی بە توندی شەرمەزار کردووە.

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ کۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان
## ١٩ ی مایسی ١٩٩٩

بەڕێز سەرۆکی کۆنگرێس

لە پەیوەندی لەگەڵ رێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی٣ی ئاداری ١٩٩٩ تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

### باکووری عێراق: ئاشتبوونەوەی کورد

لە کاتی کۆبوونەوەکەیان لە گەڵ خاتوون" ئالبرایت"، وەزیری دەرەوە لە ئەیلوولی ١٩٩٨، مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و جەلال تالەبانی، سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) چوار جار پێکەوە دیداریان کردووە بۆ درێژە پێدانی کارەکانیان بۆ ئاشتبونەوەی تەواو. بۆ ئەم مەبەستە هەر دو حیزب شەڕی ناوخۆیان شەرمەزار کرد و بەڵێنیان دا کەڵك لە رێگاگەلی توندوتیژانە وەرنەگرن بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانیان و تروریزم لە ناو ببەن لە رێگای دامەزراندنی پاسەوانی بەهێزتر لە سەر سنوورەکانی عێراق. بە

تایبــەت هــەردوولا خۆیــان بــە دەروەس زانــی لــە بەرامبــەر داڵدەنــەدانی پــارتی کرێکــارانی کوردستان(PKK ) و سڕینەوەی هــەموو بنکــەکانی PKK لــە ناوچــە و پاراســتنی ســنووری تورکیا. ئەم دوو لایەنە لە سەر ئەو باوەڕەن کە بڕیارە سەرەکییەکانی پەیوەندیدار بــە داهــاتووی عێراق، دەبێ لە لایەن سەرجەم خەڵکی عێراق، پێکەوە بدرێت لە کاتی گەنجاودا و لە پرۆسەیەکی سیاسی رێکوپێکدا. کاری ئەم لایەنانە بۆ گەیشتن بەو پرەنسیپانە کە لــە بەیاننامــەکانی ئانکــارا وێنا کراوە، بەواتای جێبەجێ کردنی چوارچێوەی ئیدارەیەکی ناوچەیییە، هەتا کاتێك کە عێراقێکی یەکگرتوو، پلورالیست و دیموکرات پێکدێت.

کۆمیسیۆنی هاوئاهەنگی باڵا(HCC)کە لە نوێنەرە پایەبەرزەکانی PUK و PDK پێکــدێت بە شێوازێکی رێکوپێك لە گەڵ یەکدی لە باکووری عێراق دیدار دەکەن و کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش بەردەوام لە پەیوەندیدان لەگەڵ ئــەم دوو لایەنــە بــۆ بەرەوپێــشبردنی زیــاتری رەوتی ئاشتبوونەوە.

### بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق هەروا زۆر لە رێــسا نێونەتەوەییــەکان دوورە و بڕیارنامــەی ٦٨٨ پێشێل دەکرێت.

لە ماوەی ٧ ساڵی رابردوودا، دەوڵەتی عێراق رێگەی بە راپــۆرتێری تایبــەتی کومــسیونی مــافی مرۆڤی بۆ عێراق، "ماکس وان دێرستــونیل" نــەداوە ســەردانی عێــراق بکــات و قــەد رێگــە بــە چاودێرانی مافی مرۆڤ نەدراوە بچنە نێو عێراق. لە گەڵ ئەمەشدا گەلێ راپۆرتی دڵتەزێن بەردەوام لە عێراق دزە دەکاتە دەرەوە. بۆ نمونە بــە گــوێرەی ئــەو راپۆرتانــە کــە بــە دەســتی بــەڕێز "وان دێرستونیل" گەیشتووە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧ تا ئێستا ٢٥٠٠ بەندکراوی سیاسی بێ تێپــەڕ کردنی قۆناخە یاساییەکان لەسێدارە دراون و لــە ســەر زۆربــەی ئــەو تەرمانــەی کــە تەسلیم بــە بنەماڵەکان کراونەتەوە ئاسەواری روونی ئەشکەنجە دیار بووە.

کوژرانی سێ کەس لە مەلا ئیسلامییە پایەبەرزەکانی(شیعە) مایەی نیگەرانی تایبەتی ئێمەیە. لە مانگی شوبات " ئایەتوڵڵا محمد الصدر" کە پلەبەرزترین مەلای شیعەیە لە عێراقدا، لە گەڵ دو لە کورەکانی پاش نوێژی هەینی لە نەجەف لە نیسانی ١٩٩٨ و"ئایەتوڵڵا الغروی" لە حوزەیرانی ١٩٩٨ کوژراون. ئەم کوشتنانە پاش چەند مانگ دەستبەسەر کردن و پرس و جواب لە لایەن هێزەکانی ئیستخباراتەوە ئەنجام دراوە و قامك بەرەولای رژێمی عێراق راکێشراوە. ئەم کوشتنانە هاوکاتە لە گەڵ دەستپێکردنەوەی سەرکووت لە باشووری عێراق. رژێم هەروەها کار دەکات بۆ لە ناوبردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان" و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشوور". رژێمی عێراق هەروەها بەردەوامە لە پشتگوێ خستنی داواکارییەکانی بەرێز "وان دێرستویل" و کەسانی دیکە بۆ چوونی چاودێرانی مافی مرۆڤ بۆ عێراق بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەم راپۆرتانە.

## راپۆرتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە کۆنگرێس دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ بوونی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە لایەن عێراقەوە

## ٢ ی ئابی ١٩٩٩

بەرێز سەرۆکی کۆنگرێس

لە پەیوەندی لەگەڵ رێگەپێدان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق(یاسای گشتی ١ - ١٠٢ ) وەك بەشێك لە هەوڵەکانم بۆ ئاگادار کردنەوەی تەواوی کۆنگرێس، راپۆرتتان بۆ دەنێرم دەربارەی هەوڵەکانمان بۆ ملکەچ کردنی عێراق بە جێبەجێ کردنی بریارنامەکانی ئەنجوومەنی

ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم راپۆرتە قۆناخی١٩ی مایسی ١٩٩٩ تا ئێستا لە خۆ دەگرێت.

### باکووری عێراق: ئاشتبوونەوەی کورد

لە مانگی حوزەیران، لێژنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان(PDK ) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK ) سەفەریان کرد بۆ واشنگتۆن بۆ باس و تاوتوێ کردنی هەنگاوەکانی دواتری جێبەجێ کردنی رێککەوتننامەی ئەیلوولی ١٩٩٨ . لەم وتووێژانەدا کۆمەڵێك رێگا بۆ زیاد کردنی متمانە بە یەکدی گیرانە بەر لەوانە کردنەوەی بارەگای هەر دو حیزب لە شارە سەرەکیەکانی باکووری عێراق ، دووری کردن لە دەرکردنی راگەیاندننامەی نەرێنی بۆ چاپەمەنیەکان ، بەرپرچدانەوەی کاریگەری دووبەرەکینانەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK )، دەستپێکردنی گەڕانەوەی ئاوارەکانی نێوخۆی باکووری عێراق و پێکهێنانی کومیسیونی تۆمار کردنی دەنگەکان بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو. لێژنەی PDK و PUK باس و تاوتوێ کۆمەڵێك مەسەلەی دیکەیان کرد وەك دابەش کردنی داهات ، ئاسایشی ناوخۆ و پێکهێنانی ئیدارە و ئەنجوومەنێکی هاوبەشی ناوچەیی. PDK و PUK درێژە بەم وتووێژانە دەدەن لە باکووری عێراق و هەنگاو هەڵدەگرن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو خاڵانەی کە لە سەری رێککەوتوون.

### بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق

بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق هەروا زۆر لە پێوانە نێونەتەوەییەکان دوورە و بڕیارنامەی ٦٨٨ پێشێل دەکرێت. ئەم بڕیارنامەیە بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە ئاکام و ئەنجامەکانی سەرکوتی خەڵکی عێراق بە دەستی رژێمی عێراق بووە بە مەترسییەك بۆ ئاشتی جیهانی و ئاسایشی ناوچە. ئەم بڕیارنامەیە هەروەها داوای لە عێراق کردووە دەستبەجێ رێگەبدات بە دەستڕاگەیشتنی رێکخراوە یارمەتیدەرە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییەکان بە سەرجەم خەڵکی عێراق کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە. بەهەرحاڵ لە ماوەی ٧ساڵی رابردوو دەوڵەتی عێراق رێگەی نەداوە بە راپۆتێری تایبەتی کومسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان ، "ماکس وان

دێرستویل" سەردانی عێراق بکات و قەدەغە ڕێگا بە چاودێرانی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان نەدراوە بچنە نێو عێراق. ڕژێم هەروەها کار دەکات بۆ لە ناوبردنی شێوەی ژیانی "عەرەبە مارشەکان" و ژینگەی بێ وێنەی "مارشەکانی باشوور".
ڕژێمی عێراق هەروەها بەردەوامە لە پشتگوێ خستنی داواکارییەکانی بەڕێز "وان دێرستویل" و کەسانی دیکە بۆ چوونی چاودێرانی مافی کەمینەکان بۆ عێراق بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم ڕاپۆرتانە. چاودێرانی مافی کەمینەکان داوای لێکۆڵینەوەیان کردووە دەربارەی کوژرانی ٣ کەس لە پلەبەرزترین مەلایانی شیعەی عێراق کە دەگوترێت بە دەستی ڕژێمی عێراق کوژراون واتا کوژرانی ئایەتوڵڵا "محمد الصدر" لە شوباتی ١٩٩٩ ، ئایەتوڵڵا"بروجیردی" لە نیسانی ١٩٩٨ و ئایەتوڵڵا "غرەوی" لە حوزەیرانی ١٩٩٨ .
لە باکووری عێراق، لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی کوردەکان، دەوڵەت درێژە دەدات بە دەرکردنی زۆرەملێی کورد و تورکمانەکان لە کەرکوك و شارەکانی دیکە.

## کونفرانسی چاپەمەنی" فرانسیز ریکاردۆن"، کوردیناتۆری گۆڕینی دەوڵەتی عێراق دەربارەی ئۆپۆزیسیونی نیشتمانی عێراق

## ئانکارا ، ١٤ ی نیسانی ٢٠٠٠

پرسیار: وادیارە بومبارانکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکا لەم دواییانەدا زیاتر بووە، بیروڕای ئێوە چییە لەم پەیوەندییەدا؟

" فرانسیز ریکاردۆن": ئاگادارنیم بومبارانکردنی عێراق زیادی کردبێت، دەتوانم تەنها بەم شێوەیە وەڵامتان بدەمەوە کە ڕێسا و ڕێوشوێنەکانی ئەم هێرشانە روونە و بە راوێژ لە گەڵ تورکیا

دادەنرێن. ئێمە و خەڵکی تورکیا و سوپای تورکیا هاوکارییەکی زۆر نزیکمان پێکەوە هەیە لە سەر هەموو مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە چاودێری کردنی باکووری عێراق. ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە بۆ ئێمە و هەروەها گرنگە بۆ دەوڵەتی تورکیا. زۆر روونە کە ئەگەر هێزەکانی سەدام حوسەین ئیدی تەقە لە فڕۆکەکانی ئێمە نەکەن، ئێمەش هێرشەکانمان ڕادەوەستێنین. ئێمە هەمیشە هێرش دەکەینە سەر ئامانجەکانمان لە عێراق لە بەر ئەوەی هێزەکانی سەدام تەقە لە فڕۆکەکانی ئێمە دەکەن. هەر رۆژێك کە سەدام حوسەین تەقە لە فڕۆکەکانی ئێمە نەکات، ئێمەش هێرش ناکەینە سەر ئەوان.

پرسیار: هەڵویستی دەوڵەتی تورکیا چیە بە نیسبەت ئەم هێرشانە؟

بە نیسبەت هەڵویستی دەوڵەتی تورکیا من نامەوێت لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە قسە بکەم. ئەرکی من ئەوە بوو کە زۆر بە روونی ئامانجی خۆمان بۆ تورکیا شی بکەمەوە کە دەمانەوێت چ بکەین، با دەوڵەتی تورکیا خۆی بڕیار بدات کە ئایا ئەم رێوشوێنانەی قبوڵە بۆ وڵاتەکەی یان نا.

هەروەها ئێمە لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا راوێژ دەکەین بۆ ئەوەی چۆن لەم کارە زۆر هەستیارەدا بچینە پێش لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوە کە لەگەڵ ئۆپوزیسیونی عێراق لە چ قۆناخێکداین و هەروەها ئەوە کە ئۆپوزیسیون لە قۆناخی داهاتوودا دەیەوێت چ بکات. ئەوان دەتوانن باشترین دارێژەری بەرنامە و پلانەکانیان بن بەلام ئێمەش گەیشتووینەتە قۆناخێکی نوێ لەگەڵ ئۆپوزسیون. گەلێ لە خەڵك ئاگاداری ئەوە نین کە ئێمە تا ئێستا تەنانەت یەك دولاریشمان نەداوەبە ئۆپوزوسیونی عێراق. ئێمە لە رێگای بەلێندەرەکانەوە برێك پارەمان بۆ خەرج کردوون بۆ ئەوەی یارمەتیان بدەین کونفرانسەکانیان بە رێکخستن بکەن. هەروەها برێك پارەمان خەرج کردووە بۆ پرۆژە مرۆڤدۆستانەکان بەلام تا ئێستا بەشێوازی راستەوخۆ هیچ پارەیەکمان نەداوە بە ئۆپوزسیونی عێراق.

بەڵام بە هەرحاڵ لە داهاتوویەکی نزیکدا پارە تەرخان دەکەین بۆ ئۆپوزسیون، هەروەها کە جێگری وەزیری دەرەوە، بەڕێز" واکێر "چەند هەفتە پێش، ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکای ئاگاداری ئەم مەسەلەیە کردووەتەوە. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا یەکەم وەجبەی یارمەتی ماددی راستەوخۆی ئۆپوزسیون بەشێوازێکی زۆر رێکوپێك و حیساب بۆکراو دابین دەکەین، لە بەرامبەردا ئۆپوزسیون دەبێت بەشێوازی نووسراو پلانێك ئامادە بکات و بیدات بە ئێمە. یەکەم وەجبەی ئەم پارەیە نزیکەی ٢٥٠ هەزار دولار دەبێت کە ئەوان دەبێت خەرجی بکەن بۆ سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی رێکخراوەکەیان بۆ ئەوەی ببێت بە رێکخراوێکی سیاسی کاریگەرتر و بتوانێت بەرژەوەندییەکانی خەڵکی عێراق بپارێزێت لە وڵاتێکی ئازاد لە داهاتوودا کە بە یەکپارچەیی بمێنێتەوە و تێیدا سەرجەم هاووڵاتیانی عێراق هاووڵاتی پلە یەك بن و نەتەنها لە گەڵ یەکدی بەڵکوو لەگەڵ دراوسێکانیشیان بە ئاشتی بژین. ئەمە بە بۆچوونی ئێمە شتێکی گرنگە، هەندێ لە خەڵکی عێراق شتی وا دەڵێن بەڵام ئێمە شتێکی وا لە زمانی دەوڵەتی عێراق نابیسین. کەوابوو ئۆپوزسیون یەکەم وەجبەی ئەم پارەیە بۆ کارکردن لەم بوارانەدا بەکاردەهێنیت.

ئۆپوزیسیونی عێراق ئەو شەرت ومەرجانەی تێدایە و شایانی ئەوەیە کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە پەروەردە بکرێت. تەنها پلانی ئێستای ئێمە(لە پاڵ ئەو خاڵانەی کە ئاماژەیان پێکرا) ئەوەیە کە کۆمەڵێك پەروەردەی کاتی بدرێت بە ئۆپوزیسیون کە سوودمەند بێت بۆ سەرلەنوێ دروست کردنەوەی وڵاتی عێراق لە کاتی ئاڵوگۆڕ لەو وڵاتەدا و هەروەها بۆ ئەوەی خودی ئۆپوزیسیون وەك رێکخراو کاریگەرتر بێت. من پێشبینی ئەم جۆرە پەروەردەیە دەکەم لە گەڵ ئەوان بەڵام لە ئێستادا پێشبینی ئەوە ناکەم هیچ جۆرێ یارمەتییەکی سەربازی و چەکیان پێ بدرێت.

ئێمە ئێستا دەتوانین چ بکەین بۆ یەکخستنی خەڵکی عێراق دژی ئەو بڕیارانەی کە دەیانەوێت خەڵکی عێراق لە یەك جیاو بکەنەوە، واتا ئەو کارە کە دەوڵەتی ئێستای عێراق دەیکات. ئێمە

ئێستا دەبینین دەوڵەتی ئێستای عێراق برا دەکات بە دوژمنی برا. مەبەستی من تەنها هاندانی کوردەکان و عەرەبەکان نییە، بەڵکو عەرەب دژی عەرەبە، موسڵمان دژی مەسیحییە و عەرەب دژی تورکمانە. بە باوەڕی ئێمە ئەمە زۆر زیان لە سەقامگیری عێراق دەدات، نەتەنها لە کورت خایەندا بەڵکو لە درێژخایەنیشدا و ئێمە نیگەرانین لەم شتە.

ئێمە بەشێوازێك لەگەڵ ئۆپۆزسیونی نیشتمانی عێراق کار دەکەین کە هەوڵ بدات بۆ لە دەوری یەك کۆکردنەوەی گروپە جۆراوجۆرەکانی عێراق، چ کورد، چ تورکمان، چ عەرەبی سوننە، چ عەرەبی شیعە. ئێمە پێیان دەڵێن:"دەوڵەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قۆناخی یەکەمدا وەك خەڵکی عێراق سەیری ئێوە دەکات ، لەوانەیە ئێوە ناسنامەی جیاوازتان هەبێت، گەلێ لە مرۆڤەکان، ناسنامەی جیاوازیان هەیە، بەلام دەتوانن لە ئاستێکی هاوبەش یان نەتەوەییتردا لە دەوری یەك کۆ ببنەوە. ئەم ئەرکە لە سەرشانی ئێوەیە بەلام گرنگ بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە ئێوە خۆتان وەك عێراقی پێناسە بکەن کە دەتانەوێت بە یەکەوە ولاتەکەتان بەڕێوەبەرن". ئەمە هەڵوێستی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە،هەر بۆیە ئێمە پشتیوانی لە یەك ئۆپۆزسیون دەکەین لە عێراق، کەوابوو بۆ ئێمە گرینگە کە تورکیا چۆن سەیری ئەم مەسەلەیە دەکات.

ئەمە کێشەیەکی جیدییە. هەندێ لە خەڵکی عێراق قەد نایانەوێت لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتێکدا بژین کە کیمیابارانی کردوون. بە بۆچوونی ئێمە ئەمە کاردانەوەیەی مرۆڤی و دادپەروەرانەیە. ئێمە دەمانەوێت سەرجەم خەڵکی عێراق هەست بکەن کە هاوولاتی پلە یەکن لە دەوڵەتی داهاتووی عێراقدا و لەوە نەترسن کە دەوڵەتی عێراق سەرکووتیان بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەشداری بکەن لە دەوڵەتی داهاتوودا، لە ئەنجوومەنی وەزیراندا، لە ئەنجوومەنی نیشتمانیدا، لە گۆڕەپانی ئابووریدا، لە سیستمی پەروەردەی نەتەوەیی و هتد.

پرسیار: ئۆپوزسیون چ پێشنیارێکی هەیە بۆ ئێوە؟

" فرانسیز ریکاردۆن": ئەم پێشنیارە زۆر هەستیارە. ئێستا مەسەلەی رێبەرایەتی کردن کێشەیە، وەلامی ئەم پرسیارە ئاسان نییە. هیچ رێگاچارەیەکی دەستبەجێ لە ئارادا نییە. بەڵام ئێمە نامانەوێت هیچ کارێك لە "حەوشە خەڵوەتی" تورکیا ئەنجام بدەین مەگەربەو مەرجە کە پەیوەندی زۆر نزیکمان هەبێت لە گەڵ دەوڵەتی تورکیا و هەروەها ئەو خەڵکەی کە لەوێ دەژین.هەر بۆیە ئێمە لە پەیوەندیداین لە گەڵ خەڵکی ئازادی عێراق، چ ئەوانەی لە لەندەن دەژین، چ ئەوانەی لە ولاتانی عەرەبی دەژین و چ ئەوانەی کە لە باکووری عێراق دەژین. ئێمە عێراقێکی ئازاد و خاوەن یەکێتی نەتەوەیی و یەکپارچەیی خاکمان دەوێت. ئێمە لە گەڵ کوردەکانی عێراق، تورکمانەکان، ئاشوورییەکان، عەرەبەکان، سوننە و شیعەکان لە سەربنەمای عێراقی بوون کاردەکەین، لە سەربنەمای ئەوە کە دەیانەوێت ولاتەکەیان بە یەکگرتوویی رابگرن و بەرەو مەدەنیەتی بەرەن.

پرسیار: هەڵوێستان چییە بە نیسبەت شالاوەکانی تورکیا لە باکووری عێراق؟

" فرانسیز ریکاردۆن": ئێمە و دەوڵەتی تورکیا بەیەکەوە لە سەر سنوورەکان دژی ترووریزم(PKK بێت یان هەر رێکخراوێکی دیکە) کار دەکەین. ئەم بارودۆخە لە باکووری عێراق و وەلامی تورکیا شتێکی نوێ نییە. وەبیرم دێت تێوەگلانی تورکیا لەم کێشەیە دەگەرێتەوە بۆ دەیەی ۱۹۸۰ واتا زۆر پێشتر لە شەری کەنداو و دروست بوونی هەرێمی دژەفرین لە باکووری عێراق . لە حالی حازردا ئێمە پشتیوانی لە مافی خۆپاراستنی تورکیا دەکەین. ئێمە بەردەوام پشتیوانیمان کردووە لە مافی خۆپاراستنی تورکیا دژی ئەو تروریستانە کە خۆیان لە ولاتانی دراوسێدا داڵدە داوە. تورکیا خۆی دەپارێزێت. ئێمە هاوپەیمانی تورکیاین، هیچ گومان لەمەدا نییە. ئێمە بەردەوام وتوومانە تەنها چاوەروانی ئەوە لە هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەکەین کە لە رەوتی پاراستنی

وڵاتەکەیان، لە کەمترین هێزی پێویست کەڵك وەربگرن و رەچاوی مافی دانیشتوانی ناوچەکە بکەن. هێزەکانی تورکیا تا ئێستا رەچاوی ئەمەیان کردووە. کەوابوو ئێمە لەم پەیوەندییەدا هیچ نارەزایەتیەکمان نییە لە مافی خۆپاراستنی نەتەوەیی تورکیا دژی ترووریزم.

پرسیار: هەڵویستتان چییە بە نیسبەت فدراڵیزم بۆ عێراق؟

فدراڵیزم دەستەواژەیەکە کە لە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتی عێراق پێناسە نەکراوە. کەوابوو مەسەلەی فیدراڵیزم، ئەستەمە. بەڵام دەتوانم ئەو خاڵە روون بکەمەوە کە کاتێ کە باسی ئەم دەستەواژەیە دەکرێت، مەبەست فیدراسیون یا دەوڵەتگەلی لە یەك جودایە. ئێمە دژی ئەم جۆرە فدراڵیزمەین، ئێمە پشتیوانی لە هیچ جۆرە پارچە پارچە بوونێکی عێراق بە چەند دەوڵەتی جیاواز ناکەین، ئێمە بە دڵنیاییەوە دژی ئەم جۆرە فدراڵیزمەین. بە هەرحاڵ خەڵکە کە دەبێ بریار بدات چ جۆرە سیتمێکی سیاسی و ئیداری دەوێت. هەندێ لە وڵاتان سیستمی سیاسی و ئیداریان ناوەندیترە و هەندێ لە وڵاتان کراوەترە. وڵاتی ئێمە زۆر لە سانتراڵیزم دوورە، ئێمە ٥٠ ئەنجوومەنی مەحەلی و ژمارەیەکی زۆر شارەوانیمان هەیە کە هەندێکیان ئەنجوومەنی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئێمە ٥٠ پارێزگاری هەڵبژێردراو و دەسەڵاتی باجستاندنی مەحەلیمان هەیە.

خەڵکی عێراق هەموو پێکەوە دەبێ بڕیاری ئەوە بدەن کە دەیانەوێت چۆن لە داهاتوودا لەگەڵ یەك بژین. بەڵام مۆچیاری بەردەوامی ئێمە بۆ ئەوان ئەوەیە کە"باشترین داهاتوو بۆ ئێوە ئەوەیە کە پێکەوە بژین بە یەك یاسای بنەڕەتی کە هەمووتان بپارێزێت و هەمووتان بەشدار بن لە دەوڵەتی نیشتمانیدا". بەڵام ئەمە تەنها مۆچیارییە.

لە روانگەی بەرژەوەندی ئەمریکا(هەر وەك دراوسێکانی عێراق) هیچ وڵاتێك نییە لە جیهاندا کە وا بیر بکاتەوە کە بە قازانجی عێراقە یا بە قازانجی ئێمەیە کە عێراق دابەش بێت بەسەر چەند پارچە عێراقێکی بچووکدا. کەوابوو هەڵویستی ئێمە لەم پەیوەندییەدا زۆر روونە. من چەند جار

تا ئێستا وتوومه و کاتێ که ئۆپۆزسیونی عێراق له نیویۆرك کۆبووه، زۆر به روونی پێیانم وت بیرۆکەی دامەزراندنی چەند دەوڵەت و حیزبی سیاسی له سەر بنەمای ئەتنیکی، رەگەزی و ئایینی له راستیدا ئەمریکا زیز دەکات. به بۆچوونی ئێمه ئەمه خەڵك لەیەك جیا دەکاتەوه، خەڵك له دەوری یەك کۆ ناکاتەوه. ئێمه به هیچ شێوازێك پشتیوانی لەمه ناکەین.

ئێمه تەنها وەك حیزبگەلێکی سیاسی و ئیداری ناوچەیی نائاسایی و کاتی سەیری حیزبەکانی باکووری عێراق دەکەین له بارودۆخێکدا که بۆ کەس ئایدیال نییه. ئێمه ئەشویقیان دەکەین بەیەکەوه کاربکەن، نەئەوه که هەوڵ بدەین بەرژەوندی گروپێکی ئەتنیکی بخەینه پێش ئەوی دیکه. ئێمه دەمانەوێت عەرەب، کورد، تورکمان، ئاشووری له سەر بنەمایەکی به دور له گروپچێتی کاربکەن. بۆیه ئێمه له پەیوەندیداین لەگەڵ هەموو ئەم گروپانه . ئێمه هەوڵ دەدەین له رێگای چەتری کۆنگرێسی نیشتمانی عێراق له گەڵیان هەڵسوکەوت بکەین، ئێمه تەنها وەك کورد مامەڵه له گەڵ کوردەکان ناکەین. ئێمه له گەڵ کورد، تورکمان، ئاشووری و ئەوانی دیکه وەك عێراقی مامەڵه دەکەین. ئەمه باشترین شتێکه که ئێمه دەتوانین بیکەین بۆ خەبات دژی بەریانه جیاییخوازەکانی باکووری عێراق.

پرسیار: بیروڕاتان چیه به نیسبەت گەمارۆکانی سەر عێراق؟

" فرانسیز ریکاردۆن": ئێمه قەدت خوازیاری بەردەوامبوونی گەمارۆکان نەبووینه. به پێچەوانەوه، کاتێ که سیستمی گەمارۆکان له ئابی ١٩٩٠ پێکهات و له بڕیارنامەی ٦٨٧ و بڕیارنامەکانی دواتری پاش شەری کەنداودا پەسەند کرا، ئێمه(هەر وەك هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش) وابیرمان دەکردەوه و هیوادار بووین که سەدام حوسەین زۆر بەخێرایی ملکەچ دەبێت و گەمارۆکان کۆتایی پێدێت. کەوابوو ئێمه چاومان لەوه نییه که گەمارۆکان بۆ هەمیشه بمێنێتەوه، ئەمه ئامانجی ئێمه نییه. به پێچەوانەوه ئامانج و خواستی ئێمه ئەوەیه که دەوڵەتی سەدام حوسەین ملکەچ بێت بۆ ئەو شتانەی که بەڵێنی داوه ملکەچی بێت و هەر کاتێك که به تەواوی ملکەچ بێت گەمارۆکان بەتەواوی هەڵدەگیردرێت. بەڵام ئێمه گەمژه نین، ئێمه له

سهر ئهو باوهڕه نین كه سهدام قهت بیهوێت ملكهچ بێت، ههر بۆیه وابیر دهكهینهوه كه سهدام سهرهنجام دهبێ ههر بڕوات.

لایهنیكی دیكهی باس و گفتگوكانی گهمارۆكان ئهوهیه كه خهڵك زۆربهی جاران زانیاری دروستیان لهم پهیوهندییهدا نییه، خهڵك راستیهكان نازانن. ئێمه كۆمهڵێك زانیاریمان له ویبسایتی وهزارهتی دهرهوهی ئهمریكا بڵاو كردووهتهوه دهربارهی راستیهكان و بڕی خۆراك و دهواو دهرمان و پێداویستیهكانی دیكه كه له ماوهی چهند ساڵی ڕابردوودا له چوارچێوهی بهرنامهی "نهوت له بهرامبهر خوراك" دراوه به عێراق. ئێمه دهمانهوێت بهرنامهی نهوت له بهرامبهر خوراك له جێی خویدا بمێنێ. ئێمه له بڕیارنامهی ١٢٨٤دا ههوڵمان دا روونتری بكهینهوه كه چۆن دهكرێت گهمارۆكان ههڵبواسرێنهوه له بهر ئهوهی ئێمه دهمانهوێت زۆرتر یارمهتی خهڵكی عێراق بدهین، بهپێچهوانهی دهوڵهتی عێراق كه خۆی له خهڵكهكهی دوور دهگرێت.

له باكووری عێراق كه دهوڵهتی عێراق ناتوانێت دهستێوهردان له كاروباریدا بكات، بارودۆخی ژیانی خهڵك له چاو پێش له جهنگی كهنداو باشتر بووه. له باشووری عێراق كه دهوڵهت رێگاكهی گرتووه و ناهێڵێ نهتهوه یهكگرتووهكان چاودێری بكات و NGO نێونهتهوهییهكان به سهر دابهش كردنی خۆراك و دهوادهرمان چاودێری دهكهن، خهڵك له ئازار و ئهزیهت دان. له باشووری عێراق خۆراك و دهوادهرمان له بنكه سهربازییهكاندا زۆره، ئێوه دهتوانن راپۆرتی نهتهوه یهكگرتووهكان لهم پهیوهندییهدا بخوێننهوه. كهوابوو ئێمه روانگهیهكی زۆر جیاوازمان ههیه به نیسبهت گهمارۆكان، روانگهیهك كه زۆر لهو روانگهیه جیاوازه كه سهدام به جیهان نیشانی دهدات. ئێمه دهزانین ئهم گهمارۆانه كۆمهڵێك گیروگرفتی دروست كردووه بۆ توركیا و یهكێ له بهشه باشهكانی قسهكانی بهڕێز "واكێر" و باڵوێزی ئهمریكا له توركیا له گهڵ وهزارهتی دهرهوهی ئهمریكا ئهوه بووه كه چۆن ئێمه بتوانین به یهكهوه كاربكهین بۆ سووككردنی باری ئهم گهمارۆانه، نهتهنها له سهر شانی خهڵكی عێراق بهڵكو بۆ سهر بهرژهوهندییهكانی توركیاش.

پرسیار: ههڵویستی ئێوه چییه بهنیسبهت شهڕی یهكێتی و پارتی؟

" فرانسیز ریکاردۆن": به بۆچوونی من ئه‌م بارودۆخه هه‌روا به‌رده‌وامه. ئه‌وه که له ده‌ستی ئێمه دێت ئه‌وه‌یه(له ڕێگای ڕه‌وتی ئاشتبوونه‌وه‌ی ئانکارا) که PDK و PUK ته‌شویق بکه‌ین ڕێك بکه‌ون و نه‌ته‌نها له‌گه‌ڵ یه‌کتر به‌ڵکوو له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی که له باکووری عێراقن به‌ئاشتی بژین. ئێمه نابێت تووشی ئه‌و تێڕوانینه هه‌ڵه‌یه بین که ته‌نها دو جۆره خه‌ڵك (کورده‌کانی سه‌ر به PUK و کورده‌کانی سه‌ر به PDK) له باکووری عێراق ده‌ژین، گه‌لێ خه‌ڵکی دیکه له باکووری عێراق هه‌یه ، بۆ نموونه ئاشوورییه‌کان که گه‌لێ حیزبیان هه‌یه، تورکمانه‌کان که گه‌لێ حیزبیان هه‌یه و عه‌ره‌به‌کان. له‌ڕێگای ڕه‌وتی ئاشتبوونه‌وه‌ی ئانکارا، ئێمه ئه‌و دو حیزبه کورده سه‌ره‌کییه ته‌شویق ده‌که‌ین ڕێکبکه‌ون و له‌گه‌ڵ یه‌کدی به ئاشتی بژین.
له ڕێگای کارکردن له گه‌ڵ ئۆپۆزیسیونی عێراق ئێمه ده‌مانه‌وێت ئه‌وه به جیهان و شوێنه‌کانی دیکه‌ی عێراق نیشان بده‌ین که عه‌ره‌ب، کورد، تورك و حیزبه شیوعی و ئایینیه‌کان هه‌موویان ده‌توانن له داهاتوودا به‌شێوه‌یه‌کی مه‌ده‌نی و دیموکراتیك پێکه‌وه کار بکه‌ن. به باوه‌ری ئێمه ئۆپوزیسیونی عێراق بۆ ئه‌م مه‌به‌سته له ڕاستیدا کۆمه‌ڵێك هه‌نگاوی به‌ره‌و پێش هه‌ڵگرتووه به‌ڵام ئه‌م ڕه‌وته ڕه‌وتێکی ئه‌سته‌مه.

## کورد له گۆڕه‌پانی جیهاندا

**کۆبوونه‌وه‌ی به‌ڕێز" فرانسیز ریکاردون[1]"، کۆردیناتۆری تایبه‌تی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا بۆ ئالوگۆڕ له عێراق له ژێر ناوی "کورد له گۆڕه‌پانی جیهاندا[2] " له ناوه‌ندی ئاشتی جیهانی سه‌ر به زانکۆی ئه‌مریکا**

---

[1] Francis J. Ricciardone
[2] **Kurds in the Global Arena**

## کورد و کوردستان له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

### ١٧ ی نیسانی ٢٠٠٠

فرانسیز ریکاردون : ڕێگەم پێبدەن ئاماژە بە چەند خاڵی سەرەکی بکەم:

یەکەم: دەوڵەتی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ سیاسەتێکی تۆکمەی نییە بە نیسبەت کوردەکان و ئێمە هەروەك هاوولاّتیانی دیکەی ئێران، عێراق، سوریا و تورکیا چاو لە کوردەکان دەکەین . بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە بەگشتی ئاماژە بە سیاسەتی عێراق و پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ کوردەکانی عێراق و خەلکی ئازادیخوازی دیکەی عێراق دەکەم. شێوازی نزیکایەتی ئێمە لەگەڵ ئەم مەسەلەیە هەم لەگەڵ ئالۆگورە قوڵەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەگونجێت و هەم دەربڕی ئەم ئالۆگۆڕانەیە. ئەم مەسەلەیە دەمباتەوە سەر خاڵی دووەم:

دووەم: هەروەها کە پروسەی بەجیهانیبوون کێشە ناوچەییەکانی رابردووی خستوتە ناو گۆڕەپانی جیهان، نەتەوە بێ دەوڵەتەکانیش کاریگەرییان هەیە لە سەر پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان کە بە خێرایی بەرەوپێش دەچێت.

سێیەم: کوردەکانی عێراق یەکێ لە رێبەرانی ئەو عێراقە ئازادیخوازن کە هەم لە ناو عێراقیەکاندا و هەم لە ناو خۆیاندا و هەم لەگەڵ دنیای دەرەوەدا پاوانی دیکتاتوری عێراق لە سەر پەیوەندییەکان دەشکێنن. کەوابوو بوار خۆش دەکەن بۆ ئەوەی پێناسەیەکی هیوابەخش و مودێرن بخەنەڕوو دەربارەی ئەوە کە عێراقیبوون واتای چییە و عێراق وەك ولاّتێك دەتوانێ چۆن بێت.

### سیاسەتی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کورد

## کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

لەوانەیە ئێوە چاوەڕوانی ئەوە بکەن کە من ڕاگەیاندننامەی سیاسەتی ئەمریکاتان بۆ بخوێنمەوە بە نیسبەت کورد بەڵام بەداخەوە بێ هیواتان دەکەم، من نازانم سیاسەتی فەرمی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کورد چییە. هیچ پێویستیش بە زانینی ئەم سیاسەتە ناکات. ئەم کۆبوونەوە دۆستانەیەی ئێمە کۆمەڵێك پرسیار لە خۆ دەگرێت دەربارەی ناسنامەی کورد، لە ڕووی پەیوەندییەکان و سیاسەت و شتانی دیکە. ئەم مەسەلانە بۆ خودی کوردەکان، دراوسێکانیان و دەوڵەتەکانیان و هەروەها بۆ توێژەران و لێکۆڵەران، ئالۆز و هەستیار و سەرنجراکێشە. شرۆڤە و شیکردنەوەی ئەم مەسەلانە بە دڵنیاییەوە بە دەر لە توانایی، دەسەڵات یان بەرپرسیارێتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە .

ئێمە(هەر وەك دەوڵەتانی دیکە) وەك هاوولاتیانی ئێران، تورکیا، عێراق و سوریا مامەڵە لە گەڵ کوردەکان دەکەین. ئەڵبەتە لە سەر ئەو بڕوایەین کە مافی کوردەکان دەبێ وەك مافی هاوولاتیانی دیکەی ئەم ولاتانە پارێزراو بێت. ئێمە هەروا لە سەر ئەو باوەڕەین کە دیموکراسیەکی بەهێز، باشترین پارێزەری مافی سەرجەم هاوولاتیانی ئەم ولاتانەیە. من بارودۆخی کوردەکان لەم ولاتە جۆراوجۆرانە بەراوەرد ناکەم بەلام دەمەوێت ئاماژەیەکی کورت بکەم بە سیاسەتی ئێمە لە گەڵ کوردەکان لە هەر یەك لەم ولاتانە بۆ ئەوەی نیشان بدەم کە نەبوونی سیاسەتێکی تایبەت بە نیسبەت کوردەکان ڕێگر نییە لە پەیوەندی سودمەند و ڕاستەوخۆی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە گەڵ تاك و ڕێکخراوە کوردەکان کە دەورێکی مەحەلی و نەتەوەیی گرنگ دەبینن لە ولاتەکانیاندا.

یەکێ لەو ولاتانە کە بەشێکی زۆری کوردەکان تێدا دەژین، تورکیایە کە وەك هاوپەیمانی ناتۆ باشترین و نزیکترین پەیوەندی لە گەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە. ئەمە بە واتای ئەوەیە کە هەزاران بازرگان، لێکۆڵەر، ڕۆژنامەنووس، سیاسەتمەدار، توریست، دیپلومات و سەربازی ئەمریکایی هەر ڕۆژ بە شێوازی جۆراوجۆر هەڵسوکەوتیان هەیە لە گەڵ ئەو تورکانە کە بە ڕەگەز

